# مەملەکەتی من و تۆ

## تێگەیشتنێکی نوێ لە بیروباوەڕی ئیسلامی

ئایا دادپەروەریی خوا لەسەر زەوی هەیە؟

عەقڵ چییە؟

لەکوێوە هاتووم؟

من کێم؟

بۆ کوێ دەچم؟

قەزا و قەدەر چییە؟

هەموو شتێک لەناوچاومان نووسراوە؟

دین چییە؟

مردن چییە؟

ژیان چییە؟

بۆ دەبێ خوا بپەرستم؟

خوا چییە و کێیە؟

نووسینی

**ماکوان کەریم**

پێداچوونەوەی

م. عبدالرحمن محمد عارف




مەملەکەتی من و تۆ

ماکوان کەریم






مەملەکەتی من و تۆ

تێگەیشتنێکی نوێ لە بیروباوەڕی ئیسلامی

ئەم کتێبە فەلسەفە نییە تا لە مەخلوق و دروستکراوەکان بکۆڵێتەوە

عیلمی کەلام نییە تا بە عەقڵ لە خوا و پەیام و پەیامبەرەکەی بکۆڵێتەوە

بەڵکو ئەم کتێبە ئیمانە، تا چێژی نەکەیت نازانیت چییە، وە تەواوەی ئەو بابەتانەشی تێدا کۆبووەتەوە!


کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوار ڕیانی شێخ مەحمود بەرامبەر مزگەوتی محمود عەلاف

٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ — M.Ktebxana — نرخ: ١٠٠٠٠





Design: **Braw** Al-Najjar



# مەملەکەتی من و تۆ


نووسینی: ماکوان کەریم

پێداچوونەوە: م. عبدالرحمن محمد عارف



## کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی




بەڕێوەبەری گشتی: موحەممەد خضر ئەحمەد ٠٧٨٢٤٦٧١٣٩٤ - ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤

بەڕێوەبەری هونەری: موستەفا موحەممەد کوردی ٠٧٥٠٩٩٩٨١٨٢

فەیسبووک: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

ئینستگرام: کتێبخانەی حاجی قادری کۆیی/ M.Ktebxana

لقی یەکەم: بەرامبەر دەرگای قەڵا - بازاڕی ڕۆشنبیری

لقی دووەم: چوارڕیانی شێخ مەحموود - بەرامبەر مزگەوتی مەحموود عەلاف

ئیمێڵ: mdmaktaba@gmail.com

تایپ: باران ئاریایی، یەحیا حەسەن

نەخشەسازی ناوەوە: موستەفا محمد کوردی

نەخشەسازیی بەرگ: برەو نەججاڕ

چاپی یەکەم: ١٤٤٥ک-٢٠٢٤ز

پێوانە: ١٤ * ٢١

تیراژ: ٢٠٠٠

لاپەڕە: ٥١٢

نرخ: ١٠٠٠٠

له بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان

ژمارەی سپاردنی (٨٥٩) ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

لە بڵاوکراوەکانی بزاڤی نوێ

تێگەیشتنێکی نوێ لە بیروباوەڕی ئیسلامی

# مەملەکەتی

# من و تۆ

نووسینی

ماکوان کەریم

چاپی یەکەم

٢٠٢٤

﴿.. ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ..﴾ ٦٠

ئەم کتێبە فەلسەفە نییە تا لە مەخلوق و دروسـتکراوەکان بکـۆڵێتەوە.. عیلمی کەلام نییە تا بە عەقڵ لە خوا و پەیام و پەیامبەرەکەی بکـۆڵیتەوە.. بەڵکو ئەم کتێبە باسی ئیمانە تا چێژی نەکەیـت نازانیـت چیـیە، وە تەواوی ئەو بابەتانەشی تێدا کۆبووەتەوە!

# پێشەکی

ئەزانم پەلەتە بۆ ئەوەی بیخوێنیتەوە، زۆرێک لە ئێوە کە ئەم کتێبەتان بەدەست خستووە  یان کڕیوتانە وا دەزانن باسی عشق و خۆشەویستی و موغامەراتی دڵدارییە.

نا، وانییە و هیچ پەیوەندییەکی بەو باسانەوە نییە..

من و تۆ لێرەوە هاوڕێین و دەمەوێت پێکەوە پرسیار و شیکاری بکەین، بۆ باسێک کە سەرتۆپی باسەکانە، بەهەشت و دۆزەخی لە پێناودا دروست کراوە، چارەنووسی تۆ و هەموو کەسێکی پێوە بەندە. جیهادی لە پێناودا کراوە، خوێنی بۆ ڕژاوە، سنووری بۆ بڕاوە، غەریبایەتی چێژراوە لە پێناویدا، تەنانەت ڕۆحی پێبەخشراوە، ماڵ و سامانی بۆ سەرف کراوە.

مەمەلەکەتی من و تۆ دارشتنەوەی کەسایەتی تۆیە، بەهێزکردنی کەسایەتیتە، بەواقیع کردنی کەسایەتی تۆیە، ئازادکردنی کەسایەتی تۆیە، لەکۆتاییدا ئاقڵکردنی کەسایەتی تۆیە. لەوانەیە بڵێن بۆ ماکوان من بەبێ عەقڵ دەزانێت وا دەڵێت ئەم کتێبە بۆ ئاقڵکردنی تۆیە. لەوەڵامدا دەڵێم عەقڵ مەخلوقێکی زۆر عەجیبە لە ڕۆح سەرسام ترە، هەموو کەس عەقڵ و ڕۆحی هەیە.

ئەم دوو مەخلوقی خوایە پێویستیان بە وەرزشە، وەرزشی ڕۆح پەیوەیستە بە عەقڵەوە، ئەگەر وەرزش بە عەقڵ نەکەیت ڕۆح داماو دەبێت و دەپوکێتەوە تا لە کۆتایی لە لاشە دەردەچێت. بەڵام عەقڵ کەرەستەی وەرزش بوونەکەی لە مەملەکەتی من و تۆدایە، بەم کەرەستانە دەتوانێت عاقڵ بێت، خۆ ئەگەر پێشتر زانیوتە و لێرەدا من دووبارەم کردۆتەوە ئەوا داوات لێدەکەم بەچاوی ڕەخنەگرانەوە تەماشای بکەیت و هەرچی هەڵە و نەزانی من هەیە تۆ بۆم ڕاست بکەرەوە.



ئەگەر بووە هۆکاری عاقڵ بوونی تۆ من هیچم لە تـۆ ناوێـت، پاداشـتم لای پەروەردگارە، خۆ ئەگەر دوعایەکی خێرم بۆ بکەیت ئەوە خراپ نییە و خوا پاداشتت باتەوە. ئەمەوێت ئەوە بەتۆ بڵێم ئەم کتێبەم لەسەر بنەمای پرۆژەی خوێندنەوە نووسیومە واتا (إقرأ) زۆربەی پرۆژەکانم بـۆ ئەوەیە کە تۆ و من ئەوانەی تـریش و ئەوانەی دێـن فێـری خوێنـدنەوە بـن، پـرۆژەی (إقــرأ) زۆر هەوڵــم دا بــۆ ئەم پــرۆژەیە تــا ڕادەیەک ســوپاس بــۆ خــوا سەرکەوتوو بووم.

بەڵام مـن پەنـادەگرم بە خـوا لەوشــەی (مـن) مەبەسـت خۆبـادان و خۆبەزلزانی نییە، لێرەدا بەواتـای خزمەتکـار و فێرکـارێکی سـادە بەکـاری دەهێنم.

ئەگەر هەوڵی ئەوەمان دابێت خەڵک فێری ئەوە بکەیـن بخـوێنێتەوە، دەبێت فێری بکەین کە چی بخـوێنێتەوە، دوایـی بیـرم لێکـردەوە کە ئەمە دیکتاتۆرییە، کە تۆ دیاری بکەیت خەڵک چی بخوێنێتەوە، ناکرێت دەست بەسەر عەقـڵ و حەز و ویـژدان و تەنـانەت سۆزیشـیاندا بگریـت و پێیـان بڵێیت ئەوە بخوێنەرەوە کە من دەمەوێت ئەی لەم دیکتاتۆرە تۆتالیتـارییە زاڵمانە!

بۆیە بڕیـارم دا تـۆ ئـازاد بیـت لە خوێنـدنەوە بـڕۆ چـی دەخـوێنیتەوە بیخوێنەرەوە، بەڵام دەبێـت بزانیـت لەنـاو ئایینەکەتـدا هەنـدێک بنەمـای بنەڕەتی نەگۆڕ هەن، نەگۆڕەکان بزانە. پاشـان بـڕۆ بە ئـارەزووی خـۆت لە (مارکس، فرۆیـد، داروین، نـیچە و سـارتەر.هتد) بخـوێنەرەوە، مـن ترسـی گۆڕانی فیکری و بیروباوەڕی تـۆم نـیە، بەڵام بەو مەرجەی مەملەکەتـی من و تۆ بەجـوانی بخـوێنیتەوە یـان بیخـوێنە لای مامۆسـتایەک ئەو کـات بیرفراوانیـت ئەداتـێ، تێگەیشـتنێکی زۆر عەجیبـت پێشـکەش دەکـات لە پرنسیپ و مەبدەئەکانی جیهان و دنیابینییەکی وات ئەداتـێ کە هەمیشـە لە دوعای خێر بێبەشم ناکەیت.

تۆ بڵێ بۆ؟



زۆر بەسادەیی لەبەر ئەوەی لەسەرەتاوە کە ماکوان-ت ناسیوە داوای لێ کردوویت کە بخوێنیتەوە، ئەم مەبدەئەش لای منی نووسەر چەسپاوە بەهۆکاری ئەوەی یەکەم وشەی قورئان (إقرأ)ە. سەیرە کەسێک کۆمەڵگاکەی جێدەهێڵێت و نازانێت بخوێنێتەوە و خوێندەواری نییە، لەلایەن خواوە لە ئاسمانەوە بە فریشتەیەکدا پەیامێکی بۆ دەنێرێت کە پەیامەکە لە دوتوێی کتێبێکدا خۆی دەبینێتەوە لە سەرەتادا بەو کەسە دەفەرموێت بخوێنە.

ئەو فریشتە بە دەنگێکی ناسک دەڵێت (بخوێنە) ئەویش وەڵام ئەداتەوە دەڵێت من خوێندەواریم نییە، لەوکاتەش دا خۆ نازانێت بووە بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

بەو وەڵامە وازی لێناهێنێت و دووبارە دەڵێت (بخوێنە)، ئەو کەسەش زۆر بە هێمنی دەڵێت ئاخر خوێندەواریم نییە، چەند وشە و ڕستەیەک دەفەرموێت و کەسەکە دەگوشێت بەخۆیەوە پاشان بەجێی دەهێڵێت. ئەم وشەی (بخوێنە) نهێنییە لەناو ئەم ئەشکەوتە پڕ لە ڕتوبەت و خۆڵ و تەنهاییەدا، لەناو کۆمەڵگایەکدا کە دەوڵەمەند دەوڵەمەند دروست دەکات و هەژاریش هەژار.

داخۆ ئەم نهێنییە چی بێت کە لەرزوتا لەگەڵ خۆی دێنێت، ئەم وشانە لەسەر ئەم کەسە بەڕێزە قورسە و ماناو واتای زۆر قوڵە، پێشتر وا پەیم دەبرد بەواتای خوێندنەوەی قورئان و خوێندنەوەی ترە بۆ ئوممەتەکەی ئەم پیاوە بەڕێزە کەناوی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ نەخوێندەوارە، وامدەزانی بەشێکە لە موعجیزەی پێغەمبەرایەتی وامخوێندبووە و بیستبووم لە زانایەکی ئەم ئیسلامە، بەڵام وانییە زۆر زۆر لەوە قوڵتر و فراوانترە کە بڵێین خوێندنەوە تەنها موعجیزەی پێغەمبەرایەتی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم وشە لەرزوتای لێهێنا.

بەدوایدا باسی دروستبوونی مرۆڤ دەکات (بخوێنە) لەپاشان ئـایینەکە باسی پەرەسەندنی مرۆڤ دەکات کە باسێکی زانستی ڕوونە باسی ئـامێری خوێندنەوەیە کە نووسینە ئەویش قەڵەمە.

ئەم وشانە هەموو کۆدن پێویستە کۆدەکە بدۆزینەوە لەوباسە دەرچین کە بیرکردنەوەمان وەرزش پێنەکەین و ڕاستەخۆ بڵێین موعجیزەیە ئەی بـۆ نەڵێین لە موعجیزەی هەموو پێغەمبەرانی تر گەورەترە. سـەیرە ئەم کـۆدە چ تـام و چێژێـک ئەبەخشـێت؟ بەڵـێ ورد بـوونەوە و گەڕان بە شـوێنیدا لەگەڵ هەمـووی نهێنـیە و لەرزوتـای لە پێغەمـبەرەکە هێنـاوە، بەڵام یەک پارچە چێژ و خۆشی و وروژاندنە.

ئەزانـم تـۆ لەم مەمـلەکەتەدا پەلەتە بـۆ ئەوەی ئەنجـامی (بخـوێنە)ی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەست بکەوێت، ئەنجـامەکە زۆر ئاسانە ئەو قسەیەی بۆم کردیت تۆزێک پێـت نـاخۆش بـوو، وتـم عەقڵـت پێدەبەخشێت ئەم کتابە، چونکە بنەماکەی (بخوێنە)یە. نهێنی ئەم وشـەیە لەچیدایە، ئەگەر بڵێم چەندین بەرگ کتێبی دەوێت بڕوام پێبکە، بەڵام من هەندێک سەرەقەڵەمت ئەدەمێ.

نهێنـی (إقـرأ) لەوەدابـوو کە هەمـوو پێغەمبەرانـی پێشـوتر (سـەلامی خوایان لەسەربێت) موعجیزەی بەرجەستەیەکانیان هەبوو، نموونەی نوح و لافـاوو کەشـتییەکەی، نمـوونەی صـالح و وشـترەکەی، نمـوونەی ابـراهیم و نەسوتاندنی لە ئاگرەکەدا و پارچەپارچە کردنی باڵندە و گەڕانەوە بۆ ژیان، نمـوونەی موسـا و گۆچـانەکەی و ڕۆشـنایی دەسـتی، نمـوونەی عیسـا و زیندووکردنەوەی مردو و چارەسەری نەخۆش..هتد.

بەڵام نهێنییەکەی پێغەمبەر محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ جیاوازتر بوو لەهەمـــوو پێغەمبەرانـــی تـــر ئەوان لەســـەر ئامرازەکـــان، لەســـەر هەستەکان(حاسەکان) کاریان دەکرد، وەکـو بینـین و بیسـتن و بـۆنکردن و بەرکەوتن و تامکردن بوو، بەڵام پێغەمبەر لەسەر بنەمای عەقڵ کاردەکات،



خوای پەروەردگار ڕێبازەکەی گـۆڕی لەمەودوا عەقـڵ لەکـایەی ژیانـدایە و شارستانیەت دروست دەکات.

پەیوەندی عەقڵ بەمرۆڤ و کۆمەڵگـاوە پەیوەنـدی عەقـڵ بەمـرۆڤ و گەردوونەوە، پەیوەندیی. سەدەها بەرگ کتێبی دەوێت بۆ شیکاری نهێنـی ئەم وشـە کە (بخـوێنە)یە زۆر سەرسـامت دەکـات بەوەی بەدوای بخـوێنە باسی پەرەسەندنی کۆرپەلە و جینات دەکـات، ئـاخر ئەوەمـان فێردەکـات هەموو گیانلەبەران لە پشیلە، سـەگ، مانگـا، کیسـەڵ، کـرم، مـار، مێـروو و ماسی..هتد بەهەمان قۆناغی پەرەسەندی مرۆڤ دا دەڕۆن جیاوازی نێوان مرۆڤ و گیانلەبەرەکانی تر (بخـوێنە)یە ئەوان کـار لەسـەر عەقـڵ نـاکەن، بەڵکو کار لەسەر خواردن و خواردنەوە و جوتبوون و خەو دەکەن، کۆتایی ژیانیان بێ مێژوو و نـاوە، بەڵام وشـەی بخـوێنە چ گۆڕانکـارییەکی کـرد بە گشتی لە ژیانی مرۆڤ دا، ژیار و شارستانیەتی دروستکرد.

سەرەتای وەحی و سروش بۆ ئەم پێغەمبەرە نەخوێندەوارە (بخـوێنە)یە خۆ بەتەنها مانا و واتای خوێندنی کتێبێک نییە، ئەو خوێندەواری نییە ئیـتر چی بخوێنێت؟

بەڵام هاوکێشەکە بەو سادەییە نییە و زۆر قوڵە، دەبێـت خوێنـدنەوەی هەبێت بۆ گەردوون بۆ مرۆڤ، بۆ کۆمەڵگا بۆ ژیار بۆ ئاشتی بۆ جەنگ، بۆ پەرەستن بۆ بازرگانی بۆ ئابووری، تەنانەت بۆ خوای پەروەردگاریش.

ئەم وشــە هەروا ســادە نیــیە، بەڵکــو کەهــات هەڵبــژاردەی هەمــوو وشەکانی تری لەهەموو بەنـدایەتییە تەوقیتییەکـان، {هیواخـوازم زانایـانی شەریعەت ناسی بەڕۆحێکی وەرزشی وەربیگرن}، وشـەی (بخـوێنە) فەرزە لە پێشترە لە هەموو دروشمەکانی تـر، ئـاخر تـا خوێنـدەوار نەبیـت چـۆن چۆن دەتوانیت نوێژ بکەیـت کە کردیشـت بـە ڕوکـەش عیبادەتـە، ئـەگینا وەک ناوەرۆک عادەتە و خوت پێوە گرتووە.



ئەگەر تەماشــــای ڕەوەنـــــدی یەکەم بکەیـــت کە هـــــاوەڵانن چ کۆمەڵگایەکیان پێک هێناو چۆن شارستانیەتی ئیسلامیان بوونیادنا.

دەزانــن بەچــی بوونیادیــان نــا بە (بخــوێنە)، بەزانســت کە هۆکــاری ئاراستەی وەحی بوو بۆ عەقڵ و فێـری ئـیمان بـوون. وشـەی (بخـوێنە) لە ڕەحمیدا وشەیەکی تری تێدا لەدایک بوو، ئەویش وشـەی ئـیمان بـوو، ئەم نهێنی یەکەمە دنیایەک شـتی تـری تێـدایەو کۆدەکانمـان بـۆ نەکـراوەتەوە یەشــتا بەجێــی دەهێڵــین بــۆ جیلــی دوای خۆمــان لێــی بکــۆڵنەوە، بەڵام فراوانیەکــی تــری پــێ بەخشــین لە وشــەیەک کە زیــاتر لەخــۆی نهێنــی هەڵگرتووە، ئەو وشەیەش پاشا وشـەی زەوی و ئاسـمانەکانە نـاوی وشـەی (ئیمان)ە.

مەملەکەتی من و تـۆ باسـی ئـیمانە ئـادەی فەرمـوو بـڕۆ نـاو باسـەکە بــابەیەکەوە گەشــتی ئیمانمــان دەســت پێــبکەین. پەلە مەکە بیــرم چــوو، لەوانەیە بۆ تۆ گرنگ نەبێت بەڵام بۆ من گرنگە  تۆ بزانیـت بە چ ئازارێـک ئەم کتێبە لەدایک بووە، بە سێ زینداندا تێپەڕیووە تـا تـۆی خۆشەویسـت بە ئاسانی بیخوێنیتەوە.

یەکەم جار لە زیندانی ئیتالیا بەناوی (زیندانی ساساری) دەستم پێکـرد کە ئەو کافرە زاڵمانە ئەوەی کە نوسـیبووم لێیـان سـەندم، دوای سـاڵیک و مانگێک گواسـتمیانەوە بـۆ زینـدانێکی تـر لە شـاری (ڕۆسـانۆ) لەوێ وەرم گرتەوە و دەستم کردەوە بە نووسین، دیسانەوە کۆنترۆڵ کـرامەوە و لێیـان سەندمەوە، تا گەڕامەوە بۆ نەرویج و لە زیندانی (ئیولەشمۆ) پێیان یامەوە و تا ئەم شەو کە ٢٠٢٣/٢/٥ یە کاتژمێر ٠٩:٣٧ خولەک تەواوم کرد.

کەواتە بڕۆ ناو مەملەکەتی من و تۆ و بزانە چ باسە!

ماکوان کەریم
زیندانی ئیولەشمۆ/ نەرویج



# پێشەکی

الحمد لله رب العالمين، و لا عدوان إلاّ على الظالمين، و الصلاة و السلام على خير خلق الله محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ و صحبه و أتباعه و من دعا بدعوته و جاهد في سبيل دينه إلى يوم الدين. أما بعد:

ئەو چرکەساتەم لەیاد ناچێت کە لەڕێی برای بەڕێزم مامۆستا ماکوان کەریم -وەک شتێکی چاوەڕوان نەکراو-زەنگی تەلەفون لێیداو کاتێک فەرمووم کرد بێ خۆناساندن زانیم ئەوە خۆیەتی لەناو حەپسخانەوە دلێرانە سەلام و دوعام بۆ ئەکات، لە حاڵ و ماڵم پرسیار ئەکات، لەوەیان شیرینتر و لە تەلەفۆنی دواتری چەند هەفتەیەک وتی: کتێبێکم نووسیوە و داواکارم پێداچونەوەی بۆ بکەیت و خۆت وەکیلبە لەهەر گۆڕانکارییەک. شیرینی ئەم هەواڵە ئەوەنەبو کە من پێداچونەوەی کتێبی بۆ بکەم، ئەوە بەخەڵکی تریش ئەکرێت، بەڵکو لەوەدا بو کە لەناو تەنهایی و لەچوار دیواری بەندینخانەی تاغوتەکاندا کتێبی نووسیوە! ڕێی نەداوە خەمی تەنهایی و دوری لە خێزان، و خزمان، و برایان، و دۆستان هەم لە تین و تەوەکول، هەمیش لە هێز و هیوای کەمکاتەوە!

ئەم هەنگاوەش شوکرانەی خوای ئەوێت و جێی ئەوەیە ئەم برا ستەملێکراوەمان بکرێتە نموونە و پێشەنگێک و چاوی لێبکرێت. ناحەزان و ڕاپۆرتچییەکان وایانزانی ئەگەر مامۆستا ماکوان بخرێتە کونجی زیندانەوە لە (ڕۆژئاواي دیموکراسی) ئیتر ئەکوژێتەوە و نە دەنگی دلێر ئەمێنێت و نە قەڵەمی سەبەرزانە ئەنووسێت و نە دێتەوە گیانی ناحەزانی دین و ژینی خەڵک، بەڵام هەموو ئەم حەز و ئاواتانە بوونە بڵقی سەرئاو و خەیاڵ پڵاویی! ئەوەتا بە کتێبی (مەملەکەتی من و تۆ)، کە شەرح و تەرحێکی جوان و جەوهەر قوڵە بۆ بیروباوەڕی موسڵمان، لەودیو دیوارەکانی

ستەمەوە شوێن پەنجە و پەیامی خۆی ئەگەیەنێتە نەوەی نوێ و خوێنەوارانی نەتەوەکەمان.

گەرچی دوژمن وائەزانێ من بە دیلی لاڵ ئەبم
باش بزانێ کونجی زیندان بۆ من قوتابیخانەیە
بیری ئازادیم لە زیندانا فراوانتر ئەبێت
قوڕ بەسەر ئەو دوژمنەی هیوای بە بەندینخانەیە
گرتن و لێدان و کوشتن عامیلی ئازادییە
تۆپ و شەستیر و کەلەبچە لام وەکو ئەفسانەیە
چاوەڕوانی شۆڕشێکم عالەمێ ڕزگار بکات
میللەتم بۆ ئەم مەبەستە کردەوەی شێرانەیە
چەکی شۆڕشگێڕی من نووسین و بیروباوەڕە
ڕاپەڕینە هەڵمەتە پڕ نەعرەتەی کوردانەیە
گەر بە ئازادی نەژیم مردن خەڵاتە بۆ لەشم
نۆکەری و سەردانەواندن کاری نامەردانەیە

مێژووی زانایان و پیاوانی ئیسلام لە کۆن و نوێ ئەوەیان فێرکردووین و دڵنیاییان پێداوین کە هەڵوێستی مەردانەی ئەوان و نووسینەکانیان لە گشت بوارەکانی قورئانناسی و سوننەتناسی وخەڵکناسی و فیقە و عەقیدە و ئوسوڵ و تەفسیر و..هتد بونەتە چاوگگەلێکی ئیلهام بەخش و پێگەیەنەر و پارێزەری نەوەکانی ئیسلام.



سووربونی ئەوان لەسەر ئیسلامەتی ڕاستەقینە،و پاراستنی زانستەکان، و تۆمارکردنی نەبەردیی و جوامێرییەکان، و بەرگرییان لە خاک وخەڵکی موسڵمان، و ڕوو بە ڕووبونەوەی تاغوتانی سپی و ڕەش و بەرگری لە ستەملێکراوان ناووشوێنەواری ئەوانی هێشتەوە، ئەنجا بە شانازییەوە بونە مامۆستا و چاوساغ و مورشیدی گەلانی موسڵمان لە هەرکوێیەکی ئەم جیهانەدا گوێبگریت و چاو بگێڕیت بوونی ئەوان وەک مانگی چواردە وایە لەشەوەزەنگی جاهیلیەتی سەدەی بیست و یەکدا.

دوژمنانی بانگەواز و بانگخوازان وێنەیەکی ناشیرین و نامرۆڤانەیان نەماوە نیشانی نەدەن، ئەوان تەنها کینە و ئیرەیی و لوتبەرزی ناوەشێنن، بەڵکو جەنگی سەروماڵییان ڕاگەیاندووە، گرنگیش لای ئێمە کۆتایی ڕێ و ڕوداوەکانە کە بە خێرو سەرکەوتنی ستەملێکراوان و ژێر پێکەوتنی ستەمکاران کۆتایی دێت، پێغەمبەر یوسف بەنزیک نۆ ساڵ خرایە بەندینخانە، ئەوە بژاردەی بو نەک سەرشۆڕ بکات و ئیمان و کەرامەتی بکاتە قوربانی هەواو هەوەسی دەسەڵاتدارێک. ﴿قَالَ رَبِّ ٱلسِّجۡنُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِمَّا يَدۡعُونَنِيٓ إِلَيۡهِۖ ..﴿٣٣﴾﴾ یوسف.

لەوێ و لەناو ژێرخانی ستەمکاراندا چرای ئیمانی هەڵکرد و بناغەی ئازادکردنی مرۆڤەکانی دارشت، هەرلەوێوە و لەناو ئاهو نزولەی ژێردەستەکاندا دەسەڵاتی ناچارکرد بۆ نەخشەڕێی فریادڕەسی پێغەمبەرایەتی خاڵ بە خاڵ بچنە ژێر باری، هەر لەوێشەوە لەنێو چوار دیواری مەزڵومییەتدا دەوڵەتدارانی ڕۆژگاری هێنا بەچۆکا و لێی پاڕانەوە خۆی سەرکردە بێت و پێشیانکەوێت بۆ ڕزگاریی، بۆ ئاسوودەیی، بۆ هێنانەدی مەبەست!

ئایینی خوای گەورە بە ئاسانی نەگەیشتوەتە ئەمڕۆ، لەو پێناوەدا سەعیدی کوڕی جوبەیر سەری لە لاشە جیاکرایەوە، پێشەوایان ئەبو

حەنیفە و ئیبن تەیمیە لە گرتوخانەدا گیانیان سپارد، پێشەوا مالیک بن ئەنەس تێلاکاریکرا و جەللادەکەی ئەڵێت ٨٠ دارم داوە لە ئەحمەد ئەگەر لە فیلم بدایە ئەمردا!

هەرلەو پێناوەدا سەید قوتب و عبدالقادر عەودە لە سێدارە دران، کاک ناسر لە ڕۆژی جەژندا خنکێنرا، مەلای ڕەبیعی بە غەدر کوژرا، عبدالله عەززام نامرۆڤانە خۆی و دو کوڕەکەی بە تێ ئێن تی تەقێنرانەوە، هەزاران هەزار گەنج و پیری ئەم ئوممەتە لە پێناوی خوداو لە پێناوی ستەملێکراواندا سەریان نایەوە و ئامادەش نەبوون بۆ چرکەیەک بیروباوەڕی خۆیان بفرۆشن.

پێشەوا (بویطي) کە فەقیهێکی دێرینی مەزهەبی شافیعییە هەمو هەینییەک لە گرتوخانەدا خۆی ئەشۆرد و دەستی بە خۆیدا ئەهێنا و ئەچووە بەردەرگاوان و ئەیوت دەی ڕێم بدەن با بڕۆم بۆ نوێژی هەینیم، دەرگاوانیش ئەیوت بۆت نییە لێرە دەرچیت، لە وەڵامدا ئەیوت: خوایە ئەوەتا خۆم ئامادە کردووە بێمە ماڵەکەت بۆ نوێژی هەینی بەڵام ڕێم نادەن!

ئەوان ئەشکەنجەیان خوارد، ژەهراو کرا بە گەروویانا، بەڵام خۆیان هەڕاج نەکرد بۆ حەزی تاغوتان، ئەم ڕۆحبەرزی و دڵپاکییەی ئەوان سەججان و جەللادەکانی کردە پەندی زەمانە و ڕوانین و نووسینەکانی زانایانیش بۆ پیاوان و ژنانی موسڵمان بونە چاوگەی ئیلهام و هیواو هەستانەوە. ﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتۡرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمۡ لَا يُفۡتَنُونَ ٢ وَلَقَدۡ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡۖ فَلَيَعۡلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعۡلَمَنَّ ٱلۡكَٰذِبِينَ ٣﴾ العنكبوت. پێشەواش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموێت: (إنَّ من أشدِّ الناس بلاءَ الأنبياء، ثم الذين يَلُونَهم، ثم الذين يَلُونَهم، ثم الذين يَلُونَهم).



مامۆستا ماکوان لەم کتێبەدا مەرجەعیەتی دیارە، سەرچاوە فیکرییەکانی ڕوونە، ڕێز لە زانایانی ئێستا و جاران و مێژوومان ئەگرێت و وانەی گەورەی لێوە ئەگوازێتەوە بۆ نەوەی تازە و خەڵکی ئەم چەرخەمان، ئەمانەش پێوەری گەورەن بۆ بەسەربەرزی مانەوەی هەر نووسەرێک و هەر کەسێک. دوور لەوەی بچێتە ژێرباری فشاری دەروونی، وەکو کەسێکی ئازاد قسەکانی نووسیوە و شڵەژان و سڵەمینەوەی پێوە دیارنییە، سەرەڕای ئەوەی ٩ ساڵ بە ستەم و ناڕەوا حوکم دراوە و لە پشت دیوارەکانی تەنهاییەوە توندکراوە. هەروەها بە زمانێکی سادە و ڕوون و (گەنجانە) و(بەڵگەدارانە)و هاوچەرخانە بۆمان دواوە.

لە نووسینەوەی ئەم کتیبەدا ئەیەوێت لە ڕێی کەسێکەوە هەموو گەنجان و هەموو خەڵک بدوێنێ، هاوخەمێکەوە، هاوزیندانییەکەوە کە ئەویش هەر خۆیەتی!، کەسی تر ئەبێت کێ بێت هەتا بیدوێنێ کاتێک ئەو لەدوای دەرگا داخراوەکانەوە نیشتەجێکراوە؟. ئەم کتێبە ژیانی لە سێ زیندانی ئیتاڵیا و نەرویج بەسەربردوە ئەنجا گەیانراوەتە دەرەوە، ئومێدیش وایە چاپ بکرێت و وانەی ئاییندارى و ئازادیی بە خوێنەرانی بڵێتەوە.

هەمیشە ئەو کتێبانەی بە هەوای (گرتووخانەکان) و لەژێر ستەمی جەللادەکان و یاساکانی دژە مرۆڤدا نووسراون ئاوازێکی تایبەتیان هەیە، هەموو خوێنەرێکی جددی تینووە بە خوێندەوە و وانە لێوەرگرتن و کارپێکردنی لە ژیانی خۆی و کۆمەڵگەکەیدا. کێ هەیە قەدری (ظلال)ی سەیید قوتب نەزانێ کە لە عەزابخانەی عبدالناصردا نوسراوە؟ کام خوێنەرە تاسوق بە ئازادی بێت و نەیەوێت (المسلمون و الحضارة الغربية)ی شێخ سەفەر ئەلحوالی بخوێنێتەوە لە تاریکخانەکانی محمد بن سەلماندا نووسراوە؟ کەس ئەتوانێ بڵێت کتێبەکانی ئبن تەیمیە خۆمی لێنادەم و هیچ

پێویستم بەو عەقڵە گەورەیە نییە کە زۆربەیان لە پشت دەرگای ئاسنینەوە نووسراون؟

هیچ گەورە مەلایەک ئەڵێت کتێبەکەی جەنابی سەرەخسی(المبسوط) لە مەزهەبی ئەبوحەنیفە خێری تێدانییە لەبەر ئەوەی خۆی لە بیرێکدا بووە و بیرەکەش لەناو گرتوخانەیەکدا و بەو دژوارییە و بە زارەکی بۆ فەقێکانی گواستووەتەوە؟ جاران و بە ئێستاشەوە تەنها دێڕە شیعرێک، یان پەیامێک لە دیلێکەوە دزەی پێبکرێت ئەبێتە جێی باس و گرنگی پێدان و خولانەوە بە دەوریدا، ئەی ئەگەر کتێب بێت و پەیام و پرۆژەیەکی پێبێت؟.

لە کتێبی(مەملەکەتی من و تۆدا) دەیان زاراوەی ئیمان و ئەحکام و ئەخلاقی ناساندووە، ئەمەش بەشدارییەکی زۆر باشە لە ململانێی زاراوە و زاراوەناسیدا، زۆرێک لە فیکری تاقمەکانی کۆن و نوێی باسکردووە، ئەمەشیان پشکێکی ماریفی باشە لەجەنگی ناساندنی تاقمە دژەکاندا، زۆر جەخت لە سوننەتپارێزی و مەرجەعیەتی سوننەت و سوننی بوون ئەکاتەوە، ئەمەش بەشدارییەکی جوانە لە بوون و مانەوەی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا کە لەم چەرخەدا گەورەترین پیلانی سیاسی و مەیدانی لەسەرە.

ئازایانە و ژیرانە لەسەر تەتبیقی شەریعەت قسەی خۆی ئەکات، ئەمەش ئەچێتە ناو بانگەوازی گەڕانەوە بۆ شەریعەت نەک تەنها لە نوێژو ڕۆژو زەکات و هتد. بەڵکو هەموو ژیان پێویستە شەریعەت و ئیجتیهاد و ئەزمونی جوان و ئەقڵی پابەند تێیدا خاوەن بڕیار بێت. بۆ ئەمەش بەراوردێکی زیرەکانە ئەکات لە نێوان ئیسلام و ئایینەکاندا، هەروا لە قوڵکردنەوەی تایبەتمەندییەکانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ وەک ئەوەی پەیامی خوایان هێناوە لەگەڵ مرۆڤەکان بە گشتی کە ئەیانەوێ



ببنه بەدیلی عەقیدە و شەریعەت، ئەم بەراوردکارییەش خزمەت ئەکات بە هەڵتەکاندنی بەڵگەی نەیارانی شەریعەت و دژەکانی پێغەمبەرایەتی.

شتێکي تر کە جێی سەرنجە مامۆستا ماکوان هاتووە هەماهەنگی کردووە لە نێوان یاسا و ڕێسا شەرعییەکان و بنچینە و بزاڤە کەونییەکان، کە ئەم دوو کۆمەڵە یاسا نەگۆڕانەش بۆ کەسی بانگخواز و تێکۆشەری ڕێی خودا ناکرێت بە هەند وەرنەگیرێت لە درێژایی قۆناغەکانی بۆ خوا ژیان و بۆ خوا مردندا.

داواکارم لە خوای گەورە دەرگای ئازادیی لە مامۆستا ماکوان و هەموو برایان و خوشکانی ستەملێکراو بکاتەوە لەهەر کوێیەکی ئەم جیهانە نوێیە کەڕو لاڵ و کوێرەدا بێت!.

عبدالرحمن محمد عارف
ئاوایی بەکراوا - هەڵەبجە
٧ ذي الحيجة، ١٤٤٤||٢٥-٦-٢٠٢٣

# بەندی یەکەم

نیگەرانی داهاتوت مەبە..
ئێمە یەکەم جارمانە بەندەیی ئەکەین
بەڵام ئەو لە ئەزەلەوە خوایە



پێت خۆش بێت یان ناخۆش ئەم کتێبەم بۆ تۆ نووسیووە.

تۆ کێیت؟

لە ڕاستیدا ئەو کەسەی کە دەبێتە هاوڕێم و بەیەکەوە ڕێگایەکی دوورودرێژ دەبڕین، بەڵام کاتێکی کەم.

چۆن؟

ئەوە ئەو نهێنییەیە کە لە کۆتایی ئەم کتێبەدا دەستت دەکەوێت.

ئەم کتێبە شێوە و مێتۆدی جیاوازە لە هەموو کتێبەکانی جیهان!

چۆن؟

بەردەوام لەگەڵمدا فێر دەبیت و پێدەگەیت و پێت دەڵێم چۆن، بەڵام جارێ پەلە مەکە با پێشەکییەکت بۆ باس بکەم، ئەزانم پەلەتە بۆ ئەوەی بڕۆینە ناو قوڵایی و ناوجەرگەی باسی خۆم و خۆت، بەڵام بە قسەم بکەو پەلە مەکە. ئەوکات هێواش هێواش و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵمدا وەرە تا دەگەینە نهێنی کتێبەکە، ئەوکاتە دەزانیت من کێم و خۆشت باش دەناسیت کە تۆ کێیت.

ئەزانم ئێستا دەڵێیت پێشەکییەکەت چییە و قسەم بۆ بکە!

منیش دەڵێم تۆی بەڕێز پێش هەموو شتێک فێری ئەوە ببە کە لە ژیانتدا پەلە نەکەیت و هەڵەشە نەبیت، وردە وردە و لەسەرخۆ دەگەیتە ئامانج، پاشان لەهەموو شتەکان تێدەگەیت.

هەوڵبدە کاتی جددی بۆ ئەم کتێبە تەرخان بکە، پاشان وا دابنێ و خەیاڵ بکە من لەلاتم و هاوڕێی یەکین، بۆیەش ناوم ناوە مەملەکەتی من و تۆ، چونکە ئەوەی من مەبەستمە ئەگەر ویستت ئەیدەم بە تۆ، ڕازیت؟

ئەزانم پێشت خۆشە!



جا با دەست پێ بکەین..

سەرەتا سڵاوت لێ بێت بە سڵاوی ئیسلام، السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته.

باش هۆش بدە بە نووسینەکەم کە قسەت لەگەڵ دەکات، بۆ نموونە تۆ کێیت بۆ من گرنگ نییە، خەڵکی کوێیت هیچ بابەتی من نییە، لەکام پۆست و مەقام دایت ئەسڵەن ئەرزشی نییە بۆ من، گرنگە تۆی بەڕێز لە من تێبگەیت، هەوڵیش ئەیەم وا بنووسم کە لێم تێبگەیت. کەواتە با من و تۆ دەست پێ بکەین.

ئەوەی لای منە بۆ تۆ.

کورد عەقڵی ناوناوە بە ژیری، جا بزانە عەقڵ بەعەرەبییە، بەڵام کورد بەکاری دەهێنێت و کەمتر وشەی ژیری بەکاردەهێنێت.

باشتر وایە ئێمەش بە وشەی عەقڵ گفتوگۆکەمان بکەین، لەجیاتی وشەی ژیری، ئەزانی بۆچی؟

لەبەر ئەوەی وشەی عەقڵ بەربڵاوترە تا ژیری، منیش کتێبەکەم پێش ئەدەبی بوونی زانستی بوونیەتی کە مەبەستە لای من و تۆ بە زانست و واقیع ڕێگا ببڕین نەک بە ئەدەب و فەنتازیا، ئەمە ڕۆمان نییە یان شیعر و پەخشان و چیرۆک.

نا، ئەمە من و تۆین لەوانەیە تۆ نەزانیت کە من چەندە تۆم لا گرنگ و بەڕێزە.

پرسیاری من بۆ تۆ.

ئایا تۆ تا ئێستا لە خۆت پرسیووە کە عەقڵ چییە؟

یان پرسیوتە عەقڵ لە کوێدایە؟

دەزانم ئێستا دەڵێیت جا ئەوە چییە، عەقڵ لە کەلەی سەرمدایە یان دەڵێیت نازانم، من پێم وابێت نازانم زۆر عاقڵانە تر بێت و ژیرانەتر بێت لەوەی بڵێیت کە عەقڵ لە کەلەی سەرمدایە.

کەلەی سەر جێگای مێشکە، نەوەک عەقڵ، مێشکیش جێگای بیرکردنەوەیە لەکاتی بیرکردنەوەدا مادەیەک دەڕێژێت بۆ بیرکردنەوە بەناوی (دۆپامین)

ئەزانم ئێستا وا بیر دەکەیتەوە دەڵێیت باشە کەواتە عەقڵم لە کوێمدایە؟

منیش لەوەڵامدا پێت ئەڵێم، ئایا عەقڵ لاشە و جەستەیە؟

دۆش دامەمێنە و چاوت زەق بووە بە دیارمەوە، لەگەڵمدا بەردەوام بە با تێبگەین.

عەزیزەکەم عەقڵ غەریزەیە، بەڵام جێگای هەیە، دەپرسی چۆن؟

منیش دەڵێم: برسێتی غەریزەیە، بەڵام جێگای گەدەیە (مەعیدە)، حەزی سێکسی غەریزەیە، بەڵام جێگای هەردوو پێشی نێرو مێیە، جۆری ترمان زۆرە لە غەریزە. هتد.

هەموو غەریزەیەک پێویستی بە تێرکردن هەیە، بۆ تێرکردنی غەریزەکان دوو ڕێگای داناوە سێیەمی نییە، تەنها دوو ڕێگا هەیە ڕێگای حەڵاڵ و حەرام.

نموونە: غەریزەی سێکس هەمان کردارە کە ناونراوە بە زینا لە ڕێگای حەڕامەوە و تاوانە، بەڵام بۆ خێزان {هاوسەری خۆت} خێرو پاداشتە.



غەریزەی گەیشتن بە دەسەڵات ڕێگای چاک و دادپەروەرانە هەیە و خوای پەروەردگار پاداشت ئەداتەوە، پێچەوانەکەی ڕێگای دیکتاتۆری و کوشتن و بڕین و دزی هەیە کە دۆزەخ جێگایەتی.هتد.

جا عەقڵیش هەمان کردار و ڕێگای هەیە، ئەگەر لەڕێگای ئایینی ئیسلامەوە وەرزشی پێبکەیت و خواردنی زانستی تەندروستی پێ ببەخشی، ئەوا لەگەڵ ئەم بوونەدا کە خوای گەورە دروستی کردووە، یەکانگیرە و هەموو بەیەکەوە ڕێگا دەبڕن و زۆر تەندروست و ساغ و سەلامەتە، ئەگەر لە ڕێگای ترەوە بێت کە ڕێگای حەڕامە، بەدڵنیاییەوە خاوەنەکەی بێ عەقڵە ئەگەر چی وەکو زاناش هەنگاو هەڵبهێنینەوە، جا با نموونەی (ستیڤن هاوکینگ) بێت یان (ئەنشتاین) و (نیکۆلا تێسلا)..هتد.

ئاخر خۆ قسەی من نییە، تۆ لێم زویر مەبە خێرا قسەم پێ مەڵێ بڵێیت ماکوان زیادەڕەوە، نا ئەمە وتەی خوای پەروەردگارە لە سورەتی الملک دا ئایەتی ١٠دەفەرموێت:

﴿وَقَالُواْ لَوۡ كُنَّا نَسۡمَعُ أَوۡ نَعۡقِلُ مَا كُنَّا فِيٓ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ١٠﴾ الملك.

(ئینجا بە حەسرەتەوە) دەڵێن: ئەگەر ئێمە گوێمان بگرتایە و بیر و هۆشمان بەکار بێنایە نەدەبووینە نیشتەجێی دۆزەخ..

کەواتە عەقڵیش ڕێگای حەڵاڵ بدۆزێتەوە، با خاوەنەکەشی بڵێن زانا و فەیلەسوفن، کۆتاییەکەی بێعەقڵییە بچێتە ئاگری دۆزەخ، کەواتە عەقڵی بەکارنەهێناوە.

سەرەتا پێویستە کە من و تۆ عەقڵ بناسین..

خوای گەورە پێش هەموو شتێک عەقڵی دروست کردووە، لەچەند فەرموودەیەکدا هاتووە کە خوای گەورە عەقڵی دروست کردووە، ڕاستە فەرموودەکە لە گێڕانەوەی دا واتا سەنەدەکەی لاوازە، هەندێک



ئەفەرموون فەرموودەی مورسەلە، لای زۆرێکیش لە زانایـان وانییـە، بـەڵکو حـوکمی مەوزوعیانـداوە، چـونکە فەرمـوودەی ڕاسـتترمان هەیە کە یەکەم جار قەڵەمی دروست کردووە کێشە نییە، هەموو ئەداتی زانسـت چ قەڵەم بێت یان عەقڵ بەدڵنیاییەوە قەڵەمیش پێویستی بە عەقڵە بۆ نووسین.

فەرمــوودەکە لە عائیشــەوە ڕیــوایەت کــراووە کە پێغەمــبەری خــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت:

وقال صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ: أول ما خلق اللـه العقـل فقـال لـه: أقبـل فأقبل ثم قال له: أدبر فأدبر ثم قال الله عز وجل: وعزتي وجلالي ما خلقـت خلقا أكرم علي منك بك آخذ وبك أعطي, وبك أثيب, وبك أعاقب.

یانی: کاتێ کە خوای گەورە عەقڵی دروستکرد، بە مانایەکي تر دێت کە: یەکەم شتێک کە خودا دروستی کرد عـەقڵ بـوو، پێـی فـەرموو: وەرە ئـەو هات، پشت هەڵبکە پشتی هەڵکرد، ئەنجا خـوای بەشـکۆ و بـە دەسـەڵات فـەرمووی: سـوێند بـە جـەلال و عیـزەتی خـۆم هـیچ مـەخلوقێکم خـەلق نەکردووە لەتۆ لام بەڕێزتر بێت، بە تۆ ئەگرمەوە بە تـۆ ئەبەخشـم، بـە تـۆ پاداشت ئەدەمەوە، بە تۆش سزا ئەدەم.

لەوانەیە بڵێـی مـاکوان مانـدوت کـردم مـن کـارم چیـیە بەم بێـنەو بەردەیەوە، عەقڵ چۆنە و چییە و لەکوێدایە کەی گرنگە بۆ من؟

ئازیزەکەم وامەڵێ کلیلی کردنەوەی هەرچی دەرگـا هەیە لەم بـوونەدا عەقـڵە، خـوای گەورە مرۆڤـی لەسـەر شـێوەی سـیفەتی ڕەحمانـی خـۆی دروست کردووە، لەبەر ئەوەی خاوەنی عەقڵ و ڕۆحە.

لە فەرمـوودەیەکی دروسـت (صـحیح)دا بەچەنـد ڕیوایـەتێکی جیـاواز پێغەمــبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێــت: "خلــق الــله آدم علــى صورته"



مانای وانییە مرۆڤ لە خوا دەچێت، پەنا بەخوا تەفسیر و تەئویل ناکرێت، بەڵکو خوای گەورە لەهیچ دروستکراوێکی ناچێت، هاوشێوە و وێنەی نییە، بەڵام ابن حەجەری عەسقلانی دەفەرموێت: (لەبەر ئەوەی خاوەنی عەقڵە ئەم سیفاتە لە خوای پەروەردگارەوەیە، بۆیە لەسەر سیفاتی ڕەحمانی وێنەی کێشراوە، چونکە جوانترین و باشترین وێنەی بۆ مرۆڤ کێشاوە، کە تەئویلی بە قورئانی پیرۆز دەکرێت کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ بِنَآءً وَصَوَّرَكُمْ فَأَحْسَنَ صُوَرَكُمْ وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ فَتَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٤﴾﴾ غافر. خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ کردوون بە شوێنی سرەوتن و ژیان و حەوانەوە، ئاسمانیشی بەسەرتانەوە ڕاگرتووە، ڕوخسار و شێوازتانی نەخشاندووە، بە جوانترین شێوەش نەخشاندوویەتی، لە ڕزق و ڕۆزیی جوان و چاک و بەسوود و بەتام و بۆنخۆش بەهرەوەری کردوون، ئا ئەوەیە خوای پەروەردگارتان، بەرز و پیرۆز و بڵندە ئەو خوایەی کە پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

کەواتە ئەوەی کە دەمەوێت تۆ فێری ببیت لەم سەرەتایەدا ئەوەیە وەرزش بە عەقڵت بکەیت، توانای ئەوەت بۆ دروست ببێت هەرچی دەقی غەیبی و ئیمانی هەیە بتوانیت بیکەیت بە دەقی عەقڵی. واتا ئەگەر نەخشەیەک لەسەر لاپەڕەیەک بەم جۆرە دروست بکەیت و واتاکان بدۆزیتەوە لە غەیبی و ئیمانییەوە بۆ عەقڵانی

| عەقڵانی/المعقول | غەیبی و ئیمانی/المنقول |
| --- | --- |
| ؟ | الله |



| | |
|---|---|
| ؟ | الملائكة |
| ؟ | كتاب |
| ؟ | رسول |
| ؟ | اليوم الآخر |
| ؟ | القدر |

ئەم خشتەیە و ڕاهێنانە بۆ تۆی خوێنەرە کە هەوڵ بدەیت هەموو مەنقولێک بکەیتە مەعقول.

قۆناغی یەکەم هەرچی باسی ئیمانی هەیە دەیکەینە عەقڵانی واتا هەوڵ ئەدەین ئەوەی کە بەوەحی هاتووە بۆ پێغەمبەری ئازیز صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ کە (منقولە) واتا گوازراوە لە پەروەردگارەوە بۆ حەزرەتی محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ گشتی دەکەینە (معقول) واتا عەقڵانییەت کە لەگەڵ عەقڵت دەگونجێت.

جاتۆی بەڕێز ئەگەر سەلەفی مەشرەب بیت ڕاستەوخۆ دەڵێیت (استغفرالله) ئەم ماکوانە گومڕایە چۆن پەروەردگار و ئیمانیەت کە عەقڵ درکی پێناکات ماکوان ئەیکاتە عەقڵانیەت، ئەگەر سەلەفیش نەبیت بە چاوەڕوانییەوە چاوەڕێی ڕوونکردنەوەی زیاتر دەکەیت.

کاتێک بیرۆکەی ئەم کتێبە لە مێشکمدا جموجۆڵی دەکرد ئەوەم لە پێش چاوبوو هەندێک لە -تۆ-کان لەوانەیە تا ناوەڕاستی کتێبەکە گومڕاو لەوانەیە کافریشم بکەن یان دەڵێن ماکوان شتی عەجیب و غەریب دەنووسێت.

با پێکەوە بچینە ناو باسەکە..



با سەرەتایەک دابڕێژین دوایی خۆت ئۆتۆماتیکی باسەکان بەئاسانی وەردەگریت.

عەقڵ زۆر گرنگە لە بانگەوازی ئیسلامیدا ئەگەر بێت و بە عەقڵ خوای گەورە نەناسیت و خەڵکی پێ ئاشنا نەکەیت هەرگیز ناتوانیت خوای پەروەردگار بە زانست بە خەڵک بناسێنیت، چونکە عەقڵ زانست وەردەگرێت هەر عەقڵیشە ئیمان قبوڵ دەکات و وەریدەگرێت. پێغەمبەری خواش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ زۆر جەخت لەسەر عەقڵ دەکات و دەفەرموویێت: يا أيها الناس اعقلوا عن ربكم تواصوا بالعقل، تعرفوا به ما امرتم به وما نهيتم عنه واعلموا أنه مجدكم عند ربكم، واعلموا أن العاقل من أطاع الله وإن كان دميم المنظر حقير الخطر دنيء المنزلة رث الهيئة، وإن الجاهل من عصى الله تعالى وإن كان جميل المنظر عظيم الخطر شريف المنزلة حسن الهيئة فاصيحا نطوقا، فالقردة والخنازير اعقل عند الله تعالى ممن عصاه، ولاتغتروا بتعظيم اهل الدنيا إياكم فإنهم من الخاسرين.

واتە: ئەی خەڵکینە لە خوای خۆتانەوە فێر بن، بە عەقڵ یەکتری ئامۆژگاری بکەن، بە عەقڵ فەرمانەکان و قەدەغەکراوەکان بناسن، بزانن کە شکۆی ئێوە لای خوایە، بزانن کە عاقڵ ئەو کەسەیە گوێڕایەڵی خوایە، با دیمەنیشی ناشیرین و پلە نزم و نەخوازراو و شکڵ شپرز بێت، نەفامیش ئەو کەسەیە کە بێگوێیی خوا ئەکات، با سیمای جوان و دەرکەوتە و هەڵکەوتە و شکڵ جوان و قسە لوس و لەبلەبان بێت، مەیموون و بەراز



ژیرترن هەتا ئەوانەی یاخین لێی، فریو مەخۆن بە ئـەهلی دونیـا و هۆشـیار بن و خەسارۆمەند نەبن.[١]

خوای گەورە لە قورئاندا لە چەندین جێگادا باسی عەقـڵ و تێفکـرین و بیرکردنەوە دەکات کە بەناوی (نوها، عەقڵ، ئەلبـاب، تەفکیـر، و تـەدەبور و..هتد).

## چوونە ناوباس بەوردی و قوڵی

ئەو کەسانەی کە پابەند دەبن بە ئیسـلامەوە بەهۆکـاری تێگەیشـتنیانە لە دەقە پیرۆزەکـان لە قورئـان و سـوننەت، هەنـدێک بەهۆکـاری بـاش تێگەیشتنی دەبێتە زانا و تایبەتمەند لەبوارە ئایینییەکانـدا وەک فەرمـوودە، تەفسیر، فیقهی ئیسلامی، ئوصوڵی فیقهی ئەم ئایینە.. هتد.

هەندێکی تر عارف و خوانـاس لە بەندایەتیـدا تایبەتمەنـدی وەردەگـرن وەکو زۆرێک لە پیاوچاکان خواناس و صاڵحەکانی ئەم ئیسلامە.

تەنـانەت ئەو کەسـانەی بـانگەواز دەکەن بـۆ ئیسـلام ئەگەر کەسـێکی عەقڵانـی نەبێـت ئەوە خەڵکـی باوێشـک دەدەن بەدیـارییەوە، چـونکە لە عەقڵانی بووندا نموونە بەرجەستە دەکات، واتا هەر دەقێـک بـاس دەکـات لە قورئـان و سـوننەتدا خێـرا نمـوونە و مەسـەلەیەکی بـۆ ئەدۆزێـتەوە بـۆ ئەوەی پەیـامەکە زوو بگـات و خەڵکـی بەئاسـانی وەری بگرێـت، ئەمە تاڕادەیەک پێناسەیەکی ناتەواوی عەقڵانییەتە.

---

[١] بۆ ناسینی ئەم فەرمودەیە بگەڕێنەوە بۆ (الحافظ العراقي) کەلەساڵی ٨٠٦کۆچی وەفاتی کردوە و لە کتێبی (المغني عن حمل الأسفار في تخريج ما في الأحياء من الأخبار).



ئەو کەسانەی ئیسلام بە عەقڵ وەردەگرن ڕۆژبەڕۆژ ئاستی زانستی خۆیان بەرز دەکەنەوە بەرەو لوتکەی خواناسی و پایەی بەرزی ئیسلامەتی و زانستەکەی هەنگاو دەنێت. خۆ ئەوانەشی کە بەسۆز و عاطیفە وەریدەگرن یان لە دایک و باوکەوە لاسایی کردنەوەیان بۆ مابێتەوە یان واز لە دین دێنن یان وەکو کلتور و بواری کۆمەڵایەتیی دین بەکار دەهێنن کە چێژێکی باش و بەردەوام لە بەندایەتی و بواره ڕۆحییەکان نابینێت و زۆرتر موسوڵمانێکی کول و مەنگ و تیاماوە.

کاتێک کە قورئانی پیرۆز هات هەموو باسەکانی سەرەتای عەقڵانی بوو بە عەقڵ قسەی لەگەڵ کافر و موشریکەکان دەکرد، بە (منقولی) ئەوان کە بڕوایان پێی بوو خوای پەروەردگار بۆی دەکردن بە (معقول).

چەند نموونەیەک..

دەهاتنە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێیان دەوت محمد ئەم ئێسقانانەی کەلە بەرچاوت وردی دەکەین، خواکەی تۆ دروستی دەکاتەوە بۆ لاشەی مرۆڤ؟

خوای گەورە دەیفەرموو محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ پێیان بڵێ: کێ یەکەم جار دروستی کردووە ئەویش دەتوانێت زیندووی بکاتەوە.

﴿وَضَرَبَ لَنَا مَثَلًا وَنَسِيَ خَلْقَهُۥ قَالَ مَن يُحْيِ ٱلْعِظَٰمَ وَهِيَ رَمِيمٌ ٧٨﴾
نموونەی لاوازیی و بێدەسەڵاتی بۆ ئێمە هێناوەتەوە و بەدیهاتنی خۆی لەبیر کردووە، دەیوت: کێ ئەم ئێسکانە زیندوو دەکاتەوە لە کاتێکدا کە ڕزیوو و پڕوکاون؟!

﴿قُلْ يُحْيِيهَا ٱلَّذِىٓ أَنشَأَهَآ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَهُوَ بِكُلِّ خَلْقٍ عَلِيمٌ ٧٩﴾ يس.
پێیان بڵێ: ئەو زاتەی کە یەکەمجار دروستی کرد، هەر ئەویش زیندووی

دەکاتەوە، ئەو بەهەموو دروستکراوێک زاناو ئاگایە (دروستکردن و دروستکردنەوەی هەموو شتێکی لا ئاسانە).

کەواتە بۆمان ڕوونبوویەوە ئەوانەی دژی ئیسلامن لەم ئایەتەدا چەندە نـــاعەقڵانی ئەدوێـــن و خـــوای پەروەردگـــار بە پێغەمـــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: عەقڵانی وەڵامیان بدەرەوە.

زۆری تر لەوباسانەی لە قورئـانی پیـرۆزدا بوونیـان هەیە، کۆتـایی بەوە دەهێـــنم کە جـــولەکە داوای ناســـینی ڕۆحیـــان لە پێغەمـــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ کرد، خوای گەورە بە ئوسلوبێک وەڵامی دانەوە بـۆ ئەوان عەقڵانی بوو لە سـورەتی الکهـف لە وەڵامـی پرسـیارەکەیاندا خـوای گەورە باسی موسا و خضری بۆ کردن واتا کە پێغەمبەرەکەی ئێوە هەندێک نهێنی هەیە نەیزانیووە، مەرج نییە هەموو پێغەمبەرێـک وەڵامـی هەمـوو پرسیارێکی لابێت، نموونەی پێغەمبەر موسا و خضر.

لەوانەیە تۆی خوێنەر پرسـیارێکت بـۆ دروسـت ببێـت و بڵێیـت مـادام ئیسلام توانای وەڵامدانەوەی عەقڵانی هەیە و دەتوانێت ئیمانییەکان بکاتە عەقڵانی ئەی بۆ مولحید، کافر، عەلمانییەکـان و ئایینەکـانی تـر بـڕوای پـێ ناهێنن؟

پرسیارەکە زۆر عەقڵانییە، واتا معقولە، بەڵام پێویسـتی بە منقـولی مـنە بۆ تۆی خوێنەر، چۆن؟

لەڕاستیدا پرسـیارەکەت زۆر نایـابە، وەڵامەکەشـی زۆر ئاسـانە. چـونکە پرسـیاری تەندروسـت وەڵامـی تەندروسـتی دەسـت دەکەوێـت، پرسـیاری هەڵەش وەڵامی هەڵەی دەست دەکەوێت.

سێ جۆریان کە مولحیدو کافری خوانەناسـی وەکـو بـوزی و کریشـنا و هندۆسەکان بە گشتی ئەمانە بانگەشـەی عەقڵانـی بـوون دەکەن، بەڵام لە



ڕاستیدا درۆ بەدەم عەقڵانییەتەوە دەکەن، یـان نـازانن عەقڵانیـیەت چیـیە یاخود خەڵکی چەواشە دەکەن، مولحیـد و عەلمـانی و ئەوانەی بڕوایـان بە وەحدەتی وجودە، دوورن لەبواری عەقڵی بەدوای بەڵـگە و شـتی بیـنراو و دەست لێدراو و بـۆن کـراو و گـوێلێگیراو، واتـا بەدوای هەسـتەکانمانەوەن نەک عەقڵ، دەیانەوێت (دین بکەنە شتی مەلموس و مـاددی) ئەمە دوورە لە عەقڵ بۆ نمـوونە زۆربەی بیـردۆزە زانسـتییەکان عەقڵانـین نەک مـاددی گەورەتـرین بیـردۆز (بیـگ بانـگ)ە هـیچ پەیوەنـدی بە مـادەوە نیـیە بیردۆزێکی عەقڵانی پوختە.

لەڕاســتیدا ئەوان بڕوایــان بە عەقڵانییەتــی ئیســلام نیــیە خۆیــانی لێدەشارنەوە، بەڵام هەموو عەقڵانییەکانی تر قبوڵ دەکەن وەکـو نمـوونەی بیردۆزی بیگ بانگ.

ئەوانــی تــریش وەکــو ئایینەکــانی مەســیحی و یەهودی..هتــد زۆر خورافیـات و شـتی دوور لە ڕاسـتی تێـدایە، کـوێر بـوون بە خورافیـات لە بەشێکی کتێبی مەملەکەتی من و تۆدا باسی دەکەین.

کەواتە ئەوانەی بانگەشــەی عەقڵانــی دەکەن لە عەلمــانی و مولحیــد، ڕاسـتییەکی چاوبەسـتە لە خەڵکـی بەڵکـو داوای ناسـینی ئـایین دەکەن بە هەستەکان (بۆن و تام و بینین و دەست لێدان و بیستن).

دەیانەوێت خوا بەو هەستانە بناسن، یان مەلائیکەت.هتد، جـا ئیسـلام بە ئایینی ئەوان دەڵـێن ئەو فـاکتەرانەی ئێـوە سـنوردارە توانـای ڕێکردنـی زۆری نییە، زوو وزەی پێ نامێنێت.

دەمانەوێت لەم مەملەکەتی من و تۆدا ئەوە بە تۆی خوێنەر بگەیەنین جیاوازی تێگەیشتن هەبێت لەنێـوان (عەقـڵ و هەسـت و ئـیمان)دا، هـیچ کات ناتوانرێت ئیمان بەرجەسـتە بکرێـت بە پێـنج هەسـتەکە بناسـێنرێت،

بەڵام ئیمان بە عەقڵانی دەکرێت، ئەوا من و تۆش لە هەوڵی ئەوە داین و خەریکین کارەکە ئەنجام ئەدەین، بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

## تۆ بزانە کە من موعتەزیلە نیم

بۆیە ئەم بڕگەیەم تەرخان کردووە بۆ ئەوەی من خۆم بە تۆ بناسێنم، ئەمە پاکانە نییە، بەڵکو بیروباوەڕ و عەقیدەیە بە دڵنیاییەوە من موعتەزیلە نیم، چونکە لەوانەیە خەڵکێک کە ئاشنایەتی لە بواری عەقڵانیەت هەبێت وا هەست بکات، من تەنها مرۆڤ بە بونەوەرێکی عەقڵی تەماشا بکەم، وەکو لە بیروباوەڕی موعتەزیلەدا وایە کە مرۆڤ کائینێکی عەقڵییە و بەس.

بەشێک لە قسەی موعتەزیلە ڕاستە مرۆڤ بونەوەرێکی عەقڵییە، بەڵام من وەکو ئەهلی سونەت و جەماعەت دوو بەشی تری بۆ زیاد دەکەم کە بریتییە لە شەهوەت و ڕۆح، هەرچەندە ئەوانیش داندەنێن بە شەهوەت و ڕۆح و لاشەش، بەڵام لای ئەوان عەقڵ سەنتەرە، بەڵام لای من چوار بەش سەنتەرە کە سێ دانەیان سەرەکین و دانەیەکیشیان سەرداری سەرەکییەکانە ئەویش عەقڵە، بۆ ئەوەی سەرلەنوێ مێشکت تێک نەیەم هەموویان وەک یەکن، بەڵام لە پلەبەندیدا عەقڵ یەکەمە و ئەوانی دیکە بەدوایدا تەواوکەری یەکترن.

بۆ ئەوەی نەقیزەیەکیش بدەم لە موعتەزیلە ئەویش ئەوەیە لەڕاستیدا ئەوانیش عەقڵانی نین، بەڵکو بانگەشەی عەقڵانی بوون دەکەن، مێژوویان دیارە بۆ نموونە لە دروستبوونیانەوە تا دەسەڵاتیان بەشەڕ و ئاژاوە و قامچی و زۆرلێکردن خەڵکیان کردۆتە موعتەزیلە، هەرگیز بە عەقڵ



نەیانتوانیوە ڕووبەڕووی ئەهلی سونەت و جەماعەت ببنەوە، بەڵکو هەر بە زیندان و لێدان خەڵکیان چەوساندۆتەوە.

بۆ نموونە: زانا و بەناوبانگەکانیان وەکو عەطای کوڕی واسڵ نەیتوانی ڕووبەڕووی حەسەنی بەسڕی ببێتەوە لە مەجلیسەکەیدا هەڵسا و نەگەیشتە کۆتایی ڕووبەڕوو بوونەوەکەی، یاخود زانا و قازی دەوڵەتی عەبباسی (ئەحمەد کوڕی ئەبی دوئاد) لەسەردەمی کوڕەکانی هارونە ڕەشید (موعتەسەم و مەئمون) خەڵکی بەزۆر کردە موعتەزیلە و بە زیندان و تۆقاندن و قامچی خەڵکی دەترساند، هەرکەس نەیتوانی ڕووبەڕووی عەقڵ بێتەوە هێزی فیزیکی بەکارهێنا ئەوا دۆڕاوە و دوورە لە عەقلانیەت، هەر ئەو بوو چەندین زانای شەهید کرد و تەنانەت ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەلی خزاندە زیندان.

ڕاستییەک هەیە پێویستە دانی پێدا بنێم ئەویش ئەوەیە سەردەمێک لەسەردەمەکان موعتەزیلە توانی ڕووبەڕووی کوفر و فەلسەفەی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات بێتەوە و تێکوپێکیان بشکێنێت، بەڵام ئەهلی سونەت لەڕووی بەڵگە و حوجەوە زۆر بەهێزتر بوون لەوان و توانیان بیروبۆچوونی موعتەزیلە لاواز بکەن بە عەقلانیەت بەتایبەت دوو زانای عیملاقی ئەهلی سونەت و جەماعەت کە یەکەمیان ئەبو حەسەنی ئەشعەری بوو دووەمیان تەقیودین ئەحمەد ئیبنو تیمیە بوو (ڕەحمەتی خوا لە هەردووکیان بێت).

موعتەزیلە پێی وایە قورئان مەخلوقە، من پێم وایە ئەوە کوفرە.

موعتەزیلە پێی وایە ئەوەی چووە دۆزەخ نایەتە دەرەوە، من پێم وایە هەڵەن. دەشێت موسوڵمان بچێتە دۆزەخ و پاشان دوای سزاکەی خوای گەورە بیخاتە بەهەشت.



ئەڵبەت دەڵێم (من) مەبەستم وەرگرتنی بیروباوەڕی منە لە ئەهلی سونەت و جەماعەت لەبەر ئەوەی کتێبەکە بەناوی -من و تۆ-یە بۆیە بەناچاری وشەی من بەکار دەهێنم، دەنا پەنا دەگرم بەخوای گەورە لە وشەی من، چونکە من هیچ نیم بەڵکو لە هیچیش هیچترم.

زۆرێکی تر بیروباوەڕیان لای من گومڕاییە وەکو ئەوەی موعتەزیلە دەڵێن کە خوای گەورە خێری خەلق کردووە و شەڕی خەلق نەکردووە، ئەوە بە گومڕایی تەواو دەزانم، هەمووو ئەم قسانەم بۆ ئەوە بوو کە بزانیت من و موعتەزیلە زۆر لە یەکتر دوورین.

## گەڕانەوە ناو باس و قاڵبوونەوە لە عەقڵ دا

زانایانی ئەم ئیسلامە عەقڵیان کردووە بە چەند بەشەوە.

عەقڵی غەریزیی، عەقڵی فیطری، عەقڵی مەلەکە، عەقڵی بۆ ماوەیی، عەقڵی پەی پێبردن، عەقڵی وەرگرتنی خێرا، عەقڵی دانەوە، عەقڵی شیکاری، عەقڵی باطنی بۆ پیاوچاکان  و عەقڵی غەیبی

دەکرێت هەمووی وەکو ئیمامی غزالی کورتی کردۆتەوە لە چوار بەشدا ئاماژەم پێبکردایە، بەڵام وەکو ئەرکێکێ زانستی و قیامەتی ئاماژەم بە بەشەکانی کردووە.



## شیکارییەک بۆ جۆری عەقڵەکان
## بەگشتی و تێگەیشتن لێیان

● عەقڵی غەریزیی: زیاتر لە منداڵدا بەدی دەکرێت کاتێک لەدایک دەبێت دەگری، برسی دەبێت دەگری، خۆی پیس دەکات دەگری، خەوی دێت دەگری، واتا داوا دەکات بە جۆرێک لەجۆرەکانی عەقڵی منداڵی داوای هاوکاری دەکات، دایک و باوک بە تایبەتی تر دایک جۆری گریانەکان دەناسێتەوە، منداڵەکە بە عەقڵی غەریزیی دایک و باوکی دەناسێتەوە، یاخود شێت کەسوکاری دەناسێت یاخود یەک و دوان جیا دەکاتەوە. هتد.

● عەقڵی فیطری: شوێن و مرۆڤ دەناسێتەوە و مرۆڤەکان جیادەکاتەوە لە نێوان ڕەگەزەکانیاندا هەست بە بونی هێز و توانایەک دەکات لەم بوونەدا بە سادەیی ئەزانێت پەروەردگارێک هەیە، پاک و پیس جیادەکاتەوە، خۆشەویستی جیادەکاتەوە، لەنێوان خۆشەویستی پیاو و ژن و مەحرەم و نامەحرەم واتا شەهوەت و خۆشەویستی ئاسایی، دزی و خراپە و درۆ دەزانێ و دەیناسێت بە عەقڵی فیطری، ئەمەش دەشێت یارمەتی بدات بە گەیشتن بە جۆرەکانی تر.

● عەقڵی مەلەکە: فێربوونی بۆماوەیی هەست پێکردن، بۆ نموونە ئەگەر مرۆڤ لەگەڵ کەسانی تردا ژیا کە هاوزمانی نەبوون ڕاستەوخۆ بێ ئەوەی هەست بەخۆی بکات زمان و کلتوریان وەردەگرێت، لە زیندانی ئیتالیا زۆربەی ئەوانەی لەگەڵمدا زیندان بوون عەرەب بوون، پەیوەندیم زیاتر لەگەڵ عەرەبەکاندا هەبوو فێری زمانەکەیان بووم، بەڵام لە ڕووی ئەکادیمییەوە هیچی لێ نازانم، واتا نازانم مبنی چییە و معرب چییە، وشەکان چۆن ئەلف و لام وەردەگرن.

نموونەیەکی تر کاتێک هەنگێک شیلەی گوڵ دەمژێت و دەیکاتە هەنگوین، ئەمە بە مەلەکە وەریگرتووە، ناوی عەقڵی مەلەکەیە.

● عەقڵی بۆماوەیی: وەرگرتنی پیشەیەکە لە دایک و باوکەوە کە لەبەرچاویا کراوە و فێری بووە، یاخود دووبارەی دەکاتەوە، ئەویش نموونەی چنینی شاڵ و کڵاش و فەرش و پێداویستییەکانی کە زیاتر لەناو هەورامییەکاندا دەبینرێت.

● عەقڵی پەی پێبردن: بەهۆکاری خوێندنەوە و گوێگرتن و هەوڵدان دەگاتە ئاستی عەقڵی پەی پێبردن بە زۆرێک لە زانستەکان.

● عەقڵی وەرگرتنی خێرا: ئەمەش توانای زیرەکی مرۆڤەکەیە چەندە وەرزش بە زیرەکی دەکات تا بەخێرایی بتوانێت عەقڵی بە زانستەکان بشکێت.

● عەقڵی دانەوە پێچەوانە کردنەوە: بەهاوکاری وەرگرتنی زۆر ئەم جۆرە عەقڵەوە وەکو ئاوێنە پێچەوانەی زانیارییەکان دەکاتەوە، وەکو نووسەر یاخود ئەوانەی کە دەبنە مامۆستا و یاخود داهێنان دەکەن.

● عەقڵی شیکاری: ئەم جۆرە پلەیەکی بەرزە لە جۆرەکانی عەقڵ کە دەتوانێت هەموو جەمسەرەکان بخوێنێتەوە و شیتەڵ بۆ ڕووداو یاخود تیۆرە زانستییەکان بکات بە گشتی.

● عەقڵی باطنی: ئەم جۆرە عەقڵە لە ڕێگای خواناسی و دڵپاکی و دەروونی مرۆڤ پێدەگات، هاوشێوەی کەراماتی پیاوچاکان و خواناسانە. نموونە زۆرن لەوانە جورەیج عابد، هاوڕێیانی کەهف.. هتد.

● عەقڵی غەیبی: بە وەحی ئاراستە دەکرێت تایبەتە تەنها بە پێغەمبەران.





# عەقڵ هەرگیز پڕ نابێت، بەڵام زیاد دەکات کە زیاد بوو ئەیداتەوە

لەوانەیە ئێستا پرسیارم لێبکەیت و بڵێیت تا ئێستاش تێنەگەیشتم کەوا پێکهاتەی ئەم عەقڵەی باسی ئەکەیت چییە؟

پرسیارەکەت جوانە و مەعقولە: کەواتە پێکهاتەی عەقڵ چییە؟

پێکهاتەی عەقڵ بریتییە لە چەند توخمێک هەموو بەیەکەوە عەقڵ پێکدەهێنن، ئەوانیش بریتین لەم توخمانە (سۆز، نەوا، خۆشەویستی، عیشق، ڕق، بوغز، ترس، دڵەڕاوکێ و حەز) دەتوانیت پێکهاتەی تریشی بۆ زیاد بکەیت لەو بوارانەی باسمان کرد، یاخود (بیرکردنەوە، بینین، بیستن، دەستلێدان، بۆنکردن.هتد) ئەمانە هەریەکە توخمێکە لە توخمەکانی عەقڵ یان ئامرازێکە لە ئامرازەکانی دامەزراوەی عەقڵ.

ئەزانم تۆی خوێنەر دەتەوێت بڵێیت باشە جێگای عەقڵ کوێیە؟

ئەم پرسیارەشت هەر زۆر مەعقولە، بێگومان جێگای عەقڵ (دڵ)ە.

ئەزانم ئێستا دەڵێیت باشە چۆن؟

منیش دەڵێم چاک، بۆ نموونە چاو جێگای بینینە، ئەی بینین چییە؟

ئەو نورەیە کە لە ناوە و دەرەوەی لاشەیە، بینینەکە لە ناو چاو و بیلبیلەکان دا دروست دەکات، یاخود گوێ جێگای بیستنە، ئەی بیستنەکە چییە؟ ئەو دەنگە چۆن دێت و دەڕوات؟ ئەویش ئەو تۆڕ و زەبزەبەیە کە لە زمانی گوێچکە دەیخوێنێتەوە و دەبیستێت.

کەواتە جێگای عەقڵیش دڵە، بەهۆکاری توخمەکان لە دڵدا دروست دەبێت.

لەوانەیە بڵێیت مێشک چییە و بۆچییە؟

پرسیارەکە باشە، بەڵام مێشک هیچ پەیوەندی بە عەقڵەوە نییە، تەنها و تەنها پەیوەنـدی بە بیرکـردنەوەوە هەیە، وتمـان بیرکـردنەوەش یەکـێکە لە توخمەکانی عەقڵ.

کەواتە تا ڕادەیەک زانیارییەکانم چڕبوونەوە لەسـەر خـوودی عەقـڵ و پاشان پێکهاتەو جۆری عەقڵ و توخمەکانی و جێگا و مەکانیشی.

بەوەندە کۆتایی بەباسی عەقڵ دەهێنین و دەچینە ناو باسێکی نوێ.

بەڵام پێش ئەوەی بچینە ناو باسە نوێیەکە و لەگەڵ خۆم بتـبەم شـتێک هەیە بیزانە.

عەقـڵ ئەگەر نەتبـوو شـێتی، ئەگەر بەکـاری نەهێنـی جـاهیلی، ئەگەر وازیشت لە عەقڵ هێنا گەمژە و هیچ لەگەڵ ئـاژەڵ دا جیـاوازی ناکرێـت، تەنها عەقڵ نەبێت دەبا بڕۆینە ناو بابەتێکی نوێ.

## لە عەقڵەوە بۆ زانست

لەوانەیە تـاڕادەیەک بەرچـاوت ڕوون بـوبێتەوە ئەگەر عەقـڵ نەبێـت چـۆن دەتوانیـت زانسـت وەربگریـت، کەواتە بـزانە ئەم ژیـان و جیهـانە پـاکێجێکە بەیەکەوە وەکـو مـرواری، هەمـوو دەنکەکـانی بەدوای یەکـدا هۆنراوەتەوە لەهەمان کاتدا هەریەک لەو مروارییانە لە ژیانت ئەزموونێک دروست دەکات.

لەوانەیە تۆ پرسیاری ئەوە بکەیت بڵێیت، باشە زانست چییە؟

پرسیارەکە لەجێگای خۆیدایە کەواتە وەرە با ئەو چییەیە لە زانسـت دا پێناسە بکەین.



# زانست چییە؟

واتا تێگەیشتنە لەو شتەی خۆی هەیە و پێناسە و وەسف کراوە دڵنیـای لێـی هـیچ زیـاد و کەمێـک ناکرێـت دەبێـت وەکـو خـۆی بیناسـیت، ئەم پێناسەیە دەکرێت بەبەرگی هەموو زانستێک دا.

خـوای گەورە کە مرۆڤـی دروسـت کـردووە لەم زەویـیەدا کـردویەتییە خەلـیفە و لەم بـوونەی خـوای گەورە واتـا گەردوون مـرۆڤ بەهۆکـاری خەلیفەیەتی دەبێتە سەنتەر.

کەواتە بـۆچی مـــرۆڤ لەم گەردوونەدا ســـەنتەرە و لەســـەرزەویدا خەلیفەیە و خاوەنی ئەم زەوییەیە، بەهۆکاری زانست. بەڵام پێش زانسـت بەهۆکاری عەقڵ، چونکە لەهەموو دروستکراوەکان عاقڵترە.

سەرەتا پێویسـتە خـوێنەری بەڕێـز پێناسـەی زانسـت لەبەر بکەیـت تـا بەیەکەوە هەڵاوێر و شیتەڵ بۆ باسەکان بکەین.

لەوانەیە بپرسی وا تێگەیشتم لە عەقڵ و زانست و پێناسەکەیم زانی لە ئێستادا بۆ من سوودی چییە؟ بێجگە هەندێک زانیاری و ڕۆشنبیریم زیادی کرد، سوودەکەی چییە؟

یاخود لەوانەیە بپرسیت کام زانست وەرگـرم تـا سـوودی هەبێـت، ئەم کتێبەی تۆ بۆ منت نووسیوە زانستەکەی باسی چـی دەکـات؟ ئایـا فیزیـایە یان کیمایایە یاخود زانستی پزیشکی و ماتماتیک و فەلسەفە و دینە؟

بۆ وەڵام دانەوەی ئەو دوو پرسیارە منیش بە پرسیارێک دەستپێدەکەم.

ئەگەر ســـەرەتا پرســـیاری یەکەم وەربگـــرین، چـــونکە بە تەواوەتـــی کەوتووینە بیرکردنەوە کە تـوخمێکی گرنگـی عەقـڵە، خـۆ ئەگەر پرسـیاری



دووەم خولیات بێت ئەوا من ئامانجی خۆم پێکاوە و بەتەواوەتی ئەقڵت سەرداره کەواتە زوو پێ دەگەیت.

با من و تۆ بەیەکەوە بیر بکەینەوە بزانین کام زانست وەربگرین؟

گومانی تێدانییە سەرداری هەموو زانستەکان زانستی خواناسییە واتا (بیروباوەڕ) ئەگەر خاوەنی بیروباوەڕ نەبوویت و خوات نەناسی دڵنیابە هیچت نەناسیووە با پرۆفیسۆریش بیت لە بواری زانستە مرۆییەکاندا، بەڵام ژیانت وەکو ئاژەڵ وایە. تەنها ئەخۆیت و ئەخەویت و غەریزەکانت تێر دەکەیت، ئەو زانستەی وەرتگرتووە بۆ پیشەی خۆت بەکاری دەهێنیت و بۆ بژێوی ژیان کە مردیت کۆتایی بەژیانت هات هەروەک ئەوە وایە وەکو ئاژەڵێک ژیاویت و کۆتایی بەژیانت هاتووە، ئەمەش مانای سوکایەتی و جنێو نییە بۆ مرۆڤ، چونکە خوای گەورە کردویەتییە خەلیفە و ناوەند لەم زەویی و گەردوونەدا بۆ ئەوەیە خوا بناسیت.

## خواناسی

کاتێک دەڵێین دەبێت و پێویستە خوا بناسین، ئەم باسە بەهەمانشێوە پاکێجێکی تەواوە، واتا چەند قۆناغێکە دەبێت ببڕیت تا دەگەیت بە خوای پەروەردگار ئەویش دەبێت بزانیت (خوا کێیە، خوا چۆنە، خوا لەکوێیە، چۆن پێیدەگەم، پەیوەندی بەندە بە خواوە چییە..هتد).

ئەم پاکێجە لەناو کورد زۆر کەم شیکاری بۆکراوە پێناچێت دەستت بکەوێت، خۆ ئەگەر هەبێت من تا ئێستا نەمدیووە هاوشێوەی ئەو باسە.

هەرچەندە لە فەلسەفەدا بەشێکی بۆ کراوەتەوە بەناوی (ئیلاهیات، یاخود میتافیزیقیا "لاهوت")



بەڵام بێ سەرچاوە و قسەکردنی بەتاڵ و مرۆڤ بەرەو گومڕایی دەبات، زۆرێک بەو هۆکارە گومڕا و سەرلێشێواو بوون.

هەرچی زانستی دنیا هەیە لەهەموو تەکنەلۆجیا و بیناسازی و هەموو جۆرەکانی کیمیا و فیزیا و پزیشکی و فەلسەفە و..هتد ناتوانێت وەڵامی پرسیاری خواناسی بداتەوە تەنها دین ئەتوانێت ئەو وەڵامە دەستەبەر بکات ئەویش کام ئایین؟

بێگومان ئایینی پیرۆزی ئیسلام، چونکە نەئایینی نەسرانی مەسیحییەکان ئەتوانێت خوا بناسن، خوایان ناسی بەڵام سەریان لە خۆیان و خەڵکیش شێواند، کتێبەکەیان ناوی ئینجیلە لە ئێستادا بەشێوەیەک دەستکاری کراوە و لێی کەمکراوەتەوە بە ئەندازەی سورەتی البقرة نابێت هەموو کتێبەکە. هەموو ئینجیل (١٦) لاپەڕەیە ئەگەر لای یوحەنا تۆزێ زیاتر بێت دەگاتە (٢٠) لاپەڕەی ئەم دیواو دیو واتا بگاتە (٤٠) لاپەڕە. تەوراتیش ئەوەی بۆ پێغەمبەر موسا -عليه السلام- هاتووە هەمووی (١٧٠) لاپەڕەیە کە لە تەکوینەوە دەست پێدەکات تا التثنية.

ئەو دینانەی تر هیچیان توانای خواناسییان نییە، بەڵکو هەموو بتپەرستین و یاخود دیاردە سروشتییەکان دەپەرستن لە هیندۆسی و تا بودایی و ئەوانی تر.

بۆ ئەو ئایینانە بە پشتیوانی خوا باسێکمان لەم کتێبەدا تەرخان کردووە، بەڵام با جارێ بڕۆین بۆ خواناسی.

دووبارە بیرت دەخەمەوە ئەم باسە پاکێجە ئەگەر پاکێجەکە وەکو خۆی نەناسین ناتوانین خواش بناسین.

زۆر بە ئاسانی بۆ ئەوەی لەم پاکێجە تێبگەین نموونەیەکی بچوک باس دەکەین. زۆربەمان کامپیوتەرمان بەکارهێناوە، خۆ جیهازەکە بەتەنها



کارەکان ئەنجام نادات بەڵکو ئەو ئامێرە چەند پێکهاتەیەکی هەیە، پاشان بۆ کردنەوەی ئەم ئامێرە پێویستی بە بەرنامەیە هەر بەرنامەیەکیش پەیوەندی بە بەرنامەیەکی ترەوە هەیە، بۆ نموونە بۆ کردنەوەی دەنگ و ڕەنگ پێویستت بە ڕیال پلەیەر، مێدیا پلەیەر و.. هتد هەیە.

بۆ نووسین پێویستت بە بەرنامەی مایکرۆسۆفت ئۆفیس و نۆتپاد و.. هتد هەیە.

بۆ گەڕان بەدوای زانیارییەکاندا پێویستت بە وێبگەڕی مایکرۆسۆفت ئێج، گووگڵ کرۆم یان فایەرفۆکس و.. هتد هەیە.

بۆ کردنەوەی هەموو بەرنامەکانیش پێویستت بە زمانی دیجیتاڵی هەیە.

ئەمانە هەموو پێکەوە ئامێرەکە پێکدەهێنن (ولله مثل الأعلا)

بۆ ناسینی خوا پێوسیتە پاکێجەکە بناسیت کە ناوی ئیمانە.

## ئیمان چییە؟

ئیمان واتا بڕوا بوون بەو نادیارانەی کە هەواڵمان پێدراوە.

لێرەدا شیکاری و شیتەڵی زیاتر هەڵدەگرێت و دنیایەک پرسیار دروست دەکات.

ئەوە چییە کە نادیارە؟ ئیمان بۆ نادیارە، هەواڵەکە چییە و لەکوێوە هاتووە..هتد.

چوونە ناو باس..



ئیمان بەهیچ درک پێناکرێـت تەنها عەقـڵ نەبێـت، کەواتە دەبێـت لە وشەی درک تێبگەیت وەکو وشەی هەست نییە. هەست دەتوانین هەستی پێ بکەین و چۆنێتی باس بکەین، بەڵام درک باسکردنی ئەستەمە هەرگیـز بـۆت بەرجەسـتە نابێـت، بەڵام بەدرکـی عەقڵـی ئەو هەسـتە بـۆ خـۆت دروست دەبێت، چۆن؟

بۆ نموونە ئەگەر مۆزێک، سێوێک یاخود برنج یان هەر خـواردنێکی تـر بخۆیت، پرسیارت لێ بکرێت تامی ئەو خواردنانە باس بکەیت.

کەس ناتوانێت باسی تام و جۆری خواردنەکان بکات، بـۆ نمـوونە بڵێـت مۆز شیرینە، ناکرێت چونکە زۆر شتی تر هەیە شیرینە وەکو مۆز.. هتد.

بەڵام ئەگەر کەسێک پرسی پرتەقـاڵ یـان سـێو چ تامێـک یـان بـۆنێکی هەیە خۆی درک بەتـام و بـۆنەکەی دەکـات، بەڵام ناتوانێـت بەرجەسـتەی بکەیت تەنها خۆت هەستی پێ دەکەیت.

یان کاتێک هەست بە جموجۆڵی دوژمن دەکەیت لە جەنگدا، زۆرجـار لە جەنگـدا تـۆ دوژمـنەکەت نابینیـت، بەڵام هەسـت بە جموجوڵەکـانی دەکەیـت بە عەقـڵ. یـاخود ئەم کەونە بەو هەمـوو یاسـا و ڕێسـا و سیستەمێکی ڕێکوپێکییە بکەیت، بێ ئەوەی ئەو هێزەی دروستی کـردووە بینیبێتت ڕاستەخۆ بـڕوا دەهێنیـت بە قـودرەت و پـاوەر و هێـزەکەی، جـا کەسێک ناوی ناوە وزە ئەویتر ناوی ناوە سروشت یان ڕێکەوت. منیش ناوم ناوە خوا.

بەڵام ناونانەکەی من لە ڕێگای ئەو زانستەوەیە کەلە پـاکێجی ئیمانیـدا هاتووە. ئیمان لە ڕاسـتیدا خـاوەنی چەنـد پـایەیەکە، پایە سـەرەکییەکانی بریتین لە:

خوا – فریشتە – کتاب – پێغەمبەر - ڕۆژی قیامەت و کۆتـایی - قەزا و قەدەر.

هەموو ئەم ئەرکانانە خەڵکی دەیزانێت لە فەرموودەکەی جوبریل دا، بەڵام لێرەدا ئێمە واتا من و تـۆ دەگەڕێینەوە بـۆ نـاو باسـەکەی کە وتمـان چۆن دەتوانین مـەنقول بکەیـنە مـەعقول واتـا دەقە ئیمانییەکـان بکەیـنە دەقی عەقڵانی.

وا کاری بنەڕەتیمان دەسـت پێـدەکات بەیەکەوە ئـیمان بە عەقڵانـیەت دەکەین و ئەو پرۆسەیە لەسەرەتاوە دەبێت بزانیـت بـۆ ناسـینی خـوایە و هەریەکە لەو پاکێجانە هەمووی خوای پەروەردگارت پێ دەناسێنێت.

مەبەستمان فریشتە و کتێبە ئاسمانییەکان و پەیامبەران و ڕۆژی دوایـی و قەزا و قەدەرە.

بۆ هەریەک لەم باس و تـوخمانە سـەرەتا پێویسـتمان بە ناسـین هەیە، پاشان ڕێکخستنی ئۆتۆماتیکی عەقڵانی لەناو باسەکاندا خـۆی دەردەخـات منیش زیاتر زەقی دەکەمەوە بە پشتیوانی خوای گەورە.

فریشـتە (ملائکـة): کۆمەڵێـک مەخلـوقن خـوای پەروەردگـار دروسـتی کـردوون بـۆ ڕێکخسـتن و کاروبـاری گەردوون و ژیـان و مـرۆڤە، زۆرتـرین مەخلـوقی خـوای پەروەردگـارن لە گەردوونـدا. هەر کـۆمەڵە و کـارێکی تایبەتی پێ سپێردراوە، بۆ نموونە فریشـتە هەیە تەنهـا لە سـوجدەدایە بـۆ پەروەردگاری، جۆرێکی تر لە چەمانەوە و ڕکوعدان بـۆ پەروەردگـار، هەیە عەرشی خوای گەورەی هەڵگرتووە. فریشتە هەیە باران دەبارێنێـت، هەیە خـاوەنی شـاخە، هەیە کـاری چـاودێری مرۆڤەکـانە، هەیە جەنگـاوەرە و سەربازی پەروەردگارە، ئەم گەردوونە بەوان سپێردراوە لە ژێر سەرپەرشتی خوای پەروەردگاردان و ناویان زۆرە لەوانە (جبرائیـل، میکائیـل، ئیسـرافیل، هاروت، ماروت، رقیب، عتید..هتد).



لەنێـوان ئەم فریشـتانە هەیـانە پەیوەنـدی لەگەڵ مرۆڤـدا دروسـت کردووە بەفەرمانی خوای گەورە تەنها بۆ ئەوەیە خـوای پەروەردگـار وەکـو خۆی بناسین بێ زیاد و کەم کە پێناسەی زانستە!

ئەو فریشتەیەی ناوی جبریلە دێت بۆلای کۆمەڵێک مرۆڤ ئەویش خوا دەستنیشانی دەکات و هەڵیاندەبژێرێت، بەڵام بۆ ناسینی خـۆی پەیامێـک دەنێرێت بۆ ئەوەی خوا خۆی بناسێنێت و کار و فەرمان و پاداشـتمان بـۆ دیاری دەکات لەو پەیامەدا کە لە شێوەی کتێب دایە.

## کەواتە پەیامەکە چییە؟

لەسەرەتای دروستبوونی مرۆڤەوە وەکو ڕێزێک بۆ مرۆڤ پەیامی خۆی ناردووە ئەویـش ئەو ڕێـزە گەورەیەیە خـوا لەبەنـدەکانی نـاوە، کتێبەکـان زۆرن ئەوانەی کە بۆمان باسکراون بـریتین لە (صـوحوف، تەورات، زەبـور، ئینجیل و کۆتاییشیان قورئان)ە ئەشێ کتێبـی تـری ناردبێـت خـوای گەورە، بەڵام ئێمەی مرۆڤ ناوەکانیان نازانین.

وەکو لە باسی فریشتەدا ئاماژەمان پێدا خوای پەروەردگار ئەو مرۆڤـانە هەڵـدەبژێرێت، مـرۆڤ ناتوانێـت ئەو پـلەیە بەدەسـت بهێنێـت، تەنهـا هەڵبژاردەی خوان ناویان پێغەمبەرانە و ئەوان پەیامەکە هەڵدەگرن، بەڵام بـۆ ئەوەی ئەوان ببـنە چاوسـاغ و مامۆسـتا و ڕۆشـنکەرەوەی پەیـامەکەی خوای پەروەردگار.

لەو پەیامەدا کە دەنێردرێـت لە ڕێگـای فریشـتەوە بـۆ مرۆڤەکـان دوو شـتی تێـدا بەدی دەکرێـت، ئەوانـیش ناسـین و گەڕانەوە بـۆلای خـوای پەروەردگـار و ناسـینی ئەم وجـودەیە بە چ جـۆرە یاسـایەک ڕێکخـراوە کە ناوی یاسای قەزا و قەدەرە و ستراتیژی ئەم کەونە لەسەری دامەزراوە.

لێرەدا ئەوە ڕوون بوویەوە کە ناسینی خوای گەورە لەڕێگای فریشتەوە بە پەیامێک بـۆ پەیامبەرێـک کە خوامـان پـێ بناسـێنێت و بگەڕێـنەوە بـۆ دنیـایەک کەوا جیـاوازترە لەم جیهـانەی لەنـاو ئەم مەملەکەتـی خـوای پەروەردگـارەدا یاسـا و ڕێسـای تـایبەتی خـۆی هەیە، هەروەکـو نمـوونەی وڵاتـان کە هەمـوویـان خـاوەنی سـنوور و یاسـاو ڕێسـای خۆیـانن. خـوای گەورەش بەم یاسایە مامەڵەمان لەگەڵ دەکات کە خۆی بـۆی داڕشـتووین، ئەویش یاسای ئیسلامە لە ڕێگای پەیام و پەیامبەرەکەیەوە بۆی ناردووین.

## چۆن خوا بناسین؟

ئایا دەبێت خۆمـان بچـین بـۆلای یـان لەڕێگـای خەڵکـانێکی سـەر ئەم زەویە، ئایا ئەو کەسە کێیە کە پێمان دەناسێنێت و چۆن پێمان دەناسێنێت، لەڕاستیدا دەبێت ناسینی خوا بە شێوەیەکی جیاواز بێت لە ناسینەکانی تر، بـۆ نمـوونە ئەوەی کەوا زانسـتمان پـێ ئەناسـێنێت دەبێـت زانـا بێـت بە زانستەکە، ئەوەی کە خوامان پێ دەناسێنێت دەبێت خۆی خوای ناسـیبێت پێشتر، بەڵام لە ڕاستیدا ئەم هاوکێشەیە بەم شێوەیە نییە، بەڵکو هەموو لە ناسینی خوادا یەکسانین کەسێک نییە بگاتە ئەو زانستە، بەڵکو تەنهـا خـوا خــۆی دەتوانێــت خــۆیمان پێبناســێنێت، ناکرێــت لە ڕێگــای زانــا و فەیلەسوفەکانەوە بیناسین، چونکە خەڵکی بۆچـوونی وایە چـاوەڕێی ئەوە دەکەن کەسێکی وەکـو (دیکـارد، کانـت، نـیچە، ئەنطونیـۆ فلـو، سـتیڤنس هاوکین) خوامان پێ بناسێنن، وەکو وتم لە توانای مرۆڤ و زانستی مرۆڤ دا نیــیە، هەمیشــە پێــوانەی شــتەکان لای مــرۆڤ لە ڕێگــای عەقــڵ و هەســتەکانەوەیە، بەڵام ناســینی خــوا عەقــڵ درکــی پێناکــات و هەســت ناتوانێت بیدۆزێتەوە تا ئەو ساتەوەختەی خوودی خوا زاتی پاکی خـۆیمان پێدەناسێنێت و تەعاروفمان لەگەڵ دەکات.



لەڕێگای کەسێکی نەخوێندەوار کە لە ژیانیدا بێجگە ڕەوشتی جوان خاوەنی هیچ ئارگۆمێنت و فەلسەفە و شیعر و پەخشان و زانستێک نەبووە و پێوەری خواناسی دەبێت لەڕێگای کەسێکی وەکو ئەو مرۆڤەوە بێت کەناوی محمد کوڕی عبدالله-یە و عەرەبە و خەڵکی شاری مەککەیە لە عەشیرەتی قوڕەیشە.

## کەواتە بۆ محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ؟

لەبەر ئەوەی ویستی عەقڵانیەت وایە بۆیە خوای گەورە محمدی نەخوێندەواری بۆ هەڵبژاردووین، ئەگەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەیلەسوف بوایە دەوترا فەلسەفەکە خوای بۆ دۆزیوەتەوە، ئەگەر شاعیر بوایە دەوترا بە فەنتازیا و خەیاڵ خوای دروست کردووە، ئەگەر کوڕەپادشا و خاوەن دەسەڵاتی سیاسی و سەربازی بوایە دەوترا بەهێز خوا و بیروباوەڕی سەپاندووە بەسەر خەڵکیدا.

لەڕاستیدا هیچیان نەبوو نەخوێندەوار بوو دوور بوو لە شارەزایی هەموو زانستەکان، ئەمەش وەڵامێکی عاقڵانەمان بۆ دەستەبەر دەکات کە گرنگی کارەکە لە گەیاندنی پەیامەکەی خوای پەروەردگارە.

## کەواتە بۆ قورئان؟

لەبەرئەوەی قورئان ڕۆشنکەرەوەی ئەو پەیامەیە کە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵیگرتووە بە زمانی عەرەبی هاتووە، ئەمەش پەیوەندی بە خوودی پەیامبەرەکەوە هەیە کە عەرەبە، ئەگەر بە زمانی فارسی بهاتایە دەوترا گرنگ نییە، پێشتر فەلسەفەی زەردەشت و مانی و



فەیلەسوفە ئێرانییەکان ناوچەی ئاریا و فارس بوونی هەبـووە، فەلسـەفە و ئایینیـان زۆر بـووە، ئەگەر لە چـین و توبـا بـووایە کە نـاوچەی شـەرقە بە گشـتی دەوتـرا دەیـان ئـایین و فەلسـەفەی وەکـو (کریشـنا، بـودا، میـترا، مەزدەک، لاوتسـتۆ، کۆنشـۆفیوس و.هتـد) ئەگەر لە یۆنـان و ڕۆمـا و فەڵەسـتین بهاتـایە دەوتـرا زۆرێـک لە پێغەمـبەران و فەیلەسـوفی تـر لەو ناوچەیە بوون (وەکو ئەرستۆ و ئەفلاتون.هتد) لە ڕۆم و یۆنان. فەڵەسـتین دیارە خاکی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلە.

ئەگەر لەو جێگایـانەوە بهاتـایە پەیـامە قورئـانییەکە کە وەحیـیە لە عەقڵانییەوە دەردەچو بۆ خورافیات. جێگای پەیام و پەیامبەرەکەمان ناسی تـا ئێسـتا پێویسـتە نـاوەرۆکی پەیـامەکە بـزانین چیـیە، چـۆن لەڕووی عەقڵانیـیەوە جێگاکەمـان سـەلماند پێویسـتە لەڕووی عەقڵانییەتیشـەوە ناوەرۆکەکەش بسەلمێنین.

## کەواتە ناوەرۆکی پەیامەکە چییە؟

ناوەرۆکی پەیامەکە چەند باسێکی گرنگە کە هیچ زانستێک لەسەر ئەم زەوییەدا ناتوانێت وەڵامی ئەو پرسیارانە بداتەوە تەنها بەو پەیـامە نەبێـت بۆ محمد صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ هـاتووە ئەویـش بـریتییە لە (خـوا کێـیە؟ خـوا چـۆنە؟ بـۆ دروسـتی کـردووم؟ بـۆچی دەگەڕێـمەوە بـۆلای، ئەرک و فەرمـانم چیـیە؟ مـردن و زینـدووبوونەوە چیـیە؟ ڕۆژی قیـامەت کەیە و چـۆنە؟ ئەمـانە هەمـووی بـۆ؟) ئەم پرسـیارانە خەڵکیـان عاقـڵ کـردووە لەهەمانکاتدا خەڵکانێکی سەرلێشێواو گومڕا و کافر کردووە، ئەم پرسیارانە هیچ زانستێک لە دنیادا ناتوانێت وەڵامی بداتەوە ئەگەر ملیۆنێک سـاڵیش زانسـت بـڕواتە پێشـەوە، تەنهـا و تەنهـا ئـایینی ئیسـلام وەڵامـی ڕاسـت و دروست و عەقڵانی لایە، چـونکە نەفیزیـا دەتوانێـت وەڵامیـان بـاتەووە نە



کۆسـمۆلۆجی و ناسا وەڵامیان لایە، نە فەلسەفە و فیکر و قودرەتیان بەسەریدا دەشکێت، هەروەها بۆ زانستەکانی دیکەش وەکو وتمان تەنها وتەنها دین وەڵام ئەداتەوە.

## خوا کێیە؟

ئەو زاتەیە کە هاوشێوەی نییە، هەر خۆیەتی لە هیچ شتێک ناچێت و هیچ شتێک لەو زاتە ناچێت. تەنهایە لەسەرەتاوە هەبووە و کۆتایی نایەت. واتا خۆی کۆتایە، دروستکەری هەموو شتێکە پێویستی بە هیچ شتێک نییە، بەڵکو هەموو دروستکراو و شتێک پێویستی بە ئەو خودایەیە. زیندوودەکاتەوە و دەمرێنێت، ناخەوێت و وەنەوز نادات و ماندوو نابێت، ئەوەی بیەوێت دەیکات لە ماوەیەکی زۆر کەمدا لەهەناسەدان و چاوتروکانێکدا، بەڵکو کات بۆ ئەو دیاری ناکرێت، جێگای ئاسمانە و بەرزەو هیچ شتێک لەو بەرزتر نییە، چواردەوری هەموو شتێکی داوە و ئاگاداری ورد و دروشتە.

بەزانست لە هەموو جێگایەکدا لە ئەلەکترۆن و نیوترۆن و خانە و ناوکی خانەو سیتۆپلازما و دی ئێن ئەی و ئاڕ ئێن ئەی لەوانەش بچوکتر بە ملیارەها جار خوای گەورە ئاگادارە بەسەریەوە پاشان بۆ گەردوون و کونەڕەشەکانی ناو ئەم گەردوونە و هەموو ئاسمانەکان خوای گەورە ئاگادارە بەسەریەوە خۆی سەرچاوەیە کە وتمان سەرچاوەیە، پێویستی بە هیچ شتێک نابێت. بەکورتی ئەگەر خوای پەروەردگار خاوەن ئەو توانایانە نەبێت پێی ناوترێت خودا.



# خوا چۆنە؟

خوای پەروەردگار ناتوانرێت وێنا بکرێت، چونکە لەهیچ شتێک ناچێت کە دروستکراوی خۆیەتی لە سورەتی الشوری دا ئایەتی ١١ دەفەرمووێت:

﴿فَاطِرُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ جَعَلَ لَكُم مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ أَزۡوَٰجٗا وَمِنَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ أَزۡوَٰجٗا يَذۡرَؤُكُمۡ فِيهِۚ لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١١﴾ الشورى. (خوایەک کە) بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە، هەر لە خۆتان هاوسەرانی بۆ سازاندوون، لە ئاژەڵ و مەڕو ماڵاتیشی جوت، (نێرو مێ)ی بۆ فەراهەم هێناون، لەو ڕێگەیەوە زاووزێ دەکەن و زۆر دەبن بۆتان، هیچ شتێک نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێک لەو ناچێت (چونکە خوایە و بەدیهێنەرە، چۆن لە بەدیهێنراوەکانی دەچێت) لەهەمان کاتدا زاتێکی بیسەرو بینایە.

خـوای گەورە خـاوەن دەنـگ لەگەڵ موسـا -علـيه السـلام-دا قسـەی کردووە خاوەنی چاوە دەبینێت، خاوەنی گوێیە دەبیستێت، خاوەن دەسـت و پەنــجەیە، خــاوەن تەنیشــت و لایە، خــوای گەورە تــوڕە دەبێــت، پێدەکەنێت. هەموو ئەمانەی باسم کرد لایەقە بەزاتـی پـاکی و دیسـانەوە دەیڵــێمەوە لەهــیچ شــتێک ناچێــت، خــۆی ســەرچاوەیە ئەگەر بێــت لەدروستکراوەکانی بچێت کەواتە خوا نییە!

هەر لەبەر ئەوەیە دەڵــێین ئەوەی خــۆی بــۆی باســکردووین لەڕێگـای پەیـام و پەیـامبەرەکەیەوە، وەکـو بـڕوای پێـدەکەین بەبـێ زیـاد و کەم لە چۆنێتی نـاکۆڵینەوە، لەبەر ئەوەی هـیچ کەس و زانسـتێک پەی پێنابـات و هـیچ ئەقڵێکـیش درکـی پـێ ناکـات، ئەمەش ئەو تـام و چێـژی ئـیمانەیە موسوڵمان دەبێتە خاوەنی.



لێرەدا پرسیارێک خۆی زیت دەکاتەوە دەڵێت عەقڵانییەت لەکوێی ئەم باسەدایە؟ زۆر بەسادەیی باسەکە خۆی عەقڵانییە ئەگەر بهاتایە و خوای پەروەردگار وەکو خوا دەستکردەکانی مرۆڤ بەرجەستە بکەین و لاشەی بۆ دروست بکەین وەکو بوزا و کریشنا و خوای سێگانەی نەسرانی یان وەکو ڤینۆس و ژوپیتەر و ئاپۆلۆ..هتد ئەوە لە عەقڵانییەت دەردەچێت و دەبێتە خورافیات. عەقڵانی ڕاستەقینە ئەوەیە خوا خالق و سەرچاوەیە چۆن عەقڵ و هەست درکی پێ دەکات.

## کێ دەڵێت خوا هەیە؟

ئەم باسانەی کردمانن لە سەربوونی خوا و سیفات و ئەندامەکانی وەک چاو و دەست و گوێ و..هتد خوای پەروەردگار تەنها لایەق بەزاتی پاکێتی ئەوە و هاووێنەی نییە، لەوانەیە من و تۆ ئەو پرسیارەمان بۆ دروست بێت، باشە خەڵکانێک هەر بەتەواوەتی نەفی وجودی پەروەردگار دەکەن. ئەو مولحید و عەلمانی و بێباوەڕانەی کە لە دنیادا هەن ڕەتی دەکەنەوە کە خوا بوونی هەبێت.

جا بۆیە ئەم برگەیەمان تەرخان کرد بۆ ئەوەی تۆی خوێنەر لە پرسێکی بێ وەڵام دا بەجێ نەهێڵم.

سەرەتا بە مولحیدێک دەست پێدەکەم کە ٥٠ ساڵ خەڵکی مولحید و بێدین دەکرد، ناوی (ئەنتۆنیۆ فلو)ە لە زانکۆی ئۆکسفۆرد ئوستازی فەلسەفەیە ١٩٨٠ ڕۆژنامەنووسێک لێی پرسی بۆچی بڕوات بە بوونی خوا نییە؟

لەوەڵامدا ئەنتۆنیۆ وتی: ئەگەر خوا هەبێت دەبێت خۆی سەرچاوەی هەموو بوونێک بێت لەم گەردوونەدا، لە نیوەشەو و لە ڕۆژێکدا و

لەهەموو کات و ساتێکدا دەبێت ئاگاداری ورد و درشتی ئەم بـوونە بێـت، تەنانەت دەبێت ئاگاداری وەرینی گەڵای دارێک بێت.

ئینجا ئەوە بە ڕۆژنامەنووسەکە دەڵێت: خوایەکی وا شـک دەبەیـت تـا بڕوای پێ بکەم؟

ڕۆژنامەنووســەکە دەســت دەکــات بە پێکەنــین و بەرنــامەکە تەواو دەبێت.

ئەو مامۆستای فەلسەفەیە لە زانکۆی ئۆکسـفۆرد کتێبێـک دەنووسـێت بەناوی (خودا بوونی نییە)، چەندین ساڵ خەڵکی مولحید کرد تـا لە سـاڵی ٢٠٠٠-٢٠٠٢ وتی هەڵە بووم، خوا بوونی هەیە. ئەمەش دوای شـیکردنەوە و لێکۆڵینەوە لە کۆدەکانی ناو (دی ئێن ئەی) کە هەر یەکێک لەو کـۆدانە کارێکیــان هەیە و هەڵدەســتن بە دروســتکردنی ئەنــدامێکی جەســتە و سیفاتێکی پێدەبەخشێت، بەبێ هەڵە و بە دەقیقـی نـاو ئەو شـفرانەی کە لە (ئارِ ئێن ئەی)دا هەیە، ئەمانە و ڕێکی ئەو سیسـتەمە و ئیشـەکانیان وا نیشان دەدات خوا بوونی هەیە، پاشان کتێبێکی تری نووسی بەناوی (خـوا بوونی هەیە).

پەنجا سـاڵ خەڵکـی بێـدین کـرد لەدوای قـاڵ بـوونەوەی لە زانسـت و دروست کراوەکانی خـوای پەروەردگـار و وەگەڕخسـتنی عەقڵـی ئینجـا لە کۆتاییــدا وتــی خــوا بــوونی هەیە، بەڵکــو بــوونی خــوا لەم گەردوونەدا پێویستە.

پــۆڵ دەیڤــس: زانــا و مامۆســتای زانکــۆ لەبەشــی فیزیــا کە خــاوەنی خەڵاتــێکە قــیمەتەکەی زۆر لە نۆبــڵ بە بەهــاترە و خــۆی ئەدات لە ٢٥ ملیۆن دۆلار.



لەوەڵامدا دەڵێت زانایانی فیزیا و کیمیا هیچ داهێنانێک ئەنجام نادەن، بەڵکو یاساکانی ئەم گەردوونە ئەدۆزنەوە، پاشان زانستی لەسەر دادەمەزرێنن. کەواتە بەم زانیاریانەی کە دەست زانایان دەکەوێت و یاساکان دەدۆزنەوە مادام یاسا هەیە گومانی تێدا نییە دەبێت یەکێک یاساکەی دانابێت، یاسا و ڕێکی سیستەم لەخۆیەوە دروست نابێت، دەقی وتەکەی دەڵێت: (کە یاسا هەبوو یاسادانەریش هەیە).

ئەوانەشی کەوا دەڵێن ئەم وجود و گەردوونە بە سوتفە و لە خۆیەوە دروست بووە لە ڕاستیدا جێگای پێکەنینە، گەردوونێک بەو هەموو سیستەم و بەش و پێکهاتەوە لەخۆیەوە چۆن دروست دەبێت، زانایانی ماتماتیک وەڵامی ئەم جۆرە بیردۆزانە ئەدەنەوە.

زانای گەورە شەهید (محمد رمضان البوطي) دەڵێت: ئەگەر هاتوو سفر زەڕبی هەر ژمارەیەک بکەیت کۆتاییەکەی هەر سفرە، ئەم هاوکێشەیە نەگۆڕە، لە گەردووندا کە کەرەستەت نەبێت لە هیچەوە ماددە و وزە دروست نابێت چونکە سفر لە ملیاردی بدە ئەنجامەکەی هەر سفر دەردەچێت، ئەم هاوکێشەیە پەیوەندی نییە بەسەر تیۆری فەلسەفەوە ئەوەی باسی دەکەین زانستی موجەڕەدە و دیارە کۆنکرێتییە، ئەم وتانەی جەنابی زانای گەورەی کورد محمد رمضان البوطي بۆ ماوەی دوو ساڵ لە مونازەرەی شوعییەکاندا بوو لە سوریا لە ساڵەکانی ٨٠ کە (حافظ ئەسد)ی سەرۆک کۆمار بەشدار بوو تێیدا، لە کۆتاییدا محمد رمضان البوطي هەموو شوعییەکانی خزاندە سوچی ژوورەکانیان و ئەویش بوو بە ئەستێرەیەک لە ئەستێرەکانی ئەم ئیسلامە.

هەروەها ئەندازیار (فاضل سولەیمان) دەڵێت هەموو ژمارەکان سەرچاوەیان هەیە، بۆ نموونە ژمارە شەش لەسەرچاوەی پێنجەوە هاتووە، پێنج لە سەرچاوەی چوارەوە هاتووە، چوار سەرچاوەی سێیە، سێ-ش

سـەرچاوەی دووە، دوو-ش سـەرچاوەی یەکە، بەڵام یەک سـەرچاوەی هەموو ژمارەکانە دوای یەک ژمارەیەک نییە، بەڵکو سفرە، سفریش بێ سەرچاوەیە کەواتە (یەک) خاوەنی هەموو سەرچاوەکانە، بۆیە زاناکانی بیرکاری بەئاسانی دەتوانین ئیسپاتی بوونی خوای پەروەردگار بکەن.

کەواتە سەلماندنی هێز و توانا و دەسەڵاتی خوا و بوونی خوای پەروەردگار لە ئێستادا ئەوەندە کارێکی قورس نییە، بەڵکو هەموو خاوەن عەقڵێک دەتوانێت بە زانست تەنانەت خوودی فەلسەفە لەماوەیەکی کورتدا بوونی خوای گەورە بسەلمێنێت بەتایبەت گەڕانەوە بۆ سەرچاوە و مەصدەر خێراترین ڕێگایە بۆ سەلماندنی بوونی پەروەردگار.

## ڕێگای دۆزینەوەی خوا

ڕێگای دۆزینەوەی خوای پەروەردگار زۆرە، بە تێڕامان لە زانستەکانی گەردووناسی و کۆسمۆلۆجی و یاخود زەویناسی و جیۆلۆجی و ڕووەکناسی..هتد. هەموو زانستەکان لە دروستبوونی کلۆرۆفیلێک تا خانە و پێکهاتە زیندووەکانی ئەم بوونە و ئەلەکترۆن و پرۆتۆن و دی ئێن ئەی تا گەورەترین کونەڕەش لەم گەردوونەدا هەست دەکەیت هەموویان لەیەک دەچن و دەستی یەک زاتی پێوەدیارە کە خاوەن قودرەت و توانایە و ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت بگاتە کۆتایی ئەو زانست و نهێنانیانەی کە هەیە، خەڵکی خاوەن هۆش و ژیری و عەقڵانی و زوو پەی دەبات بە وەحدەتی ئەم وجودە لەدەستی تاکە هێز و قودرەتێکدایە کە ناوی (الله)یە، نەک بەمانای فەلسەفەی وەحدەتی وجود پەنا بەخوا.

خاڵی سەرەکی دۆزینەوەی نییە، بەڵکو وەکو ئاماژەمان پێداوە هەموو دروستکراوەکان ئاماژەن بۆ ئەوە کە دەسەڵاتێک کە زۆر بەتوانایە دروستی



کـردووه، بەڵام خـاڵی جەوهەر و سـەرەکی گرنـگ ئەوەیە چـۆن و لەکـام ڕێگـاوە دەگەیـن بەخـوای پەروەردگـار، کەواتە دۆزیـنەوەکە ئاسـانە بەڵام ڕێگای گەیشتن بە پەروەردگار تاڕادەیەک ماندووبوونی دەوێت، ئەو ڕێگایە کامەیە مرۆڤ دەتوانێت بگـات بەو پەروەردگـارە گەورە و بـێ وێـنەیە کە دنیایەک نهێنی یە، مرۆڤ دەیەوێت بگات بە نهێنیەکان، بێگومـان دەبێـت بگەڕێین بەدوای ڕێگای گەیشتن بە خوای پەروەردگاردا.

## ڕێگای گەیشتن بەخوا

ڕای یەکجار زۆر هەیە گوایە بۆ گەیشتن بە خوای پەروەردگار، ئەم ڕێگا و ڕایانە لە کۆتاییـدا بەرەو چـاڵ و چـۆڵ و نغـرۆ بـوون ئەتـبەن، تـا لەنـاو دۆزەخ خـــۆت دەبینیـــتەوە. ئەوەی ڕێگـــای ڕاســـتەوخۆی ئاگـــاداری کردوینەتەوە ناونیشان و ئەدرەسی ڕاست و دروستی پێ داویـن، تەنهـا لە ڕێگای خۆیەوەیەتی کە ئەو زاتە پاکە پێمان دەڵێت گەیشتن بە من لەیەک سەرچاوە و ڕێگاوەیە، ئەویش نەخشە ڕێگـای (قورئـان)ە کە ناونیشـانم بە تەواوەتـی لەو کتێـبەدا نەخشـە ڕێگـای ئیمانـدارە بە پەروەردگـار تیایـدا یاداشت کـراوە، ئەگەر ئەتەوێـت بگەیـت بە زاتـی پـاکی خـودا، پێویسـتە ناونیشـانەکەی لەم کتێـبەدا هەڵبگریـت و ڕێگـا ببڕیـت تـا دەگەیـتە ئەو مەملەکەتەی کە خوای پەروەردگـار خـاوەنیەتی، هەمـوو مەملەکەتەکـانی دیکە، تەزویر و کـائین و مـرۆڤ لەنـاو خۆیـدا نغـرۆ دەکـات، کۆتـایەکەی نەهامەتی و سەرلێشێواوی و بەرەو دۆزەخی هەتا هەتاییە.

# قورئان تاكە ڕێگای گەیشتنە بە خوای پەروەردگار

قورئان واتا خوێندنەوەی زۆر لە ڕووی زمانەوانییەوە، لەڕووی زاراوەوە بەواتای كتێبێكی پەروەردگارە ناردوویەتی بۆ مرۆڤایەتی لە ڕێگای فریشتەكەوە بۆ مرۆڤێك تا ئەو مرۆڤە پەیامەكەی خوای پەروەردگار بگەیەنێت و ئێمە بتوانین لە ڕێگای ئەو كتێبەوە بگەین بە پەروەردگار.

كتێبەكە باسی چەند پرسێكی گرنگ دەكات، لەوانە ناسین و گەیشتن بە خوا خۆی ڕێنیشاندەرە بۆ گەڕانەوە بۆلای ئەو پەروەردگارە وەڵامگەلێكی زۆری تێدایە لە پرسیارە وجودییەكان، كە مرۆڤ بۆچی دروست بووە، خوای پەروەردگار چۆن دروستی كردووە، كۆمەڵێك نهێنی ئاشكرا دەكات لە دروستكراوەكانی و پاشان دوژمنەكانی مرۆڤ بە خوودی مرۆڤ دەناسێنێت و ئامۆژگاری مرۆڤ دەكات لەسەر چاكەكردن و دووركەوتنەوە لەكاری زشت و خراپەكاری بێجگە ئەوەی ئەدرەس و ناونیشانی خۆی بۆ ناردووین، پێمان دەڵێت خوودی پەروەردگار دەبینین و بەخزمەتی دەگەین.

لەهەمانكاتدا یاساگەلێكی زۆری ناردووە تاكو لە سەرزەوی دادپەروەری بچەسپێت و هاتمان ئەدات بۆ پێكەوە ژیان لەگەڵ مرۆڤەكان بەتایبەتی سوود وەرگرتن لە سەروەتی كانزای سەرزەوی و ئاوی تەنانەت ئاسمانی. لەگەڵ ئەمانەدا خوای پەروەردگار وەكو ئەزموون و هەواڵ و بەدواداچوونی گەلانی ڕابردوو پیاو چاك و خراپ و پێغەمبەرانی بۆ باس كردووین لە قورئاندا ئەمە بەكورتی باس و سەرگوزشتەی ئەو كتێبە خوایە كە ناوی قورئانە و مەخلوق نییە و كەلامی خۆیەتی.



هەرچەنــدە لەم کتێــبەی مــن و تــۆ دا گەڕامــان لەم بەشــەدا بەدوای ناونیشانی خوای پەروەردگارە کەواتە ناونیشان و ئەدرەسی خوا کـامەیە تـا پێی بگەم؟

لە ڕاســتیدا ناونیشــانی پەروەردگــار زۆر کــورتە، بەڵام ئەدرەسـێکی پـڕ مانایە و تەنانەت پێغەمبەر ئەم ناونیشانەی فەرمـووە سـێ یەکـی قورئـانە واتــا ئەگەر قورئــان بکەیــن بە چــوار بەش ســێ بەشــی لەم ئەدرەس و ناونیشانەدا کۆدەبێتەوە ئەویش سورەتی الإخلاص-ە.

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بەناوی خوای بەخشندی میهرەبان.

﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١﴾ (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوایە تاک و تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە).

﴿ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢﴾ خوا زاتێکی پایەدار و دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییە و هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەوە دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازییەکانمان جێبەجێ بکات.

﴿لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣﴾ نە کەسی لێ بووە و نە کەسی لێ دەبێت، وە خۆیشی لە دایک نەبووە و دایک و باوکی نییە.

﴿وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾ الإخلاص. هەرگیز هاوتا و هاوشێوە و بە دەسەڵاتێکی تر نییە کە لە بەرانبەرییەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

ئەم دەربڕینەی خوای پەروەردگار بۆ گەیشتن بەخـۆی و ناسـینی وەکـو خۆی زۆر پڕ بەها و مانادار و دەقیقە، چونکە باسی لەیەک خوایی ناکـات بەتەنها، بەڵکو باس لە وشـەی تـاک دەکـات نەک یەک، چـونکە لە زمـانی عەرەبی دا ماناکە جیاوازترە وەکو لە زمـانی کـوردی شـیکاری بـۆ بکرێـت، بەڵام بەگشتی واتا ئەو تاکە و وێنەی نییە و لەگەڵیدا هیچ شتێکی تر نییە.



هەر بەتەنها ئەم وجـود  و گەردوونە و زەویـیەی دروسـت کـردووە و پێویســت و نیــازی بە هــیچ کەس و کەرەســتە و شــتێک نیــیە، خــۆی سـەرچاوەیە لەکەس نەبـووە و لەکەسـیش نابێـت و کەسـیش لەو نەبـووە هیچ خوایەکی تر نییە بێجگە لەخۆی.

لەکۆتایشدا ئەوەمان پێ دەڵێت هاوشێوەی و نموونەی هەرگیز نەبـووە لە کۆندا خۆی ئەوەڵ و ئەخیرە، دروستکاری چاکە و خراپەیە.

بەڵام فەرمـانی نەکـردووە بە خـراپە، بەڵکـو بـۆ تـاقیکردنەوەیە و داوا دەکـات خۆمـان بەدوور بگـرین لەکـاری خـراپە لە بـڕگە و بەنـدەکانی داهاتوودا زیاتر ئەو باسە ڕۆشندەبێتەوە بە پشتیوانی پەروەردگار.

ئەم یەکتاییەی خوا لەهەمـوو شـتێکدا لەگەڵمانـدا ڕێـدەکات، یەکتـایی لەدروستکراوەکانیدا، یەکتایی لە پێناسە و وەسف و سیفاتی دا.

## تێبینی بۆ تۆ.

لێرەدا پێویستە ڕوونکردنەوەیەک بۆ خـوێنەر و هەمـوو تۆکـان بـدەین کاتێک باس لەیەکتاپەرستی یاخود یەکانگیری وجود  دەکەیـن مانـای ئەوە ناگەیەنێت کەبـاس لە فەلسـەفەی وەحـدەتی وجـود  بکەیـن. وەحـدەتی خـالق لە دروسـتکراوەکانیدا جیـاوازە لەگەڵ وەحـدەتی وجـود، چـونکە ئەشێت بڵێین وەحدەتی وجود, تـاکە خـوایەک دروسـتی کـردووە بەڵام کە وترا فەلسەفەی وەحدەتی وجود  واتا هەرچی لەم بوونەدایە لەگـەڵ خـوا یەک وجودیان هەیە، ئەم فەلسەفە کۆن و پوکاوە دوور لە تیۆری زانسـتی زۆرێـک لە خەڵکـی جیهـان بڕوایـان پێیەتـی، ئەویـش زۆریـنەی خەڵکـی ســـەرزەوین بڕوایـــان بەو فەلســـەفەیە هەیە، هنـــدۆس، بـــودی،



کریشناکان..هتد. بڕوایان بە وەحدەتی وجود  هەیە کەپەنا بەخـوا کـوفری مطلقە و هیچ پاساوێک هەڵناگرێت.

لەکاتێکدا موسوڵمان بڕوای بەهەموو دروستکراوەکانی ئەم بوونە هەیە واتـا بڕوامـان وایە کەچـی لەوجـود دا هەیە خـوای پەروەردگـار دروسـتی کردووە. ئەو زاتەش لە هیچ شتێک ناچێت و وێنەی نییە، واتا خۆی خاوەن دروستکاری هەموو وەحدەتی وجودە، چونکە خەڵکێکی بێ ویـژدان هەن لە نەتاشراو بۆ خەڵکی موسوڵمان دادەتاشن بەتـایبەت ئەوانەی ڕەخـنە لە شەهیدی ئەم ئیسـلامە سـید قطـب دەگـرن بەداخەوە ئەوان لە قسـەکەی سید قطب تێنەگەیشتوون کە چی دەڵێت. سەید باسـی وەحـدەتی وجـود دەکات.

لەڕاستیدا سید قوطب -ڕەحمەتی خوای لێ بێـت- ڕەخـنە دەگرێـت لە فەلسەفەی وەحدەتی وجود  ودەڵێت وەحدەتی ئەم وجودە هەمـوو یەک دەستی پێوەدیارە ئەویش خوای پەروەردگارە (لە سورەتی البقـرة ڕەخـنە و کـوفری وەحـدەتی وجـود  دەردەخـات) هەروەهـا لە سـورەتی الإخـلاص بەڕوونی باسی وەحدەتی وجود  دەکات کە خوای گەورە خاوەنیەتی.

ئەمەش دوو جیاوازی یەکجار گەورەیە کە خەڵکی عاقڵ لێی تێدەگات.

بسم الله الرحمن الرحيم

قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ① اللَّهُ الصَّمَدُ ② لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ③ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ④

هذه السورة الصغيرة تعدل ثلث القرآن كما جاء في الروايات الصحيحة . قال البخاري : حدثنا إسماعيل : حدثني مالك عن عبد الرحمن بن عبد الله بن عبد الرحمن بن أبي صعصعة ، عن أبيه ، عن أبي سعد ، أن رجلاً سمع رجلاً يقرأ : « قل هو الله أحد » يرددها . فلما أصبح جاء إلى النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ فذكر ذلك له ـ وكأن الرجل يتقالها ـ فقال النبي ـ صلى الله عليه وسلم ـ : « والذي نفسي بيده ، إنها لتعدل ثلث القرآن » ..

وليس في هذا من غرابة . فإن الأحدية التي أمر رسول الله ـ صلى الله عليه وسلم ـ أن يعلنها : « قل هو الله أحد » .. هذه الأحدية عقيدة للضمير ، وتفسير للوجود ، ومنهج للحياة .. وقد تضمنت السورة ـ من ثم ـ أعرض الخطوط الرئيسية في حقيقة الإسلام الكبيرة ..

« قل هو الله أحد » .. وهو لفظ أدق من لفظ « واحد » .. لأنه يضيف إلى معنى « واحد » أن لا شيء غيره معه . وأن ليس كمثله شيء .

إنها أحدية الوجود .. فليس هناك حقيقة إلا حقيقته . وليس هناك وجود حقيقي إلا وجوده . وكل موجود آخر فإنما يستمد وجوده من ذلك الوجود الحقيقي ، ويستمد حقيقته من تلك الحقيقة الذاتية .

وهي ـ من ثم ـ أحدية الفاعلية . فليس سواه فاعلاً لشيء ، أو فاعلاً في شيء ، في هذا الوجود أصلاً . وهذه عقيدة في الضمير وتفسير للوجود أيضاً ..

فإذا استقر هذا التفسير ، ووضح هذا التصور ، خلص القلب من كل غاشية ومن كل شائبة ، ومن كل تعلق بغير هذه الذات الواحدة المتفردة بحقيقة الوجود وحقيقة الفاعلية .

خلص من التعلق بشيء من أشياء هذا الوجود ـ إن لم يخلص من الشعور بوجود شيء من الأشياء أصلاً ! ـ فلا حقيقة لوجود إلا ذلك الوجود الإلهي . ولا حقيقة لفاعلية إلا فاعلية الإرادة الإلهية . فعلام يتعلق القلب بما لا حقيقة لوجوده ولا لفاعليته !

٤٠٠٢



## گەڕانەوە بۆناو باس

کەواتە ئــایین و گەیشــتن بە خــوای پەروەردگــار لە ڕێگــای یەکەم ئەدرەســەوە بــوو کە ئیســلامە تەنهـا و تەنهـا لەهەمـوو بوارەکانـدا، شـێخ ئیسلام ئیبنو تەیمییە ئەم یەکتاپەرستییەی ناوناوە بە یەکتاپەرسـتی لە سـێ بواردا منیش قسەی جەنابیان وەردەگرم و زیاتر شیتەڵی دەکەیـن، ئەویـش سێ جۆرە تەوحیدەکەیە کە جیهانبینی بۆ مرۆڤ دروست دەکات.

سێ جـۆرەکە بـریتییە لە: توحیـدی الألوهیـة، توحیـد الربوبیـة، توحیـد الأســماء و صــفات. واتــا یەکتاپەرســتی لەبەندایەتیـدا، یەکتاپەرســتی لە پەروەردگارێتی خوای موتەعـال دا، یەکتاپەرسـتی لە سـیفاتی بەرز و نـاوە پیرۆزەکانی دا.

لێرەدا من شیکاری ورد بۆ ئەو سێ تەوحیدە ناکەم، چـونکە هەزارەهـا کتێب و سەرچاوە باسیان کـردووە، زۆرێـک لە خـوێنەرانی وڵاتـی ئـێمەش ئاشنان پێی.

بەڵام ئاماژەیەک دەکەم لەڕووی زانستییەوە کەواتای چییە:

تەوحید و یەکتاپەرستی لە بەندایەتی دا

زۆر بە پوختی و بەکـورتی: هـیچ پەرسـتراوێک نیـیە جـگە خـوا خـۆی، هاوبەشی بـۆ دانانرێـت لەڕێگـای خـۆیەوە دەگەیـن بەخـوا، مـادام خـۆی ئەدرەسی ناردووە ڕاستەوخۆ خـۆی ئاگـادارە تەنـانەت ناتوانێـت پەرسـتش بکەیت بە وەسیلە لەڕێگای پێغەمبەرەوە، تەنانەت ئەوەش دەبێتە شـیرکی گەورە.

تەوحید و یەکتاپەرستی لە دروستکراوەکانیدا: دەبێت مرۆڤـی خوانـاس ئەوە بزانێــت هــیچ کەس و مەخلوقێــک بەشــدار نەبــووە و نابێــت لە

دروستکراوەکانیدا نە فریشتە، نەجنۆکە، نەپێغەمبەران، نە پیاوچاکان هیچییان دەسەڵاتیان نییە، مەگەر خوا خۆی دەسەڵاتیان بداتێ ئەویش بە دەق لە قورئاندا بۆمان باسکراوە، دەسەڵاتی دروستکردن و خەلقیان نییە، بەڵکو ڕاسپێردراون بە کارەکە.

تەوحید یەکتاپەرستی لە ئەسماء و سیفات و ناوەپیرۆزەکانی: خوای گەورە ناو و سیفاتی زۆرە کە زۆرێک لە زانایان دەڵێن لە هەزاران تێپەڕ دەکات، شیخ ئیسلام ئیبنو تەیمیە دەڵێت: وانەزانیت کە سیفاتی ناوی پیرۆزی خوا تەنها ٩٩ ناوە، بەڵکو هەرچی سیفات و ناوی جوانە لایەقە بەخوای پەروەردگار، هەروەها ئیمامی ئەحمەد لە ئوصولەکەی خۆیدا هەمان وتە دووبارە دەکاتەوە هەڵبەت ئیمام ئەحمەد کوڕی حەنبەل خاوەنی عەقیدەی ئەهلی سونەت و جەماعەیە هەموو لەویان وەرگرتووە، مەبەست لە شیخ لئیسلامە.

ئەم سێ تەوحیدە لەسەردەمی محمد کوڕی عبدالوهاب تەئسیل کراوە و بەشێکی تری بۆ زیاد کراوە بەناوی تەوحیدی (المتابعة) واتا یەکتاپەرستی لە شوێنکەوتنی شەریعەتی ئیسلامدا پێغەمبەرەکەی محمد صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

کەواتە ناکرێت بڵێین من بڕوام بەو سێ تەوحیدە هەیە، بەڵام شوێنکەوتووی فلان و فیسارێکم یان فەیلەسوف و سەرکردەو یاخود طاغوتێکی تری سەرزەوی کە بە پشتیوانی خوا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە لە داهاتوودا.

لەناو قورئاندا بەتەواوەتی ئەو سێ تەوحیدە ڕونکراوەتەوە خوای پەروەردگار خالقی ئەرزو ئاسمانە و دەبێت پەرستنیش هەر بۆ ئەو بکرێت، ناو و سیفاتە پیرۆزەکانی هەمیشە لەزۆربەی کۆتایی ئایەتەکاندا خوای موتەعال خۆی ئاماژەی پێداوە.



وتەی سەرەکی لێرەدا ئەوەیە مەرجی بڕوابوون بەو سێ تەوحیدە و شوێنکەوتنی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەگەر شوێنی محمد نەکەویت کافر و گومڕایت بابڕوات بە هەمووی هەبێت، هەرچۆن خوای پەروەردگار لە سورەتی آل عمران ئایەتەکانی ٣١ و ٣٢ دا دەفەرموویت:

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣١﴾﴾ ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، (چونکە ئەو) خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

﴿قُلْ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ ۖ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلْكَٰفِرِينَ ﴿٣٢﴾﴾

آل عمران. (دووبارە) پێیان بڵێ: فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بن خۆ ئەگەر سەرپێچی بکەن ئەوە دڵنیا بن کە خوا کافر و بێباوەڕانی خۆش ناوێت.

## لەڕێگای پێغەمبەرەوە بۆ تێگەیشتن لە قورئان

هەموو پەیامبەرێک خاوەنی پەیامێکە، محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ پەیامبەر و خاوەنی پەیامی تایبەتی خۆیەتی تەواوکەری هەموو پەیامەکانە و لە ڕاستیشدا هەموو پەیامەکانی ئاسمانی لەپەیامەکەیدا کۆبووەتەوە.

ئەوەی خاڵی سەرەکی و جەوهەرە پێویستە تۆی خوێنەر بیزانیت ئەوەیە کەبێ محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەستەمە تێگەیشتن لە قورئان،

چـونکە قورئـان لەسـەر ژیـانی پێغەمـبەر ﷺ هـاتووە، هەروەکو سەرەتا ئاماژەمان پێدا ئەم بەشی ئیمانە پاکێجێکە وەکـو دەنـکە مـرواری لەنـاو مرواریەکـان بپچـڕێتەوە هەمـووی بەدوایـدا دەپچڕێـت و ئەوەشی بە ملوانکەکەوە لە کۆتاییدا نوقسان دەبێت.

کەواتە تێگەیشتن لە قورئان لە ڕێگای پێغەمـبەرەوەیە، پاشـان گەیشـتن بەخوای پەروەردگار هەربەهەمانشێوە لە ڕێگـای پێغەمـبەرەوەیە، چـونکە ئەو ڕۆشنکەرەوەی قورئانە.

ئەگەر ورد تەماشای پاکێج و پرنسیپە ئیمانییەکان بکەیـن دەبینـین زۆر عەقڵانی بونیادی ناوە خوای پەروەردگار، نەچۆتە دەرەوەی عەقڵی مـرۆڤ لەبەر ئەوە بنەڕەتی پەیامەکە بۆ خوودی مرۆڤە دەبێت مـرۆڤیش پیـادەی بکات، خۆ دەکـرا هەر لەسـەرەتاوە خـوای پەروەردگـار بـۆ ناسـینی خـۆی جوبریلی بناردایە بەڵام ئێمەی مرۆڤ پێویستە یەکێک لە خۆمان بێت واتـا لەبەنی بەشەر بێـت تـا بۆیـان شـی بکـاتەوە، پاشـان لاسـایی بکەیـنەوە و بیکەینە پێشەنگی خۆمان.

ئەگەر جوبریل یان فریشتەیەکی تـر پێغەمـبەر بـوایە زۆربەی خەڵکـی دەیانوت نوێژمان بۆ ناکرێـت، جیهـاد نـاکەین، هاوکـاری خەڵکـی نـاکەین بەسەروەت و سامان، چونکە ئێمە مرۆڤین ئەوەی ئەو کارەی کرد فریشـتە بوو.

لە ڕاسـتیدا محمـد ﷺ لەخـوودی مـرۆڤە بـۆیە پەیامەکەی پێدا نێردراوە بـۆ ئەوەی هەمـوو وەکـو ئەو لاسـایی بکەیـنەوە کەس نەتوانێـت بڵێـت نـوێژم بـۆ ناکرێـت وەکـو محمـد و هـاوەڵانی و پیاوچاکان هەموو کردوویانە، یاخود جیهاد کردن یان هەر دروشمێکی تری ئەم ئیسـلامە. چـونکە بـۆ مـرۆڤ هـاتووە پێغەمبەرەکەشـی مـرۆڤە. ئەمە



لەلایەک لەلایەکـــی تـــر هەواڵە غەیبییەکـــان و داهاتوەکـــان لەزمـــانی پێغەمبەرەوە ﷺ وەرمانگرتووە تەریـبە لەگەڵ ناسـینی خـــــوای پەورەدگـــــاردا کەواتە شـــــوێنکەوتنی محمـــــد پێغەمـــــبەر ﷺ لەهەمـــوو بوارەکـــانی ژیـــانی مرۆڤـــدا واجـــبە و پێویستە، هەروەکو ئاماژەمان بۆ کرد دەرچـوون نیـیە لە ڕەفتـار و کـرداری عەقڵی مرۆڤ لەبەر ئەوەی خۆی مرۆڤ بووە بەئاسانی دەتوانرێت لاسـای بکرێتەوە و بکرێتە پێشەنگ.

## ناسینی خوا تەریبە لەگەڵ ناسینی ڕۆژی دوایی

ئەم بەشە بەشێکی سەرەکییە لە پاکێجی ئیمان، چونکە زۆرێک بڕوایان بە خواو دین هەیە بەڵام بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نییە.

عەرەبی قوڕەیش بڕوایان بە خوایەک هەبوو لەئاسمان هەروەها خوای تریان دروست کردبوو لەسەرزەوی بۆ ئەوەی نزیکیان بکاتەوە لە خودا.

خوای گەورە لە سورەتی الدخان دا دەفەرمووێت:

﴿ذُرِّيَّةَۢ بَعۡضُهَا مِنۢ بَعۡضٖۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٣٤﴾ (کەچی بتپەرستان) دەڵێن:

﴿إِذۡ قَالَتِ ٱمۡرَأَتُ عِمۡرَٰنَ رَبِّ إِنِّي نَذَرۡتُ لَكَ مَا فِي بَطۡنِي مُحَرَّرٗا فَتَقَبَّلۡ مِنِّيٓۖ إِنَّكَ أَنتَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡعَلِيمُ ٣٥﴾ هەر یەکجار دەمرین و زیندوو ناکرێینەوە.

﴿فَلَمَّا وَضَعَتۡهَا قَالَتۡ رَبِّ إِنِّي وَضَعۡتُهَآ أُنثَىٰ وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا وَضَعَتۡ وَلَيۡسَ ٱلذَّكَرُ كَٱلۡأُنثَىٰۖ وَإِنِّي سَمَّيۡتُهَا مَرۡيَمَ وَإِنِّيٓ أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ

ٱلشَّيۡطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ﴿٣٦﴾ آل عمران. (ئەگەر زیندووبونەوە حەقیقەتە)، باوباپیرانمان کە مردوون بیانهێننەوە ئەگەر ڕاست دەکەن؟!

بەڵام بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نەبوو ئێستاش ئەوانەی بڕوایان بە وەحدەتی وجودە و بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نییە، پێیان وایە کە بزوتنەوەی ژیان دەووریيە و لە مرۆڤەوە بۆ ئاژەڵ، لە ئاژەڵەوە بۆ ڕووەک و پاشان بۆ کانزاکان.هتد.

کەواتە ئیسلام کە ئایینەکەمانە هاتووە لەڕێگای فریشتەیەکەوە بە کتێبێک شیکراوەیە لە تێگەیشتن لە ژیان، مرۆڤ، بوون، خوا. ئەم کتێبە دراوەتە مرۆڤێک ناوی محمدە صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوەیە شیبکاتەوە بۆمان و پێمان بگەیەنێت.

هەموو ئەم کارانە بۆ؟

بۆ ئەوەیە بزانیت کە ژیانێکی تر هەیە بێجگە لەم ژیانە دەگەڕێینەوە چاکە و خراپەمان هەمووی نووسراوە و پاداشتی لەسەر وەردەگرین و کۆتاییەکەی بەهەشت یاخود دۆزەخە.

گەڕان بەدوای ئەم بەشە لە پاکێجی ئیماندا کتێبێکی زۆری لەسەر نووسراوە و بانگخواز و زاناکان قسەیان لەسەر کردووە، لێرەوە بەوە کۆتایی ئەم باسە دەهێنم و دەچمە ناو باسی قەزاو قەدەر.

## تێگەیشتن لە قەزا و قەدەر

قەزا و قەدەر ستراتیژی ئەم گەردوونەیە، مرۆڤ لەسەر بونیادی قەزا و قەدەر کار دەکات، گرنگترین بەشی پاکێجەکەیە. لەبەر ئەوە پرسیارگەلێکی زۆری لێ دەبێتەوە. پێش چوونە ناو قوڵایی باسەکە پێشوەختە



شێکردنەوەیەک لەڕووی زمانەوانی و زاراوەییەوە بۆ قەزا و قەدەر بکەین تاتۆی خوێنەر لێی تێبگەیت.

|| قضاء: بونیاد.

|| قدر: ڕووداو.

|| القضاء القدر: بونیادی ڕووداو.

ئەم بونیادی ڕووداوە لەسەر دوو بنەما دروست دەبێت:

- یەکەم: زانستی خوای گەورە.
- دووەم: ئیرادەی ویستی خوا.

ئەوەی کە چاکە ڕوودەدات لە مرۆڤ خوای گەورە ئەمری پێکردووە، ئەوەی کە خراپە ئەکات مرۆڤە. خوای پەروەردگار هەرگیز ئەمر و فەرمانمان پێناکات کە خراپە بکەین، بەڵکو هەموو خراپەیەک لە خوودی مرۆڤەوەیە. بەڵام خوای گەورە دەیزانێت مرۆڤ ئەو کارە دەکات، لەناو پاکێجی ئیماندا کە قەزا و قەدەری تێدایە خۆی بۆ خۆی قەزا و قەدەر پاکێجێکی تایبەتە لەبەندی دووەم بەدرێژی باسی هەموو پاکێجەکان دەکەم بە پشتیوانی خوای پەروەردگار.

ئەوەی باسمان کرد لەم بەندەدا تەنها شیکارییەک بۆ ئەم ئایەتە:

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ ٢٨٥﴾ البقرة. پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی کە لەلایەن پەوەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خوا و فریشتەکانی و کتێبەکانی و



پێغەمبەرەکانی, وە دەڵێن:)هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان پێغەمبەرانی خوادا.

هەروەها دەڵێن: گوێڕایەڵ و ملەکەچین (بۆ بەدی هێنەرمان)..

پەروەردگارا لێمان خۆش ببە سەرەنجام و گەڕانەوەمان بۆلای تۆیە).



# بەندی دووەم

خوای پەروەردگار لە داهاتووی ئێمە ئاگادارە،
بەڵام قەدر و قامەتی ئێمە باش دەزانێت کە هیچمان
نیشان نادات، چونکە توانای بینینیمان نییە

# کردنەوەی پاکێجی قەزا و قەدەر

قەزاو قەدەر یەکێکە لە زانستە هەرە ئاڵۆزەکانی ئیسلام، ئەگەر سەری داوەکانی نەدۆزینەوە ئەوا هەمووی دەئاڵۆسکێ بەیەکدا و زۆر ئاستەنگ دەبێت جیاکردنەوەی، لەبەر ئەوەی خەت و دەزوولەی زۆرە یەک بەیەک دەبێت بە شوێنیدا بڕۆیت بۆ ئەوەی سەرت لێ تێک نەچێت. لە کردنەوەی دەرگای ئەم قەزار و قەدەرە خوودی مرۆڤەکان ئازاد کراون واتا خوای پەروەردگار مرۆڤی بە ئازادی دروست کردووە.

## ئازادی مرۆڤ

خوای پەرورەدگار کە مرۆڤی دروست کردووە هیچ پێویستی بە مرۆڤ نییە، بەڵکو هەموو مرۆڤەکان پێویستیان بە خوای گەورە هەیە، خوای پەروەردگار مرۆڤی لە هەموو مەخلوقاتەکانی تری زیاتر خۆش دەوێت، هەر بە هۆکاری خۆشەویستی خوایە مرۆڤ بۆتە خەلیفە لەسەر زەویدا، لەوانەیە پرسیارێک بێت بە مێشکی تۆی خوێنەردا بڵێیت ئەی ئەوە نییە خوای پەرورەدگار دەفەرموویت، بۆیە مرۆڤ و جنۆکەم دروست کردووە بۆ ئەوەی بمپەرستن.

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ۝٥٦﴾ الذاريات. (بێگومان) من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە (هەمیشەو بەردەوام) هەر من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

منیش لەوەڵامدا دەڵێم لە فەرموودەی قودسیدا هاتووە خوای گەورە پێویستی بە بەندایەتی مرۆڤ نییە.



ئەمەش لەبەشی ئەم پاکێجەدا زیاتر ڕوونی دەکەینەوە کە چۆن ئەم دوو دەقە تەفسیر بکەین.

کەواتە خوای گەورە بەشێک لە ئازادی و ڕەهایی بە مرۆڤ بەخشیووە و بەشێکی تری وابەستە کردووە بە فەرمانەکانی کۆتا بەشی قەزا و قەدەری خۆی.

تۆی بەڕێزیش دەپرسیت چۆن؟

ئازادی ڕەها لە خواردن و خواردنەوە و کردارو ڕەفتاردا، ئەوەی وابەستەی شەهوەتە وەکو تینوێتی، برسێتی، حەز.هتد.

ئەوەی قەزا و قەدەری خۆیەتی لە دەسەڵاتی تۆدا نییە کوڕی کێیت، یاخود خەڵکی کام وڵاتیت، یان ڕەنگی پێست و ڕەنگی چاو و.هتد.

هەریەک لەم باسانەش مەدلولاتی خۆی هەیە، پەیوەیستە بەبەندایەتییەوە وەکو ملوانکەیە بەدوای یەکدا مووروەکانی هۆنراوەتەوە، من ئازادم لە ڕەفتارم دا، بەڵام ئازاد نیم لەوەی کە هەرگیز نابێت تینووم بێت یاخود برسیم بێت، بەڵام ئازادم لەوەی چی هەڵئەبژێرم بۆ خواردنەوە تا تینوێتییەکەمی پێ بشکێنم بە خواردنەوەی حەڵاڵ یان حەرام، یان چی هەڵدەبژێرم بۆ خواردن تا تێربم ئایا خواردنی حەڵاڵە یان حەرام.

بەڵام کە ئازادی کردوویت هەروا وازی لێنەهێناویت ٤ پێکهاتەی تری لەگەڵ ئازادییەکە پێبەخشیوویت واتا بە ئازادییەوە پێنج پێکهاتەیە.

یەکەم: ئازادی.

دووەم: عەقڵ.

سێیەم: فیطرە.

چوارەم: قورئان.

پێنجەم: پێغەمبەر.

ئەمەش بـۆ ئەوەیە ئـازادییەکەت بەهەڵە بەکارنەهێنیـت و حـوججە و بەڵگە بێت لەسەرت لەڕۆژی قیامەت نەڵێیت نەمزانی.

بۆ نموونە.

لە کردارتـا ئـازادی دزی دەکەیـت، بەڵام هەمـوو خـاوەن عەقڵێـک دەزانێـت دزی خـراپە، ئەگەر عەقـڵ کـوێر بـوو، فیطـرەت کە ئەو جـۆرە هەستەیە لە چاکەو خراپە لەیەک جیادەکاتەوە لەسـەرەتای باسـی عەقڵـدا شیکردنەوەمان بۆ کرد، بەڵام خوودی فیطـرەت واتـا چـاکی و ڕاسـتی. خـۆ ئەگەر خاوەن فیطرەتـی پـاک نەبوویـت پێـوەری قورئـان هەیە بـۆ ئەوەی کاری چەوت و خراپ نەکەیت، ئەگەر وتت نازانم چۆن لە قورئان دا بـاس کراوە لەگەڵ قورئانەکەدا مامۆستایەک نێـردراوە پێغەمـبەرە بە دڵنیـاییەوە شوێنکەوتووی پێغەمبەرانیش لەهەمـوو کـات و سـاتێکدا بوونیـان هەیە و بریتین لە زاناو بانگخوازەکان.

کەواتە تۆی مرۆڤ ئازادی لە هەڵبژاردەی کردار و خـواردن و ڕەفتـارت دا، خوای گەورە تەنها لەسەر ئەوەی ئازادیت پرسیارو لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکات، لێت ناپرسێت تۆ کوڕی کێیت، یان خەڵکی کوێیت، یان بـۆ ڕەشـی یان بۆ سپیت..هتد.

لەوانەیە بپرسیت بۆ ئازادی ڕەهای نەدامێ؟

لەبەر ئەوەیە مافی مرۆڤەکانی ترت پێشێل دەکرد، مرۆڤ ئەو ئـازادییە کەمەی هەیە چ زوڵم و زۆرێک دەکات لەسەرزەویدا.



# کوا دادپەروەری خوایی لەسەر زەویدا

لەباسی ڕابردوودا کۆتایمان بەوەهێنا خەڵکی زوڵم زۆر دەکەن، ئەزانم تۆی بەڕێز لەبیرکردنەوەی ئەوەدا بوویت بڵێیت، باشە کوا دادپەروەری خوایی. کەسێک هەزارە ئەوی تر دەوڵەمەند، کەسێک دەگری یەکێکی تر قاقای پێکەنین لێئەدات. منداڵ لە هەندێ جێگادا لەتاو برسێتی دەمرێت لە بەرچاوی دایک و باوکی، منداڵی واش هەیە نزگەرەی تێری لێ دەدات. لە جێگایەک ئاو نییە، لە شوێنێکی تر باوبۆرانە لە جێگایەک بورکانە، لە شوێنێکی تریش لە قەراغ دەریا خۆشی و شادی و مەلەکردنە. کەسێ تووشی شەلەل دەبێت، کەسێکی تر تووشی سەرەتان بووە و ئەوی تر هیچ کێشەی نییە کوا دادپەروەری خوایی؟

لەڕاستیدا ئەم پرسیارە جەوهەری قەزا و قەدەرە، چونکە بە دڵنیاییەوە دادپەروەری خوای گەورە لەسەر زەوی لەم کاتەدا جێی باس نییە، چونکە دادپەروەری خوایی لەجێبەجێ کردنی قورئان و شەریعەتەکەیدایە. خۆ ئەگەر بهاتایە خوای گەورە دادپەروەری خۆی لەم جیهان و سەرزەویەدا بچەسپاندایە بێ ئەوی مرۆڤ هیچ ڕۆڵێکی هەبێت ئەوا نە بەهەشت دەما و نە جەهەنەم، ئەوکات هەموو وەکو فریشتە کارمان دەکرد کەس زوڵمی لەکەس نەدەکرد و خراپەکاری نەدەما.

خوای پەروەردگار بۆیە ئازادی داوە بە مرۆڤ و عەقڵ و فیطرەت و قورئان و پێغەمبەری بۆ ناردووە تاکو دادپەروەری خوایی لەسەر زەویدا بچەسپێت، کەسێک ئەبێت بەرنامەکە پیادە بکات بە دڵنیاییەوە بەرەی شەیتان و خراپەکاری دەسەڵاتدارن، چۆن برسێتی دروست نابێت لە ئوستورالیا و ئەمەریکا ساڵانە ملیاردەها تەن برنج فڕێدەدرێتە ناو زەریاکانەوە بۆ ئەوەی نرخی برنجەکەیان دانەبەزێت، لە ئوستوڕالیا ملیۆنەها وشتر و مەڕ و گیانداریماڵی کە بۆ خواردن دەشێت فڕێ

دەدرێـت بـۆ ئەوەیە نرخـی دانەبەزێـت، ئەو هەمـوو دەسـەڵاتدارە دزە لەسەر زەوی کانزا و نەوت دەفرۆشن و خەڵکەکەشیان برسییە، ئەو هەموو کۆمپانیـای دەرمانسـازییە سـاڵانە بەرهەمیـان هەیە، ئەی نابێـت ڤـایرۆس بڵاوبـــکەنەوە لە ڕێگـــای چەک و تەقەمەنیـــیەوە بـــۆ ئەوەی بەهـــای دەرمانەکانیـــان بەســـەر نەخۆشـــەکاندا ســـاغ بـــکەنەوە، بەدڵنیـــاییەوە دادپەروەری خـوایی لەسـەرزەوی وەکـو ئەوەی مـرۆڤ بیـری لێـدەکاتەوە خۆی حوکم بکات وەک مێتۆدی ڕۆژی قیامەت، شتی و انیـیە لەسـەرزەوی بـــۆیە بەرنـــامە و شـــەریعەت، عەقڵ..هتـــد بەخشـــیوە بە موســـوڵمان و کـردویەتییە خەلـیفە دەبێـت ئەوان دادپەروەریـیەکە بچەسـپێنن، دەبێـت موسوڵمان هەڵسێت بەو کارە و شـۆڕش و جیهـاد بکـات تـا مرۆڤـایەتی لە زوڵمی سەرمایەداری چاوچنۆکی بەمیکیاجی دیموکراتی کە مرۆڤ هەرزان فرۆش دەکەن، کۆمپانیا زەبەلاحەکانیان خەڵکـی بەکـاردەهێنن لەکۆتاییـدا وزە و تواناکانیان دەبەن، سوننەتی ژیان هەڵدەوەشێنن، ناوچەیەک برسـی دەکەن کاری تێدا ناهێڵن شـەڕ و ئـاژاوە و پشـێوی دەخەنە نـاو خەڵـک و وڵات بـۆ ئەوەی هەمـوو هیجـرەت بـکەن، بـۆلای زاڵـم و خوێنمژەکـانی سەرمایەداری دیموکراتی و کۆمەنیستی چین و هەموو بەرنامەکانی مرۆڤ بەرهەمی هێنـاون. لێـرەدا کێشـەکە لە دادپەروەری خواییـدا نیـیە، بەڵکـو کێشـــەکە لە زوڵـــم و زۆرداری مـــرۆڤ دایە، کە بەپێـــی ســـتراتیژی کەون کارناکات و لە قەزا و قەدەری خوایی تێناگـات، کەچـی داوای دادپەروەری خـوایی دەکـات. لە قیـامەت دادپەروەری ڕەهـای خـوایی هەیە، چـونکە ڕاستەوخۆ خۆی زاتی پاکی حوکمڕانە بۆیە سیفاتی (العدل، القاسط) هەیە و زوڵم لەکەس ناکرێت.

ئەوانەشـی لە بنەڕەتـدا تووشـی نەخۆشـی و شـەلەل دەبـن واتـا لە زگـماکەوە نەخۆشـن، پێویسـتە مرۆڤـایەتی عەقڵیـان وەگەڕبـخەن بـۆ



دۆزینەوەی زانستی تەندروست، ئەمەش هانی خەڵکیە بۆ زانست و دۆزینەوەی زانیاری نوێ.

کەواتە دادپەروەری خوایی لەسەرزەویدا بەو مانایە نیە کە چاوەڕێی بین مرۆڤەکان هەموو وەکو یەکیان هەبێت، بەڵکو لە سیستەمەوە دادپەروەری ڕووئەدات ئەوکاتە شەریعەتی خوای پەروەردگار پیادە دەکرێت ئەمەش مانای ئەوە نییەکە لە سەرزەویدا بوونی نەبوو، بەڵکو پیادەی شەرع کراوە و ڕوویداوە، نموونەش زۆرە لەوانە لە سەردەمی (عمری کوڕی خطاب، عبداللەی کوڕی زوبیر، عمر کوڕی عبدالعزیز، هارونە ڕەشید، عبدالرحمن کوڕی معاویە، عبدالرحمن کوڕی سلیمان، عبدالرحمن ناصر، یوسفی کوڕی تاشفین، نظام الملک، سلیمان قانونی و سەلیمی باوکی، محمد کوڕی خەواریزمی شاهی طاجیکستان..هتد).

کەواتە مانای ئەمەیە کە دەڵێن پیادەکردنی شەرعی خوا داهێنانی دادپەروەرییە، چونکە ئەزموونی هەزار ساڵمان لەبەردەم دایە.

بەڵام کێشەکە لەوەدایە مرۆڤەکان کاتێک هەڵبژاردەی شەریعەتیان کردووە و هەست بە گەورەیی خۆیان ناکەن خوای گەورە کردوونی بە خەلیفە لەسەرزەوییدا، لەوانەیە تۆی خوێنەر پرسیار بکەیت بڵێی خەلیفە واتای چی؟

پرسیارێکی گرنگە و پێویستە مرۆڤ هەستی خەلیفە بوونی بۆ دروست بێت تاکو بتوانێت پیادەی شەریعەتی خوای گەورە بکات.

## خەلیفە و جێنشینی یاساکانی خوا لەسەرزەوی

خوای پەروەردگار مرۆڤی دروست کرد بەهۆکاری عەقڵ و وەرگرتنی زانست ڕێزی لێناوە، فریشتەکانیش ڕێزیان گرتووە. ئادەم یەکەم مرۆڤی عاقڵ و پێغەمبەرە خوای گەورە لەسەر زەویدا کردویەتییە خەلیفە، ئادەم -علیه السلام- خوای گەورە بۆ جێنشینی کردنی یاسای خۆی لەسەر زەوی دروستی کردووە و، خوای گەورە لە سورەتی البقرة ئایەتی ٣٠ دەفەرمووێت:

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة. (وەبیریان بێنە) کاتێک پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: من لە زەویدا جێنشینێک دادەنێم (تا زەوی ئاوەدان بکاتەوە). فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێ تیایدا دەکەیتە جێنشین کە خراپە و تاوانی تیا بکا و خوێن ڕێژیی تیا ئەنجام بدات؟! لە کاتێکدا ئێمە (شایستە ترین) قەدری تۆ بەچاکی دەزانین، (لە وەڵامیاندا) خوا فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

خەلیفەش واتا جێگرەوەی پیادەکردنی حوکم و فەرمانڕەوایی خوا لەسەرزەوی لەڕێگای ئەو وەحییەوە کە دەینێرێت، بەشێکی یاساییە ناونراوە بە شەریعەت.

شەریعەت لە زمانی کوردیدا واتا سەرچاوەی سەرەکی یاخود سەرچاوەی بنەڕەتی یاسا، لەڕووی زاراوەشەوە بەمانای ئەوە دێت کە مادام خوای گەورە مرۆڤی دروست کردووە هەر ئەویش دەزانێت چ یاسایەک باشە بۆ ئەوەی پیادەی بکات، کەواتە بێجگە لە خوای پەروەردگار هیچ کەس حەقی دانانی یاسای نییە.



له ئادەمەوە تاکو خاتەم واتا کۆتـا پێغەمـبەر کە نـاوی محمـدی کـوڕی عبداللەیە صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ یەک دینیان هەبووە ئەویش ناوی ئایینی ئیسلام-ە، تەنها لە ڕووی یاسـاوە واتـا شـەریعەتەوە جیـاوازییەک هەبـووە بەگوێرەی سەردەمەکان شەریعەتەکان گۆڕاون.

لەوانەیە تۆی خوێنەر پرسـیارێک لە مێشـکتدا دروسـت بێـت و بڵێیـت باشـــە ئەم ســـەردەمە جیـــاوازە لەگەڵ ســـەردەمی پێغەمـــبەر محمـــد صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ باشتر نییە مرۆڤەکان خۆیان یاسا بۆ خۆیان دابنێن؟

لە ڕاستیدا دەڵێین خوای گەورە یاسا دانەرە مانای وانیـیە بـۆ یاسـاکانی هاتوچۆی سەیارە، دەبێت لە قورئانەوە وەریبگرین، نا-بەڵکو مەبەسـت لە دەستوری دەوڵەتە لە بنەمای یاسایی شەریعەت دەبێت چـونکە هەنـدێک یاسا هەیە مرۆڤ دەتوانێت خۆی دایبنێ ئەمەش ئەو ڕێزەیە خـوای گەورە لەمرۆڤی ناوە بەهۆکاری عەقڵ و زانستی.

کەواتە دانانی یاسا بنەڕەتییەکان لەلایەن خواوە دەبێت، پاشان ئاراستە و تەعلیماتی ڕۆژانەی مرۆڤ دایدەنێ وەکو ئەو هەموو کتێبە فیقهیەی لە بەردەست دایەو زانا و شەریعەت ناسەکان دایانناوە.

زۆرێک وا دەزانن دانانی یاسا هەروا شتێکی سادەیە لەکاتێکـدا ئیسـلام بنەمای دەستوری داڕشتووە هەموو دەوڵەتەکانی دونیـا بەکـاری دەهێـنن، ئەویـش بنەماکـانی فیقهـە (أصـول الفقـه) کە ئیمامـی شـافیعی تەدوینـی کردووە سەرچاوەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

خـوای گەورە هەمـوو ئەمـانەی بـۆ مـرۆڤ دەسـتەبەر کـردووە، بەڵام ئازادیشی کـردووە لەهەڵبژاردنیـدا، چـونکە مێتـۆدی ژیـان وایە لەبەرئەوە گەڕانەوە هەیە بـــۆ ڕۆژی دوایـــی حەق و حیســـاب و پاداشـــت و ســـزا وەردەگرێت لەسەر کردەوەکانی.

وابزانم مێشکت جەنجاڵ بوو بە باسەکان لەوانەیە بپرسی جـا مـن ئەم هەموو بێنەو بەردەیەم لەکوێ پێ دەکرێت، بۆ ئەم ئەرکە گەورەیە لەسەر شانمان دانراوە کە توانای چارەسەرکردنیم نییە بەتەنها؟

لەوەڵامدا دەڵێین ئەوەنـدەی لەتواناتـدایە ئەنجـامی بـدە، کەس داوای دامەزراندنی خیلافەتی لێ نەکردوویت. ئەوەندەی دەتوانیت بـانگەواز بـۆ دینی خوا و شەریعەتەکەی بکە، بەڵام پێش وەخت پێویستە خۆت شـارەزا و لێـزان بیـت لەبوارەکـانی ئـایین دا. چ لە قورئـان و فەرمـوودە و فیقهـی ئیسلامی و زۆرێکی تر لە زانستەکان لەسەر هەموویانەوە عەقیدە.

دەشێت بپرسیت بانگەوازی بۆ چییە دینی خوا، ئایا بـانگەواز پێویسـت و واجبە لەسەرمان؟

## ئایا بانگەواز بۆ دینی ئیسلام پێویستە؟

یەکێکە لە پرسە هەرە گرنگەکانی ئایینی ئیسلام، لە ڕاستیدا وەکو نـوێژ و زەکـات و ڕۆژ و حەج واجـبە لەسـەر هەمـوو موسـوڵمانێک بەگـوێرەی توانای خۆی و زانستی مرۆڤەکە.

بانگەواز جۆری زۆرە سەرەتاکەی بەدڵ دەست پێدەکات و پاشان وتە و ئینجا دەست و لاشە.

بانگەواز بە دڵ: ئەم جۆرە لە کاتێکدایە هیچ دەسەڵاتێک نییە خەڵکـی قسە بە خوا و بە دیـن و پیرۆزییەکـانی ئیسـلام دەڵێـت، لەدڵەوە دەبێـت پێتناخۆش بێت. ئەم جۆرە بانگەوازە لاوازترین جۆری بانگەوازە خـۆ ئەگەر بە دڵ پێت ناخۆش نەبوو ئەوا بزانە ئیمان لە دڵتا نییە و پەنا دەگرم بەخوا لە کافر بوون.



بانگەواز بە وتە: دەکرێت ئەم جۆرە بانگەوازە نـاوی بنێـین مامناوەنـد کە وتنی وشەی حەق لەبەرانبەر دەسەڵاتداری زاڵم و حاکمە ملهوڕەکانـدا بڵێیت، یاخود دەشێت بە نووسین  بێت لەهەر جێگاو لایەکی تەکنەلۆجی و پەڕا و گۆڤار و تیڤی و تۆڕی کۆمەڵایەتی.هتد.

جۆری کۆتایی لە بـانگەواز بە لاشـە و گـۆڕینە بەدەسـت، ئەم جـۆرەش بەرزتـرین پـلەیە لە ئیمانـدا، بەڵکـو بەرزتـرینە لە ئیسـلام دا کە جیهـاد و خەبات و شۆڕش بکەیت دژی زاڵم و خوانەناس و ئەوانەی پێشـێلی مـافی موسوڵمان و مرۆڤ دەکەن، لەئاستی ئیسلام و شەریعەت دا دەم درێژن و پێویسـتە وەڵامبـدرێنەوە و بوەسـتێنرێن بـۆ ئەوەی ئەو جورئەتەیـان بـۆ دروست نەبێت.

ئەم سێ جۆرە بەگوێرەی قۆناغی توانای موسوڵمان کاری پێ دەکەن کە خاوەن هێز و دەسـەڵات بـوو، دەبێـت هێـز و سـەروەرییەکانی بپـارێزین، وەکو هەموو دەوڵەتێکـی خـاوەن هێـز و سـەروەری یاسـا و پیرۆزیەکـانی وڵاتەکەی دەپارێزن.ئەوەندەی لە توانـا و دەسـەڵاتی موسـوڵمان هەیە بـۆ بانگەوازکردن بە گشتی.

تـا بـانگەواز بەردەوام نەبێـت موسـوڵمانان سـەرناکەون، لەهەمـوو بوارەکاندا موسوڵمانان سەرەتا  بانگەوازیان دەست پێکرد لە ڕووی سیاسی و سـەربازییەوە توانییـان دوو ئیمپراتـۆریەتی گەورەی جیهـان بـخەنە ژێـر ڕکێفی خۆیان، بەردەوام بوون لەبانگەواز مـاوەی ١١٠٠ سـاڵ موسـوڵمانان خـاوەنی ملیۆنەهـا کتێبـی پڕ لە زانسـت بـوون بـۆ جیهـان، کەوازیـان لە بـانگەواز هێنـا بـوونە ژێردەسـتە و هەر خوانەنـاس بـوو زرتەبـۆر بـوون بەسـەریانەوە هەرچـی خوانەنـاس هەیە حـوکمی موسـوڵمانان دەکەن، خۆشی هیچی پێ ناکرێت، هۆکارەکەش وازهێنانیان بوو لە بانگەواز.

ئەم باسە فەرموودەیەکی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ ی پاڵپشتە کە دەفەرموویت:

عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال سمعت رسول الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ يقول: من رأي منكرا فليغيره بيده، فإن لم يستطع فبلسانه فإن لم يستطع فبقلبه و ذالک اضعف الإيمان.[٢]

ئەبی سەعیدی خدری -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- دەڵێت گوێم لێبوو پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمووی: هەرکەس خراپەیەکی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بە زمانی بیگۆڕێت، ئەگەر نەیتوانی با بەدڵ پێی ناخۆش بێت، کە ئەوەش لاوازترین پلەی ئیمانە.

لەوانەیە پرسیارێک بێت بە مێشکتدا و بڵێی بانگەواز واتای جیهادە؟

بەڵێ، هەرشتێک چالاکی و بانگەشەی ئایینی ئیسلام پێی دەوترێت جیهاد، بە کوردی کۆشش و خەبات.

## جیهاد چییە؟

جیهاد تا ڕۆژی قیامەت هەیە و بەردەوامە هەر موسوڵمانێک لە نیەتی دا نەبێت بڕوات بۆ جیهاد پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرموویت: مونافیقە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢] رواه مسلم.



خوودی جیهادیش چەند جۆرێکە بریتین لە (جیهادی نەفس، جیهادی شەیتان، جیهادی قسەی حەق بەرانبەر دەسەڵاتی زاڵم، جیهاد بە چەک و هێز).

مرۆڤی موسوڵمان دەبێت بزانێت هەر دەمرێت و بۆی دیاری کراوە کە دەمرێت، ئیتر نابێت لە ئازایەتی و سەربەرزی بترسێت، چونکە تەمەنی بەترسنۆکی زیاد ناکات، بەئازایەتیش کەم ناکات کەواتە هەموو مرۆڤێک هەڵنابژێرێت ئەگەر بە نیەتیش بووە لە دڵیدا، تا خوای گەورە پلەی شەهیدی بکاتە نسیبی لە دوای پێغەمبەران شەهیدان لە پلەبەندی جیهاد خاوەنەکەی سەربەرز دەکات لە دنیاو قیامەت دا، هەرکەس لە جیهاد دا چاونەترس و ئازا بوو تەمەنی درێژە ئەوەش قسەی ئەبوبەکری صدیق -ڕەزامەندی خوای لەسەر بێت- کەواتە مرۆڤ مردنێک قەرزارە و هەر دەمرێت و بۆی نووسراوە کەی دەمرێت، بەڵام ئازادی لەهەڵبژاردنی جێگاکەیدا لەسەر جێ یان لە پێناوی خوادا یان لە پێناوی خەڵکی و یاسایی طاغوت دا.

دەزانم ئێستا پرسیارێک بە مێشکتدا دێت و دەڕوات و دەڵێیت: تۆ وتت ئازادیت، ئەی چۆن مردنمان بۆ نووسراوە واتا لەناو چاوم نووسراوە؟

پرسیارێکی باش و لە جێگای خۆیدایە، بەڵێ هەموو شتێک لای خوای گەورە زانراوە و نووسراوە، نەک بە واتای ئەوەی خوای گەورە لەناوچاوی نوسیبێتی و ئیجباری کردبیت، بەڵکو بەوەی کە خوای گەورە لەم بوونەدا ڕابردوو، ئێستا و داهاتوت لای ئەو زانراوە، جا ئەگەر پەروەردگار توانای ئەو زانینەی نەبێت کەی بە پەروەردگار هەژمار دەکرێت، بۆیە خوای پەروەردگار دەزانێت چی دەکەین و بەتەمای چین و دەشزانێت پێش و داهاتوو چی دەکەیت ئەوە مانای قەزا و قەدەری خواییە.



## لەناوچاوم نووسراوە کە چاکە و خراپە بکەم؟

فەرمـوودە زۆرە لەوبـارەیەوە، بەڵام یەک فەرمـوودە هەمـوو باسـەکە ڕوون دەکاتەوە.

ئیمامی بوخاری لە علی کوڕی ئەبو طـالیبەوە دەگێـڕێتەوە: تەرمێکیـان برد بۆ گۆڕستانی بەقیع، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ تەشریفـی هێناو لە لێـواری قەبرەکەیـدا دانیشـت و ئـێمەش بە دەوریـدا دانیشـتین، چیلکەیەکـی بە دەسـتەوە بـوو لە زەویەکەی دەخشـاند و فەرمـووی: (هەرکەس لە ئێوە لە دایک دەبێت خوای گەورە دەزانێـت و نووسـیویەتی ئەهلی بەهەشـتە یـاخود دۆزەخ، دەزانـێ و نووسـیویەتی سـەرەڕۆیە یـان چاکەخوازە).

پیاوێـک لە ئامـادەبووان پرسـی: (ئەی پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ جا کەمادام وایە با پشت ببەسـتین بەو نووسـینەی لەسەرمان نووسراوە و واز لە کردار بهێنین).

هەرکەس لە ئێمە ئەهلی خۆشـی و شـادی چاکەکـاری بێـت ئەوا بـۆی نووسراوە کە ئەهلی ئەو ڕێگایە و چاکەکارە، خـۆ ئەگەر لە ئەهلـی خـراپە کاریش بێت هەر بۆی نووسراوە، ئیتر چی پێویست دەکـات خـۆی مانـدوو بکات ئەوە ئەهلی دۆزەخە.

لەوەڵامدا پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمـووی: ئێـوە کـار بکەن، هەریەک لە ئێـوە ئـەو کـارەی ئەیـەوێت بـۆی ئاسـانکراوە، ئەهلـی خۆشی و چاکەخواز و بەهەشـت کاردەکـات بـۆ بەهەشـت و خۆشـی ئەو دونیـای، ئەوەی ئەهلـی سـەرەڕۆیی و خراپەکـارییە کـار بـۆ ئەم دنیـایەی



دەکـات وخەریکـی خـراپە کـارییە و لەو دنیـا ئەهلـی دۆزەخە، ئینجـا پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ ئەم ئایەتانەی بۆ خوێندەوە..

﴿فَأَمَّا مَنۡ أَعۡطَىٰ وَٱتَّقَىٰ ۝٥﴾ جا ئەوەی دەبەخشێت و پارێزکارو لە خوا ترسە.

﴿وَصَدَّقَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٦﴾ بڕوای پتەوی بە پاداشتی چاک و بە نرخی خوایی هەیە.

﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡيُسۡرَىٰ ۝٧﴾ ئەوە ڕێگەی چاکەو چاکە کاری بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام دەیخەینە خێرو خۆشیەوە.

﴿وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسۡتَغۡنَىٰ ۝٨﴾ بەڵام ئەوەی ڕەزیل و دەست نوقاو بێت و خۆی بێنیاز بزانێت و (ڕەزامەندی خوای مەبەست نەبێت).

﴿وَكَذَّبَ بِٱلۡحُسۡنَىٰ ۝٩﴾ وە بڕوای نەبێت بە پاداشت و بەهرەی چاکی خوایی و بە درۆی بزانێت.

﴿فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلۡعُسۡرَىٰ ۝١٠﴾ الليل. ئەویش ڕێبازی تەنگانەو ناخۆشی بۆ ئاسان دەکەین و سەرئەنجام بە دۆزەخی دەگەیەنین.

دەقی فەرموودەکەی کە لەسەرەوە ئاماژەمان پێدا دەفەرمووێت:

عن عليٍّ بنِ أبي طالبٍ قالَ كنَّا في جنازةٍ في بقيعِ الغرقدِ قالَ فأتى رسولُ اللَّهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ فقعدَ وقعدنا حولَهُ ومعَهُ مِخصرةٌ فنَكسَ رأسَهُ وجعلَ ينكتُ بمخصرتِهِ ثمَّ قالَ ما منكم من أحدٍ من نفسٍ منفوسةٍ إلَّا وقد كتِبَ مَكانُها منَ الجنَّةِ والنَّارِ وإلَّا قد كتِبت شقيَّةً أو

سعيدةً فقالَ رجلٌ يا رسولَ اللَّهِ أفلا نتَّكلُ على كتئيبنوا وندعُ العملَ فمن كانَ منَّا من أَهْلِ السَّعادةِ فسيصيرُ إلى عملِ أَهْلِ السَّعادةِ ومن كانَ من أَهْلِ الشَّقاءِ فسيصيرُ إلى عملِ أَهْلِ الشَّقاءِ فقالَ اعمَلوا فَكلٌّ ميسَّرٌ لما خُلِقَ لَهُ أمَّا أَهْلُ السَّعادةِ فيُيسَّرونَ لعملِ أَهْلِ السَّعادةِ وأمَّا أَهْلُ الشَّقاوةِ فيُيسَّرونَ لعملِ أَهْلِ الشَّقاوةِ ثمَّ قرأَ فَأَمَّا مَنْ أَعْطَى وَاتَّقَى وَصَدَّقَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْيُسْرَى وَأَمَّا مَنْ بَخِلَ وَاسْتَغْنَى وَكَذَّبَ بِالْحُسْنَى فَسَنُيَسِّرُهُ لِلْعُسْرَى.

کۆتا وتە لەم بارەیەوە ئەوەیە وشـەی (کتـب) بـۆ پەروەردگـار بەواتـای (علــمە) واتـا زانـین، مانـای وانیـیە ئەوەی خـوای پەروەردگـار دەیزانێـت واتاکەی ئەوەبێت نوسیبێتی لەسەرت بو ئیجبـاری و مەجبـورت بکـات بـۆ ئەوەی  ئەو کارە بکەیـت، نـا ئەوە خـۆتی هەڵیـدەبژێریت، بەڵام ئەو زاتە خوایە و ئاگادارە بەسەر هەموو دروستکراوەکانییەوە، ڕابردوو داهـاتوو بـۆ ئێمەیە لای خوای پەروەردگار کات نییە، ئەوە ئێمەین دەڕۆین نەک کات.

هەروەهـا لە فەرمـوودەی تـردا هـاتووە خـوای پەروەردگـار هەمـوو کۆرپەلەیەک فریشتەیەکی بۆ تەرخان کردووە لە سکی دایکی دا لەمـاوەی دیاری کراودا دوای ٤٠ ڕۆژ خوای گەورە لە دۆسیەیەکدا فریشتەکە ئاشـکرا دەکـات کە توانـای ڕزق و ڕۆزی چەنـدە کە پەیـدای دەکـات لە حەڵاڵ و حەرام.

یاخود چەند تەمەن دەکا کردەوەکانمان کـردەوەی چـاک و خـراپ یـان ئەهلـی بەهەشـت یـاخود دۆزەخ، نێـر یـان مـێ. ئەمەش لە ئەنجـامی کــردنەوەی دۆســیەو مەلەفــی ئەو کــۆرپەلەیە کە فریشــتەکە وەکــو

سەرەتایەک دەبینرێت، بەڵام زانینەکەی لای پەروەردگارە نەک سەپێنرابێت بەسەر ئەو کۆرپەلەیەدا دەبێت یان ئەهلی بەهەشت بێت یان دۆزەخ.

بیرۆکەی باوەڕی سەپاندن لە ئەهلی سونەت و جەماعەت دا نییە (عقيدة الجبرية) پەنا بەخوا، خوای گەورە کاری خراپە ناسەپێنێت بەسەر هیچ دروستکراوێکیدا، ئەوە مرۆڤەکانن بەئازادی خۆیان کارەکانیان هەڵدەبژێرن، بەڵام خوا زانایە بەسەر هەموانەوە.

دەقی فەرموودەکە..

عَنْ أَبِي عَبْدِ الرَّحْمَنِ عَبْدِ اللَّهِ بنِ مَسْعُودٍ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وَهُوَ الصَّادِقُ المَصْدُوقُ، قَالَ: "إِنَّ أَحَدَكمْ يُجْمَعُ خَلْقُهُ فِي بَطْنِ أُمِّهِ أَرْبَعِينَ يَوْمًا نُطْفَةً، ثُمَّ يَكونُ عَلَقَةً مِثْلَ ذَلِك، ثُمَّ يَكونُ مُضْغَةً مِثْلَ ذَلِك، ثُمَّ يُرسَلُ إِلَيهِ الْمَلَك فَيَنْفَخُ فِيهِ الرُّوحُ وَيُؤْمَرُ بِأَرْبَعِ كلِمَاتٍ: بِكتْبِ رِزْقَهِ وَأَجَلِهِ وعَمَلِهِ، وَشَقِيٌّ أَوْ سَعِيدٌ، فَواللهِ الَّذي لا إِلَهَ غَيرُهُ إِنَّ أَحَدَكمْ لَيَعْمَلُ بعملِ أهلِ الجَنَّةِ حَتَّى مَا يَكونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَها إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ النَّارِ فَيدخُلُهَا، وإِنَّ أحدَكم ليَعْمَلُ بعملِ أهلِ النَّارِ حَتَّى مَا يَكونُ بَيْنَهُ وَبَيْنَها إِلَّا ذِرَاعٌ، فَيَسْبِقُ عَلَيْهِ الكتَابُ، فَيَعْمَلُ بِعَمَلِ أَهْلِ الجَنَّةِ فيَدخلُها.

هەموو ئەمانەی باسمان کرد لە پاکێجی قەزا و قەدەردایە، قەزا و قەدەر دنیایەکی پڕ نهێنییە، مەرج نییە بتوانین هەموو نهێنییەکان ئاشکرا بکەین، چونکە ڕەوەند و جیلی تر ماوە بێن، هەواڵەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوانیش دەقە موتەشابیهەکانیان جێهێشت بۆ جیلەکانی دوای خۆیان ئەوانیش بۆ جیلی دوای خۆیان.

لەوانەیە تۆ پرسیارێک لەمن بکەیت بڵێیت باشە نەدەکرا پرسێکم پێ بکرایە بۆ هاتم بۆ ئەم ژیان و جیهانە، کێ دەڵێت من ڕازی دەبووم بە هاتنم؟

## بۆچی پرسم پێنەکرا کە دێم بۆ ئەم ژیانە؟

لەڕاستیدا زۆرێک لە خەڵکی ئەم پرسیارە دەکەن، لەکاتێکیشدا ئەم پرسیارە ڕووبەڕووی خۆیان دەکەنەوە تووشی ناڕەحەتیەک دەبن و توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆیان نییە.

ئیتر بە هۆکاری دەستەوسانی خۆیان ئەم پرسیارە دەکەن لەمەئیوس بوونیان لەچارەسەر، ئەمەوێت بڵێم باشە خۆ هەر هاتوویت لەگەڵ واقیعەکەدا بژی.

بڕواناکەم ئەو وەڵامە جێگای ڕەزامەندی ئەو خەڵکە بێت کەوا دەڵێن، بەڵکو ئارگۆمێنتی زیاتریان دەوێت، مرۆڤ کاتێک لە نەبوونەوە دێت بۆ بوون هەر مرۆڤێک بێت ئەمە نیشانەی خۆشەویستی خوایە بۆی.

با گریمانێک بێنین و بڵێین لەنەبووندا بن، خوای گەورە دەفەرمووێت: فڵان ئامادەیت بێیت بۆ ژیانێک کە هەتا هەتایە دەمێنێتەوە، بەڵام قۆناغ دێت بەسەر ژیانتا لە دونیادا ژیان بەسەر دەبەیت، ژیانی یەکەم ئازادیت لە کردارەکانت، ئەگەر چاکەت کرد پاداشتی لەسەر وەردەگری خراپەش بکەیت پاداشتەکەی سزایە. پاشان بەهەشت هەیە و جەهەنەم هەیە، دایک و باوکت هەیە، خزم و کەس وکارت، ژیان، چوار وەرزە لە منداڵییەوە دەست پێدەکات بۆ پیری و مردن کە قۆناغی یەکەمە. پاشان قۆناغی دووەم لە تەمەنێکی لاویدا بۆ ژیانێکی ئەبەدی زۆری تریش لەم ڕوونکردنەوانە. تۆش لە نەبوون و عەدەم دایت هیچت نییە، خاوەنی هیچ



نیت، ئەو جێگـایەش ترسـناکە، چـونکە عەدەم تەنـانەت مولحیـدیش لێـی دەترسێت، مولحید بڕوای بە هیچ نییە لە جادەیەک دەپەڕێتەوە چەند جار سەیری ئەملاو لای خۆی دەکـات، چـونکە ئەو بـڕوای بە زینـدوو بـوونەوە نییە، بڕوای وایە کۆتـایی دێـت و دەگەڕێـتەوە بـۆ عەدەم، عەدەم هیچـی تێدانییەو بەتاڵ و بۆشە!

وەڵامەکە: هەموو کەس بێ دوو دڵی هەڵیدەبژێرێت، چونکە هاتن بـۆ ژیـان ئیمتیـاز و جێگـای ڕێـزە، دەی کە هاتوویـت ئەوەی باسـمان کـرد هەمووی هەیە و واقیعیە بەدەستی بهێنە بە چاکە.

## مردن چییە؟

گۆڕانکاری قۆناغێکی ژیانە بۆ ژینێکـی تـری کـاتی ژیـانی یەکەم نـاوی ژیانی سەرزەوییە، دووەم قۆناغ ژیانی ژێرزەوی و بۆ ژیانی ڕۆحەکـان. ئەم دوو جیهـانە یەکەمیـان ئەوەیە ئێسـتا تێیـدا دەژیـن، ئەوەی ژیـان لەنـاو گۆڕەوە بۆی دەڕۆین کە ژێر خاکە.

مرۆڤ پێکهاتووە لەچوار بەش (ڕۆح، لاشە، عەقڵ، نەفس) لاشەو عەقڵ هـاوڕێی گیـانی بەگیـانین، ڕۆح و نەفـس ئەوانـیش هەروان. لەکۆتاییـدا هەموو پەیوەندیەکی توندوتۆڵیان بەیەکەوە هەیە.

کە ڕۆح دەرچوو لە لاشـە، عەقـڵ و نەفـس کاریـان نامێنێـت، ڕۆح ئەو نهێنیـیە گەورەیە تەنـانەت پێغەمبەرانـیش نەیـانزانیووە، کەواتە هەرچـی لەسەر بڵێین وانییە، لەبەر ئەوە یەکێکە لە نهێنیەکانی ئەم بوونە کە خوای گەورە دەیزانی و بەس.

لاشە دیارە کە پێویستی بە خواردن و وەرزشە، خۆراکی ڕۆح بەندایەتی و زیکر و یادی پەروەردگـارە. عەقـڵ بـۆ تێرکردنـی پێویسـتی بە زانیـاری و

زانستە، نەفس خۆویستە هاوکاری شەیتانە، ئەگەر وەرزشی پێنەکەین و پاکی نەکەینەوە بە ئیخلاص و صەبر خۆساغ کردنەوە بۆ قیامەت، بۆ خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی ئەوە زۆر ترسناکەو مرۆڤ بەرەو هەڵدێر و نەهامەتی و کوفر دەبات. نەفس سێ جۆرە:

نەفسی پیس و خراپ: کە خۆویستەو هەموو شتێکی بۆ خۆیەتی.

نەفسی لۆمەکار: خاوەنەکەی خراپە، بەڵام دوایی لۆمەی خۆی دەکات.

نەفسی هێمن: خواناس و لەسەرخۆ و چاکەکارە.

کە ڕۆح کۆتایی هات لە لاشە هەمووی دەوەستێت، بەڵام ڕۆح دنیای تایبەتی خۆی هەیە، تا ڕۆژی قیامەت دەڕواتە ئەو جێگایەی ناوی دنیای بەرزەخە.

هەموو مرۆڤێک دەبێت بمرێت (كل نفس ذائقة الموت)، بەڵام سەرەتای مردن بۆناو بەرزەخە لەوێ لێپێچینەوەیەکی کورت دەست پێدەکات کە ئامادەکارییە بۆ ڕۆژی دادگایی خوای لەلایەن زاتی پاکی خوداوە. ئەم تەحقیق و لێپێچینەوەیە لەلایەن دوو فریشتەوە بەناوەکانی (نەکیر و مونکیر) دەکرێت.

ئەگەر لە لێپێچینەکەدا سەرکەوتوو بوویت ئەوا لە قیامەت دا دادگاییەکەت ئاسان دەبێت.

خۆئەگەر لێپێچینەوەکەت سەخت بوو و تاوانبار کرایت، ئەوە لەدادگادا مەلەفت هەڵدەدرێتەوە، ئەگەر موسوڵمان بیت هیوایەک هەیە، بۆ ڕزگار بوون و بەرشەفاعەتی پێغەمبەر و فریشتە و پیاوچاکان بکەویت، ئەگەر حاڵیشت حاڵی کافر بوو، ئیتر لە هەموو حاڵەتەکاندا هەر لە دۆزەخ دایە.



بەڵام ئیمانداران لەخۆشی و شادی و باخێکی پڕلەجوانی و خۆشیدان تا ڕۆژی قیامەت جیهانێکی پڕ موحیبەت و خۆشەویستییە، بەڵام جیهانی لاشە نییە. بەڵکو جیهانی ڕۆحە، بەڵام بۆ ئازاردانی ڕۆحەکە دەگەڕێتەوە ناو لاشەکەی لەناو گۆڕەکەدا و هەرلەوێ ئازار دەدرێت. بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

"اللهم إني أعوذ بك من عذاب القبر، ومن عذاب النار، ومن فتنة المحيا والممات، ومن فتنة المسيح الدَّجال".[٣]

پرۆسەی مردن و زیندووبونەوەش وەکو وەرزەکانیساڵە، خوای گەورە هەموو پرۆسەی سێ مانگ جارێک وەرزێک دەگۆڕێت، فێرت دەکات و ڕاهێنانت پێ دەکات بۆ ئەوەی بزانین ژیان و مردن و هەستانەوە بۆ قیامەت ڕێک لە چوار وەرزی ساڵ دەچێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣] متفق علیە.

# شەیتان کێیە و چییە و بۆ؟

شەیتان وشەیەکی عەرەبییە پێش هاتنی ئیسلام عەرەب بەکاری دەهێنا بۆ شتێک ترس بخاتە ناو دڵی مرۆڤ، واتا هەرشتێک کە مرۆڤ بخاتە دوو دڵی و لە ئاسایشی ئاسایی خۆی دەریبکات، پێی دەوترێت شەیتان، بە سەگی ڕەش و هار، بە مار، بە چەتەی ڕێگا و بان، بە ئافرەتی سۆزانی.هتد وتراوە شەیتان.

لە ڕووی زاراوەوە لە شەرعی خوای گەورە و ئایینی ئیسلام دا بەکەسێک دەوترێت شەیتان کە ناوی (عزازیل)ە ئەم دروستکراوەی خوا لە گرۆهی جنۆکەیە و جنۆکەش چەند تایەفە و گەل و هۆزێکن وەکو مرۆڤ تەکلیفی بەندایەتیان لەسەرە، بەڵام تەکلیفی خیلافەتیان نەدراوە بەسەردا کە ئەوان زەوی ئاوەدان بکەنەوە. ژمارەیان لە مرۆڤەکان زیاترە و جۆرەکانیان بریتین لە (مارد، جان، مرجان، عفریت و معمار.هتد). ژیانیان لەسەر زەوی و زیاتر کەناری دەریا و توانای فڕین و هێزی تایبەتیان هەیە.

لەناو ئەوانیشدا بیروباوەڕی جۆربەجۆر هەیە و کافر و موسوڵمان و مونافیق.هتد.

جۆراوجۆرن لە ڕووی بیروباوەڕ و عەقیدەوە، کەس ناتوانێت لەسەر شێوەی خۆی بیانبینێت، چونکە لە ئاگر دروست کراون واتە ووزە و طاقەن، بەڵام توانایان هەیە لەسەر شێوەی مرۆڤ و گیانداران خۆیان نیشانی مرۆڤەکان بدەن، شەیتان کەناوی عەزازیلە و پلەو پایەی ئیلبیس و شەیتانی دراوەتێ، شێخی سەعدی لە تەفسیرەکەیدا دەڵێت: پێش هەڵسانەوەی قیامەت ئەویش دەمرێت، هەروەها بسام جرار دەڵێت: شەیتان خوودی دەجالە و لەکۆتاییدا بەدەستی عیسا کۆتایی دێت.بەڵام بەڵگەیەکی ڕاست و ڕاشکاوی نیە.

چیرۆک و سەرگوزەشتەی شەیتان بەشێکی لە قورئاندا بۆمان باسکراوە خوای پەروەردگار بە دوژمن و خراپترین و سەرسەخترین دوژمنی مرۆڤ پێی ناساندووین هەمیشە لە کەمین و مەتەرێز و سەنگەردایە بۆ هەڵخڵەتاندنی موسوڵمان و بەگشتی زۆر ڕقی لە مرۆڤە.

لە سورەتی الأعراف دا باسی بەدواداچوون و سەرگوزەشتەی شەیتان و باوکە ئادەم کراوە.

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَٰكُمۡ ثُمَّ صَوَّرۡنَٰكُمۡ ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١﴾ سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە (باوە گەورەی) ئێوەمان دروست کردو نەخش و نیگاری ڕواڵەت و ڕوخساری ئێوەمان کێشا، پاشان وتمان بە فریشتەکان: ئادەی سوژدە بەرن بۆ ئادەم (سوژدەی ڕێزو بەفەرمانی خوا) جا هەموو فریشتەکان سوژدەیان برد جگە لە ئیبلیس (کە فەرمانی خوای شکاندو) لە سوژدەبەران نەبوو.

﴿قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ ١٢﴾ خوا فەرمووی: باشە، چی بەرگری کردیت کە سوژدە نەبەیت کاتێک فەرمانم پێدایت؟ وتی: من لەو چاکترم، (چونکە) تۆ منت لە ئاگر دروست کردوە و ئەوت لە قوڕ دروستکردووە.

﴿قَالَ فَٱهۡبِطۡ مِنۡهَا فَمَا يَكُونُ لَكَ أَن تَتَكَبَّرَ فِيهَا فَٱخۡرُجۡ إِنَّكَ مِنَ ٱلصَّٰغِرِينَ ١٣﴾ خوا فەرمووی: دەی کەواتە دابەزە و لە بەهەشت یان لە ئاسماندا یان لە پلەو پایەی بەندایەتی، چونکە تۆ بۆت نییە لەوێدا فیز بکەیت و خۆت بەگەورە دئبینوێیت، جا تا زووە دەرچۆ، چونکە بەڕاستی تۆ لە ڕیسواو بچوک و بێ نرخەکانیت.

﴿قَالَ أَنظِرْنِيٓ إِلَىٰ يَوْمِ يُبْعَثُونَ ١٤﴾ شەیتان وتی: داواکارم کە مۆڵەتم بدەیت تا ئەو ڕۆژەی کە هەموو نەوەی ئادەم زیندوو دەکرێنەوە.

﴿قَالَ إِنَّكَ مِنَ ٱلْمُنظَرِينَ١٥﴾ خوا فەرمووی: بەڕاستی تۆ لە مۆڵەت دراوانیت.

﴿قَالَ فَبِمَآ أَغْوَيْتَنِي لَأَقْعُدَنَّ لَهُمْ صِرَٰطَكَ ٱلْمُسْتَقِيمَ١٦﴾ شەیتان وتی: بەهۆی ئەوەی کە تۆ منت گومڕاو سەرگەردان کرد، ئەوە سوێند بێت منیش لە ڕێگە ڕاستەکەتدا بۆیان دادەنیشم (لایان بدەم).

﴿ثُمَّ لَأٓتِيَنَّهُم مِّنۢ بَيْنِ أَيْدِيهِمْ وَمِنْ خَلْفِهِمْ وَعَنْ أَيْمَٰنِهِمْ وَعَن شَمَآئِلِهِمْۖ وَلَا تَجِدُ أَكْثَرَهُمْ شَٰكِرِينَ١٧﴾ پاشان سوێند بەخوا لە بەردەمیانەوە، لە پشتیانەوە، لە لای ڕاستیانەوە، لە لای چەپیانەوە، بۆیان دێم و (دنیایان لاخۆشەویست دەکەم و گومانیان دەربارەی قیامەت لادروست دەکەم) و دەستت ناکەوێت زۆربەیان سوپاسگوزار بن.

﴿قَالَ ٱخْرُجْ مِنْهَا مَذْءُومًا مَّدْحُورًاۖ لَّمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكُمْ أَجْمَعِينَ١٨﴾ خوا فەرمووی: لە بەهەشت دەرچۆرە دەرەوە بەسەرشۆڕی و ڕیسوایی و دەرکراوی، سوێند بە خوا ئەو کەسەی شوێنت کەوت لەوان، ئەوە بێگومان دۆزەخ پڕ دەکەم لە ئێوە هەموو.

﴿وَيَٰٓـَٔادَمُ ٱسْكُنْ أَنتَ وَزَوْجُكَ ٱلْجَنَّةَ فَكُلَا مِنْ حَيْثُ شِئْتُمَا وَلَا تَقْرَبَا هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةَ فَتَكُونَا مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ١٩﴾ (تۆش) ئەی ئادەم، خۆت و هاوسەرەکەت لەبەهەشتدا نیشتەجێ بن، جا لە هەر کوێ ئارەزوتان لێ بوو (خواردەمەنی و میوەیە) بخۆن، (بەڵام) نزیکی ئەم درەختە مەکەون (درەختێکی تایبەتی بەرداربوو، بۆ تاقی کردنەوەیان خوای گەورە بڕیاریدا



کە هەر نزیکی نەکەون، چ جای لە بەرو بوومی بخۆن) ئەو کاتە دەچنە ڕیزی ستەمکارانەوە.

﴿فَوَسۡوَسَ لَهُمَا ٱلشَّيۡطَٰنُ لِيُبۡدِيَ لَهُمَا مَا وُۥرِيَ عَنۡهُمَا مِن سَوۡءَٰتِهِمَا وَقَالَ مَا نَهَىٰكُمَا رَبُّكُمَا عَنۡ هَٰذِهِ ٱلشَّجَرَةِ إِلَّآ أَن تَكُونَا مَلَكَيۡنِ أَوۡ تَكُونَا مِنَ ٱلۡخَٰلِدِينَ ٢٠﴾ شەیتان (ئەو سنوورەی بۆ ئادەم و حەوا بەفرسەت زانی) و ئینجا کەوتە فرێدانی وەسوەسەو خەتەرە و خەیاڵ بۆ ناو دڵ و دەروونیان تا ئەو عەیب و عارەیان دەربخات کە شاراوەبوو لێیان (دوایی خۆی ئاشکراکرد) و پێی وتن: پەروەردگارتان ئەم درەختەی لێ قەدەغە نەکردوون تەنها لەبەر ئەوەیە نەوەکو ببنە فریشتە، یاخود بۆ ئەوەیە نەوەکو لە نەمران بن!

﴿وَقَاسَمَهُمَآ إِنِّي لَكُمَا لَمِنَ ٱلنَّٰصِحِينَ ٢١﴾ (ئەوسا شەیتان زانی دەترسن و دوودڵن) سوێندی بۆ خواردن کە من بەڕاستی لە ئامۆژگارانم بۆ ئێوەو دڵسۆزتانم!

﴿فَدَلَّىٰهُمَا بِغُرُورٖۚ فَلَمَّا ذَاقَا ٱلشَّجَرَةَ بَدَتۡ لَهُمَا سَوۡءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا يَخۡصِفَانِ عَلَيۡهِمَا مِن وَرَقِ ٱلۡجَنَّةِۖ وَنَادَىٰهُمَا رَبُّهُمَآ أَلَمۡ أَنۡهَكُمَا عَن تِلۡكُمَا ٱلشَّجَرَةِ وَأَقُل لَّكُمَآ إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمَا عَدُوّٞ مُّبِينٞ ٢٢﴾ ئیتر شەیتان بەفێڵ و پیلان فریوی دان (بەرەولای درەختەکەی بردن) جاکاتێک تامی بەرو بوومی درەختەکەیان چەشت، هەرچی عەیب و عاریان هەیە کەوتە دەرەوە، (ناچار بەپەلە) دەستیاندایە گەڵای درەختەکانی بەهەشت عەیب و عاری خۆیان پێ دائەپۆشی و پەروەردگاریان بانگی کردن و فەرمووی: ئایا من قەدەغەی ئەو درەختەم لێنەکردن و پێم نەوتن، کە بەڕاستی شەیتان بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە؟!

﴿قَالَا رَبَّنَا ظَلَمۡنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمۡ تَغۡفِرۡ لَنَا وَتَرۡحَمۡنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ﴿٢٣﴾﴾ (ئەوسا ئیتر هەردووکیان هەستیان بەهەڵەی خۆیان کردو وتیان: پەروەردگارا ئێمە ستەممان لە خۆمان کرد، خۆ ئەگەر لێمان خۆش نەبیت و بەزەییت پێماندا نەیەتەوە، ئەوە بەڕاستی ئێمە سوێند بە خوا لە خەسارەتمەند و زەرەرمەندانین.

﴿قَالَ ٱهۡبِطُواْ بَعۡضُكُمۡ لِبَعۡضٍ عَدُوّٞۖ وَلَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُسۡتَقَرّٞ وَمَتَٰعٌ إِلَىٰ حِينٖ﴿٢٤﴾﴾ خوای گەورە فەرمووی: ئیتر دابەزن هەندێکتان دوژمنی هەندێکتانن (شەیتان و دارو دەستەی دوژمنی ئێوەن و نەوەی ئادەمیش بەهۆی پیلانی شەیتانەوە دوژمنایەتی یەکتر دەکەن)، بۆتان هەیە لە زەویدا نیشتەجێ بوون و هۆی ڕابواردن و ژیان تا ماوەیەک.

﴿قَالَ فِيهَا تَحۡيَوۡنَ وَفِيهَا تَمُوتُونَ وَمِنۡهَا تُخۡرَجُونَ﴿٢٥﴾﴾ خوا فەرمووی (پێیان): هەر لە زەویدا دەژین و لەوێش دەمرن و (تێکەڵ بەخاکی دەبن، لە کاتی دیاری کراویشدا) هەر لە ناخیەوە دەهێنرێنە دەرەوە (بۆ لێپرسینەوە).

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ قَدۡ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكُمۡ لِبَاسٗا يُوَٰرِي سَوۡءَٰتِكُمۡ وَرِيشٗاۖ وَلِبَاسُ ٱلتَّقۡوَىٰ ذَٰلِكَ خَيۡرٞۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ لَعَلَّهُمۡ يَذَّكَّرُونَ﴿٢٦﴾﴾ ئەی نەوەی ئادەم، ئێمە بەڕاستی پۆشاکی لەبارمان بۆ فەراهەم هێناون، عەورەت و ئەوەی پێتان ناخۆشە دەربکەوێت دای ئەپۆشێت، هەروەها جل و بەرگی جوانیش کە خۆتانی پێ برازێننەوە (بەڵام بیرتان نەچێت) کە پۆشاکی تەقواو خواناسی چاکتر و خێردارتر و بەفەڕترە، ئەو پۆشاکە (ماددی و مەعنەویانە) لە نیشانە و بەڵگەکانی خوای گەورەن بۆ ئەوەی یاداوەری وەربگرن و (یادی بەهەشت بکەن).

﴿يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ لَا يَفۡتِنَنَّكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ كَمَآ أَخۡرَجَ أَبَوَيۡكُم مِّنَ ٱلۡجَنَّةِ يَنزِعُ عَنۡهُمَا لِبَاسَهُمَا لِيُرِيَهُمَا سَوۡءَٰتِهِمَآۚ إِنَّهُۥ يَرَىٰكُمۡ هُوَ وَقَبِيلُهُۥ مِنۡ حَيۡثُ لَا تَرَوۡنَهُمۡۗ إِنَّا جَعَلۡنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ ٢٧﴾

ئەی نەوەی ئادەم: شەیتان، ئێوەش لە خشتە نەبات، هەروەک باوک و دایکتانی لە خشتە بردو لە بەهەشتدا بە دەرکردنی دان، لەکاتێکدا دەستی کرد بەداماڵینی پۆشاکەکانیان تا عەورەتیان پیشانی یەکتربدات، بێگومان شەیتان و دارو دەستەی ئێوە دەبینن، لە شوێنێکدا کە (دنیایە) ئێوە ئەوان نابینن، جا دڵنیابن کە ئێمە شەیتانەکانمان کردووە بە یارو یاوەری ئەوانەی باوەڕ ناهێنن.

﴿وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةٗ قَالُواْ وَجَدۡنَا عَلَيۡهَآ ءَابَآءَنَا وَٱللَّهُ أَمَرَنَا بِهَاۗ قُلۡ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَأۡمُرُ بِٱلۡفَحۡشَآءِۖ أَتَقُولُونَ عَلَى ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ ٢٨﴾ کاتێکیش (بێ باوەڕان) تاوان و گوناهێک ئەنجام بدەن دەڵێن: باوو باپیرانیشمان دیوە ئەم کارەیان کردووەو خوای گەورە خۆی فەرمانی پێداوین بیکەین!! پێیان بڵێ: (نەخێر وانییە) چونکە بەڕاستی خوا فەرمان بەگوناهو تاوان و کاری نابەجێ نادات، چۆن (جەسارەت دەکەن) و شتێک هەڵدەبەستن بۆ خوا کە نازانن وتویەتی یان نا.

﴿قُلۡ أَمَرَ رَبِّي بِٱلۡقِسۡطِۖ وَأَقِيمُواْ وُجُوهَكُمۡ عِندَ كُلِّ مَسۡجِدٖ وَٱدۡعُوهُ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَۚ كَمَا بَدَأَكُمۡ تَعُودُونَ ٢٩﴾ ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ بڵێ: پەروەردگارم فەرمانی بە دادپەروەری داوە، لەکاتی هەرپەرستن و نوێژێکدا، لە هەموو مزگەوتێکدا، ڕووی دڵ و ڕوخسارتان بەڕاستی لە پەروەردگارتان بکەن و بیپەرستن و لێی بپاڕێنەوە، لەکاتێکدا دینداری بێگەردو دڵسۆزانە هەر بۆ ئەو زاتەیە، چونکە هەر



چۆن دروستی کردوون لە سەرەتاوە، لە ئاییندەشدا هەر بۆ لای ئەو دەگەڕێنەوە..

﴿فَرِيقًا هَدَىٰ وَفَرِيقًا حَقَّ عَلَيۡهِمُ ٱلضَّلَٰلَةُۚ إِنَّهُمُ ٱتَّخَذُواْ ٱلشَّيَٰطِينَ أَوۡلِيَآءَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَيَحۡسَبُونَ أَنَّهُم مُّهۡتَدُونَ ٣٠﴾ الأعراف. (جا ئەو کاتە دەبنە دوو دەستە) دەستەیەک هیدایەت و ڕێنمووی وەرگرتووە، دەستەیەکیش بڕیاری گومڕای و سەر لێشێواوی بەسەردا چەسپاوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە بێجگە لە خوا شەیتانەکانیان کردە پشتیوان و خۆشەویستی خۆیان، واش دەزانن کە ڕێگەی ڕاست و دروستیان گرتۆتەبەر.

زۆرێک لە شوێنکەوتووی ئەم شەیتانە، هاوکاری مرۆڤ دەکەن بۆ سیحر و جادوو کەتاوان و کوفرێکی زۆرگەورەیە لە ئیسلامدا.

## سیحر چییە؟

جۆرە فێڵ و چاوبەستێکە شەیتانەکان ئەنجامی ئەدەن لە ڕێگای تەلیسم و خوێندنی چەند کۆد و وشەیەک، کە مەس و وەسوەسە دەخەنە دڵی خەڵکی و توانای ئەوەیان پێ دراوە لەلایەن خوای گەورەوە کە بتوانن کاری زشت و خراپەکاری بەتایبەت هەڵوەشاندنەوەی خێزان و تێکدانی نێوان ژن و مێرد و ناشرین کردنی خەڵکی لەبەرچاوی یەکتردا و زۆرێکی تر لەم باسانە لە کتێبەکانی مەملەکەتی شەیتان زیاترڕوون کراوەتەوە.

بۆ مرۆڤی دیندار و خواناس هیچ کاریگەری نییە و تواناو دەسەڵاتیان بەسەر خواناس و دینداردا ناشکێت، بەڵکو لە ئاستیاندا دەستەوسان و زۆر لە مرۆڤی خواناس و چاکەکار دەترسن.



سیحر لەدوای وەفاتی پێغەمبەر سولەیمان -علیه السلام- شـەیتانەکان لەناو خەڵکدا بڵاویان کردۆتەوە، خوای پەروەردگار دوو فریشتەی نـارد بـۆ سـەرزەوی ناویـان هـاروت و مـاروت بـوو بـۆ جیـاکردنەوەی سـیحر لە موعجیزەی پێغەمبەران.

## چارەسەری سیحر و ڕاوەدوونانی شەیتان

ئەمەش لە ڕێگـای قورئـان و سـوننەتەوە دەبێـت، بەگشـتی بەتـاڵ کردنەوەی سیحر و جادوو لەڕێگای قورئانەوە بەتایبەت سورەتی (الفاتحة، معوذتين، آية الكرسى، کۆتـایی سـورەتی البقـرة، یـاخود خـوودی سـورەتی البقـرة، سـورەتی طه، زۆرێکـی تـر لە سـورەتەکان) ئەوانە زیـاتر تـاقی کراونەتەوە و پاشان بەدەق لە سونەتدا هاتووە بەتاڵ کـردنەوەی سـیحر و جادوو ڕێگا گەلێکی زۆری هەیە کە تاڕادەیەک لە کتێبەکـانی مەملەکەتـی شەیتان ڕوونکراوەتەوە.

هەروەها وەسوەسەی شەیتان و مەس و چوونە ناولاشەی بێتەهۆکـاری ئەوەی وەسوەسەی بۆ دروست بکات، چونکە شەیتان بەناو لاشەی هەموو مرۆڤێکدا دەتوانێت بڕوات و تێپەڕێت، بەهۆکاری ئەوەی ووزە و طـاقەیە. باشترین چارەسەر بۆ ئەم کارە خواناسی و دینداری و پابەند بوونە بە نوێژ و ڕۆژ و قورئان خوێندن و خێر و چاکە لەپێناوی خوادا.

ئەو کەسەی هەڵدەسێت بە هاوکاری شـەیتانەکان و شـەیتان دەیخـاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و کاری خراپە و زشتی لە ڕێگای سیحرەوە فێردەکات و پێ دەکـات ئەوە کـافرە لە شـەریعەتی ئیسـلامدا. دەبێـت بکوژرێـت و لە گۆڕسـتانی موسـوڵمانان نانێژرێـت، خـۆ ئەگەر تـۆبەی کـرد ئەوە هەر دەکوژرێـت بەڵام ڕای جیـاواز هەیە کە ئایـا لە قەبرسـانی موسـوڵمانان

بنێژرێت یاخود نا. هەرچەند ڕایتر هەیە تۆبەی قبوڵ ئـەکرێت و بەڵگـەش پشتگیری ئەکات وەک تۆبەی ساحیرەکانی فیرعەون، ئەنجا تۆبە لە شـیرک و کفری گەورە قبوڵ کراوە بۆچی لە سیحر قبوڵ نـاکرێ؟. سـیحریش یەکـێکە لە تـاوانە زۆر گەورەکـان لە ئـایینی ئیسـلام دا و خـاوەنەکەی کـافر و موشریکە.

## چاوپیسی و چاولێدان و چارەسەری

چاو پیسی ڕاستە و مـرۆڤ بەهۆکـاری حەسـەد و ئێرەیـی زۆرجـار ئەو هێرە دروست دەبێت، گومانی تێدا نییە کە هەمووی لە ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگاردایە، بەڵام چارەسـەری لە قورئـان و سـونەت دا هـاتووە. مرۆڤ هەر شتێکی جوانی بینی و سەرنج ڕاکێش بوو با بڵێت (ماشـاء الـله تبارک الله) یاخود (سبحان الله) بەم شێوەیە.

بەڵگەکـانی چـاو لە قورئـان دا لە سـورەتی یوسـف ئـایەتی ٦٧ وە لە سورەتی القلم ئایەتی ٥١ دا هاتووە و خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَقَالَ يَٰبَنِيَّ لَا تَدۡخُلُواْ مِنۢ بَابٖ وَٰحِدٖ وَٱدۡخُلُواْ مِنۡ أَبۡوَٰبٖ مُّتَفَرِّقَةٖۖ وَمَآ أُغۡنِي عَنكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِن شَيۡءٍۖ إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِۖ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُۖ وَعَلَيۡهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ ٦٧﴾ یوسف. هەروەها وتی: کوڕەکانم (هەموتان) لەیەک دەروازەوە مەچنە ژوورەوە، بەڵکو لەچەند دەرگایەکەوە خۆتان بکەن (بە بارەگای پاشادا)، (دڵنیاش بن کە) من هەرگیز ناتوانم (لەو بەڵاو پێشهاتانەی کە بڕیاری خوای لەسەرە) فریاتان بکەوم، هەرچی پێش بێ و هەموو فەرمان و هەموو بڕیارێک هەر بە دەست خوایە، پشتم هەر بەو بەستووەو پشت و پەنام هەر ئەوە، دەبا ئەوانەی پاڵ پشت و پشتیوانیان دەوێ هەر پشت بەو ببەستن.



﴿وَإِن يَكَادُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَيُزۡلِقُونَكَ بِأَبۡصَٰرِهِمۡ لَمَّا سَمِعُواْ ٱلذِّكۡرَ وَيَقُولُونَ إِنَّهُۥ لَمَجۡنُونٞ ٥١﴾ القلم. ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ!! ئەوانەی کە بێ باوەڕ و کافرن بەجۆرێک تەماشات دەکەن و خێسەت لێ دەکەن، هەروەک بیانەوێت بە تیلەی چاویان لەناوتبەرن، بەتایبەت کاتێک کە گوێیان لە ئایەتەکانی قورئان دەبێت، دەڵێن: (ئەم فرستادەیە) شێتە.

هەروەها پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: چاو لە مرۆڤ بدات دەیخاتە ناو گۆڕ، خۆ ئەگەر لە وشتر بدات دەیخاتە مەنجەڵەوە، واتا ئەیکوژێت عن جابر رضي الله عنه أن النبي صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ قال: العين تدخل الرجل القبر، وتدخل الجمل القدر.[٤]

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە دەفەرمووێت: چاو حەقە و ئەگەر شتێک پێشی قەزا و قەدەر بکەوتایە ئەوە چاو ئەبو.

أن النبي صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ قال: العين حق، ولو كان شيء سابق القدر لسبقته العين.[٥]

## ڕوقیەی شەرعی

ئەم ڕوقیەیە هەموو کەس دەتوانێت بیکات و کەسی تایبەتی بۆ تەرخان نەکراوە نەوەکو ئێستا دەبینین لە هەموو کۆڵانێکدا دووکان و بازاڕیان بۆ داناوە باشترین ڕوقیەی شەرعی ئەوەیە مرۆڤ خۆی بۆ خۆی

---

[٤] رواه أبو نعيم في الحلية وئيبنو عدي بإسناد حسن

[٥] رواه ئەحمەد ومسلم.

بیخوێنێت، خۆ ئەگەر نەیتوانی کەسێکی خواناس و لەخواترس زیاتر کاریگەری هەیە.

هەروەکو ئاماژەمان پێدا کەس تایبەت نییە بەم کارە، بە ڕوقیەی شەرعی دەتوانرێت سیحر و جادو چاو چارەسەر بکرێت و جنۆکەش لە لاشە دەربکات.

## کێ دروستکەری خەیر و شەڕە؟

بەدڵنیاییەوە خوای گەورە خالق و دروستکاری هەموو شتێکە و خوای گەورەش شەڕ و خێری دروست کردووە، بەڵام ئەمر و فەرمانی پێکردووین بە چاکە و خۆ بەدوورگرتن لە خراپە، هۆکاری درووستکردنی

هەردووکیان پەیوەستە و یەکانگیرە بە ئازادی مرۆڤەوە، چونکە خوای گەورە بەهەشت و دۆزەخی هەیە کەرەستەش بەشی هەردوو مەخلوقەکەی خوای گەورە کە بەهەشت و دۆزەخە دروستکراوە. بۆ بەهەشت چاکە بێ بێگومان بۆ دۆزەخیش خراپەکاری، تۆی مرۆڤ خۆت هەڵیدەبژێریت دەبێتە کەرەستەی کامیان.

خوای گەورە بۆ تاقیکردنەوەی مرۆڤەکان ئەم دروستکراوانەی چاک و خراپی دروستکردووە، دەبێت باش ئەوە بزانین خوای پەروەردگار هەرگیز مرۆڤ بە خراپە تاقی ناکاتەوە، بەڵکو بە چاکە تاقی دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿ٱلَّذِی خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَیَوٰةَ لِیَبۡلُوَكُمۡ أَیُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلࣰاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِیزُ ٱلۡغَفُورُ ۝٢﴾ الملك. هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە، تا



تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە (بەسەر بێ باوەڕاندا)، وە لێخۆشبووە (لە ئیمانداران).

ئەگەر ورد ببینەوە باسی دوو مەخلوقی تر کە ژیان و مردنە کە کۆکراوەی هەموو دروستکراوەکان لەو دوانەدا کۆبونەتەوە.

کەواتە کورت و پوخت خوای پەروەردگار دروستکاری چاکە و خراپەیە، ئێمە وەکو ئەهلی سونەت و جەماعەت ئەوە باوەڕمانە.

## دادپەروەری ڕەهایی خوای پەروەردگار

زۆرن ئەو کەسانەی ئەو پرسیارە مێشکی جەنجاڵ کردوون و دەڵێن چۆن دەبێت خوای پەروەردگار کەسێک ٧٠ ساڵ ژیان دەکات بە هەتا هەتایی لە ئاگردا بیسوتێنێت؟

لەڕاستیدا ئەوەی پرسیارەکە وا بە مێشکیدا دێت، یەک چاوی هەیە یاخود بەچاوێک تەماشای ڕاستیەکان دەکات، نازانێت کە پەروەردگار لەبەرانبەر دۆزەخ دا بەهەشتیشی هەیە ئەی ئەو کەسەی ٧٠ ساڵ بەچاکە و باشە دەژی بۆ هەتا هەتایی دەچێتە بەهەشت.

پرسیاری تری ئەو جۆرە خەڵکە یەک لا دەبینن ولاکەی تری هەمیشە شەیتان یان خۆیان دەیشارنەوە و عەقڵیان پێی ناشکێت، بۆ نموونە دەڵێت ئەم هەموو کەسە دەچێتە دۆزەخ کە بڕوای بە ئایینی ئیسلام نییە؟

بەڵێ بە دڵنیاییەوە ئەوەی موسوڵمان و هەڵگری ئایینی ئیسلام نەبێت دۆزەخ بۆ هەتاهەتایی جێگایەتی خوای گەورە پەنامان بات.

چونکە پەروەردگار هەموو حوجە و بەڵگەیەکی بۆ سەپاندوون، لە پێغەمبەر، لە قورئان، لە هەموو شتەکانی گەیاندن، لە گەیاندن بەهەموو



زمانەکـان، ئەو کەسـەی ئەم ئـایینەی پێـدەگات و پشـتی تێـدەکات بە دڵنیاییەوە دەبێت لە قیامەتدا بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت.

لەوانەیە تـۆی هـاوڕێم بپرسـیت ئەی ئەوەی دینـی ئیسـلامی پـێ نەگەیشتووە؟

وەڵامەکە ئاسانە، خوای پەروەردگار دادپەروەرە، بەبێ حـوجە و بەڵـگە خەڵکی ناخاتە دۆزەخ و زوڵم لەکەس ناکات، ئەوە مرۆڤەکان خۆیانن زوڵم لەخۆیان دەکەن و ڕاستییەکان چەواشە دەکەن بۆ حەزەکانی خۆیان خـواو قیامەت لەبیر دەکەن.

## ژیان پڕیەتی لە نهێنی

ئەم جیهـانە و ژیـان و هەمـوو دروسـتکراوەکان نهێنیەکـی بێشـوماری لەخۆگرتووە، بەتایبەت لەڕووی قەزاو قەدەرەوە، زۆرجار هەست بەبـوونی شـتێکی زۆر خـراپ دەکەیـت وا پەی پـێ دەبەیـت بەڵایەکـی گەورەت بەسـەردا هـاتووە، بەڵام دوای چـاوەڕوانی و نەجـات و ڕزگـار بـوون لەو نەهـامەتی و بەڵایە، دەبینیـت ڕێـک پـێچەوانەکەی ڕاسـتە، ئەو بەڵایە نـاوەخنەکەی ڕەحـمەت و چـاکە و سـوود بـووە بـۆ تـۆی مـرۆڤ، پێچەوانەکەشـی زۆرجـار پەی دەبێـت بـۆ ئەوەی بـۆت باشـە، هەسـت دەکەیت بەڵاو موصیبەتە بەسەرتەوە و خۆزگە دەخوازیت کەوا نەبوایە.

خـوای گەورە لە سـورەتی البقـرة_دا خـۆی ئامـاژە بەوە دەکـات و دەفەرمووێت:

﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِتَالُ وَهُوَ كُرْهٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تَكْرَهُواْ شَيْـًٔا وَهُوَ خَيْرٌ لَّكُمْ وَعَسَىٰٓ أَن تُحِبُّواْ شَيْـًٔا وَهُوَ شَرٌّ لَّكُمْ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا



تَعۡلَمُونَ﴿٢١٦﴾ البقرة. جەنگ لەسەرتان بڕیار دراوە کە شتێکی ناخۆشە بۆتان، بەڵام لەوانەیە شتێکتان لا ناخۆش بێت کەچی خێر لەوەدا بێت، هەروەها لەوانەیە شتێکتان پێ خۆش بێت کەچی شەڕ لەوەدا بێت، بێگومان هەر خوا خۆی دەزانێت (خێر لەچی دایە)، ئێوە نایزانن.

(جەنگ لە ئیسلام دا بۆ بەرهەڵستی کردنی دوژمنانی داگیرکەرو دوژمنانی دینە، وە بۆ لابردنی ئەو کۆسپانەیە کە نایەڵن خەڵک ئازادانە بژین و ئازادانە ئەو ڕێبازە هەڵبژێرن کە خۆیان قەناعەتیان پێ یەتی، هەرگیز بۆ ئەوە نییە کە بە زۆر خەڵک موسوڵمان ببێت، وە مێژووی ئیسلام شایەتی حاڵە، وە ئەگەر کارێکی وا ڕووی دابێت ئەوە ئایینی ئیسلام لێی بەرییە).

هەروەها لە قورئان دا نموونەی زۆری باسکردووە بۆمان لەو جۆرە نهێنیانە زۆرجار مرۆڤ هەست بەو دەستە خواییە دەکات کە هاوکار و پارێزەریەتی بەبێ ئەوەی خۆی هیچ توانایەکی بەسەریدا بشکێت، ئەو نهێنیە زۆر بە زەقی و ئاشکرا هەست پێ دەکرێت لەم ژینەدا. ئەوەش ئەو قەزا و قەدەرە خواییە کە هەمیشە لەگەڵماندا ڕێ دەکات و ستراتیژی درێژخایەنی ئەم گەردوونەی لەسەر دامەزراوە. نموونەی بەدواداچوونی پێغەمبەر موسا و یوشعی کوڕی نون و خضر -علیهم السلام-.

کاتێک خضر سەفینەکە خراپ دەکات، موسا لای سەیرە چونکە ئەو بەچاوی واقیعەکە تەماشا دەکات، لەدوایدا بۆی ڕوون دەبێتەوە کە خێروچاکە بوو بۆ خاوەن سەفینەکە.

یاخود کوشتنی گەنجەکە لەلایەن خضرەوە کارێکی زۆر دژوار بوو کە گەنجێکی بێ هۆ کوشت، لە دوایدا

پێغەمبەر موسا بۆی دەرکەوت ئەو کەسە دەبێتە هۆکاری بەڵا و دزێتی و خراپەکاری لەناو شار و گەڕەکەکەیاندا و خوای گەورە لەباتی ئەو کەسە

خراپە چەند نەوەیەکی تر بە دایک و باوکی دەبەخشێت، ئەمەش کارێکی ڕێک و چیرۆکی قەزا و قەدەرە.

یاخود ئەو دیوارەی خەریک بوو دەڕووخا و بێ هیچ کێشەیەک هەڵسا بەڕاست کردنەوە و چاک کردنی دیواری کەلاوەکە دوایی زانرا خاوەنەکەی دوو منداڵن و باوکیان پیاو چاک بوون، خوای گەورە بەهۆکاری چاکە و بەرەکەتی باوکیان گەنجینەکەی پاراستن.

لە ڕێگای خضرەوە ئەو چاکەی لەگەڵ منداڵەکان کرد، تا گەنجینەکەیان دەست بکەوێتەوە، ئەمانەی ڕوویدا لە ژیان و عەقڵ و واقیعەکەدا هیچی جێگای چاکە و بڕینی عەقڵ نەبوو، بەڵام دوایی هەمووی بە چاکە شکاندەوە بۆ خاوەنەکانیان، سەفینەکە خاوەنەکانی بەهۆکاری شکاندنەکەی پارەی زیاتریان دەست کەوت. گەنجەکە مرد و کاری خراپەی ئەنجام نەدا و بە ڕەحمەتی خوای گەورە چووە بەهەشت و دایک و باوکی قەرەبوو کرانەوە بەباشتر، منداڵەکان خوای گەورە ژیانی بۆ مسۆگەر کردن ئەگەرچی بێکەسیش بوون، ئەمە دەرچوونە لە واقیع و عەقڵ، بەڵام ڕێک قەزا و قەدەری خوای پەروەردگارە.

هەست دەکەم ئەوەندە بەسبێت بۆ خەڵکی خاوەن عەقڵ و زانست و هۆش و بیروزیرەکی کە بەو ئەندازەیە لە قەزا و قەدەری خوای گەورە تێبگات.

زۆرجار مرۆڤ غەمبار و ناڕەحەتی ڕووی تێدەکات، بەڵام یەکێک لە نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار ناڕەحەتی و نەخۆشی و ناخۆشییە، چونکە هیچ شتێک بە ئەندازەی ناڕەحەتی و نەخۆشی و ناخۆشی ترس نزیک ناکاتەوە لە خوای پەروەردگار. ئەو کەسانەی کە زۆر لەناڕەحەتیدان ئەوانەن کە زۆر نزیکن لەخوای خۆیان، هەروەها ئەوانەی نەخۆشن یاخود

لە ترس و بیمدا دەژین، خوای گەورە حەزی بە دەنگ و هاواریانە بۆ ئەوەی نزیک ببنەوە لێی.

پێچەوانەکەشی ئەوەی لە خۆشی و شادیدایە کە نارەحەتی ژیان هیچی بەسەردا نەهێناوە کەم ئەزموون و دوورە لە خواناسی و دوعا و زیکر بەگوێرەی پێویست. ئەمەش دیارە ئەو قەدەرەی قبوڵکردوە کە دونیایی بێت و لەناو دوعاو دینداریدا نەژی، ئەمەش هەر قەدەرە بەڵام ئیختیاری کەسەکەیە. ئەمەش چیرۆک و سەرگوزەشتەی تەواوەتی قەزا و قەدەرمان بۆ دەردەخات.

زۆرجار مرۆڤ لەدەستی خۆی قەزا و قەدەر بۆ خۆی دروست دەکات، نموونەی شۆفێرێک کە سەیارەکەی لێ دەخورێت بەپێی یاسای شۆفێری دەبێت لەسەر ٦٠کم/ک بڕوات، بەڵام ئەو لە ١٢٠کم/ک خێراییەکەیەتی، ئەمەش خۆی دروستکەری قەزاکەیەتی و بەدەستی خۆی دەچێت بۆلای قەدەرەکە.

# بەندی سێیەم

پەروەردگارا ئیمانم دامەزراو بکە تا لە تەنهاییدا
زاتی بەرزتم لێ ون نەبێت..

# بونیادی ئایینی ئیسلام
# پاکێجی ئیمانی (المنقول) بۆ عەقڵانی (المعقول)

هەمـوو بەرنـامە، ئـایین، مەزهەب، فیکـر و فەلسـەفەیەک لەسـەر بونیادێـک بینـاکراوە، لەبەر ئەوەی ئیسـلام ئـایینی پەروەردگـارە لەسـەر بونیادێکی تایبەت بەخۆی دامەزراوە، ئەگەر یەکێک لەو بونیاد و بابەتـانە لارو خوار بێت هەمـوو ئەوانـی تـریش خـێچ و خـوار دەکـات، خـۆ ئەگەر بونیادی یەکەم بە ڕاسـتی هـات بەدوایـدا هەمـوو ئەوانـی تـر بە ڕێکـی و ڕاسـت و ڕەوان دەوەسـتن و هێـزی بونیـادەکە لە دڵ و دەروونـدا دەردەکەوێت، لە ڕاستیدا ئەم بونیادی ئیسلامە بەشێکە لە پاکێجی ئیمان.

ئەم بونیادە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لە فەرموودەیەکـدا بۆمان ڕوون دەکاتەوە و دەفەرمووێت:

عن أبي عبد الرحمن عبد الله بن عمر بن الخطاب رضي الله عنهما قـال: سمعت رسول الله صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ يقول: بني ئیسـلام عـلى خمـس: شهادة أن لا إله إلا الله, وأن محمدا رسول الله, وإقام الصلاة, وإيتاء الزكاة, وحج البيت، وصوم رمضان).[٦]

واتا: ئیسلام لەسەر پێنج پایە دامەزراوە، ئەوانیش بریتین لە شایەتومان بە تەنهایی خـوای پەروەردگـار کە جـگە لە زاتـی بەرزی هـیچ خـوایەک و پەرستراوێکی دیکە نییە، محمد نێردراوی خوای پەروەردگارە، ڕاگرتنی نـوێژ و دانی زەکات، چوون بۆ حەج و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦] رواه البخاري ومسلم.



پێش ئەوەی دەست بکەم بەم پاکێجە نوێیە لەم کتێبەدا پێویستە نـاوی پاکێجەکە ڕوونبکەینەوە ئەویش ئیسلامە.

## ئیسلام چییە؟

ئیسلام لە ڕووی زمانەوانییەوە واتـا تەسـلیم بـوون، یـاخود ئاشـتییەکی یەکجار زۆر، دەشێت زانایان لەڕووی زمانەوانییەوە مانای تریان لە ئیسـلام داتاشیبێت.

لەڕووی زاراوەوە: واتا ئایینی پێغەمبەران لە ئادەمەوە تا خاتەم محمـد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ هەموو یەک ئایینیان هەبووە بەناوی ئیسلام.

خوای گەورە لەسـەرزمانی پێغەمـبەران ئەوەمـان بـۆ بـاس دەکـات کە ئایینیان ئیسلام بووە، نموونە (نوح، ئیبراهیم، یعقوب، عیسا..هتد).

﴿رَبَّنَا وَٱبْعَثْ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِكَ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَيُزَكِّيهِمْۚ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ ١٢٩﴾ پەروەردگارا، بۆ ئەو خەڵکەی (کە لە ئاییندەدا دێن) پێغەمبەرێک لەخۆیان ڕەوانە بکە، تا ئایەتەکانی تۆیان بەسەردا بخوێنێتەوە وە فێری کتێبە پیرۆزەکەت تۆ (واتا قورئان) و دانایی یان بکات، تا دڵ و دەروونیان لە ژەنگ و، کردەوەیان لە ڕەوشتی ناپەسەند پاک بکاتەوە، بێگومان تۆ خوایەکی باڵادەست و دانایت.

﴿وَمَن يَرْغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبْرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفْسَهُۥۚ وَلَقَدِ ٱصْطَفَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَاۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١٣٠﴾ کێ لە ئایینی ئیبراهیم پشت هەڵ دەکات، مەگەر ئەو کەسەی کە گێل و نادان و وێڵ بێت، بەڕاستی

ئێمە ئەومان لەم دنیایەدا هەڵبژاردووە و (کردومانە بە پێشەوا) وە لەو دنیاشدا لە ڕیزی پیاوچاکاندایە.

﴿إِذۡ قَالَ لَهُۥ رَبُّهُۥٓ أَسۡلِمۡۖ قَالَ أَسۡلَمۡتُ لِرَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ١٣١﴾ کاتێک پەروەردگارت پێی وت: ملکەچ و فەرمانبەرداربە، (ئەویش خێرا) وتی: تەسلیمی پەروەردگاری جیهانەکانم و (باوەڕی پتەوم پێی هەیە).

﴿وَوَصَّىٰ بِهَآ إِبۡرَٰهِـۧمُ بَنِيهِ وَيَعۡقُوبُ يَٰبَنِيَّ إِنَّ ٱللَّهَ ٱصۡطَفَىٰ لَكُمُ ٱلدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ١٣٢﴾ ئیبراهیم وەسێتی کرد بۆ نەوەکانی هەروەها یەعقوبیش، (هەریەک لەوان وتوویەتی): ڕۆڵەکانم: بەڕاستی خوا ئایینی یەکتاپەرستی بۆ ئێوە بڕیار داوەو هەڵی بژاردووە، ئیتر ئێوەش هەوڵ بدەن بە موسوڵمانی نەبێت مەمرن و (تا دوا هەناسەتان پەیڕەوی بکەن).

﴿أَمۡ كُنتُمۡ شُهَدَآءَ إِذۡ حَضَرَ يَعۡقُوبَ ٱلۡمَوۡتُ إِذۡ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعۡبُدُونَ مِنۢ بَعۡدِيۖ قَالُواْ نَعۡبُدُ إِلَٰهَكَ وَإِلَٰهَ ءَابَآئِكَ إِبۡرَٰهِـۧمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ إِلَٰهٗا وَٰحِدٗا وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ١٣٣﴾ البقرة. ئایا ئێوە (ئەی جولەکە و گاورانێک کە محمد بە درۆ دەخەنەوەو خۆشتان بەشوێن کەوتەی ئیبراهیم و یەعقوب دەزانن) ئامادەی سەرەمەرگی یەعقوب بوون؟ ئەو کاتەی بە کوڕەکانی وت: دوای مردنی من چی دەپەرستن؟!

هەموو وتیان: خوای تۆو باوباپیرانت ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق دەپەرستین کە تاک و تەنهایە، وە ئێمە هەموو تەسلیمی ئەوین و فەمانبەرداری ئەوین.



## شایەتومان چییە؟

وشەی شایەتومان گەورەترە لە وشەی ئیمان، چونکە ئیمان لە دڵـدایە و پاشان لەڕەفتار و کرداردا دەردەکەوێـت، بە زمـانیش دانـی پێـدا دەنێیـت، شایەتومان ڕێک واتای بڕوابوونە بەدڵ و بە گیان و جەستەو کردار پێکردن و ڕەفتار نواندن و باسـکردنی و ڕازی بـوون پێـی و دژی دژەکـانی دەبێـت بوەستینەوە.

خۆی لە ڕاستیدا ئیمان زیاد و کەم دەکات بەزۆری بەندایەتی و نزیـک بوون لەمزگەوت و خوێندنی قورئـان، پیاوچاکان.هتـد. پێچەوانەکەشـی کە ئیمان کەم دەکات هۆکاری دوورکەوتنەوەیە لەو جێگا و بەندایەتیانە.

ئـیمان تەنهـا بڕوابـوون نیـیە بەدڵ یـاخود بەدەم، بەڵکـو پێویسـتی بە کردارە لەهەموو جێگاکانی قورئاندا خوای پەروەردگار کە باسی ئیمانی بـۆ ئیمانداران کردووە و فەرموویەتی:

الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ.

تـــا بەیـــانی بەدەم بڵـــێ یارســـول الـــلە ئەی پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ مـن تـۆم زۆر خـۆش ئەوێـت، ئەبێـت بەڵـگەیەک هەبێت بەسەلماندنی ئەم قسەیە، ئەویش ڕەفتارتە لە پیادەکردنی سوننەت دا.

با بەدەم بڵێیت بەڵام پێویسـتە نـیەت پـاک و بـڕوات پێـی هەبێـت لە دڵەوە هەموو ئەمانە پێکهاتەی ئیمانە لەدڵ و دەروون و کردار و ڕەفتار و وتەدا.

دێـــمەوە نـــاو باســـی شـــایەتومانەکە ئەو وشـــەیەیە کە پێغەمـــبەران هەموویان بۆخاتری ئەو وشەی (تەوحید)ە هاتوون ئەوەیان ڕوونکردۆتەوە



بــۆ خەڵکــی هەرکەس ڕاســتگۆ بــوو لەپیــادەکردنی ئەو شــایەتومانە، بە دڵنیــاییەوە بەهەشــتی مســۆگەر کــردووە. ئەو وشــەیە دوو ئیمپراتــۆریەتی جیهانی دابە زەویدا. ئەو وشەیە پرۆژەیەکی گەورەیە لە بونیادنانی تــاک و خێــزان و کۆمەڵگــا و دەوڵەت، پێغەمــبەری خــوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ فەرمووی: بڵێن (لا اله إلا الله) عەرەب و عەجەم دەخەنە ژێــر دەســەڵاتان ڕاستی فەرموو هاوەڵان فەرموویان بەڕاستی عەرەب و عەجەم کەوتە ژێــر ڕکێفیان.

## واتای (لا إله إلا الله، محمد رسول الله) چییە؟

ئەم ڕســتەیە زۆر گەورەیە زۆر نهێنــی و شــیکاری لەخۆگرتــووە، توانــا و هێزێکــی زۆر ســەیر و عەجیــب ئەدات بەو کەســەی پیــادەی دەکــات، پێچەوانەکەشی هەرکەس بڕوای پێنەکات یاخود لێی دووربێت سەرگەردان و سەرەڕۆیی هەردوو دنیایە.

ئەم ڕستەیە (مـوبتەدا و خەبەرە) واتـا هـیچ خـوایەک نـیـە تەنهـا الـلە نەبێت ئەم سەرەتایە نەفـی هەرچـی خـوایە دەیکـات، تەنهـا پەروەردگـار نەبێت هەواڵەکان لای کەسێکەوە بۆ هاتووە، کە الله ئەو کەسەی ناردووە.

خوای پەروەردگار دەشێ وەکو خــۆی دەفەرمووێــت لەهەمــوو شــتێک خــۆش بێــت واتــا تــاوان، تەنهــا لە هاوبەشــدانان بــۆی و شــەریکی بــۆ دروســتبکەیت لەکارەکانیــدا لێخۆشــبوونی ئەســتەمە، ئــاخر ناکرێــت ئەو خــاوەنی هەمــوو شــتێکە و دروســتکەریەتی کەچــی لەپــڕ و لەناکــاو هاوبەشــێکی زۆر ســەخیف لە بەردو دار دروســتکراو بهێنیــت بڵێــی ئەمە خوایە، ئاخر چۆن خوای گەورە تورە نابێــت بە هەمــوو هێــز و توانــاوە کە



یاسای بۆ داناویت بڵێیت من یاسا و ڕێسای تۆم ناوێت و یاسای کەسێک باشترە کە خوا دروستی کردووە.

لەبەر ئەوە مرۆڤی ئیماندار نەفی هەرچی خوا و طاغوت و پەرستراوێک و یاسا و ڕێسایەک دەکات کە خوای گەورە پێی ڕازی نییە، خوای پەروەردگار ڕازی نابێت هاوبەشی لە خوایەتیدا بۆ دروست بکرێت واتا لە خالقێتی و دروستکراوەکانیدا، چونکە هاوشێوەی نییە، خوای گەورە ڕازی نابێت بەبەرنامەیەکی دەستکرد بڵێین لەبەرنامەی خوای پەروەردگار باشترە جا با بەربڵاویش بێت هەر کوفرە، نموونە هەموو بەرنامە سیاسی و فیکری و فەلسەفییەکانی سەرزەوی هاوشێوەی (دیموکراتی، لیبراڵی، سەرمایەداری، ئیشتراکی و شوعی.هتد) هەموو دینێک بێجگە دینی خوای پەروەردگار کوفرە و خوای گەورە قبوڵی ناکات، جا ئایینی ئاسمانیش بێت وەک یەهودی و مەسیحی، چونکە بەهاتنی محمد پێغەمبەر ﷺ کۆتایی بەئایینەکانی تر هاتووە.

## ئەمەش مانای (لا إله إلا الله)یە بە کورتی

تەواوکەرەکەی هاوەڵی هیچ خوایەک نییە بێجگە (الله) ئەم نەفی و ئیسپاتە کێ فێری کردووین، بێگومان محمد ﷺ خوای پەروەردگار ناردوویەتی خۆی بەبەرنامەی ئیسلام تاکی دروست کرد تا کردییە کۆمەڵگا و دەوڵەتی دامەزراند و دەستوری لەشاری مەدینە نووسی و دوو وەزیری هەبوو کە ئەبوبەکر و عمر بوون ڕەزامەندی خوا لەهەردووکیان بێت.

مادام خۆی کارەکانی ئەنجام داوە کەواتە من و تۆش دەتوانین ئەنجامی بدەین، یان موسوڵمان بیت، با خوا و پێغەمبەرت خۆش بووێت،

بەڵام لەگەڵ حیزبێکی عەلمانی کاربکەیت بڵێیت دین بەکەڵکی ئێستا نایەت و ئیسلامت پێ قبوڵ نەبێت بۆ حوکمڕانی گومڕاو کافریت، ئەگەر نوێژەکانیشت لە مزگەوت بە جەماعەت بێت.

ناکرێت بڵێیت بڕوام بە لا إله إلا الله هەیە، بەڵام لەگەڵ عەلمانیەت کاربکەیت، کوا ڕاستی و دروستی نەفی هەرچی خوا هەیە و ئیسپاتی (الله) بکەیت، ئەمە جێگای قبوڵ کردن نییە لەڕووی عەقیدەوە و عەقڵانیەتیشەوە، هیچ حیزب و ڕێکخراوێک قبوڵ ناکات ئەندامەکانی لەدوو حیزبدا یان ڕێکخراودا کاربکەن، چۆن دەڵێیت من موسوڵمانم و ئایینی ئیسلامم قبوڵە، بەڵام دیموکرات خوازم یان سوسیالیزمم..هتد.

خوای پەروەردگار لە سورەتی الأحزاب دا باسی ئەوە دەکات کەمرۆڤ لە هەناویدا دوو دڵی نییە، ئەمەش ئاماژەیە کە دەبێت مرۆڤی موسوڵمان یەک دید و تێڕوانینی هەبێت.

﴿مَّا جَعَلَ ٱللَّهُ لِرَجُلٍ مِّن قَلْبَيْنِ فِي جَوْفِهِۦۚ وَمَا جَعَلَ أَزْوَٰجَكُمُ ٱلَّٰٓـِٔي تُظَٰهِرُونَ مِنْهُنَّ أُمَّهَٰتِكُمْۚ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَآءَكُمْ أَبْنَآءَكُمْۚ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَٰهِكُمْۖ وَٱللَّهُ يَقُولُ ٱلْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي ٱلسَّبِيلَ﴿٤﴾﴾ الأحزاب.
خوا دوو دڵی دروست نەکردووە لە دەروونی هیچ کەسێکدا (دوو بیروباوەڕ جێی نابێتەوە)،کەواتە هاوسەرانیشتان کە بەدەم پێیان دەڵێن: (ئێوە لەجێی دایکمانن) بەو قسەیە نێبنوە دایکتان، ئەوانەش بە کوڕی خۆتانی دەزانن (لە کاتێکدا ڕاستیەکەی وا نییە)، خوا حەق وێژەو هەر ئەو ڕێبازی ڕاست و دروست، نیشانی (بەندەکانی) دەدات.

کەواتە یان موسوڵمان بەو خاوەنی ئایین و سیستەمی تایبەتی خۆت بە، یان بڕۆ کافر و بێدین بە بەڵام لەو نێوەندەدا یاری مەکە، چونکە



ئەوکات مونافیق دەردەچیت. مونافیقیش جێگای ژێرترین و خوارترین پلەیە لە ئاگری دۆزەخ دا.

لەبەر ئەوەیە کۆمەڵێک لە زانایانی ئەهلی سونەت و جەماعەت بە ڕاشکاوانە دەڵێن هەرکەس ئیسلامی وەکو خوێ قبوڵ نەبێت کافرە یان بڕوای بە بەشێکی نەبێت ئەوا هەر کافرە، ئیسلام وەکو سیستەمەکانی تر خاوەن یاسا و ڕێساو حوکمڕانی خۆیەتی، ١٣٠٠ ساڵ حوکمی کردووە چۆن دیموکراتیەکی شەق و شڕ و لیبراڵیەک کە ڕەواج بە نێربازی و سەرمایەداریەک کە مرۆڤ ئەڕوتێنێتەوە، دەیگۆڕێتەوە لەکاتێکدا ئیسلام لە ڕووی مەنهەجەوە لەهەموویان بەهێزترە.

## پەرستن چییە؟

هەرشتێک وەکو خوای پەروەردگار تەماشا کرا، ئەوە پەرستنە. هەرکەس بەشوێن خوادا گەڕاو شوێنی بەرنامەکەی کەوت و گوێڕایەڵی بوو، ئەوە پەرستنە.

هەرکەس یاسا و ڕێسای ژیانی دانا بۆ خەڵکی و وتی یاسای ئیسلام بەکەڵک نایەت و ناپەرسترێت، هەرشتێک لەخواو پێغەمبەری خواوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بوو نەیویست و خۆشی نەویست ئەوە ئیمانی وێرانە و تەواو نییە.

بە بەڵگەی ئایەتەکان

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.

﴿قُلْ يَٰٓأَيُّهَا ٱلْكَٰفِرُونَ ۝١﴾ (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ) بڵێ: ئەی هۆزی کافرو بێباوەڕو خوانەناسان.

﴿لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ٢﴾ من هەرگیز ئەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن نایپەرستم، (چونکە من خوا پەرستم).

﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ٣﴾ ئێوەش دیارە ئەوەی من دەیپەرستم نایپەرستن (چونکە بت پەرستن).

﴿وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ٤﴾ وە من بەندایەتی پەرستراوانی ئێوە ناکەم.

﴿وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ٥﴾ ئێوەش، ئەو زاتەی من دەیپەرستم، (دیارە کە) نایپەرستن.

﴿لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ٦﴾ الكافرون. (دەی کەواتە) دینی خۆتان بۆ خۆتان و دینی خۆم بۆ خۆم.

هەروەها لە سورەتی المائدة دا هاتووە:

﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَا ٱلتَّوۡرَىٰةَ فِيهَا هُدٗى وَنُورٞۚ يَحۡكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسۡلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ بِمَا ٱسۡتُحۡفِظُواْ مِن كِتَٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُواْ عَلَيۡهِ شُهَدَآءَۚ فَلَا تَخۡشَوُاْ ٱلنَّاسَ وَٱخۡشَوۡنِ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِـَٔايَٰتِي ثَمَنٗا قَلِيلٗاۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ٤٤﴾ ئێمە کاتێ کە تەوراتمان ڕەوانە کردووە ڕێنموییی تیا بوو (بۆ هەموو خێرو چاکەیەک)، وە نوورو ڕووناکیش بوو (لەناو تاریکستانەکاندا) ئەو پێغەمبەرانەی کە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی جولەکەیان پێ دەکرد، هەروەها زانا پەروەردگار ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان، ئەوەی کە لایان بوو لە کتێبی خوا دەیان پاراست و لەبەریان دەکردو پەیڕەویان دەکرد شایەتیش بوون لەسەری (کەواتە ئەی زانایانی جولەکە، ئەی ئیمانداران) لە خەڵکی



مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن وە ئایەتەکانی من بە نرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر هەموو دنیاش بێت هەرکەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئەو جۆرە کەسانە لە ڕیزی کافراندان.

﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ لە تەورات دا بڕیارمان داوە لەسەریان کە (ئەگەر) یەکێک کەسێک بکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە، وە چاوی یەکێک کوێر بکات، دەبێت کوێر بکرێت، وە لوتی یەکێک عەیب دار بکات دەبێت لوتی عەیبدار بکرێت، وە گوێی یەکێک ببڕێت دەبێت گوێی ببڕێت، وە دانی یەکێک بشکێنی دەبێت دانی بشکێنن، وە برین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەنرێت، جا ئەوەی لە تاوانبار خۆش ببێت، ئەو چاوپۆشی و لێخۆشبوونەی دەبێتە کەفارەتی گوناهانی، (بێگومان) ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئا ئەوانە لە ڕیزی ستەمکاراندان.

﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ ۖ وَءَاتَيْنَـٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾﴾ ئەوجا بەشوێن پێغەمبەرانی (نەوەی ئیسرائیل دا) عیسای کوڕی مەریەممان ڕەوانەکرد، کە ڕاستیی تەوراتی دەردەخست و پشتیوانی لێ دەکرد، وە ئینجیلیشمان پێ بەخشی کە هیدایەت و نوورو ڕووناکی تیایە، پشتگیریی تەوراتی پێش خۆیەتی، هیدایەت و ڕێنمویی و ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن.

﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴿٤٧﴾﴾ دە با شوێن کەوتوانی ئینجیل بەو ڕێنمونیی و ئامۆژگاریانە هەڵسوکەوت بکەن کە خوا تیای دا ڕوونی کردۆتەوە (کە گرنگترینیان شوێنکەوتنی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامە) جا ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئا ئەوانە ناپاک و تاوانبارو گوناهکارن).

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴿٤٨﴾﴾ (ئێمە) قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستیی و دروستیی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات، وە نیگابانە بەسەر هەموویاندا (کاتێ کە خاوەنانی کتێب لە گاورو جوو گیروگرفتیان دێنن بۆلای تۆ) بە بەرنامەی خوا داوەریی بکە لە نێوانیاندا، وە شوێنی ئارەزواتی ئەوانە مەکەوە، لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە، بۆ هەر لایەکتان (موسوڵمانان و خاوەنانی کتێب) بەرنامەو پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەموتانی دەکردە ئوممەت و گەلێکی یەک پارچە، بەڵام (ویستی وایە) کە تاقیتان بکاتەوەو (سەربەستان بکات تا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوە ڕێبازی ڕاست بدۆزنەوە) وە لە بەخششەکانی سوود وەرگرن، دەی کەواتە زۆر بە پەلە و تاڵوکە بن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێرو چاکەیەک، دڵنیاش بن کە هەموتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەو کاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کە کێشەتان لەسەری هەبوو.



﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ۝٤٩﴾ (کاتێ کە هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆلات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیەی کە لە لایەن خواوە بۆت ڕەوانە کراوە، شوێنی ئارەزواتی ئەوان مەکەوە، وریایان بە نەوەکو ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو ڕێنموونییانەی کە خوا بۆی ناردووی (جا ئەگەر ئەو جولەکانە ڕازیی نەبوون و) پشتیان تێ هەڵکرد، ئەوە دیارە خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێک لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخیی و سەرکەش و تاوانبارن.

﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ۝٥٠﴾ المائدة. ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامی یان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەتی) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

بەهەمان شێوە لە سورەتی الناس دا خوای گەورە دەفەرمووێت:

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.

﴿قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ۝١﴾ (ئەی محمد صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: پەنا دەگرم بە پەروەردگاری خەڵکی.

﴿مَلِكِ ٱلنَّاسِ۝٢﴾ بە پادشای خەڵکی.

﴿إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ۝٣﴾ بە خوای خەڵکی.

﴿مِن شَرِّ ٱلۡوَسۡوَاسِ ٱلۡخَنَّاسِ۝٤﴾ لە شەڕو خراپەی ئەو (شتانەی) کە وەسوەسەو خەتەرەو خەیاڵی خراپ دروست دەکات.

﴿ٱلَّذِي يُوَسۡوِسُ فِي صُدُورِ ٱلنَّاسِ ۝٥﴾ لەو (شتانەی) کە وەسوەسە فڕێدەداتە سینەو دڵ و دەروونی خەڵکییەوە.

﴿مِنَ ٱلۡجِنَّةِ وَٱلنَّاسِ۝٦﴾ الناس. لە پەری و خەڵکی، لە جنۆکەو ئادەمیزاد.

مادام خوای پەروەردگار خۆی مەلیکە بەدڵنیاییەوە مەلیک خۆی یاسا دادەنێت.

## طاغوت چییە؟

هەر یاسایەک، بتێک، فیکر و فەلسەفەیەک کە پەرستراو خەڵک گوێڕایەڵی بوون پێش وتەی خواو پێغەمبەرەکەی خرا ئەوە طاغوتە.

زۆرجار دەکرێت سەرکردە بێت لەڕووی زاراوەوە، بەڵام لە ڕووی زمانەوانییەوە واتا هەرشتێک لە ڕێگای خۆی دەرچوو، بەتایبەت بە ئاو و جۆگەی ئاو دەوترێت کە دەشکێنرێتەوە و لە ڕێڕەوەکەی خۆی دەگۆڕدرێت ئەوە طاغوتە.

﴿إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ۝١١﴾ الحاقة. ئێمە کاتێک کە ئاو لە سنوور دەرچوو (لە کاتی تۆفانەکەی نوحدا) ئێوەمان لە کەشتیدا هەڵگرت.

فەرمان کراوە بەهەموو موسوڵمانێک واتە واجبە کە دەبێت بەرائەتی خۆی بکات لەهەموو طاغوتێک و بەکوفری بزانێت، بەبەڵگەی سورەتی البقرة ئایەتی ٢٥٦.



﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾ البقرة. دینداری بە زۆر نابێ بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بە سەر کەسدا، چونکە ڕێبازی چاک و دروست و ئاشکرا بوەو (جیا بۆتەوە لە تولە ڕێگای) گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە (طاغوت) کە بریتیە لە هەموو ڕێگەو ڕیبازو هێزو بەرنامەو بت و لادانێک، وە باوەڕی دامەزراو بێنێت بە خوا، بێگومان ئەوە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هەڵناوەشیت و هەڵناتەکێت، وە هەمیشە پتەوو دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە، (بە هەموو کردارو گوفتارو نییەت و نهێنی بەندەکانی).

ڕستەی (لا إله إلا الله) مەنهەجێکی کاملە و تەواوکەرەکەی (محمد رسول الله)یە، ئەویش دوای ئەوەی ئیسپاتی خوای پەروەردگارت کرد و نەفی هەرچی طاغوت و پەرستراو و خواکانی تر هەیە کردت. دەبێت شوێنکەوتووی ئەو پێغەمبەرە ئازیزە بیت صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خوای پەروەردگار ناردوویەتی بۆ ئەوەی ببیتە خاوەنی ئەو پەیمانەی خوای گەورە داویەتی بە موسوڵمان ئەویش خەلیفە بوونەیەتی لەسەر زەوی و سیستەمەکەشی سیستەمی خیلافەتە. موسوڵمانی ڕاستەقینە کە هەڵگری دروشمی (لاإله إلا الله محمد رسول الله)یە ئەزانێ کە واجبە لەسەر موسوڵمانان کە ئەو سیستەمە بگەڕێننەوە.



## سیستەمی خیلافەتی ئیسلامی چییە؟

هەر دەسەڵاتێک کە خاوەنی یاسا و ڕێساو ئایدۆلۆژیای تایبەتی خۆی بوو، خاوەنی سیستەمی سیاسی خۆشیەتی. ئیسلام وەکو ئایین کاملە و پڕە، هیچ کەموکورتیەکی تیا نییە هۆکارەکەشی ئەوەیە کە خوای گەورە دروستکاری مرۆڤەکانە و هەر ئەو زاتەش دەزانێت چی بۆی باشە. لەناو ئایینی ئیسلامیدا سیستەمی سیاسی ئیسلامی ناوی خیلافەتە، ئەویش لە دوو ئایەتەوە سەرچاوەی گرتووە کە خوای گەورە بە سەیدنا داوود و سەیدنا ئادەم دەفەرمووێت: خەلیفە بن و سیستەمەکەشتان دەبێتە خیلافەت.

﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنِّى جَاعِلٌ فِى ٱلْأَرْضِ خَلِيفَةً ۖ قَالُوٓا۟ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ ٱلدِّمَآءَ وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ ۖ قَالَ إِنِّىٓ أَعْلَمُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٣٠﴾﴾ البقرة. (وە بیریان بێنە) کاتێک کە پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت: من لە زەویدا جێنشینێک دادەنێم (تا زەوی ئاوەدان بکاتەوە). فریشتەکان وتیان: ئایا کەسێ تیایدا دەکەیتە جێ نشین کە خراپەو تاوانی تیا بکاو خوێن ڕێژیی تیا ئەنجام بدات؟! لە کاتێکدا کە ئێمە (شایستە ترین) قەدری تۆ بەچاکی دەزانین، (لە وەڵامیاندا) خوا فەرمووی: ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن.

﴿أَمَّن يُجِيبُ ٱلْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ ٱلسُّوٓءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَآءَ ٱلْأَرْضِ ۗ أَءِلَٰهٌ مَّعَ ٱللَّهِ ۚ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٦٢﴾﴾ النمل. ئایا کێیە جگە (لە زاتی پەروەردگار) کە بێت بە هاناو هاواری لێقەوماوو بێ دەرەتان و بێ داڵدەوە، کاتێک کە نزا دەکات و لێی دەپاڕێتەوە، ئەوسا بەڵاو ناخۆشیەکان لادەبات و دەتانکاتە نیشتەجێ و جێنشین لە زەویدا، ئایا ڕەوایە لەگەڵ



ئەو زاتەدا خوای تر هەبێت؟! کەمێک یاداوەری وەرگرن و تێفکرن و بیربکەنەوە.

﴿يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلۡنَٰكَ خَلِيفَةٗ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَٱحۡكُم بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَقِّ وَلَا تَتَّبِعِ ٱلۡهَوَىٰ فَيُضِلَّكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَضِلُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ لَهُمۡ عَذَابٞ شَدِيدُۢ بِمَا نَسُواْ يَوۡمَ ٱلۡحِسَابِ ٢٦﴾ ص. ئەی داود: بەڕاستی ئێمە تۆمان کردۆتە جێنشین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوایی لە نێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام بدە، هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازی خوا، چونکە بێگومان ئەوانەی لە ڕێبازی خوا لادەدەن، سزای بە ئێش و پڕ ئازار بۆیان ئامادەیە، بەهۆی فەرامۆشکردنی ڕۆژی لێپرسینەوە.

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی کردووە بە سیستەمی ئیسلامی کە خیلافەتە، لە کتێبی گوتاری سیاسی ئیسلامی بە باشی ڕوونکراوەتەوە لە ڕووی واقیع و پراکتیزەکردنەوە ١٣٠٠ ساڵ سیستەمی سیاسی خیلافەت بوونی هەبووە و لەسەردەمی ئەبوبەکر، عمر، عثمان و علی کەوا ناسراون بە خولەفای ڕاشدین دەست پێدەکات لە نموونەی خیلافەتی ئەمەوی، عەبباسی تا کۆتاییان عوسمانیەکان بوون.

## بونیادی نوێژ

نوێژ ئەرکێکی گرنگی ئیسلامە بەنەکردنی مرۆڤ کافر دەبێت، ئەویش فەرموودەی پێغەمبەری خوایە صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ (من ترک الصلاة فقد کفر)، جا کۆمەڵێک لە زانایان دەڵێن ئەگەر لەبەر تەمەڵی نەیکات

کافر نابێت، بەڵام ڕای زانایان زۆرینە لەسەر ئەوەیە کە نوێژنەکەر کافرە. بەپێی ڕای زۆرینەی زانایان فەرمودەکان ڕاشکاون و ڕونن، بە حەزی من و تۆنیە!.

نوێژ پایەیەکە لە پایەکانی نیشاندانی هەبونی عەقیدەو سەلماندنی، بەڵام چۆنیەتی نویژکردن و ئەحکام و یاساکانی لەسەر نوێژی سونەت و جۆری نوێژەکان هەموو لە فیقهی ئیسلامدا جێگای بۆ کراوەتەوە، بەڵام کردنی ٥ فەرزەکە لە بیروباوەڕی ئیسلامییە و نەگۆڕە نەکردنی هیچ پاساوێک هەڵناگرێت، بێجگە ئەوەی خاوەنەکەی حوکمی حەدی دەکەوێتە سەر و هەرچوار مەزهەبەکە کۆکن لەسەر کوشتنی کە حەدی پاک بونەوەیەتی، ئەگەر تۆبە نەکات.

نوێژ بەهێزترین پەیوەندی نێوان خوا و بەندەیەکەیەتی، باشترین ڕێگایە بۆ گەیشتن بە ئەدرەس و ناونیشانی خوای پەروەردگار، نوێژ لەسەرەتاوە لە مەککە لەسەر موسوڵمانان و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرز کرا، بەڵام بەیانی و ئێوارە بوو دوو ڕکعات نوێژیان دەکرد، جوبریل فێری پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ی کرد چۆن بوەستێت و ڕکوع بکات و پاشان سوجدە بەرێت، پاشان ئەرکەکانی تری نێوان ڕکوع و سجود، بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: نوێژ بکەن وەکو ئەوەی من دەیکەم (صلو كما رأيتموني أصلي).

زۆرجار بیر لەوە دەکەیتەوە تۆی هاوڕێم دەڵێیت باشە ئەم کردار و ڕەفتارە بەم شێوازە چ سوودێک بە خوا دەگەیەنێت کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات؟



ڕاستی پرسیارەکە ئەگەر وشەکان تێبگەیت لەکاتی خوێندنی کردارەکاندا، ئەوکات خۆت دەزانیت پرسیارەکەت لاوازە، بەڵام ئەگەر لە وشەکان تێنەگەیت ئەوا مافی خۆتە ئەم پرسیارە بکەیت.

لێرەدا پێویستە باسێکی نوێ بکەینەوە لەوەی نوێژ بەگشتی واتای چییە و خوای پەروەردگار چی پێویستی بە نوێژی من و تۆ هەیە.

## ئیتر بۆ نوێژ بکەین؟
## نوێژ بۆ؟

خۆ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿وَمَا خَلَقۡتُ ٱلۡجِنَّ وَٱلۡإِنسَ إِلَّا لِيَعۡبُدُونِ٥٦﴾ الذاريات. هەروەها فەرموودەی قودسیمان هەیە کە خوای پەروەدگار دەفەرموێت: من پێویستم بە بەندایەتی و خواناسی و مرۆڤەکان نییە و هیچ لە موڵک و سامانی خوای پەروەردگار زیاد و کەم ناکات، کەواتە بۆ و چۆن ئەم دوو دەقە لەگەڵ یەکتردا ڕێک دەکەون کە هەردوو کەلامی خوای پەروەردگارە.

هەردوو کەلامەکە زۆر ڕاستن، چونکە مرۆڤەکان لەڕاستیدا خوای گەورە دروستی کردوون بۆ ئەوەی پەیوەندیان بە خواوە هەبێت، هیچ شێوەیەکیش نییە بۆ پەیوەندی لەگەڵ خوا تەنها لە ڕێگای عیبادەت و بەندایەتیەوە، ئەوەی کە دەیکات ڕاستەخۆ دەگات بە خوای پەروەردگار، ئەوەشی نایکات ئازادە. بەڵام دەبێت لەو دنیا بەرپرسیارێتی هەڵبگرێت، کەواتە بەندایەتی بۆ خوودی مرۆڤە بۆیە خوا پێویستی نییە، بەڵکو من و تۆی مرۆڤ موحتاجین بە پەیوەندی لەگەڵ خوای پەروەردگار نوێژ و ڕۆژووی ئێمە هیچ لە موڵکی خوای پەروەردگار زیاد و کەم ناکات، ئەوە ئێمەین پێویستمان بە بەندایەتییە.



کەواتە تاکە ڕێگا بۆ گەیشتن بە ئەدرەس و ناونیشانی خوای گەورە ئەوەیە کە خۆی بۆی داناویت.

هەروەکو ئەوە وایە من بمەوێت تەلەفۆن بۆ دایکم بکەم، بەڵام ژمارەی تەلەفۆنی هاوڕێکانم لێ بدەم، کە هاوڕێکەم هەڵیدەگرێت و وەڵام دەداتەوە من بڵێم هاوڕێ ئەمە ژمارەی تۆیە بەڵام من دەمەوێت لەگەڵ دایکم قسە بکەم، لە هەمانکاتدا دایکم ژمارەی تایبەت بەخۆی هەیە.

خوای پەروەدگار دەفەرمووێت: لەڕێگای نوێژەوە دەتوانیت پەیوەندیم پێوە بکەیت ئەوە ناونیشانی منە.

هەروەک کەسێک خاوەن ئیمێڵ ئەدرەسی خۆیەتی (تەشبیهی نەبێت بە خوای گەورە) ناکرێت لە خۆمانەوە ئیمێڵ ئەدرەسیک بنووسین  و وای دئیبنوێین کە ئەمە ئیمێڵ و ئەدرەسی هاوڕێکەمانەو نامەی بۆ بنێرین، ئاخر بەدەستی ناگات، ئەبێت بینێریت بۆ ئەو ئەدرەسەی کە تایبەتە بەو.

گەیشتن بە خوای پەروەردگار لەو ڕێگایەوەیە کە خۆی دایناوە و ناونیشانیەتی.

بۆچی وا درێژم کردەوە؟

لەبەر ئەوەی خەڵکانێک هەن کاتێک پێیان دەڵێیت نوێژ بکە ئەڵێ ئاخر من دڵم پاکە خوا خۆی دەزانێت، دڵ حسابە! لەوەڵامدا بەوانە دەڵێم چۆن کەسێک دڵی پاک بێت نوێژ ناکات، ئەوەی دڵی ژەنگ گرتوویەتی پەیوەندی بە خواوە ناکات. نوێژ ناونیشانی خوایە، تۆ ناونیشانی هەڵەت لێیاوە و ناگەیت بە خوا.

وەستانی نوێژ کە دەست پێ دەکەیت یەکەم وشەی کردنەوەی نوێژ دەڵێیت (الله اکبر) واتا خوایە تۆم بە گەورە دانا لەهەرچی لەم بوونەدا هەیە و ڕووم کردۆتە تۆی پاک و بێگەرد.



ئینجا بە دوعایەک دەست پێدەکەیت لە ڕاستیدا سورەتێک لە قورئان بە ناوی (الفاتحة) دەڵێیت بەناوی تۆ دەستم کردووە بە بەندایەتی و کەناوی پیرۆزی اللەیە، بەڵام بە دوو سیفاتی گرنگ دەستت پێکردووە کە (الرحمان، الرحیم) کە لەم دنیایەدا بە بەزەیی و لە قیامەتدا بەخشندەیە، سوپاسی دەکەیت لەبەرئەوەی خوای هەموو کەون و گەردوون و جیهانی دونیا و قیامەتە، دیسان دڵخۆشی بەوەی کە پەروەردگارت بەبەزەییە لەم دیانیەدا و لە قیامەتدا بەخشندەیە، چونکە دان بەوەدا دەنێیت و کاری بۆ دەکەیت، چونکە خاوەنی ڕۆژی قیامەتە و هەموو دۆسیەو مەلەفت دەچێتەوە لای زاتی پاکی.

ئەوەی لە ڕاستیدا تۆ و منی مرۆڤ وێڵین بەدوایدا هیدایەتە، چونکە هیدایەت نەبێت لای خواوە کافرین و سەرگەردانین و سەرەڕۆین. بۆیە داوای هیدایەت دەکەین لەخوای گەورە و هەر ئەو دەیبەخشێت.

تەنها پەرستن بۆ ئەو دەکەین کە زاتی پاکی خوایە و پشت و پەناو یاسا و ڕێساش هەر لەو وەردەگرین، چونکە ئەو هیدایەتە کە خوای گەورە داویەتی بە پێغەمبەران و پیاوچاکان، ئەویش نیعمەتە.

داوادەکەیت کە خوای پەروەردگار تووڕە نەبێت لێت وەکو لە یەهودەکان تووڕە بوو، هەروەها سەرلێشیواو نەبیت وەک نەسارەکان سەریان لێ شێواوە.

﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ١﴾ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان.

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلۡعَٰلَمِينَ ٢﴾ سوپاس و ستایش بۆ خودای پەروەردگاری جیهانەکان.

﴿ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣﴾ بەخشندەی میهرەبانە.

﴿مَٰلِكِ يَوۡمِ ٱلدِّينِ ٤﴾ خاوەن و سەرداری ڕۆژی سزاو پاداشت و قیامەتە.

﴿إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ ٥﴾ خوایە تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و تەنها داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین.

﴿ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ٦﴾ خوایە ڕێنموییمان بفەرموو بۆ ڕێبازی ڕاست و دروست.

﴿صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ ٧﴾ الفاتحة. ڕێبازی ئەوانەی کە نازو نیعمەت و بەهرەوەرت کردون. نەک ڕێبازی ئەو چەواشە بوانەی کە خەشم و قینت لێ گرتون و سەرگەردان و گومڕا بوون.

لە فەرمودەیەکی قودسیدا خوای گەورە دەفەرمویێت: من نوێژم لەنێوان خۆم و بەندەی خۆم دابەش کردووە (مەبەستیشی سورەتی فاتیحەیە کە بەشێکی سەرەکی نوێژە): کاتێک کە ئیماندار دەڵێت الحمدللە رب العالمين خوا دەفەرموێت: ئەوەتا بەندەم سوپاس و ستایشم دەکات، کاتێک کە دەڵێت: الرحمن الرحیم، خوا دەفەرموێت: ئەوەتا بەندەم ستایش و وەسفم دەکات، کاتێک دەڵێت: مالک یوم الدین، خوای گەورە ئەفەرموێت:ئەوەت بەندەکەم شکۆداری کردم. جارێکیش فەرموی: بەندەکەم هەمو شتێکی سپارد بە من، کاتێک ئەڵێت: ایاک نعبد وایاک نستعین، خوا دەفەرموێت: با ئەمە لە نێوان و خۆم و بەندەکەمدا بێت، هەرچی داوا بکات ئەیدەمێ. بەندەم ڕاست دەکات ئەوەتا هەر من دەپەرستێت و هەر من بە پشتیوان دەزانێت، کە وتیشی: اهدنا الصراط المستقیم, صراط الذین أنعمت علیهم, غیر المغضوب علیهم ولا الضالین. خوای گەورە ئەفەرموێت:



ئەوە بۆ بەندەم هەرچی داواش بکات پێی دەبەخشم. ئەمەش دەقی فەرموودە قودسیەکەیە: عن أبي هريرة رضي الله عنه قال: سمعت رسول الله -صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ - يقول: قال الله تعالى: (قسمت الصلاة بيني وبين عبدي نصفين ولعبدي ما سأل, فإذا قال العبد: الحمد لله رب العالمين, قال الله تعالى: حمدني عبدي, وإذا قال: الرحمن الرحيم, قال الله تعالى: أثنى علي عبدي, وإذا قال: مالك يوم الدين, قال: مجدني عبدي, وقال مرة: فوض إلي عبدي, فإذا قال: إياك نعبد وإياك نستعين, قال: هذا بيني وبين عبدي ولعبدي ما سأل, فإذا قال: اهدنا الصراط المستقيم, صراط الذين أنعمت عليهم, غير المغضوب عليهم ولا الضالين, قال: هذا لعبدي ولعبدي ما سأل).[٧]

پاشان دەچەمێیتەوە کە ئەو چەمانەوەیە بۆ گەورەیی خوایە، تۆ خۆت نیشانی ئەو زاتە ئەدەیت لە بۆ هیچ کەس ناچەمیتەوە تەنها بۆ ئەو خوایە نەبێت کە یەکەم جار خۆت وتت (الله اکبر دووبارەی دەکەیتەوە کە لە هەموو شتێک گەورەترە، پاشان دەڵێیت (سبحان ربي العظيم وبحمده) واتا پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگارم کە گەورەی هەموو گەورەکانە و هەر ئەو لایەقی سوپاسە.

سەربەرز دەکەیتەوە و بە ملکەچی دەڵێیت (سمع الله لمن حمده ربنا ولک الحمد) واتا دەزانم و دڵنیام کە خوای پەروەردگاری من دەنگم دەبیستێت کاتێک سوپاسی دەکەم، پەروەردگاری من تەنها تۆ لایەقی سوپاسیت.

دیسان بە الله اکبر دەچیتە سوجدە کە حەوت ئەندامی لەشت دەبێت بچەسپێت بە زەویەوە، ئەوپەڕی گەردن کەچی نیشان دەدەیت لەم

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧] رواه مسلم.



جێگایەدا بۆ ئەوەی خوای پەروەردگار خۆشی بوێیت و ڕزگارت بکات و دوعات قبوڵ بکات، ئەم کردارە پەیوەندی بە خۆتەوە هەیە بۆ ئەوەی بگەیتە ئەنجام و ئەو ئامانجەی کە دەتەوێت و دەڵێیت (سبحان ربي الأعلى وبحمده) واتا پاک و بێگەردی بۆ پەروەردگاری بەرزم کە من بۆی گەردن کەچم.

ئەمەش ئەو ناونیشانەیە لە ڕێگای نوێژە فەرزەکانەوە دەگەین بە خوای موتەعال و سوننەتەکانیش زیاتر پلەو پایە و پاداشتت بەرزدەکەنەوە و زیاتر خۆشەویست دەبیت لای (الله)ی ئەم بوونە.

ئەم نوێژە پێویستی بە پێشەکیەک هەیە کە ناوی دەستنوێژە، ئەم دەستنوێژە شۆردنی حەوت ئەندامەکەیە کە خستوتەتە سەرزەوی لەکاتی سوجدەدا کە بریتییە لە شۆردنی دەم و چاو و دەستەکانت و باڵت تا ئەنیشکت و مەسحی سەرو گوێچکە و شۆردنی هەردوو پێکانت تا قولەپێت، خۆ ئەگەر ئەم دەستنوێژە دڵ و دەرونیشت پاک نەکاتەوە ئەوە دڵنیابە یاری کردنە بە ئاو!.ئەوەش بزانە کە تۆی بەڕێز کاتێک نوێژ دەکەیت نزاو پاڕانەوەیە لەخوای پەروەردگارت.

## بونیادی زەکات

زەکات واتا پاککردنەوە، زۆرێک لە خەڵکی فەرزی زەکات تەنها لە پارە و کەلوپەل و خۆراک دا دەبینێتەوە، ئەمە ڕاستە کە بەشێکی زەکاتە، بەشێکی تری پاککردنەوەی دڵ و دەروونە. خوای پەروەردگار پارەی لە دڵی هەموو کەسێکدا خۆشەویست کردووەو دەفەرموویێت: ﴿وَتُحِبُّونَ ٱلۡمَالَ حُبّٗا جَمّٗا ٢٠﴾ الفجر.



ماڵ و سامان و دارایشتان زۆر خۆش دەوێت (ڕەچاوی حەڵاڵ و حەرام).

خۆشەویستیەکی بێوێنەی هەیە لە دڵ و دەروون و دەست وگیرفانی خەڵکیدا، بەخشین لێی پیاوی بەخشندەو چەبوک و خواناس و دەست و دڵ باشی دەوێت.

گرنگە بزانیت خوای گەورە بۆ وا خۆشەویستی کردووە لە دڵی خەڵکیدا و بە تایبەت ئیمانداردا، لەبەر ئەوەی بزانێت ئایا دەتوانیت ببەخشیت، مرۆڤ ئەگەر لە سەروەتی ببەخشێت، چۆن لەکاتی دەبەخشێت بۆ بەندایەتی و بانگەواز ئەگەر مرۆڤ بە ڕاستگۆیی زەکاتی بەخشی لە پێناوی خوادا بە هەزاران، دڵنیا ئەبینەوە کە دەتوانێت ڕۆحیشی ببەخشێت لە پێناوی خوادا.

جۆری زەکات و شێوازی دانی و ڕێژەکەی هەمووی لە فیقهی ئیسلامیدا باسکراوە ئەوەی لە عەقیدەدا جێگای دەبێتەوە و بڕوا بوون پێیەتی بەدڵ و کردار و ڕەفتار و زمان.

ئەم زەکاتی پارەو سەروەرت و سامانە و جۆرەکانی لە فیقهی ئیسلامیدا ڕوونکراوەتەوە، بەشی گرنگی ئەم زەکاتە دڵ و دەروونە کە زانایان ناویان ناوە بە تەزکییەی نەفس کە خۆپاککردنەوەیە لە ڕیایی، درۆ، دەم پیسی، داوێن پیسی، چاوپیسی و.هتد. بەگشتی دەبێت مرۆڤ تەنها پارەکەی پاک نەکاتەوە بەڵکو دڵ و دەروونیشی پاک بکاتەوە.

بونیادی زەکات بۆ پەیوەندی کردن بەخوای پەروەردگارە، هاوکاتە لەگەڵ پاککردنەوەی خوودی مرۆڤ لەوەی کە پیسییە و پارەی حەرام تێکەڵ بە پارەی حەڵاڵت نەبێت، پاککردنەوەی دڵ و دەروونتە لە کارو ئافات و ئەو خراپەیەی کە لاشەت لەگەڵ دڵ و دەروونت تووشی دەبێت، خۆت فێری چاکە دەکەیت و هەوڵی ئیخلاص و دڵ پاکی دەدەیت، خۆت

ئامـادە دەکەیـت بـۆ مـردن و گەڕانەوەت بـۆلای خـوای پەروەردگـار بە ڕاســتگۆیی و چاوپــاکی و دەســتپاکی و دەســتگیری کردنـــی هەژار و بێدەرەتان و هاوکاری بێ باوکان و ژنانی بێ مێرد دەکەیت.

لە هەوڵی ئەوەدا دەبیت کە بگەیـت بە ئاسـتی فریشـتەکان و بەڵکـو باشـتریش ئەویـش بە پـاککردنەوەی مێشــک و عەقـڵ و دڵ و ڕەفتـار و کردارت لە هەمـوو شـەریک دانـان و هاوبەشـییەک بـۆ خـوا، هاوشـێوەی فریشتە دەتەوێت بەندایەتی و پەرستش بکەیـت، چـاونەترس و ئـازا بیـت لەپێناو دینی خوادا، ڕاستگۆ و دەسـتپاک دەبیـت لە ئەمـانەت دا، گـوێ بە لۆمەی لۆمەکاران نادەیت، تا ئەو کاتەی دەچیـتە پـلەی زاهیـد و عـارف و زاهید و خواناسی ڕاستەقینە و لەنێوان تۆ و خوادا هـیچ شـتێک نامێنێـت، تەنها ئیمان دەبێتە چێژت بـۆ بەرز بـوونەوە بـۆلای پەروەردگـارت ئەوەش پلەی بەرزی ئیمانە کە مرۆڤ هەمیشە بۆی لە هەوڵ دایە.

خوای گەورە لەقورئان دا باسی تەزکـیەی دڵ و دەروون دەکـات کە بە وشەی زەکات هێناویەتی و دەفەرموویێت:

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَٱسۡتَقِيمُوٓاْ إِلَيۡهِ وَٱسۡتَغۡفِرُوهُۗ وَوَيۡلٞ لِّلۡمُشۡرِكِينَ٦﴾ (ئەی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ پێیان) بڵێ: دڵنیئیبنو کە من هەر بەشەرێکم وەک ئێوە، ئادەمیزادێکم وەک ئێوە (جیاوازییەکە تەنها ئەوەیە): من وەحی و نیگام بۆ دەکرێت کە خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، (داواتان لێدەکەم کە ئێوەش) ڕووی تێبکەن، بەڕاستی بیپەرستن، لە ڕێبازەکەی لامەدەن، داوای لێخۆشبوونی لێبکەن، (وە چاک بزانن کە) وەیل و سزای سەخت بۆ موشریک و هاوەڵگەڕان (ئامادەیە).



﴿ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُم بِٱلۡأٓخِرَةِ هُمۡ كَٰفِرُونَ۝٧﴾ فصلت.

ئەوانەی زەکات نادەن و باوەڕیان بە ڕۆژی قیامەت نییە.

ئەگەر تەماشای ئایەتەکە بکەیت باسی موشریک و کافرە، بەڵام زەکات هاتووە لە کاتێکدا زەکات لەسەر موشریک واجب نیە هەتا موسڵمان نەبێت، یانی دانی زەکات لێکەوتەی ئیمانە نەک شیرک و کوفر، بەڵام بۆ باسی زەکات ئەکات کە موشریکەکان نایدەن؟ لەبەر ئەوەی ناخیان پیسە و لاقرتی بە هەژارو نەدار ئەکەن و خۆیان پێ زلە و حەز ناکەن هەژار لە هەژاری ڕزگاری ببێت، کەواتە ئایەتەکە زۆر جێی خۆیەتی لێرەدا کە بەناوی نەدانی زەکاتەوە خوای گەورە دڵڕەقی و ناخ پیسی- ئەوان ئاشکرا ئەکات کە سەر ئەکێشێ بۆ نەدانی زەکات و داخستنی دەرگا بە ڕووی لێقەوماوو گیرفان خاڵیدا. ئەمەش هاوکێشەیەک دروست ئەکات کە هەمیشە نەدانی زەکات نیشانەی ڕق ئەستوری و ڕەزیلی و چڵکنی دەرونی پارەدارەکانە لە هەژاران، جا ئەکرێت ئەو کەسە موشریک بێت و ئەیشگونجێت موسڵمانێکی کاڵ و کرچ بێت.

## بونیادی ڕۆژوگرتن لەمانگی ڕەمەزان دا

ڕۆژوگرتن لەمانگی ڕەمەزان دا فەرزە لەسەر موسوڵمان، ئەم ناونیشان و ئەدرەسە گەشتێکی زۆر خێرایە بەرەو لای پەروەردگار، چونکە ڕاستگۆیی و دروستی تێدا دەردەکەوێت. مرۆڤ لەبەرخاتری پەروەردگاری خۆی تینوو برسی دەکات، خۆ ئەگەر تەنهاش بێت ئەگەرچی خواردنیشی لابێت، بەڵام خۆی دەپارێزێت چونکە بەندایەتییە. خوای پەروەردگار دەفەرموویت خۆم پاداشتی ئەدەمەوە.

وشەی ڕەمەزان واتا زۆر گەرم و سوتێنەر، یاخود بە واتای سوتێنەری تاوان دێت.

حیکمەتی ئەم بەندایەتییە بۆ خوودی مرۆڤە، فێری دەکات چۆن دەست بگرێت بەسەر شەهوەتەکانیدا لەکاتی چونە دەسەڵات و بەرپرسیارێتیدا. ڕۆژو تاکە ڕێگایە بۆ ئەوەی مرۆڤ فێربکات کە سەروەت و سامانی خەڵکی بپارێزێت، مرۆڤی ڕۆژووەوان تەنها سکی برسی ناکات، بەڵکو مانای برسێتی ئەوەیە لە بەرخاتری سک و شەهوەتی سێکسیت چۆن بە زمانی ڕۆژوو دەیانپارێزیت لە حەرامەکانیکیش کە برسی دەبیت دزی ناکەیت یان دەسەڵاتت هەبوو پارە و سەروەت و سامان کەوتە بەردەستت بەڕۆژو بوون فێری کردوویت دزی و خراپەکاری و داوێن پیسی نەکەیت.

شاعیر دەڵێت: ڕۆژو تینوێتی و برسیتی نییە، گەر لە خراپە لای نەدا چییە؟

دریێغی ناکەیت لەباغی خەڵکی ڕۆژو گەر وابێت دەی کەڵکی چییە؟

هەروەها حورمەت و پیرۆزیەکانی خەڵکی دەپارێزێت، ڕۆژو وەرزش و فێرکردنە بۆ ئەوەی شەهوەتەکانت کۆنترۆڵ بکەیت.

فێرت دەکات حەرام نەخۆیت، بەدوای حەڵاڵ دا بگەڕێیت ئەگەرچی درەنگ وەختیش دەستکەوت فێری ئارام گریت دەکات، چۆن سەبرت گرت لەسەر خواردن و خواردنەوە فێرت دەکات ئارامگربیت لەسەر خراپەکاریش.

لەساڵێکدا مانگێک بەردەوام کۆبونەوە دەکەیت لەگەڵ پەروەردگاردا، بەتایبەت لە دە شەوی کۆتاییدا نزیک بوونەوەیەکی زۆر سەیر هەست پێ دەکەیت لەگەڵ پەروەردگارت، لە یەکەم ڕۆژی جەژن هەست



به سوکی تاوان دەکەیت و پاکبوونەوەت و نزیک بونەوەت لە خوای پەروەردگارت.

## بونیادی حەج

لە زمانەوانیدا حەج واتا مەبەست یان مەبەستێکی تایبەت، ئەم بەندایەتییە یەکێکە لە بونیادە گەورەکانی ئیسلام کە بەگوێرەی توانای مرۆڤەکە واجب دەکرێت لەسەری. سەرەتا ڕاستە بەندایەتییە، بەڵام هەموو یادەوەری و مێژووی پیاوچاک و خواناسان بە تایبەتیش پێغەمبەرانە لە ئادەمەوە کە بونیادی کەعبەی ناوە بۆ حەج و پاشان حەج کردن لەسەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیم کە باوکی پێغەمبەرانە تا ڕەسولی ئەکرەم محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

حەج تاکە ڕێگایە بۆ تێگەیشتن لە ژیانی قیامەت ئەو کەسەی دەچێت بۆ ماڵی خوا و دەست دەکات بە دروشمەکانی حەج لەکاتی حەج دا خوای گەورە فێری دەکات چۆن قیامەت و مردن دەست پێدەکات، ڕێک ناونیشان و ئەدرەسی قیامەتت پێ دەڵێت و ڕێگای کۆتا بونیادی ئەدرەسی خوای گەورەیە لە ڕووی بەندایەتیەوە.

ئەو کاتەی بەرگی سپی دەپۆشی بۆ ئیحرام و چوون بۆماڵی خوا وەکو ئەو کاتەیە کە کفن دەکەیت و دەگەڕێیتەوە بۆلای خوای پەروەردگار و هاوار دەکەیت (لبیک اللهم لبیک)، واتا خوایە واهاتم بۆلات پاشان چونت بۆ عەرەفات وەکو وەستانی ڕۆژی قیامەتە، گەڕانەوەت بۆ شەیتان ڕەجم کردن پەیمان دانە بە خوا کە طەرەفی خوایت نەوەکو شەیتان، پاشان چونت بۆ طەوافی ئیفاضە و خواردنەوەی ئاوی زەمزەم و گەڕانەوە بەدوای نەجات بووندا، سەفا و مەروا، چوونە بۆلای هەموو پێغەمبەران تا



لە کۆتاییــدا دەچیــتە مەدیــنەی پێغەمــبەر و ئومێــدی تەواوت هەیە بە شەفاعەتی ئەو پێغەمبەرە لە ڕۆژی قیامەت دا.

ئەم دروشمە کۆبونەوەی ژیانە جارێک یـان چەنـد جارێـک بـۆ ئەوەی فێری چوون بۆ قیامەت بیت، هەربۆیە خوای پەروەردگار لەباسی سـورەتی حەج دا بە دروشمی حەج دەست پێناکـات، لەم سـورەتەدا سـەرەتا باسـی قیامەت دەست پێ دەکات و ترسناکی ئەو ڕۆژەت نیشان ئەدات.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمْۚ إِنَّ زَلْزَلَةَ ٱلسَّاعَةِ شَىْءٌ عَظِيمٌ ١﴾ ئەی خەڵکینە لە پەروەردگارتان بترسن و خۆتان لە خەشمی بپارێزن چونکە بەڕاستی زەوی لەرزەی قیامەت و کاول بوونی بوونەوەر کارەساتێکی زۆر گەورەیە و ڕووداوێکی سامناکە.

﴿يَوْمَ تَرَوْنَهَا تَذْهَلُ كُلُّ مُرْضِعَةٍ عَمَّآ أَرْضَعَتْ وَتَضَعُ كُلُّ ذَاتِ حَمْلٍ حَمْلَهَا وَتَرَى ٱلنَّاسَ سُكَـٰرَىٰ وَمَا هُم بِسُكَـٰرَىٰ وَلَـٰكِنَّ عَذَابَ ٱللَّهِ شَدِيدٌ ٢﴾ الحج. لەو ڕۆژەدا کە کارەساتەکە دەبینن، هەموو شیردەرێک لە شیر خۆرەکەی بێئاگا دەبێت و

فەرامۆشــی دەکـات، هــەموو سـک پـڕو دوو گیـانێکش کۆرپەلەکـەی دادەنێت، خەڵکی دەبینیت، وەکـو سەرخۆشـن، لـە ڕاسـتیدا سەرخۆشـیش نین، بەڵکو سزای خوایی زۆر سەخت و سامناکە و سەری لێ شێواندوون.

## ئیسلام و ئیمان یەک پاکێجن

ئەو دروشمانەی باسمان کردن بریتی بوون لە بونیادی ئیسلام، ناکرێـت و جێگای قبوڵ نییە مـرۆڤ بڵێـت مـن بەتەنهـا ئەم شـتانە پیـادەکەم ئیـتر چوونە بەهەشتم مسۆگەرە.



دەبێت ئیسلام و ئیمان پێکەوە پیادە بکات ئینجا ئیسلام تەواو دەبێت بەهەمان شێوەش ئیمان کامل دەبێت لە ڕووی بونیاد و ئەرکەکانەوەیە.

جونکە خوای پەروەردگار لە قورئاندا باسی لازم و مەلزومی هەردووکیان دەکات بەیەکەوە کە دەشتەکیەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەشتەکی بەنی ئەسەد بوون (ئەعراب) بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ یان وت کە ئەوانیش ئیماندارن، خوای گەورە ئیمانەکەی قبوڵ نەکردن، چونکە تەسلیم بوون بە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و نوێژ و ڕۆژوویەکی مردویان دەکرد و زەکاتیان لە ترسا دەدا، بەڵام خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی پاداشتی ئیسلامەکەی لێ قبوڵ کردن، بەڵام داوای ئیمانی لێکردن دەبێت ڕازی بن بە جیهاد و خەبات و بچنە ناو دەوڵەتەکەی پێغەمبەری خواوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ, ڕازی بوون بە ئیسلام تەنها دروشمەکان نییە، بەڵکو هەردوو سیستەمەکە(ئیسلام و ئیمان) بەیەکەوە دەبێت قبوڵ بکرێت. دین فێری خواو پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ مەکەن ئەوان فێرتان دەکەن، دین لەلایەن خوا و پێغەمبەرەوە هاتووە خوای پەروەردگار دەزانێت ئیمان چ مانایەکی هەیە و چۆن دەتگەیەنێت بە خۆی. فێریش مەبن منەت بکەن بەسەر خوا و پێغەمبەردا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، بەڵکو خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ منەت دەکەن بەسەرتاندا کە هیدایەت دراون بۆ ئەم ئایینە ڕاست و دروستە.

خوای گەورە لە سورەتی (الحجرات ئایەتی ١٤-١٨) بە ڕوونی باسی دەکات و دەفەرموێت:



﴿۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤﴾ بیابان نشینە عەرەبەکان دەڵێن: باوەڕمان هێناوە و موسوڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵکو تەسلیم بوون، چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، خوای گەورە لە (پاداشتی) چاکەکانتان کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا هێناوەو پاشان ناکەونە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بۆ خۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێدەکۆشن لە پێناوی ئایینیی خوادا.لە ڕاستیدا ڕاست و ڕاستگۆ هەر ئەوانەن.

﴿قُلۡ أَتُعَلِّمُونَ ٱللَّهَ بِدِينِكُمۡ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ ١٦﴾ (بە عەرەبە بیابان نشینەکان) بڵێ: ئایا ئێوە خوای گەورە لە دینی خۆتان ئاگادار دەکەن و پێی ڕادەگەیەنن؟! لە حاڵێکدا خوا زانایە بەهەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، وە خوا بە هەموو شتێک زاناو ئاگادارە.

﴿يَمُنُّونَ عَلَيۡكَ أَنۡ أَسۡلَمُواْۖ قُل لَّا تَمُنُّواْ عَلَيَّ إِسۡلَٰمَكُمۖ بَلِ ٱللَّهُ يَمُنُّ عَلَيۡكُمۡ أَنۡ هَدَىٰكُمۡ لِلۡإِيمَٰنِ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ١٧﴾ ئەوانە منەت دەکەن بەسەر تۆدا کە گوایە موسوڵمانن، پێیان بڵێ: منەت مەکەن



بەسەرمدا لەسەر موسوڵمان بونەکەتان، بەڵکو خوا منەت دەکات بەسەر ئێوەدا کە هیدایەتی داون بۆ ئیمان و باوەڕ ئەگەر ئێوە ڕاستن لە ئیمان و باوەڕتاندا.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ غَيۡبَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٨﴾ الحجرات. بگومان خوا نهێنی و شاراوەکانی ئاسمان و زەوی دەزانێت، هەروەها خوای گەورە بینایە بەهەموو ئەو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

کەواتە ئیسلام و ئیمان تەواوکەری یەکترن، زۆرجار مانای ئیسلام هەر بە ئیمان هاتووە چونکە لە ڕاستیدا دین واتا ئیمان، هەر ئیمانە لە کایەکانی دیندا فەرمان و کاری خوا ئەدات بەسەر ئیماندار و ناوی ئیماندار دەنێت و پلە بە ئیمان بەرز دەکاتەوە بۆ لای پەروەردگاری.

ئەم دروشمانەی کە بونیادی ئیسلامی پێکهێنابوو واتا شایەتومان، نوێژ، ڕۆژوو، زەکات و حەج دروشیمی نەگۆڕن لە بەندایەتی دا واتا (تەوقیفین)، زیاد و کەم ناکرێت و دەبێت وەکو خۆی ئەنجام بدرێت، هەروەکو ئاماژەمان پێداوە ناونیشان و ئەدرەسی خوای پەروەرگارن زیاد و کەم بێت هەڵە دەردەچێت و پەیوەندیەکەت دەپچڕێت لەگەڵ خوادا چونکە خوای پەروەردگار بەو شێوەیە دەیەوێت نابێت (بیدعە)ی تێدا بەکار بهێنرێت.

عەقڵی مرۆڤ لەم ناونیشان و ئەدرەسانەدا هیچ بەهایەکی نییە جگە قبوڵ و جێبەجێکردن، کەس ناتوانێت بڵێت بە عەقڵی خۆم بونیادی ئیسلام دەنێم.

بەڵام بەندایەتیەکانی تر بەگشتی تەوقیفی نین، وەکو جیهاد، ئیحسان، قورئان خوێندن. واتا کات و ڕەفتاری تایبەتیان نییە و کراوەن بۆ زۆر شوێن و زۆرکاتی جیاجیا.هتد.



## بیدعه چییه؟

بیـدعه بـریتییه لە داهێنـان لە عیبادەتـدا کە خـوا و پێغـەمبەرەکەی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ ئاماژەیـان پێـنەداوە، واتـا زیـاد و کەم کـردن لە عیبادەتدا، بەڵام بیدعە لە ئیسلامدا زیـاتر بـۆ بەنـدایەتیەکی زیـادکراوە لە ئیسـلامدا کە بـنەڕەت و هـیچ دەقێکـی قورئـان و فەرمـوودەی لەسـەر نەهاتبێت، ئەوە پێی دەوترێت بیدعە.

هەرکەس بیــدعەیەک دابهێنێــت لە قیامەتــدا جێگــای دۆزەخە و لە دنیاشدا سەرلێشێواوە.

هەنـدێک جـار وشـەی (محـدث) لەگەڵ بیـدعەدا هـاتووە، کەمـتر لەم سـەردەمەدا بـاس دەکرێـت ئەویـش بە واتـای گۆڕانکـاریە لەو پەیـمان و عەقدەی کە لە یاسای ئیسلامدا هەیە، چونکە لە ڕووی زمـانەوانییەوە واتـا پەیمانێــک کە بشــکێنرێت لەگەڵ دەســەڵاتدارێک یــان پــێچەوانەکەی دەسەڵاتدارێک پەیمانێک بشکێنێت لەگەڵ ڕەعیەتەکەی.

ئەم باسـە گومـانی تێـدا نیـیە کە ئـایەت و فەرمـوودەی زۆری لەسـەر هاتووە، ئایەتەکان بریتین لە سورەتی یونس:

﴿فَذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمُ ٱلۡحَقُّۖ فَمَاذَا بَعۡدَ ٱلۡحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُۖ فَأَنَّىٰ تُصۡرَفُونَ﴿٣٢﴾﴾ (جا ئیتر دڵنیا بن هەر ئەو زاتەیە) پەروەردگاری ڕاست و دروستان، (باشە) دوای حەق و ڕاستی چیّ هەیە جگە لە گومڕایی و سەرگەردانی، (ئیتر ئێوە بۆ بیر ناکەنەوە) ڕوو دەکەنە کویّ، ڕوو دەکەنە کیّ، بۆ کویّ دەچن؟!



﴿وَمَا مِن دَآبَّةٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا طَٰٓئِرٖ يَطِيرُ بِجَنَاحَيۡهِ إِلَّآ أُمَمٌ أَمۡثَالُكُمۚ مَّا فَرَّطۡنَا فِي ٱلۡكِتَٰبِ مِن شَيۡءٖۚ ثُمَّ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ يُحۡشَرُونَ ٣٨﴾ الأنعام. هیچ زیندەوەرو گیانلەبەرێک نییە بەسەر زەویدا بڕوات، یا باڵندەیەک کە باڵەکانی بفڕێت و ئەوانیش ئوممەت و گەلێک نەبن وەک ئێوە، (دڵنیابن) هیچ شتێک نییە پشت گوێمان خستبێ لە کتێبە (تایبەتی یەکەدا) کە (لوح المحفوظ)ە لەوەودوا هەرهەموو ئەوانە کۆدەکرێنەوە لای پەروەردگاریان (بۆ ئەوەی دادگایی بکرێن و هەموو کەس مافی خۆی وەرگرێت یا تۆڵەی ڕەوای لێ بسەنرێتەوە).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ النساء. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خوودی خۆتانن، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان، ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی صلی الله علیه وسلم، (کە پیادە کردنی قورئان و سونەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتار کردنتان) بەو شێوەیە چاکترو ڕونترو ڕەوانترە.

﴿وَأَنَّ هَٰذَا صِرَٰطِي مُسۡتَقِيمٗا فَٱتَّبِعُوهُۖ وَلَا تَتَّبِعُواْ ٱلسُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمۡ عَن سَبِيلِهِۦۚ ذَٰلِكُمۡ وَصَّىٰكُم بِهِۦ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ١٥٣﴾ الأنعام. بێگومان ئەمەی (کە باس کرا) ڕێبازی ڕاست و ڕاستەقینەی منە شوێنی کەون، شوێنی ڕێبازە (جۆراوجۆرەکان) مەکەون تا لە ڕێبازەکەی خوا وێڵ نەبن، ئابەو شێوەیە پەروەردگارتان ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو خواناس و پارێزکار بن.



﴿قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣١﴾ آل عمران. (ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ) بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و له فەرمانی من دەرمەچن، ئەوكاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و له گوناهو هەڵەكانیشتان خۆش دەبێت، (چونكە ئەو) خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

هەروەها فەرمـوودەی پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ مـان هەیە كە هەركەس لە شەریعەت زیاد و كەم بكات ئەوە قبـوڵ ناكرێـت و ڕەت دەكرێتەوە، دەقی فەرموودەكە دەفەرمووێت: عن عائشـة -رضي اللـه عنها- قالت: (قال رسول اللـه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ: مـن أحـدث في أمرنـا هذا ما ليس منه فهو رد).[٨]

لێرە مەبەسـت بیـدعەی عیبـادەت نییە، خـوای گەورەش لەهەمـووان زاناترە. بەڵكو پێم وایە كە مەبەسـت سیسـتەمی ئیسـلامیە گۆڕانكـاری لە یاسا و ڕێساكاندا بكرێت بە گشتی قـابیلی قبـوڵ نییە، بە بەڵـگەی ئەوەی بیـدعەیە و داهێنـانە لەنـاو عیبـادەتەكەدا. بەڵام لێـرەدا بە لەفـزی یـاخود وشەی (من أحدث) بەكار هاتووە، عەرەب بە شـێوەیەكی گشـتی لە ڕووی سیاسـی و سـەربازییەوە ئەم وشـەیەی بەكـار هێنـاوە، كـاتێ پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ بەنی شەیبان قسـەی كردبـوو بـۆ داڵـدان و چـوون بـۆ نـاو بەنـی شـەیبان پـێش چـوونی و هیجرەتـی بـۆ مەدینـە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ داوای كرد كە دەبێت بپارێزرێن لە هەمـوو جـۆرە دوژمنێـك كە عەرەب دەڵێـت (حـرب الأحمـر والأسـوود)

---

[٨] متفق عليه.



لەوەلامدا بەنی شەیبان وتیان ئێمە پەیمانمان هەیە لەگەڵ فارس کە ناوی پەیمانیان برد بە (محدث) باسکراوە، پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ قبوڵی نەکرد، هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە بە شێوەیەکی دیکە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (من عمل عملاً ليس عليه أمرنا فهو رد).[٩]

لێرەدا وشەی أمرنا بەمانای عیبادەت نایەت، بەڵکو لە هەردوو فەرموودەکەدا بە واتای (شەریعەتی ئیسلام)ە لە باسی بیدعەدا، من وا پەی دەبەم کە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ محدث-ی لە بیدعەدا کۆکردۆتەوە. لە فەرموودەیەکدا دەفەرمووێت:

أَمَّا بَعْد إِنَّ خَيْر الْحَدِيث كِتَاب اللَّه, وَخَيْر الْهَدْي هَدْي مُحَمَّد, وَشَرّ الْأُمُور مُحْدَثَاتها, وَكُلّ بِدْعَة ضَلَالَة.

هەرچەندە لە فەرموودەی تریشدا هاتووە، بەڵام لاوازی لە سەنەدیدا هەیە، کە دەفەرمووێت:

كل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.

لە کۆتاییدا هەموو باس لە گۆڕانکارییە لەناو شەریعەت و دینێکدا، کە هیچ ئەسڵێکی نییە یاخود بەندایەتی تەوقیفە و نەگۆڕە، هەرگۆڕانکارییەک لە دیندا زیاد و کەم بکرێت بە درۆخستنەوەی قورئانە، کە خوای پەروەردگار لە سورەتی المائدة دا دەفەرمووێت:

﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ وَٱلدَّمُ وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ وَٱلنَّطِيحَةُ وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ

[٩] رواه مسلم.

وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ ٱلۡيَوۡمَ يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن دِينِكُمۡ فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ وَٱخۡشَوۡنِۚ ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗاۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ فِي مَخۡمَصَةٍ غَيۡرَ مُتَجَانِفٖ لِّإِثۡمٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣﴾ المائدة.

گۆشتی مردارەوەبوو، خوێن و گۆشتی بەراز لێتان حەرام کراوە، هەروەها ئەو ماڵاتانەش کە سەردەبڕدرێن و ناوی غەیری خوای لەسەر دەبرێت، ماڵاتی خنکاویش، ئەوەش کە بە ئازارو لێدان مردار دەبێتەوە، یا دەکەوێتە ناو بیرێکەوە و مردار دەبێتەوە، ئەو ماڵاتەش کە بە شۆقی ماڵاتێکی کە مردار بوبێتەوە، ئەوانەش کە دڕندەی کێوی پەلاماری دئیبنو و لێی خواردبن مەگەر فریای چەقۆ کەوتبن، (هەر حاڵەتێک لەوانەی باسکرا ئەگەر بە چەقۆدا بگات حەڵاڵە) بەڵام ئەو ماڵاتانەی کە لە شوێنی تایبەتیدا بۆ بتەکان سەردەبڕدرێن ئەوانەش هەر حەرامە، هەروەها حەرامە سوێند خواردن و پشت بەستن بەو دارو تەختە بچوکانەی (کە خۆتان دەیتاشن و)، ئەو جۆرە کردارو ڕەفتارانە سەرپێچی و دەرچوونە لە (فەرمانی خوا). ئەمڕۆ (کە ڕۆژی عەرەفەیە) کافران نائومێد بوون لە دین و ئایینی ئێوە (ئیتر ناتوانن زاڵ بن بەسەرتاناو هەرگیز نوری خوایان بۆ ناکوژێتەوە) کەواتە لەوانە مەترسن بەڵکو هەر لە من بترسن ئەمڕۆ ئایین و بەرنامەکەتانم بە کۆتایی گەیاند، وە نازو نیعمەتەکانی خۆمم بۆ تەواو کردن وە ڕازیم بەوەی کە ئیسلام ببێتە بەرنامەو دین و ئایینتان. (جا لەگەڵ بڕیاردانی ئەو شتانەدا کە حەرامامان کردووە) هەرکەس ناچار بوو لە گرانیی و برسێتیدا (وە مەترسی ئەوەی هەبوو بمرێت) دەتوانێت لەو شتانە بخوات کە حەرامامان کردووە بەمەرجێک دەست درێژکار نەبێت و بەئارەزوو ژەمی زۆری لێ نەخوات و خۆی توشی گوناهو تاوان نەکات، بەڕاستی خوا لێخۆشبووەو میهرەبانە (بەبەندەکانی).

هەروەها لە سورەتی النساء دەفەرمووێت:



﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ النساء. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خوودی خۆتانن، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان، ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ، (کە پیادە کردنی قورئان و سونەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتار کردنتان) بەو شێوەیە چاکترو ڕونترو ڕەوانترە.

## ئیحسان چییە؟

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویێت: إن اللـه مُحسـنٌ يحبّ الإحسان.

خوای پەروەردگار چاکەخوازە و چاکەخوازیشی خـۆش دەوێـت. مانـای ئەم فەرمودەیە لە صەحیحی موسلیم دا هاتوە بەڵام صیغەکەیان جیایە.

زانایان دەفەرموون: مرۆڤی موسـوڵمان دەتوانێـت ئیحسـان لە هەمـوو کارەکانی ئەنجام بدات، چونکە ئیحسان لە هەموو شتێکی مرۆڤ دا هەیە، لە فەرزەکانیـدا لە سـونەتدا، لەهەڵـس و کەوتـی ڕۆژانەیـدا لە کـارو فەرمانیدا.هتد.

پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ لە فەرمـوودەی پرسـیاری جوبرەئیل دا دەفەرموویێت: ئیحسان لەوەدایە کە خواپەرستی و بەندایەتی بکەیت بەوەی خوای پەروەردگار دەیبینیت و لە پێش چاوتایە، خـۆ ئەگەر خوا نابینیت، خۆ پەروەردگار تۆ دەبینێت. ئەمە جوانترین و پڕ مانـاترین و

تەواوترین پێناسەیە بۆ ئیحسان. (أن تعبد الله كأنک تراه فإن لم تکن تـراه فإنه يراک).

خوای پەروەردگار لە چەند جێگایەکی قورئاندا دەفەرمووێـت (إن الـله مع المحسنين) ئەمەش ئەوەمان نیشان دەدات زۆرجـار مـرۆڤ بە ئیحسـان پلەی بەرز دەبێتەوە، شێوە و ئەدرەس و ناونیشانێکە بۆ گەیشتن بە خـوای پەروەردگار.

دوکتـۆر محمـد راتـب النابلسـی دەگێـڕێتەوە لە شـاری دیمەشـق لە گەڕەکـی قـابون لە مزگەوتـی قـابون، کە بەنـاوی گەڕەکەکەوە نـاونراوە ڕووداوێـک ڕوویـداوە بەو ڕووداوە دەتوانیـت ئیحسـان دەسـت نیشـان بکەیت.

کوڕێکی لاو هاوسەرگیری دەکات، لەدوای چەنـد هەفـتەیەک هەسـت دەکات خێزانی سکی لە سەروو چوار مانگیەوەیە! دوای ئەوەی ئـافرەتەکە دان دەنێـت بە هەڵە و تاوانەکەیـدا، هاوسـەرەکەی مـافی خـۆیەتی کە تەڵاقی بدات و کەرامەتیشی بشـکێنێت و بیگەڕێنێـتەوە بـۆ مـاڵی بـاوکی، بەڵام ئەم کوڕە گەنجە لە بەرزترین پلەی ئیماندا دەژی و بەخێزانی دەڵێت لەبەرخـاتری خـوا بـۆت دەپۆشـم و دەرمەکەوە تـا سـکەکەت دادەنێیـت، کاتێک کە منداڵەکەی بوو هەستا بەیانیەک زوو منداڵەکەی برد بۆ دەرگای مزگەوت دایناو خۆشـی دواخسـت لەدوای هەموویـان هـاتەوە، کە بینـی خەڵک هەمووی دەوری منداڵەکەیان دابوو، ئەویش وتی چـی ڕوویـداوە؟ باسی ئەوەیان بۆ کرد کە منداڵێک لێرەدا فڕێ دراوە.

ئەویش وتی: بیدەنە من تازە هاوسەرگیریم کردووە لەگەڵ خێـزانەکەم بەخێوی دەکەین، ئەگەر خاوەنیشی بوو ئەوە هەموو دەزانـن کەلای مـنە، منداڵەکەی بردەوە بۆلای دایکی. ئەوەش مانای ئیحسانە.



ئیحسان لەهەموو شتێکدا وەکو ڕۆح وایە، لە قانوندا ڕۆحی قـانونە، لە بەخشندەییدا ڕۆحی

بەخشـندەییە، لە جیهـاد دا ڕۆحـی جیهادە..هتـد. بەکـورتی ئیحسـان مەرتەبە و پلەی مرۆڤ دەکاتە پلەی پیاوچاک و عارف و زاهید.

بە ئـیمان و ئیسـلام و ئیحسـان مـرۆڤ لەم دنیـایەدا ڕێـدەکات و هاوکـاریەتی بـۆ گەڕانەوەی بـۆ قیـامەت و قەبـرەکەی، ئەمەش ئەو پارسـەنگییە مـرۆڤ لەڕووی بەنـدایەتیی و ئەخلاقـی و هەمـو وسیسـتەمەکانی ژیـان بەدەسـتی دەهێنێـت، هەریەک لەم پاکێجـانەی باسمان کرد پارسەنگی ئەدات بە مرۆڤ، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ ٩٠﴾ النحل.

بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بـە خزمـان، وە قەدەغـە لـە گونـاهو تـاوان و دەسـتدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس) وە ئامۆژگاریتان دەکـات بـەڵکو یاداوەری وەرگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

هەندێک لە زانایان دەفەرمـوون، ئیحسـان فەرزە لەسـەر موسـوڵمانان، چونکە خوای گەورە ئەمری پێکردووە.

# بەندی چوارەم

ئیمان واتا هەنگاوی یەکەم نان
تەنانەت ئەگەر تەواوی ڕێگاکەش شارەزا نەبیت..
دڵنیابە کاتێک ئیمانت هەبوو وە بەتەواوی وجوودت لە دڵ
و لە ژیانت خوای پەروەردگاری تێدابوو
بەبێ قەید و شەرت خوای گەورە کارت ئاسان دەکات.
کەواتە هەر ئێستا بڕیار بدە و هەنگاوی یەکەم هەڵبهێنە!

# پێکهاتەی پاکێجی ئیمان

ئەگەر ئـیمان بونیـاد و ئەرکـانی هەبێـت، بـێ گومـان پێویسـتی بە پێکهاتەیەکە تاکو بونیادەکە بینا بکرێت، گومـانی تێـدا نیـیە ئەو ئـیمانەش پێویستی بە ووزەیە لە ڕاستیدا ووزەکەش خواناسیە.

بەڵام پێکهاتە سەرەکیەکانی ئیمان بریتییە لە: پـاکو خـاوێنی، ئـیخلاص، نییەت، تەوبەکردن، ئارامگرتن، ڕاستگۆیی، چاودێری کردنی خوودی خۆت، تەقـوا، یەقـین و دڵنیـابوون، تەوەکـول، بەردەوام بـوون - ئیسـتیقامە -، هەوڵـدان بـۆ کـاری چـاکە، خۆسـاغ کـردنەوە بـۆ دیـن، کۆشـش کـردن، ئامۆژگاری و برایەتی و سیلەی ڕەحم.

ئەشێت زانایان توخم و پێکهـاتەی زیاتریـان بـاس کردبێـت، بەڵام مـن لەگەڵ تۆدا بەوەندە کۆتایی پێدەهێنم و دەچمە ناو شیکاری بـۆ هەریەک لەم پێکهاتانە.

## پاکژی

لێرەدا مەبەست بەشـی پاکوخـاوێنی لاشـە وجـل و بەرگـی نـوێژ نیـیە، بەڵکـو پـاکژی بە هەمـوو ماناکـانی، پـاکژی لە ڕق و کیـنە بەرامـبەر بە موسڵمان، ئەوەی لە حیزبەکەت یان گـروپ و جەمـاعەتەکەت نەبێـت، بە چـاوی کەم تەماشـای بکەیـت یـان لەبەرئەوەی بە دڵـی تـۆ نـاجولێتەوە: تەکفیر و تەفسیق و تەبدیع و..هتد دەکەیت.

ئیمان پابەنـد بـونە نەک دەمـارگیری، بەداخەوە ئێسـتا لە موسـڵماناندا پێوەر پێوەری خواناسین نییە، بەڵکو: جەماعەت، فیرقە، مەزهەب و حیزب

کاردەکات، هەریەک ناوێکی لە خۆی ناوە، پەروەردگاریش لەسەر زمانی حەزرەتی ئیبراهیم دەفەرمووێت:

﴿وَجَٰهِدُواْ فِي ٱللَّهِ حَقَّ جِهَادِهِۦۚ هُوَ ٱجۡتَبَىٰكُمۡ وَمَا جَعَلَ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلدِّينِ مِنۡ حَرَجٖۚ مِّلَّةَ أَبِيكُمۡ إِبۡرَٰهِيمَۚ هُوَ سَمَّىٰكُمُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ مِن قَبۡلُ وَفِي هَٰذَا لِيَكُونَ ٱلرَّسُولُ شَهِيدًا عَلَيۡكُمۡ وَتَكُونُواْ شُهَدَآءَ عَلَى ٱلنَّاسِۚ فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱعۡتَصِمُواْ بِٱللَّهِ هُوَ مَوۡلَىٰكُمۡۖ فَنِعۡمَ ٱلۡمَوۡلَىٰ وَنِعۡمَ ٱلنَّصِيرُ ٧٨﴾ الحج. هەروەها بەردەوام بن لە خەبات و جیهاد و هەوڵ و کۆشش لە پێناوی خوادا بەو شێوەیەی کە شایستەیەتی، لەبەر خاتری ئەو بێت، ئەو زاتە بۆ ئەوە هەڵی بژاردوون و لە ئایین و بەرنامەکەیدا هیچ جۆرە شتێکی نارِهواو قورس و گرانی لەسەر دانەناون (کە نەتوانن ئەنجامی بدەن، جا ئەم بەرنامەیە) رێ و شوێن و بەرنامەی ئیبراهیمی باواتانە کە پێشتر هەر خوای گەورە ناوی ناون موسڵمان و لەم قورئانەشدا بەموسڵمان ناوی بردوون، تا پێغەمبەر ببێتە شایەت بەسەرتانەوە (کە پەیامی خوای پێ ڕاگەیاندوون) و ئێوەش (بە گەیاندنی ئەو پەیامە) ببنە شایەت بەسەر خەڵکیوە، کەواتە نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش (لە ماڵ و سامانتان) دەربکەن و پشت بەخوا ببەستن، چونکە هەر ئەو زاتە یارو یاوەرتانە، جا دڵنیابن کە خوا چەندە یارمەتیدەرێکی چاکە و چەندە پشت و پەنایەکی بەهێزو بە نرخە.

خوا ناوی ناوین موسوڵمان هەریەک ناوێکی تری هەڵبژاردوە، ئەمەش واتای دەمارگیریە نەک ئیلتیزام و پابەندبوون بە بنەڕەتی ئایینەکەوە. پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (الطُّهُورُ شَطْرُ الإِيمانِ) واتە: پاکژی نیوەی ئیمانە.



ئەوەش مانــایەکی زۆر گەورەی هەیە، نەک بە واتــای خۆشــۆردن بە صابوون و شامپۆ، بەڵکو ئیمان: پاکەرەوەیە خۆی، لە شرک و فسق و کـوفر هەموو کارە خراپەکانی تـر. بـۆیە پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ نیوەی ئیمانی، بە پاکژی لە هەموو ئەندامەکانی لەش لەنـاوەوە و دەرەوە داناوە وەک داوێن پاکی، دەم پـاکی، دڵ پـاکی، چـاو پـاکی، گـوێ پـاکی.. هتد، گرنگە مرۆڤـی خـاوەن ئـیمان لەگەڵ ئـاوی دەسـت نـوێژ، بە نـوێژ و خواپەرستی ئەندامەکانی تری پاکژ بکات.

## ئیخلاص و دڵسۆزی

خـوای پەروەردگـار فەرمانمـان پـێ دەکـات لە پەرسـتن و خواناسـی و عیبادەتەکانـدا خـاوەن ئـیخلاص و دڵسـۆزی بـین ١٠٠٪ کـار بـۆ خـوای پەروەردگار بکەیـن، هـیچ جـۆرە خۆویسـت و خەڵـک ویسـتی و ناوبانـگ ویستی و خۆبادان لە بەندایەتییەکانماندا نەبێت.

کە دەچن بۆ حەج بۆ ئەوە نەبێت پێی بڵێن حاجی، کە نوێژ دەکەیت بۆ سومعە و خۆبادان و ڕیا نەبێت، ڕۆژوو دەگریت لەبەر خاتری کۆمەڵگا و گەڕەک و دراوسێکانت نەبێت، بۆ خوا کاربکە، کە خێر و چاکەو زەکـات نەدەیت بۆ ئەوە نەبێت بڵێین دەست و دڵی باشە، چونکە ٩٩.٩٪ بـۆ خـوا بێت ٠،١٪ بۆ خۆت بێت خوا قبوڵی ناکات، دەبێت بەنـدایەتی و کارەکـان هەموو لەپێناو خوادابێت.

خوای پەروەردگار ئەمرمـان پـێ دەکـات لە قورئانـدا کە بە دڵسـۆزی و پاکی ئیسلامەتی و بەندایەتی بۆ بکەین، خوا گەورە دەفەرموویت:



﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ البينة. فەرمانیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی خواپەرستی بکەن و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو بن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، (بێگومان) هەر ئەوەشە دین و ئایینی ڕاست و دروست.

کاتێک قوربانی دەکەیت خۆ خـوای گەورە پێویسـتی بە گۆشـت نیـیە، بەڵکو دڵ و دەروونی تۆ بەرامبەر بە قوربانیەکەت بۆ کێیە، بۆ (الله)یە یان بۆ ناو و ناوبانگ.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿قُلۡ إِن تُخۡفُواْ مَا فِي صُدُورِكُمۡ أَوۡ تُبۡدُوهُ يَعۡلَمۡهُ ٱللَّهُۗ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ٢٩﴾ آل عمران. پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوەی لە سینەتاندایە، بیشارنەوە یاخود ئاشکرای بکەن (چوونییەکە) خوا بە هەموو شتێک دەزانێت و زانیاری تەواوی هەیە بە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە، دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە. هەندێک لە زانایان ئیخلاص و نییەتیان بە یەکەوە داناوە، خۆی نییەت هەمیشە حزوری هەیە جا بۆ کاری خێر یان شەڕ بێت، یانی ناگونجێت هیچ نێیەتێکت نەبێت و کارێکیش بکەیت، بەڵام ماوەتەوە سەر ئەوەی ئایا ئیخلاست هەیە بۆ خوا یان ئیخلاست هەیە بۆ غەیری خوا!، یانی ئیخلاسەکە یان ڕیاکاریەکە ئەبێتە سیفەت بۆ نییەتەکە، واتە ئەگونجێت کەسێک خاوەنی ئیسلام بێت لە کارکردندا، بەڵام نییەتەکەی فاسدە، جا بۆ سەرکردەیە، یاخود بۆ حیزبە بەڵام دوریش نییە خاوەن ئیخلاص و دڵسۆزی بێت لە کارکردندا.

## نییەت و چەسپاندن لە دڵدا

هەموو زانایانی ئەهلی سونەت و جەماعەت لەسەر ئەوە کۆکن نییەت لە دڵدایە منیش لێرەدا کە ئەم دوو پێکهاتەی نییەتمان جیا کردوەتەوە، هۆکارەکەی لەکارکردندا بۆ ئەوەی دڵسۆزی لە کارکردندا و بەتایبەت لە لای هەندێک وەکو بەرپرسیارێتی دەیبینێت، بەڵام نییەتی لەسەر دانامەزرێت.

بۆ نموونە: کاتێک ئافرەتێک هاوسەرەکەی دەگەڕێتەوە لە کار دڵسۆزە و خاوەن ئیخلاصە بۆ مێردەکەی، ماڵی بۆ پاک کردۆتەوە، خواردنی بۆ دروست کردووە، هەر لە گەڕانەوەیدا بەدەمیەوە پێدەکەنێت، خێرا ئاو و فێنکایی ئەداتێ، هەموو ئەم دڵسۆزییە کارێکی پڕ بەهاو بەنرخە، ئەگەر نییەت بۆ خوابێت، پاداشت و ئەجری بێ وێنەیە، بەڵام ئەصلی کردارەکە بەندایەتیە خۆ ئەگەر نییەتی بۆ ڕازی کردنی مێردەکەی بوو، ئەوە ئەمر و پاداشتی دەبێت لە مێردەکەی وەرگرێت، کەواتە ئەصڵ لە کارەکەدا دڵسۆزی پێوە دیارە، بەڵام نییەت لە جێگایەکی ترە. هەروەکو پێشمەرگەیەکی قارەمان و خواناس و ديندار، دڵسۆز بۆ میللەت و خاک و نیشتمان و لەسەرووی هەموویانەوە خواناس و دینداره، بەڵام دڵسۆزە بۆ کارەکەی کە لە ژێر ئاڵای حیزبێکی عەلمانی کاردەکات، نییەت بۆ خوانییە، بەڵکو بۆ عەلمانییەتە، ئەمەش ترسناکە بۆ قیامەت.

بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (ثم يُبْعَثُونَ على نِيَّاتِهِم).

واتە لەسەر دڵسۆز بوون پرسیاری لێ ناکرێت لە قیامەت! زیندوو دەکرێتەوە لەسەر نییەت.



لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (إنَّما الأعـمالُ بالنِّيّـاتِ وإنَّمـا لكـلِّ امرئٍ ما نـوى) هەمـوو کردارێـک بەسـتراوە بـە نـیـیەتەوە (یـانی دڵسـۆزی پێویستە بۆ کارکردن) و هەمو کەسێک نیـازو نییـەتی چـی بـوو ئـەوەی بـۆ ئەمینێتــەوە، بــۆیە زانایــان زۆر جــار بەیەکەوە دایــان نــاوە، چــونکە هەردووکیـان (نیـازو دڵسـۆزی) لازم و مەلزومـی یەکـن، بـۆ ئـیمان ئەگەر دڵسۆزی لەگەڵ نییەت نەبوو سوودی نییە و نییەتێکی بەتاڵ و پوچە.

## تەوبە و گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار

گومـانی تێـدانییە تەوبەکـردن فەرزە لەسـەر هەمـوو موسـوڵمانێک، ڕۆژانەو هەفتـانەو مانگـانەو سـاڵانە، گومـان لەو شـتەدا نـیـیە لـە تەوبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە تاوان کردن و حەرامکاری.

تەوبەش ئەهلی سوننەت و جەماعەت سێ مەرجیان بۆ داناوە:

یەکەم: خۆ داماڵین لە تاوان.

دووەم: پەشیمانی و شەرمەندەیی لە ئاستی خوای پەروەردگاردا.

سێیەم: کە بڕیار بدات، جارێکی تر نەگەڕێتەوە سەر تاوانەکە.

ئەگەر ئەم  سێ مەرجە لە تەوبەکرندا نەبـوو، ئەوا تەوبەکە نوقصـانەو بە تەوبەکـردن هەژمـار ناکرێـت، لە ڕاسـتییدا هەر یەک لەم سـێ مەرجە، خاسـیەتی خـۆی هەیە بـۆ نمـوونە ئەگەر خـواردنی سـەروەت و سـامانی خەڵکی بێت دەبێت بۆیـان بگەڕێنـدرێتەوە، یـاخود بوختـانی کـردووە بـۆ کەسێک بۆتە هۆکاری ئاژاوە و پچڕانی سیلەی ڕەحم دەبێت دەست بەجێ ئیعتراف بە هەڵەکەیدا بکات و ئاشکرای بکات.

مەرجی یەکەم بۆ تۆبە کردن و گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگار، سێ مەرجی تری لێ دەبێتەوە، دەبێت مافی خەڵکی بەگەڕێنێتەوە.

خوای پەروەردگار بە فەرمان و ئەمرکردن دەفەرموێت: بگەڕێنەوە بۆ لای خوای پەروەردگار.

﴿وَقُل لِّلْمُؤْمِنَٰتِ يَغْضُضْنَ مِنْ أَبْصَٰرِهِنَّ وَيَحْفَظْنَ فُرُوجَهُنَّ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا مَا ظَهَرَ مِنْهَا ۖ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ عَلَىٰ جُيُوبِهِنَّ ۖ وَلَا يُبْدِينَ زِينَتَهُنَّ إِلَّا لِبُعُولَتِهِنَّ أَوْ ءَابَآئِهِنَّ أَوْ ءَابَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ أَبْنَآئِهِنَّ أَوْ أَبْنَآءِ بُعُولَتِهِنَّ أَوْ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ إِخْوَٰنِهِنَّ أَوْ بَنِىٓ أَخَوَٰتِهِنَّ أَوْ نِسَآئِهِنَّ أَوْ مَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُهُنَّ أَوِ ٱلتَّٰبِعِينَ غَيْرِ أُو۟لِى ٱلْإِرْبَةِ مِنَ ٱلرِّجَالِ أَوِ ٱلطِّفْلِ ٱلَّذِينَ لَمْ يَظْهَرُوا۟ عَلَىٰ عَوْرَٰتِ ٱلنِّسَآءِ ۖ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ لِيُعْلَمَ مَا يُخْفِينَ مِن زِينَتِهِنَّ ۚ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣١﴾﴾ النور. بە ئافرەتانی ئیمانداریش بڵێ: چاویان بپارێزن (لە تەماشای نامەحرەم) داوێنی خۆیان بپارێزن لە گوناهو جوانی خۆیان دەرنەخەن جگە لەوەی کە دیارە (وەک دەم و چاوو دەست) با سەرپۆشەکانیان بدەن بەسەر سینەو ملیانداو جوانی و زینەتی خۆیان دەرنەخەن بە تەواوی بۆ هاوسەرەکانیان نەبێت، یان باوکی خۆیان، یان باوکی مێردەکانیان، یان کوڕی خۆیان، یان کوڕی مێردەکانیان، یان بۆ براکانی خۆیان، یان برازاکانیان، یان خوشکەزاکانیان، یان ئافرەتێک کە پەیوەندیان هەیە پێکەوە، یان ئەوانەش کە کەنیزەکانیان (کە لە بارودۆخی تایبەتدا هەبوون) یان ئەوانەی کە لە ماڵەکانتاندا دەژین و پێویستیان بە ئافرەت نییە (لە بەر پیری، یان نەخۆشی...هتد) یاخود ئەو منداڵانەی کە هێشتا شارەزاییان لە ئافرەتان نییەو (ئارەزووی جنسیان بۆ دروست نەبووەو نازانن باسی عەورات بکەن) نابێت ئافرەتانی ئیماندار قاچیان دەربخەن و



پێیان بدەن بە زەویدا (تا دەنگی خشڵ و پاوانەکانیان بێت) و بزانرێت کە زینەتدارو خشڵدارن، کەواتە هەموتان ئەی ئیمانداران بەرەو لای خواو بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی ڕزگارو سەرفرازبن.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيُدْخِلَكُمْ جَنَّـٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَـٰرُ يَوْمَ لَا يُخْزِى ٱللَّهُ ٱلنَّبِىَّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ ۖ نُورُهُمْ يَسْعَىٰ بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَبِأَيْمَـٰنِهِمْ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَتْمِمْ لَنَا نُورَنَا وَٱغْفِرْ لَنَآ ۖ إِنَّكَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ٨﴾ التحريم. ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە، ئێوە بە تەوبەو پەشیمانییەکی ڕاست و دروستەوە ڕووبکەنە خوا، بەڵکو پەروەردگارتان لە هەڵەو گوناهەکانتان خۆش ببێت و بتانخاتە باخاتی بەهەشتەوە کە جۆگەو ڕووبار بە ژێر درەخت و کۆشکەکانیدا دەڕوات، ڕۆژێک دێت خوا پێغەمبەرو ئەوانەی لە خزمەتیدان خەجاڵەت و شەرمەزار ناکات، نوورو ڕووناکیان دەدرەوشێتەوە لە بەردەم و لای ڕاستیانەوە و دەڵێن: پەروەردگارا ئەم نوورو ڕووناکیەمان بۆ بەردەوام و تەواو بکەو لێمان خۆش ببە، بەڕاستی تۆ دەسەڵاتت بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

تەوبە کردنیش دوو ڕکعات نوێژی هەیە، هەر کەس تەوبەی کرد دەتوانێت دوو ڕکعات نوێژی سونەت بکات و دوای ئەوە تەوبە بکات. فەرمودەیەکە ئەبو داود لە ئەبوبەکری صدیقەوە ڕیوایەتی کردووە.

خوای پەروەردگار چێژێکی سەیر و سەرسوڕمانی خستۆتە ناو تۆبەکردنی بەندەکانی، مرۆڤ کاتێک ئەگەڕێتەوە بۆ لای خوای خۆی، هەست بە ئارامی و سوک بوونی لاشەی لە تاوان و هەست بە پاکیەک دەکات، ئەم ڕێز و کەرامەتە خوای گەورە دەیبەخشێت بە هەموو تۆبەکارێکی ڕاستگۆ و دڵسۆز و نیەت پاک.

لە عەقیدەی ئەهلی سوننەتدا مرۆڤ دەتوانێت تۆبە بکات، ئەگەر توشی تاوان بوو، چەند جارێک و چەند جاریش تۆبەی کرد، خوای پەروەردگار لێی خۆش دەبێت، تاکە مەرجی ڕاستگۆییە لە تەوبەکردندا

هەموو مرۆڤێک پێویستی بە تەوبەکردنە. پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: هەموو ڕۆژێک زیاد لە ٧٠ جار داوای لێخۆش بوون لە خوای پەروەردگار دەکەم، ئەی تۆ چەند جار داوا دەکەیت؟

خوای پەروەردگار تەوبەی بەندەکانی زۆر پێ خۆشە، چونکە مرۆڤ لە کاتی تەوبەکردندا گەردن کەچی و لاوازی خۆی و گەورەیی و عەزەمەتی خوای گەورە نیشان ئەدات.

تەوبەکردنیش ئارامگرتن و صەبری پێویستە کە ئەویش پێکهاتەی ئیمانە کەواتە با ئیمانمان نوێ بکەینەوە بە تەوبەکردن، صەبریش لەسەر تەوبەکە بگرین.

## ئارامگرتن و صەبر

ئارامگرتن لە هەموو بەندایەتیەکدا ڕێگا دەبڕێت لەگەڵ مرۆڤی موسوڵماندا لە نوێژدا مرۆڤ ئەگەر ئارامگر نەبێت ناتوانێت کاتی نوێژەکانی ڕێکبخات یاخود ڕۆژووگرتن، چون بۆ مزگەوت، بەخشینی پارە و سامان..هتد، کورت و پوخت بۆیە لە بیروباوەڕدا جێگای بۆتەوە ئەم پێکهاتەی ئیمانە، لەبەر ئەوەی لەگەڵ هەموو کردار و ڕەفتارێکی مرۆڤ دایە بەگشتی و بەتایبەتیش لە بەندایەتیدا. بۆ ئەوانەی کە بانگەواز بۆ



دینــی خــوای گەورە دەکەن زیــاتر پێویســتان  بە ئــارامگرتنە.بە تــایبەتی ئەوانەی لە گۆڕەپانی جیهاددا  دژی دوژمن و خوا نەناسەکان دەبنەوە.

بەدەست هێنانی ئارامگرتن، پێویستی بە وەرزشە، ئەو ووزە و توانایەی وەری دەگرێت پێکهاتەی خوودی ئارامگرتنە، سەرەتای هەموویان پێویستە مـرۆڤ لە پێنـاوی خـودا و لەبەر خـوا و نیـیەت سـاغی بـۆ پەروەردگـاری خاوەن بەهەشتە و لە بەرامبەریدا دۆزەخ هەیە مرۆڤ پێویستە خـۆی لـێ بپارێزێت، ئەمە هۆکاری گرنگی بەدەست هێنانی ئارامگرییە.

دووەم هۆکار: بریتییە لە شارەزا بوون لەژیانی پێغەمـبەران، بەتـایبەت حەزرەتی موسا و عیسا و یوسف و نوح و ئیبراهیم و ئیسماعیل و یونس و ئەیوب و لوط..هتد، -علیهم السلام-

هۆکاری سـێیەم: ژیاننـامەی پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان و پیاو چاکان و خواناس و عارفان، هەموو ئەمانەی باسـم کـرد بە شارەزا بوون لە ژیانیانـدا، خـوای گەورە سـەبوری و ئـارامگریەکی یەکجـار زۆرت پێ دەبەخشێت.

بۆ نمـوونە: مـرۆڤ نیـیە لەسـەر ئەم کـووەی زەویەدا سـورەتی یوسـف بخوێنێتەوە و هەست بە ئارامی و صەبر نەکات لەسەر ناڕەحەتییەکانی.

زانایان صەبر و ئارامگریان کردوە بە سێ بەشەوە:

بەشی یەکەم: صەبر لەسەر خواناسی و عیبادەت.

بەشــی دووەم: صـەبر لەسـەر دورکەوتنـەوە لەوانەی کە خـوای گەورە حەرامی کردوون.



بەشی سێیەم: صەبر لەسەر ئەو تەنگ و چەڵەمە و ناڕەحەتی و ئازار و ئەشکەنجانەی مرۆڤی موسوڵمان توشی دەبێت.

ئەم سێ بەشە هەریەک شیکاریەکی کەمی بۆ دەکەین

سەرەتا و وشەی (صەبر) واتە: بەستنەوە، گـرتنەوە یـان زینـدانی کـردنی نەفس لەوەی تێپەڕێت و سنوور بشکێنێت!.

بەشی یەکەم لە ئارامگرتن و صەبر: لەسەر بەنـدایەتییە، خـوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصۡبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ٢٠٠﴾ آل عمران. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە خۆگر بن و خۆڕاگریی و ئارامگریی بەسەر خۆتاندا بێنن، هەوڵ بدەن هەمیشە لە سەنگەری هەوڵ و کۆشش دا بن، لە خوا بترسن و پارێزکار بن بەڵکو سەرفرازیی (هەمیشەیی) بەدەست بێنن.

لە ڕاستیدا هەمـوو بەنـدایەتیەک زۆر قورسـە لەسـەر نەفسـی مـرۆڤ، ئەگەر مرۆڤ نەفسی زیندان نەکات و نەیبەستێتەوە ناتوانێت بەنـدایەتی بکات، خوای پەروەردگار بۆ نوێژ دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَعِينُواْ بِٱلصَّبۡرِ وَٱلصَّلَوٰةِۚ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلصَّٰبِرِينَ١٥٣﴾ البقرة. ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کۆمەک و توێشوو وەرگرن، لە ئارامگرتن و نوێژکردن، وە دڵنیا بن کە خوا یارو یاوەری خۆگرو ئارامگرانە. هەموو بەندایەتییەک پێویستی بە ئارام گرتنە.

بەشی دووەم: خـوای پەروەردگـار شـەهوەتی داوەتە مـرۆڤ و ئـازادی کردووە، ئەگەر بێت و ئارامگر نەبێت لەسەر بەستنەوە و زینـدانی کردنـی



شـەهوەتەکانی، ئەوا پەلامـاری زۆر کـاری قێـزەون ئەدات کە لە بنەڕەتـدا حەڕامە و خــوای گەورە فەرمــانی پێکــردووین لــێ دوور بکەویــنەوە لە ڕاستیدا، خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿لَيۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ جُنَاحٞ فِيمَا طَعِمُوٓاْ إِذَا مَا ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّءَامَنُواْ ثُمَّ ٱتَّقَواْ وَّأَحۡسَنُواْۚ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ﴿٩٣﴾﴾ المائدة. هیچ گوناهێک نییە لەسەر ئەوانەی باوەڕیان هێناوە و کردارەچاکەکانیان ئەنجام داوە لەوەی خواردوویانەو خواردوویانەتەوە (پێش حەرام کردنیان) کاتێک خۆیان پاراستبێت باوەڕیان هێنابێت لەدوایدا خۆیان پاراستبێت و بەردەوامیش بووبن لەسەر چاکە کردن (تا پلەی ئیحسان)، خوایش چاکەکارانی خۆش دەوێت و (چاوپۆشی لە ڕابردوویان دەکات).

کـافر ژیـانی خـۆی دەفرۆشـێت بـۆ هەنـدێک لەزەتـی دنیـایی، بەڵام ئیماندار هەوڵ ئەدا خۆی ئازاد بکات لە هەموو حەرام و خراپەکاریەک.

بەشی سێیەم: ئارامگرتنت لەسەر ئەو ناڕەحەتی و ناهەمواری و ئازار و ئەشــکەنجانەی بەســەر مرۆڤــدا دێــت، پێویســتە مــرۆڤ هەنــدێک لە حەزەکـانی خـۆی ببەسـتێتەوە لە کـاتی نـاڕەحەتی و ئـازار و تەنـگ و چەڵەمەکانی ژیاندا.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: سـەرم سـوڕماوە لە کاری ئیمانـدار، بەڕاسـتی هەمـوو ئەمـرو کردارێکـی پڕیەتـی لە خێـر و چاکە، ئەم پلەو پایەش بێجگە موسوڵمان بۆ هیچ کەسی تر دەست نادات ئەگەر، توشی خۆشی و شادی دونیا بوو لە سـەروەت و سـامان و منـداڵ.. هتـد سوپاسـگوزار بـوو لەسـەری، ئەوە هەمـووی بە خێـر و چـاکە بـۆی

دەنوسرێـت، بە پـێچەوانەوە ئەگەر توشـی نـاڕەحەتی و نـاهەمواری بـوو ئارامگر بوو لەسەری ئەوا هەموو بە خێرو چاکە بۆ دەنوسرێت.

دەقی فەرمودەکە: (وَعَنْ أبي يَحْيى صُهَيبِ بْنِ سِنَانٍ قَالَ: قَالَ رَسُولُ الله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ: عَجَباً لأمرِ الْمُؤْمنِ إنَّ أمْرَهُ كُلَّهُ لَهُ خَيرٌ، ولَيسَ ذَلكَ لأحَدٍ إلاَّ للْمُؤْمن: إنْ أصَابَتْهُ سَرَّاءُ شَكَرَ فَكانَ خَيْراً لَهُ، وإنْ أصَابَتْهُ ضَرَّاءُ صَبرَ فَكانَ خيْراً لَهُ).[١٠]

خوای پەروەردگار کاتێک چاکە و خێری بەخشییە ئـوممەتی پێغەمـبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ و ئەفضـەڵیەتی لە یەهـود سـەندەوە، بە هۆکـاری ئەوە بوو یەهـود خـاوەنی ئـارامگری و صـەبر نەبـوون، بەڵام موسـوڵمانان ئەگەر لە تاقیکردنەوەی ئارامگریدا دەرنەچون ئەوا ئەو جیل و ڕەوەندەش بە خەیرول ئوممەت بۆی هەژمارد ناکرێت.

تاقیکردنەوەکەش بـریتییە لە چەنـد نـاڕەحەتیەک بەسـەر موسـوڵماندا دێــت، ئەگەر ئارامیــان گــرت خــوای پەروەردگــار ســەریان دەخــات، پێچەوانەکەشی وەکو هەموو گەلانی تر لە ناو دەچـن، خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێت:

﴿وَلَنَبْلُوَنَّكُم بِشَيْءٍ مِّنَ ٱلْخَوْفِ وَٱلْجُوعِ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِ ۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾﴾ بێگومان ئێمە، ئێوە تاقی دەکەینەوە بە هەندێک ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچونی بەروبومی کشتوکاڵ، مژدە بدە بەو کەسانەی خۆگرو ئارامگرن.

---

[١٠] رواه مسلم.



﴿ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ١٥٦﴾
ئەوانەی تووشی هەر بەڵاو ناخۆشیەک دەبن دەڵێن: ئێمە هی خواین و هەرچی هەمانە بەخششی خوایە، سەرئەنجام هەر بۆلای ئەو زاتە دەگەڕێینەوە.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ١٥٧﴾

البقرة. ئا ئەوانە ڕەحمەت و میهرەبانی پەروەردگاریان شایستەیانە، ئەوانە ڕێبازی هیدایەتیان گرتۆتە بەر.

خوای گەورە پاداشتی ئەوانەی ئارامگرن بەبێ پێوانەو ژمارە پاداشتیان دەکاتەوە و دەفەرموێت:

﴿قُلۡ يَٰعِبَادِ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمۡۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ فِي هَٰذِهِ ٱلدُّنۡيَا حَسَنَةٞۗ وَأَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٌۗ إِنَّمَا يُوَفَّى ٱلصَّٰبِرُونَ أَجۡرَهُم بِغَيۡرِ حِسَابٖ ١٠﴾

الزمر. بەو بەندانەم بڵێ خاوەن باوەڕن: لە پەروەردگارتان بترسن و خواناس بن، بێگومان بۆ ئەوانەی لەم دنیایەدا چاکە دەکەن، پاداشتی چاک هەیە، زەوی پەروەردگاریش فراوانە (ئەگەر لە شوێنێک دنیاتان لێ تەنگ کرایەوە کۆچ بکەن بۆ شوێنێکی تر) بەڕاستی تەنها خۆگران پاداشتیان بێ سنوور و بێ ئەندازەیە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ئەوانەی ئارامگرن و داوای لێخۆش بوون دەکەن خاوەن عەزم و هێزن هەروەها خاوەن کەسایەتی تایبەتن.

لە کۆتاییدا خوای پەروەردگار مژدەی داوە بە خاوەن صەبرەکان دەفەرموێت:



﴿وَلَنَبۡلُوَنَّكُم بِشَيۡءٖ مِّنَ ٱلۡخَوۡفِ وَٱلۡجُوعِ وَنَقۡصٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡوَٰلِ وَٱلۡأَنفُسِ وَٱلثَّمَرَٰتِۗ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٥٥﴾ البقرة. بێگومان ئێمە ئێوە تاقی دەکەینەوە بە هەندێک ترس و بیم و برسێتی و کەم بوونی ماڵ و سامان و مردنی کەس و کارو تیاچونی بەروبومی کشتوکاڵ، وە مژدە بدە بەو کەسانەی کە خۆگرو ئارامگرن.

مانای ئەوە نییە چارەت نەبێت بڵێیت خۆ دەبێت هەر ئارام بگرم، ئارامگرتن لە هاتنی نارەحەتیەکەدایە، یەکەم جار صەبرت لەسەر گرت بۆ کاتەکانی ترت ئاسانە، نموونەی کەسێکی نزیکت کاتێک ئەمرێ یاخود خۆشەویستێک..هتد لەگەڵ بیستنی هەواڵەکەدا ئارامگریەکە دەردەکەوێت نەک هەرچی ناشکوری و گلەییە بیکات و دوایی بڵێ صەبرم گرتووە، ئەوە ئارامگری نییە.

بۆیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بەلای ژنێکدا تێپەڕی، لەسەر قەبرێکدا دەگریا و واوەیلای بوو، پێغەمبەری خواش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: لەخوا بترسەو ئارام بگرە، ژنەکە وتی: وازم لێبێنە تۆ هەرگیز موصیبەتی وەکو منت بەسەردا نەهاتووە. ژنەکە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ی نەناسی، دوایی بۆیان باسکرد ئەوە پێغەمبەری خوا بوو صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ هات بۆ بەردەرگای پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ و هیچ دەرگاوانێکی نەبوو، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی دەرگاکەی لێکردەوە، ژنەکە وتی: نەم ناسیبوویەوە کە پێغەمبەری خوای. پێغەمبەر



صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئـارامگری و صـەبر لە هـاتنی خـورپەی یەکەمدایە.

دەقی فەرموودەکە: (عَنْ أنَسٍ قَـالَ: مَـرّ النَّبِـيّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بِامْرَأَةٍ تَبْكي عِنْدَ قَبْرٍ فَقَال: اتَّقِي الله وَاصْبِرِي فَقَالَتْ: إِلَيْک عَنِّي، فَإِنّك لَـمْ تُصَبْ بِمُصِيبتي، وَلَمْ تعْرفْـهُ، فَقيـلَ لَهـا: إِنَّـه النَّبِـيّ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، فَأَتتْ بَابَ النَّبي صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، فلَمْ تَجِد عِنْدَهُ بَوّابِينَ، فَقالتْ: لَـمْ أَعْرِفْک، فقالَ: إِنَّما الصَّبْرُ عِنْدَ الصَّدْمَةِ الأولَى).[11]

هەروەهــا لە فەرمــودەیەکی قودســیدا هــاتووە پێغەمــبەری نــازدار صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێـــت: خـــوا فەرمـــووی هەرکەس لە ئیمانداران پاداشتی ئەدرێتەوە لەسەر ئەوەی کەسێکی زۆر نزیکـی بمرێـت لە دەرەجە یەکەمدا وەکو برا، منداڵ، باوک، دایک، خوشک، مـام، هـاوڕێ و ئەوەی زۆر نزیکە لە زمانی عەرەبدا بەم نزیکانە دەوترێت (صفیە).

ئەگەر ئارام گربوو لەسەری و سـوپاس گوزاربـوو بـۆ خـوا پاداشـتەکەی بەهەشتە.

دەقی فەرموودەکە: (عن أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعًـا: «يقـول اللـه تعالى: ما لعَبدِي المُؤمن عندي جَزَاء إِذَا قَبَضتُ صَـفِيّه مِـنْ أهـلِ الـدُّنيَا ثُـمَّ احْتَسَبَه إِلاَّ الجنَّة).[12]

---

[11] متفقٌ عليه..
[12] رواه البخاري.

# ڕاستگۆیی

ڕاستگۆی بێجگە ئەوەی پێکهاتەی ئیمانە لە هەمانکاتدا سیمای ئیمانداریشە، موسوڵمان دەبێت ڕاستگۆ بێت لە هەموو بوارەکانی ژیاندا لەگەڵ کافر و بێ دین و خوانەناسدا، ڕاستگۆیی پێکهاتەی خوودی ئیسلامە. تەماشای پێغەمبەرەکەمان صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ناسراوە بە (**الصادق الأمين**).

ڕاستگۆ و دەست پاک. هەڵبەتە پێش پێغەمبەرایەتی خاوەنی ئەم لەقەبە بووە بە محمدی ڕاستگۆ و دەست پاک ناسرا بوو لە شاری مەککەدا.

هەروەها هاوڕێ نزیکەکەی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ناوی ئەبوبکر صديق (عبد الله بن أبي قحافة) ناسراوە بە ئەبوبەکر لەقەبی "ڕاستگۆ"ی پێ بەخشراوە یان ئەبوو عوبەیدەی جەراح ناسراوە بە "أمين الأمة" دەست پاکی ئوممەتە، ئیمامی عومەر ناسراوە بە "فاروق" ڕاستگۆی و دادپەروەری جیاوازی لە نێوان حەق و باطڵدا کردووە بۆیە نازناوی فاروقی دراوەتێ.

خوای پەروەردگار لەبارەی ڕاستگۆییەوە دەفەرموێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَكُونُواْ مَعَ ٱلصَّـٰدِقِينَ﴿١١٩﴾﴾ التوبة. ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە لەخوا بترسن و پارێزکار بن، هەوڵ بدەن هەمیشە لەگەک ڕاستگۆیان و ڕاستاندا بن.

هەروەها خوای پەروەردگار کاتێک وەسفی ئیمانداران دەکات لە پیاو و ژن بە ڕاستگۆکان ناویان دەبات.

﴿إِنَّ ٱلۡمُسۡلِمِينَ وَٱلۡمُسۡلِمَٰتِ وَٱلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡقَٰنِتِينَ وَٱلۡقَٰنِتَٰتِ وَٱلصَّٰدِقِينَ وَٱلصَّٰدِقَٰتِ وَٱلصَّٰبِرِينَ وَٱلصَّٰبِرَٰتِ وَٱلۡخَٰشِعِينَ وَٱلۡخَٰشِعَٰتِ وَٱلۡمُتَصَدِّقِينَ وَٱلۡمُتَصَدِّقَٰتِ وَٱلصَّٰٓئِمِينَ وَٱلصَّٰٓئِمَٰتِ وَٱلۡحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمۡ وَٱلۡحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغۡفِرَةٗ وَأَجۡرًا عَظِيمٗا ٣٥﴾ الأحزاب. بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسوڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیمان دار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشەندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاک و ئەو پیاو و ئافرەتانەی زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەر کە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: واز لە گومان و شک بهێنن بە دوای ڕاستییەوە بن، چونکە ڕاستگۆیی دڵنیاتان دەکات، درۆیش بێ سومعەو سوکت دەکات لەناو کۆمەڵگادا، ئەم فەرمودەیە ئیمامی حەسەنی کوڕی عەلی گێڕاوێتیەوە.

دەقی فەرمودەکە: (عن أبي محمد الحسن بن علي قال: حفظت من رسول الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دع ما يريبك إلى ما لا يريبك؛ فإن الصدق طمأنينة، والكذب ريبة).[13]

---

[13] رواه الترمذي.

## چاودێری کردن - المراقبة

ئەم چاودێری کردنە لە پێکهاتەی ئیمانـدا، ئەگەر مـرۆڤ بە دوو شـێوە بیری لێبکاتەوە، دەگاتە پلە و پایەیەکی زۆر گەورە، شێوەی یەکەم هەست بـکە خـوای گەورە لەگەڵتـایە بەو شـێوەیەی تـۆ چـاوەڕوانی و چـاودێری خوای پەروەردگار بکەیت لەکارەکانتا و لە بەندایەتیەکاندا. بەواتای ئەوەی بزانیت تەوەکول و هێز و توانات لەو وەرگرت و هەر بەویـش تەوەکـول و هێز و توانات بەدەستی ئەوە و بەو شێوەیە چـاودێری خـوایە، ئەویـش بە بەڵگەی چەند ئایەتێک لە سورەتی الشعراء.

﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡعَزِيزِ ٱلرَّحِيمِ ٢١٧﴾ (ئەی محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِۦوَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) پشت بە خوای باڵادەست (بەسەر ستەمکاراندا) وە میهرەبان (بە ئیمانداران) ببەستە.

﴿ٱلَّذِي يَرَىٰكَ حِينَ تَقُومُ ٢١٨﴾ ئەو زاتەی کە دەتبینێ کاتێ هەڵدەستیت (لە شەوگارداو) دەیپەرستیت.

﴿وَتَقَلُّبَكَ فِي ٱلسَّٰجِدِينَ ٢١٩﴾ الشعراء. ئەو زاتە تۆ دەبینێت کە چۆن لە ڕیزی سوجدەبەراندا هەڵسوکەوت دەکەیت

شـێوەی دووەم: گومـانی تێـدا نیـیە کە پەروەردگـار چـاودێرە بەسـەر مرۆڤەوە، پەروەردگار دەفەرموویێت:

﴿هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٖ ثُمَّ ٱسۡتَوَىٰ عَلَى ٱلۡعَرۡشِۖ يَعۡلَمُ مَا يَلِجُ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا يَخۡرُجُ مِنۡهَا وَمَا يَنزِلُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ وَمَا يَعۡرُجُ فِيهَاۖ وَهُوَ مَعَكُمۡ أَيۡنَ مَا كُنتُمۡۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٤﴾ هەر ئەو زاتە خۆی، ئاسمانەکان و زەوی لە شەش ڕۆژدا دروست کردووە،

لەوەودوا لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆی پایەدارکرد، هەر خۆی دەزانێت چی دەچێت بەناخی زەویداو چیشی لێ دێتەدەرەوە، چی لە ئاسمان دێتە خوارەوەو چیشی پیادا سەردەکەوێت، لە هەر شوێنێکدئیبنو ئەو زاتە لەگەڵیاندایە، (دڵنیابن کە) خوا بە هەموو ئەو کارو کردەوانەی ئەنجامی دەدەن، بینایە.

چونکە خوای موتەعال هیچی لێ شاراوە نییە..

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَخۡفَىٰ عَلَيۡهِ شَيۡءٌ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَا فِي ٱلسَّمَآءِ۝٥﴾ آل عمران. بەڕاستی هیچ شتێک چ لە زەویدا، چ لە ئاسماندا لە خوا شاراوە نییەو هیچی لێ ون نابێت.

گرنگە هەستی چاودێریت بۆ دروست بێت ک پەروەردگار و چاودێرانی فریشتە ئاگایان لە هەڵسوکەوتتە، وەکو لە کەمیندابن بۆت وایە.

﴿إِنَّ رَبَّكَ لَبِٱلۡمِرۡصَادِ۝١٤﴾ الفجر. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەمیشەو بەردەوام ئامادەیە کە تۆڵە بکاتەوە لەستەمکاران

واش نەزانیت، تەنها ئاگـاداری ڕوکەشـە پەروەردگـار، بەڵکـو ئەوەی بە دڵ و مێشــکتدا بە چــرکە ســات دەڕوات خــوای پەروەردگــار ئاگــادار و فریشتەکان دەینوسن.

﴿يَعۡلَمُ خَآئِنَةَ ٱلۡأَعۡيُنِ وَمَا تُخۡفِي ٱلصُّدُورُ۝١٩﴾ غافر. (ئەو خوایە هەمیشە) چاوە خیانەتکارو ناپاکەکان دەناسێت و دەزانێت چی لە دڵ و دەروون و سینەکاندا حەشاردراوە.

﴿فَأَهۡلَكۡنَآ أَشَدَّ مِنۡهُم بَطۡشٗا وَمَضَىٰ مَثَلُ ٱلۡأَوَّلِينَ۝٨﴾ الزخرف. (ئەوسا ئیتر بەسەریانەوە نەچووە) بەڵکو ئێمە ئەوانەمان لەناو بردووە کە زۆر

لەمانە دڕندەترو بەهەڵمەت تر بوون، ئیتر بەسەرهات و ڕووداوی پێشینان بەسەرچووەو (تێپەڕیون).

خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿مَّا يَلۡفِظُ مِن قَوۡلٍ إِلَّا لَدَيۡهِ رَقِيبٌ عَتِيدٞ ١٨﴾ ق. هەر قسەیەکی لە دەم دەرچێت خێرا چاودێرێکی ئامادە تۆماری دەکات

پاشان خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَلَقَدۡ خَلَقۡنَا ٱلۡإِنسَٰنَ وَنَعۡلَمُ مَا تُوَسۡوِسُ بِهِۦ نَفۡسُهُۥۖ وَنَحۡنُ أَقۡرَبُ إِلَيۡهِ مِنۡ حَبۡلِ ٱلۡوَرِيدِ ١٦﴾ ق. هەر ئێمەین ئادەمیزادمان دروست کردووە و دەزانین چی بە دڵ و دەرونیدا دێت... وە ئێمە لە شاڕەگی دڵی لێی نزیکترین.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: (اتَّقِ اللَّهَ حَيْثُمَا كُنْتَ) واتە: لە خوا بترسن لە هەرکوێیەک هەن. پاشان دەفەرموێت: (وأتبِعِ السَّيِّئَةَ الحسَنةَ تَمْحُهَا) واتە: هەر کارێکی زشت و خراپت کرد بە دوایدا چاکەیەک بکە بۆ ئەوەی بیسڕێتەوە. هەروەها دەفەموێت: (وخَالِقِ النَّاسَ بخُلُقٍ حَسَنٍ) واتە: هەڵسوکەوتیش لەگەڵ خەڵکیدا با بەجوان و ئەدەب و ئەخلاق بێت.ڕیوایەتی ترمذی لە(معاذ بن جبل)وە.

## پێکهاتەی تەقوا

تەقوا واتا خۆپاراستن لە عەزابی خوای پەروەردگار، یاخود خۆپاراستن لە ئاگری دۆزەخ، لە هاوەڵێکی بەڕێزی پێغەمبەری خوایان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ پرسی کە ئەبو هورەیرە بو: تەقوا واتای چییە؟



لە وەڵامدا فەرمووی: کاتێک بە خاکێکدا ڕۆشتویت هەموو دڕک و داڵ و چەوێڵ بێت؟ پرسیارکەرەکە فەرمووی ڕۆشتوم و خۆم لە دڕک و داڵ و چەوێڵەکە پاراستووە خۆم لێ لاداوە، ئەبو هورەیرە فەرمووی ئەوە مانای تەقوایە.چونکە تاوان دڕک و داڵ و چەوێڵە، مرۆڤ پێویستە خۆی لێ لابدات، بە دڵنیاییەوە ئەو خۆپاراستنە، بۆ پاراستنی خوودی مرۆڤەکەیە.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ١٠٢﴾ آل عمران. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکار بن بەشێوەیەکی وا کە شایستەی ئەو زاتەیە، (هەمیشە پابەندو دامەزراو بن لەسەر ئیسلامەتی، بۆ ئەوەی هەرکاتێ مردن) بە ئیمان و ئیسلامەتی نەبێت نەمرن.

یاخود خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُمۡ وَٱسۡمَعُواْ وَأَطِيعُواْ وَأَنفِقُواْ خَيۡرٗا لِّأَنفُسِكُمۡۗ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفۡسِهِۦ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٦﴾ التغابن. هەتا دەتوانن بە تەقواو خواناس بن، گوێڕایەڵ و فەرمانبەرداربن، خێرو چاکە بکەن بۆ خۆتان جا ئەوەی خۆی لە ڕەزیلیی و ڕژدی و نەفسی خۆی بپارێزێت، ئەوانە سەرفەرازن.

یاخود خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلٗا سَدِيدٗا ٧٠﴾ الأحزاب. ئەی ئەوکەسانەی باوەڕتان هێناوە لە خوا بترسن و پارێزکاربن، هەمیشە قسە و گوفتاری بەجێ و بەسوود بکەن.



گومـان لەوەدا نیـیە کە هەرکەس خـۆی بپارێزێـت لە تـاوان خـوای پەروەردگار ڕێزی لێ دەگرێت و دەرگای خێر و ئاسان کاری بـۆ دەکـاتەوە، ڕزق و ڕۆزی بێ کۆتـایی پـێ دەبەخشـێت، هەروەهـا خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێت:

﴿فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ۚ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾﴾ کاتێک ماوەی دیاریکراویان بەسەر برد (دوای یەک یان دوو تەڵاقە)، بیان هێڵنەوە لای خۆتان هاوڕی لەگەڵ ڕەفتارو هەڵسو کەوتی چاکدا، یاخود وازیان لێ بێنن و لێیان جیا ببنەوە (لە سێیەم جاردا) بە شێوەیەکی جوان کە مافیان پارێزراو بێت، لە کاتی جیابوونەوەی یەکجارییدا با دوو شایەتی دادپەروەرو خواناس لە نێواندا هەبێت، وە ئامادەی شایەتی بن و بیپارێزن بۆ خواو لەبەر خوا، بەم شێوەیە ئامۆژگاری ئەو کەسە دەکرێت کە باوەڕی بە خواو ڕۆژی دوایی هەیە، جا ئەوەی لە خوا بترسێت و پارێزکار بێت خوا دەرووی لێ دەکاتەوە.

﴿وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ۚ وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ ۚ إِنَّ اللَّهَ بَالِغُ أَمْرِهِ ۚ قَدْ جَعَلَ اللَّهُ لِكُلِّ شَيْءٍ قَدْرًا ﴿٣﴾﴾ الطلاق. لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و بە خەیاڵییدا نەهاتبێت، جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا ئەوەی بڕیاری لە سەری هەبێت بە ئەنجامی دەدات، وە بۆ هەرشتێک کاتی دیاریکراوی بڕیارداوە.

مرۆڤی خۆپارێز لە تاوان، خـوای گەورە سـێ ئیمتیـازی پێدەبەخشـێت، یەکەم جیاوازی دەکات لە نێوان حەق و باطڵ دا، ئەمەش دەچێتە خـانەی



زانست و خوای گەورە زانستی پێ دەبەخشێت تا بتوانێت ئەو جیاوازیە بکات، هەروەها ئەو زانستە بۆ خۆی و خەڵکانی تریشە، دەبێە هۆکاری چاو و مێشک کرانەوە، لەبەرکردنی زۆری بەشەکانی دین لە قورئان و فەرموودەو هەروەها دەقە شەرعیەکان، لە هەمووی گرنگتر خوای پەروەردگار کەرامەت و ئیلهام دەبەخشێت بە موتەقی و خۆپارێزەکان، بێجگە لەوەش خوای گەورە بە هۆکاری کارە چاکەکانی لێیخۆش دەبێت و پلەو پایەی بەرز دەکاتەوە، دەشیکاتە خاوەن پلەو پایەی تایبەتی کە لە قورئاندا بە (ذُو فَضْلٍ عَظِيمٍ) هاتووە خوای گەورە دەفەرمووێت:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا وَيُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْۗ وَٱللَّهُ ذُو ٱلْفَضْلِ ٱلْعَظِيمِ﴿٢٩﴾ الأنفال. ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە: ئەگەر تەقوای خوا بکەن و پارێزکاری بکەن، ئەوە خوا بەرچاو ڕۆشنییەکی تەواوتان بۆ فەراهەم دەهێنێت (کە بتوانن حەق و ناحەقی بەئاسانی لەیەک پێ جیابکەنەوە) هەروەها هەڵەو گوناهەکانیشتان دادەپۆشێت و لێتان خۆش دەبێت، (چونکە)خوا خاوەنی فەزڵ و ڕێزی گەورەو بێ سنوورە.

ئەبو هورەیرە پرسی لە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ: ئەی ڕەسولی خوا بەڕێزترین کەس کێیە؟!

فەرمووی ئەو کەسەیە کە خاوەن تەقوایە و خۆی دەپارێزێت، دەقی فەرموودەکە: (قِيلَ يَا رَسُول اللَّه مَنْ أَكرَم النَّاس؟ قَالَ أَتْقَاهُمْ)[١٤]. چونکە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٤] رواه البخاري.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن ذَكَرٖ وَأُنثَىٰ وَجَعَلۡنَٰكُمۡ شُعُوبٗا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْۚ إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٞ ١٣﴾ الحجرات. ئەی خەڵکینە ئێمە هەموتانمان لە نێرومێیەک درووستکردووە (کە باوکە ئادەم و دایکە حەوایە)، کردوومانن بە گەلان و تیرەو هۆزانی جۆربەجۆر، تا یەکتر بناسن و پەیوەندیتان خۆش بێت بە یەکەوە.بەڕاستیی بەڕێزترینتان لای خوا ئەوەتانە زۆرتر لە خواترسە و فەرمانبەرداری خوایە، بێگومان خوا زاناو ئاگایە بە هەموان.

بنەمای سەرەکی خۆپاراستنی مرۆڤی موسوڵمان لە دوو تەوەردایە:

تەوەری یەکەم: خۆپاراستنە لە دنیا، لە پلەو پایەی، لە سەروەت و سامانی، لە خۆبادان و خۆبەزل زانینی، لە خواردنی حەرام ڕیباو چەواشەکاری خەڵکی بەگشتی.

تەوەری دووەم: بریتییە لە ئافرەت، لە شەهوەت، هەروەها پێچەوانەکەشی پیاوە بۆ ئافرەت حەزە شەهوانیەکان.

ئەو دوتەوەرە سەرەکی ترینن لەوەی مرۆڤ خۆپارێزی لێبکات، چونکە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (إنَّ الدُّنْيَا حُلْوَةٌ خَضِرَةٌ، وإنَّ اللَّهَ مُسْتَخْلِفُكمْ فِيهَا، فَيَنْظُرُ كيفَ تَعْمَلُونَ، فَاتَّقُوا الدُّنْيَا وَاتَّقُوا النِّسَاءَ؛ فإنَّ أَوَّلَ فِتْنَةِ بَنِي إِسْرَائِيلَ كَانَتْ فِي النِّسَاءِ).[١٥]

واتە: دنیا شیرین و سەوز و جوانە لەبەرچاوی خەڵکیدا بە گشتی، خوای پەروەردگاریش ئێوەی تێدا کردۆتە کاربەدەست و (خليفة) ئەیەوێت بزانێت چۆن کار دەکەن، کەواتە خۆتان بپارێزن لە دنیا و لە

---

[١٥] رواهُ مُسْلِمٌ.



ئـافرەتیش، چـونکە یەکەم تـاقیکردنەوەی بەنـی ئیسرـائیل ئـافرەت بـوو، سەرکەوتوو نەبوون تێیدا.

هەمــوو جارێــک پێغەمــبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دوعــای دەکــرد دەیفەرمــوو خــودایە داوات لێــدەکەم هیــدایەت و ڕێنمــونیم بکەیــت و بمپارێزیت لە تاوان و داوای پـاکێتی دەکـرد لە هەمـوو بوارەکـانی ژیـان و هەروەها دەوڵەمەندم بکەیت، ئەم دەوڵەمەندیەش تەنها مانای سـەروەت و ســامان نیــیە، بەڵکــو لە زانســت، دەوڵەمەنــدی لە دڵ و دەروون بەخشینەوەیی، دەوڵەمەندی لە چاودێری و قەناعەت..هتد

## دەقی فەرموودەکە:

عَن ئیبنو مسْعُود, (أنَّ النَّبِيّ صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ كانَ يَقُـولُ: اللَّهُـمَّ إِنِي أَسْأَلُک الهُدَى، وَالتَّقَى، وَالعفَافَ، والغنَى).[١٦]

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەربارەی ئەم پێکهاتەی ئیمانە لەناو بەشی پاکێجەکاندا دەفەرمووێت:

(عَنْ أبي أمامةَ صُدَيِّ بنِ عَجْـلان البـاهِـيِّ رضْيَ اللـهُ عنـه، قـال: سـمِعتُ رسولَ الله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ يخطـبُ في حَجَّـةِ الـوداعِ، فقـال: اتَّقـوا اللهَ، وصلُّوا خمْسَكم، وصُوموا شَهركم، وأدُّوا زكاةَ أموالِكم، وأطيعوا أمراءكم، تدْخلوا جنَّةَ ربِّكم).[١٧]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٦] رواهُ مُسْلِم.
[١٧] رواه الترمذي.

واتە: خۆپارێزبن و پێنج فەرزە نوێژەکانتان بکەن و ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان بگرن، زەکاتەکانتان بدەن، گوێڕایەڵی ئەمیرەکانتان بن دەچنە بەهەشت. ئەگەر تەماشا بکەین لەسەرەتای هەموو بەشەکانی ئیسلام ئیمان هاتووە.

(عن أَبِي أُمَامَةَ رضي الله عنه قَالَ: سَمِعْتَ رَسُولَ الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ يَخْطُبُ فِي حَجَّةِ الوَدَاعِ فَقَالَ: «اتَّقُوا اللَّهَ رَبَّكُمْ، وَصَلُّوا خَمْسَكُمْ، وَصُومُوا شَهْرَكُمْ، وَأَدُّوا زَكَاةَ أَمْوَالِكُمْ، وَأَطِيعُوا ذَا أَمْرِكُمْ؛ تَدْخُلُوا جَنَّةَ رَبِّكُم).[18]

## یەقین و دڵنیابوون - تەوەکول

ئەم باسە گرنگە پێکهاتەکانی ئیمانە، چونکە ئەگەر یەقین و دڵنیایی بوونی نەبێت لە خوای پەروەردگار و پاکێجەکەی ئیمان بەگشتی، هیچیان لێوەرناگرێت ئەم قۆناغی یەقین و دڵنیایی بوونە، بەداخەوە کە زۆرێک لە مرۆڤەکان تا مردنیان پێ ناگەن، نەمتوانی تەنها وشەی دڵنیایی بۆ یەقین بەکاربهێنم، چونکە یەقین، زۆر بەهێزترە لەوەی وشەی دڵنیایی بۆ دابنێم وەک ئەڵتەرناتیڤ، بەڵام واباشترە یان یەقین خۆی بەکاربهێنم یان لەگەڵیادا دڵنیا بوونیش بنووسم.

یەقین دوو جۆرە:

جۆری یەکەمیان: یەقین و دڵنیابوونە بە زانست (علم اليقين)

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[18] رواه الترمذي.



جۆری دووەمیان: یەقین و دڵنیابوونە بە چاو، لەگەڵ تەوەکول یاخود پشت بەستن وەیان پەنابردن، هەمووی لە تەوەکولدا کۆدەبنەوە، یەکانگیردەبن لە ماناو واتادا بەگشتی.

یەقین سەرەتا لە ئەقڵەوە دەست پێ دەکات، دەشێت، هەندێک یەقین بە چاو کە مرۆڤ دەیبینێت چەواشەکاری بێت، بۆ نموونە سەراب، کە بە زمانی کوردی واتا تراویلکە، لە گەرمادا خۆی وانیشان ئەدات کە ئاوە، بەڵام چەواشەکارییە و یەقینێکی درۆزنانەیە، تەنها شەپۆلی گەرمایە، یاخود سیحر و جادوبازی کە هەمووی چاوبەستنە.

یەقینی زانست: دەشێت لەسەر بنەمای تیۆری دامەزرێت، بووە بە زانستی حەتمی لای خەڵکی، بەڵام بنەماکەی تیۆری و گریمانەییە، بۆتە هۆکاری دڵنیایی زانستی وەکو نموونەی تیۆری زانستی.

(بیگ بانگ) یان لە سەردەمێک لە سەردەمەکاندا هەندێک تیۆری زانستی چەقیو بووەو یەقین بووە لە زەمەنەکەدا، وەکو تیۆری (ئیسحاق نیوتن) کە (ئەنیشتاین) تیۆری خۆی دامەزراند لەسەر (نسبیەت) تیۆرەکەی ئیسحاق پوچەڵ کرایەوە، کەواتە زانستی یەقین و چاوی یەقین و دڵنیایی، ئەستەمە لە هیچ شتێکی دنیاییدا بەدی بکرێت، چونکە ئەشێت گۆڕانکاری بەسەردا بێت، بەڵام ناسینی خواو پێغەمبەر و شەریعەتەکەی، هۆکاری سەرەکین بۆ دابین کردنی هەردوو زانستەکە کە دڵنیا بوونە لە خوودی زانست، پاشان چاوی دڵنیایی بوونە.

ئەم باسە قورسترین باسە لەم کتێبەدا، ماندووبونێکی زۆری دەوێت بۆ تێگەیشتن و پاشان بۆ گەیاندن بە خەڵکی تر و بە تایبەت تۆی بەڕێز و خۆشەویست.

ئەم پێکهاتەیە پەیوەستە زیاتر بە پاکێجی قەزاو قەدەرەوە، دیارە کە قەزاو قەدەریش بەشی ئیمانە، واتا زیاتر لە ڕووی قەزاو قەدەرەوە ئەم باسە ڕوون دەکرێتەوە.

تۆ کە خوێنەری ئەم مەملەکەتەی، پێویستە زیاتر لەم بوارەدا قاڵ بیتەوە زیاتر هەوڵی تێگەیشتن و بەدواداچون بدەیت لە ڕووی مەیدان و پاشان تیۆریەوە تا شتێک لەم پێکهاتەیە تێدەگەیت و ئینجا بتوانیت بیگەیەنیتەوە بە خەڵکی تر، وەکو پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویت: (بَلِّغُوا عَنِّي ولو آيَة. رواه البخاري عن عبدالله بن عمرو بن العاص).

واتە: لەمنەوە بیگەیەنن ئەگەر ئایەتێکیش بێت.

چجای ئەوەی پێکهاتەی ئیمانەو لە پاکێچی قەزاو قەدەر دایە، کە گرنگترین بەشی ئیمانە و وەڵامی پرسیار گەلێکی خەڵکی ئەداتەوە.

پێش هەموو شتێک بۆ تێگەیشتن لەم باسە پێویستە یاساکانی خوای گەورە بزانیت، خوای گەورە بێجگە یاسای کەونی و گەردوونی، یاسای تایبەتی هەیە لە قیامەت و غەیبیدا، یاسا کەونی و غەیبیەکانی خوای پەروەردگار، هیچی گۆڕانکاری بەسەردا نایە و هەموو جێگیرە و چەسپاوە.

خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

ٱسْتِكْبَارًا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَكْرَ ٱلسَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ ٱلْمَكْرُ ٱلسَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِۦ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ ٱلْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ فاطر. چونکە خۆیان بە گەورەو زل زانی لە زەویداو پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، (بە مەرجێک) پیلانی شەڕو تاوان



(هەمیشە) بەسەر ئەواندا دەشكێتەوە كە نەخشەی بۆ دەكێشن، مەگەر ئەمانە (بە دژایەتی ئیسلام) تەنها چاوەڕێی ئەو كارەساتانە بكەن بەسەر گەلانی پێش ئەماندا هاتووە، (كاتێ كە بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، لەناوبران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاساو بەرنامەكانی خوادا گۆڕانكاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەكانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن (كە بەشێكی ڕیسوا كردنی پیلان گێڕانە).

لەبەر ئەوە گرنگە بزانیت یاسای كەون و خواناسی و شەرع بەگشتی چەقیوە و ناگۆڕێت، لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەكەوێت، ئەگەر هەر زانایەكی فیزیایی، یاخود كیمایی یان كۆسمۆلۆجی، یان جیۆلۆجی.. هتد، كاتێک بینای بیردۆزی و زانستەكانیان دەكەن لەسەر یاسا نەگۆڕەكانی ئەم كەونە بونیاتی زانستی خۆیان دەنێن، بۆ پێكهاتنی قەزاو قەدەر خوای پەروەردگار یاسای نەگۆڕی بۆ داناوە هەر ئەم تێگەشتنە لە یاسای قەزاو قەدەر پانتایی و بەرفراوانێكی زۆر دەبەخشێت بە مرۆڤی موسوڵمان سەربارەت بە خوودی قەزاو قەدەرو پاكێجەكەی بەگشتی.

بۆ نموونە لە ئیسلامدا بۆ گەیشتن بە سەركەوتن و تەمكین، چەند یاسایەكی نەگۆڕ هەیە مرۆڤی موسوڵمان دەبێت قۆناغەكان ببڕێت، خۆ ژیانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و فەرمودەكانی هەموو بۆ ئێمە بووە بە یاسای نەگۆڕ، ناكرێت لە قۆناغی مەككە خێرا بازبدرێت بۆ ناو قۆناغی جەنگی بەدر، ئەو دوو یاسایە یاسای تری لە نێواندایە بۆ ئەوەی پیادەی یاسای بەدر یاخود ئەحزاب بكرێت.

بیروباوەڕی ئیسلام نەگۆڕە واتا ئەو یاساو ئەحكامانەی تێیدایە ناگۆڕێت، مادام وایە دەبێت شوێن یاساكان بكەوین بۆ ئەوەی سەركەوتن بە دەست بهێنین، دەگەڕێمەوە ناو باسەكەم كە باسی یەقین و تەوەكولە،



مـرۆڤ دەشـێ یەقینـی ١٠٠٪ هەبێـت بە خـوای گەورە، بەڵام بـۆ ئەوەی سەرکەویت بە دینی خوای گەورە، یەقین تەنها بەس نییە، بەڵکو یاساکانی سەرکەوتن لەگەڵ یەقین ئەنجامی سەرکەوتن بە دەست دەهێنێت، بـۆیە وشـەی پـاکێجم بەکارهێنـاوە هەر بـۆ ئەوەی تـۆی بەڕێـز تێبگەیـت ڕەهەندێک یاخود لایەنێک لەم ئیمان و ئیسلامە کارناکات، بەڵکـو چەنـد ڕەهەند و لایەن و پاکێج بەیەکەوە کاردەکەن تا سیستەمێک دابمەزرێنن و هەموو سیستەمەکەش ناوی دینی ئیسلامە.

کەواتە کارەکەمـان قورسـە، خـوای پەروەردگـار بە پێغەمـبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویت:

يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٞۖ فَلَا تَغُرَّنَّكُمُ ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَا وَلَا يَغُرَّنَّكُم بِٱللَّهِ ٱلۡغَرُورُ ٥ فاطر. چونکە بەڕاستی ئێمە فەرمودەو گوفتارێکی سەنگین دادەبەزێنینە سەرت (کە بەهۆیەوە ڕوو بەڕووی ئەرک و زەحمەتی زۆر دەبێت).

ئەو وتەی کە قورسـە خـوودی دیـن و قورئـانەکەیە واتـا سـیفەتە کـامیلەکە، چـونکە لە ڕووی ئەمـانەت و هەڵگـرتن و وتنـی حەق قورسـە وەکو وەرگرتنی لەلایەن خەڵکیەوە قورسە، لە میزانی حەقدا بە گشتی لەم ناسینە قورسە، مەرد و شێرە پیاو و شێرەژنی دەوێت بۆ هەڵگرتنی.

خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

لَوۡ أَنزَلۡنَا هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ عَلَىٰ جَبَلٖ لَّرَأَيۡتَهُۥ خَٰشِعٗا مُّتَصَدِّعٗا مِّنۡ خَشۡيَةِ ٱللَّهِۚ وَتِلۡكَ ٱلۡأَمۡثَٰلُ نَضۡرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ٢١ الحشر. ئەگەر ئەم قورئانەمان دابەزاندایە سەر کەژو کێوەکان، دەتبینی مل کەچ دەبوو،



وردوخاش دەبوو، شەق و پەق دەبوو، لەترسی فەرمانەکانی خوا، لە هەیبەتی گەورەیی و دەسەڵاتی خوا، ئێمە ئەم نمونانە دەهێنینەوە بۆ خەڵکی بەڵکو بیربکەنەوەو ژییریان بخەنە کار و (شوێن قورئانی پیرۆز بکەون).

ئەمەش ئەو ڕاستیەیە کە شاخ خۆی لەبەردەم ئەم ئەمانەتەدا ناگرێت، بۆیە هەڵگرتنی ئەم دینە خەڵکی جوامێری دەوێت.

گەڕانەوە بۆ ناو باس، ئیسلام قۆناغە، ئەستەمە بگەیتە ئامانج تا قۆناغەکانی وەکو خۆی نەبڕیت، کە دەڵێن سونەتی پێغەمبەری صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، واتا ڕێگای پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ یاخود ئەوەی ئەو کردوویەتی ئێمەش شوێنی دەکەوین و دووبارەی دەکەینەوە.

شوێنکەوتنی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ تەنها لە نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و بەندایەتیی و بابەتە فیقهیەکاندا نییە، بەڵکو ژیانی ئەو پاکێجەکەیە لەگەڵ قورئاندا سیستەم و ئایینی ئیسلامیان دامەزراندووە، کەواتە ژیانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ یاسایە بۆ مرۆڤە موسوڵمانەکان، نموونەی ئەوەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: قولوا لا إلهَ إلَّا اللهُ تُفلحوا، قولوا لا إله إلا الله تملكوا العرب والعجم. ئەم فەرمودەیە بەشی یەکەمی ڕیوایەتی ئیمام ئەحمەدە و بەشی دووەمیشی بە چەند ڕیوایەتێک هاتووە.

با یەقینت هەبێت بەخواو پێغەمبەرەکەی بەتەواوەتی دڵنیا بیت لە ئیمان و خواناسی و تەوەکولت بە خوای پەروەردگار، ئەوە نیوەی کارەکەت بۆ ئاسان دەکات، نیوەکەی تری پێویستە پیادەی یاساکانی ئەم

ئیسلامە بکەیت و شارەزابیت لە یاساو ئەحکامەکانی و قۆناغەکانی، ئەوەش نیوەکەی ترییەتی.

واتە کە دەڵێین (لا إلـهَ إلَّا اللـهُ) ئەوە بنەڕەتی پڕۆژەکەیە، ئەم پڕۆژە پێویستی بەکار و قۆناغە

بۆ تێگەشتن زیاتر بەنموونەیەک دەست پێدەکەم - گریمان پڕۆژەی (لا إلهَ إلَّا اللهُ) دروست کردنی باڵاخانەیەکە لە چوارچێوەی زەویەکی ٢٠٠٠ م٢دا، سەرەتا ئەم زەوییە پێویستی بە ڕێک کردن هەیە، پاشان پێویستت بە نەخشە هەیە، ئینجا پێویستە خەنەق لێبدرێت تا پایەکانی تێدا بوەستێت، پاشان دیوار دروست بکرێت و سەقف تێبکرێت، ئەمە تەنها بونیادی سەرەکی بیناکەیە، دەبێت بەهێز بێت بۆ ئەوەی بتوانین چەند نهۆمی تری لەسەر بینا بکەین، هێزی چەند نهۆمەکە ئەندازیارەکانی دەست نیشانی دەکەن، پاشان پێویستی تری زۆرە وەکو پەنجەرەو دەرگاو ئاو و غاز و کارەبا پێداویستیەکانی تری بەگشتی..هتد

ناکرێت بڵێم من باڵاخانەیەک دروست دەکەم، بەڵام خاوەنی ١٠٠ دۆلارم یان زەویم هەیە بڵێم یەقینم هەیە خوای پەروەردگار بێ ئەوەی پێویستم بە کرێکار هەبێت خۆی فریشتە دەنێرێت بیناکەم بۆ دروست دەکات، چونکە یەقین و تەوەکولم تەنها بەخوایە!! ئایا ئەمە ڕوو ئەدات؟ بێ گومان نەخێر، چونکە کەرەستەو هۆکارەکانت تەواو ئامادە نەکردووە، خوای پەروەردگار یاسای خۆی تێکنادات لەبەر یەقین و تەوەکولی هەڵەی تۆ.

پرۆژەی (لا إلـهَ إلَّا اللـهُ) پێویستی بەو کارانەیە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ کردی، لە لاوازترین ناوچەدا توانی کاربکات دوو



ئیمپراتۆریەتی گەورەی جیهانی دا بەزەویدا و عەرەب و عەجەمـی خستە ژێر دەسەڵاتی ئیسلام.

ئەو قۆناغـــانەی پێغەمـــبەر ﷺ بـــڕی هەمـــوو لەبەردەستماندا هەیە، بەڵام ئێمە یان بـازی بەسـەردا هەڵـئەدەین، یـاخود تەرکی دەکەین، خوای گەورەش یاسای بـۆ دانـاوین، هەر یاسـایەک کەم و کورت بێت، پڕۆژەکە خوار و خێچ دەبێت زوو لەنـاو دەچێـت، یـاخود پـێ ناگات، ئەمەش چیرۆکی ئوممەتی ئیسلامە لە ئێستادا.

گومـانی تێـدا نیـیە کە یەقـین و دڵنیـایی و تەوەکـول بە پەروەردگـار پێویستە لە هەموو کات و ساتێکدا، هەندێک وەکـو تـاکە کەس، مـوەفەق دەبێت تێیدا و خوای گەورە کارەکانی بۆ ئاسان دەکات، بەڵام بێ زانسـت؟ دیارە نەخێر، بەڵکو بە ئیمانێکـی ڕاسـتگۆیانە بـێ ئەوەی بەخـۆی بزانێـت پیـادەی هەمـوو یاسـاکان دەکـات، ئیـتر خـوای گەورە مـوەفەقی دەکـات، سەری دەخات لە بواری تاکە کەسیدا.

تێگەیشـتن لە بـواری یەقـین و تەوەکـول لە بـواری قەزاو قەدەردا، کە گرنگترین بەشی ئەم پێکهاتەیەیە، بەداخەوە زۆرێک لە خەڵکـی زۆر هەڵە لەم بوارە تێگەیشتوون و چونەتە ناو عەقیدەیەک کە ئیسلام خاوەنی نییە، بەڵکو عەقیدەی جەبریە و مەسیحی و یەهود و زەردەشتی و..هتد بڕوایان پێیەتی، هۆکاری زۆرێکە لەوەی کە خەڵکی بۆتە مولحید و بێدین، چـونکە دین بە خورافات تەماشا دەکەن، ئەویش لە چارەم نووسراوە!! واتـا لەنـاو چاوم هەموو شتێک نووسراوە.

هەرچەندە پێشتر لە پاکێجی قەزاو قەدەر ڕوونم کردۆتەوە، بەڵام بە پشتیوانی خوا لێرەدا تەواوکەرەکەی باس دەکەین، ئەویش لە فەرموودەی ئیبنو عەباسدا هاتووە کە دەفەرمووێت:

(عن عبد الله بن عباس رضي الله عنهما قال: كنت خلف النبي صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ يوماً فقال يا غلام، إني أعلمك كلمات: احْفَظِ اللهَ يحفظْك، احفظ الله تَجِدْه تُجَاهَك، إذا سألت فاسأل الله، وإذا اسْتَعَنْتَ فاسْتَعِن بالله، واعلمْ أن الأمةَ لو اجتمعت على أن ينفعوك بشيء لم ينفعوك إلا بشيء قد كتبه الله لك، وإن اجتمعوا على أن يَضرّوك بشيء لم يَضرّوك إلا بشيء قد كتبه الله عليك، رفعت الأقلام وجفت الصحف).[١٩]

واتە: ئیبن عەباس ئەفەرموێت: ڕۆژێک لە پشتی پێغەمبەرەوە بووم بە سواری وولاغ فەرمووی: ئەی غولام (غولام بە کەسێک ئەوترێت منداڵەو هێشتا باڵغ نەبووە، چونکە کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەفاتی کرد، تەمەنی ئیبنو عەباس نزیکەی ١٤ ساڵ بووە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ) چەند وشەیەکت فێر دەکەم، (لێرەدا وشە بە مانای ئامۆژگاری و فێرکاری دێت، خواش لە هەمووان زاناترە)، خوا بپارێزە، خوای پەروەردگار ئەتپارێزێت، خوا بپارێزە هەمیشە خوای پەروەردگار دەبینیتەوە کە ڕووەو تۆیە.

زانایان بەتایبەت شێخ عوسەیمین سەرۆکی گەورە زانایانی سعودیە -ڕەحمەتی خوای لێبێت- دەفەرمووێت: واتا پارێزگاری لە شەرعی خوای

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[١٩] رواه الترمذي.



گەورە بکە خوای گەورە ئەتپارێزێت، پیادەی دینی خوا بکە خوای گەورە هەمیشە ڕووە و تۆیە، (احْفَظِ اللهَ يحفظْک، احفظ الله تَجِدْه تُجَاهَک).

لێرەدا زۆرێک لە زانایان تەفسیر و تەئویل دەکەن بۆ ئەم جۆرە دەقانە کە خوای گەورە پاداشتیان بداتەوە، ڕاست و دروست و تەواوە. چەند ئایەتمان هەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَنصُرُواْ ٱللَّهَ يَنصُرۡكُمۡ وَيُثَبِّتۡ أَقۡدَامَكُمۡ ٧﴾ محمد. ئەی ئەو کەسانەی کە ئیمان و باوەڕتان هێناوە، ئەگەر ئێوە پشتیوانی لە ئایینی خوا بکەن و هەوڵی سەرکەوتنی بدەن، خوایش پشتیوانی لە ئێوە دەکات و سەرتان دەخات و پایەدارو جێگیرتان دەکات.

مادام دینی خوای گەورە سەربخەیت خوای گەورە سەرت دەخات، کەواتە ئەمە یاسای نەگۆڕە و لەو یاسا چەقیو و کۆنکرێتیانەیە کە گۆڕانکاری بەسەردانایە.

پاشان پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: بە ئیبنو عیباس: (إذا سألت فاسأل الله) واتە: ئەگەر داوات هەبوو تەنها داوات لە ڕووی خوای پەروەردگار بێت. پاشان دەفەرمووێت: (وإذا اسْتَعَنْتَ فاسْتَعِن بالله) ئەگەر پشتت بەست، تەنها پشت بەخوای گەورە ببەستە. ئەمە یاسایە لە ئەنجامی پیادەکردنی ئەم یاسا نەگۆڕانە چی ڕوودەدات؟!

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (واعلمْ أن الأمةَ لو اجتمعت على أن ينفعوک بشيء لم ينفعوک إلا بشيء قد كتبه الله لک، وإن اجتمعوا على أن يَضرّوک بشيء لم يَضرّوک إلا بشيء قد كتبه الله عليک).



واتە: بزانە ئەگەر ئەم ئوممەتە بۆت کۆببنەوە و بیانەوێت هاوکاریت بکەن، ئەگەر ویستی خوای لەسەر نەبێت کەسیان ناتوانن هاوکارت بن. لێرەدا بە سیفەتی فیعل هاتووە (نفع)و مەبەست پێی ویستی خوایە، چونکە مرۆڤ هاوکاری مرۆڤە بەسروشتی ئەم بوونە، بەڵام لێرەدا جیاوازە وەکو عەرەب دەڵێت: (إستثناء) چونکە خوای گەورە ڕازی نییە لەسەری نەک بەو مانایەی هیچ کەس ناتوانێت هاوکاریت بکات، ئەگەر هاوکاریشت بکەن مەرج نییە (نەفع) سوودی تێدا بێت، بەڵکو ئەبێتە زیان، ئەوەی مەبەستمە ویستی خوای پەروەردگارە، ویست و ئیرادەش ئەکرێت بۆ مەنع بێت و ئەشکرێت بۆ ناڕازی بون و پێناخۆشبون بێت. لە ڕابوردوودا لاپەڕەکانی سەرەتا باسمان کرد کە خوای پەروەردگار ویست و زانینی هەیە. واتە بەگشتی تەنها ئەوەی ویستی خوایە کە پێت بگات بە هاوکاری خەڵک کەوا هۆکار و سەبەبن پێت دەگات و پێچەوانەکەشی.

ئەگەر هەموو ئوممەت، یاخود خەڵکی بە گشتی گەلە کۆمەکیت لێ بکەن بۆ ئەوەی زەرەرو زیانت پێبگەیەنن، ئەگەر خوای پەروەردگار ویستی لەسەری نەبوو ناتوانن هیچ زیانێکت پێبگەیەنن، ئەمەش لە عیلم و زانست و ویستی خوای گەورە دا هەیە هیچ کەس ناتوانێت دەستکاری بکات و گۆڕانکاری تێدا بکات.

ئەگەر تەماشا بکەین فەرموودەکە جوان دەری دەخات مەگەر خوای گەورە بیەوێت، ئەمەش ویستی ئیرادەی خوای پەروەردگارە چونکە زاتی پاکی دەیەوێت (رفعت الأقلام وجفت الصحف).

دێمەوە بۆناو باسی یەقین و تەوەکول لە قەزاو قەدەر دەردەچم، هەموو ئەم فەرمودەیەی کە شیکاریمان بۆکرد زانایان سەرەتاکەی باس و تەفسیری دەکەن و تەئویلیش بە زانایان فەرمووودەوانی و عەقیدە.هتد.



بەڵام باسی ویستی خوای پەروەردگار لەم بەشەدا ناکەن بۆ؟ نازانم، ئەشێت من هەڵە بم، یاخود من بە خزمەت زانایانی تر نەگەیشتووم و وتەیان هەبێت لەم باسەدا، بەهەرحاڵ ئەمە تێگەشتنی منە لەم فەرموودەدا، کە یەقین و تەوەکول بە مرۆڤ ئەدات لەسەر ویستی خوای پەروەردگار بە مەرجی پیادەکردنی یاساکانی کە پیادەی شەرعی خۆیەتی ناردوویەتی بۆ محمدی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ هەر بۆیە شێخ عوثەیمین دەفەرموێت: ئیمان واتا بڕوا بونی مرۆڤ بەو شتانەی کە زۆر دڵنیایە لێی و هیچ دووڕیانێکی تێدا نابینێت و یەقینی تەواوی پێ هەیە و هیچ درزێکی تێدا نابینێت، وەکو ڕۆژ دەبینرێت لە نیوەڕۆی هاویندا، ئەم بینینەش هیچ گومان و دوو دڵیەک ناهێڵێتەوە.

جا بەم پاوپێوەندە هەموو کارێکی غەیبی لەلایەن خواو پێغەمبەرەوە هاتووە گومانمان لێی نییە و یەقینمان پێیەتی بۆ کارکردنیش تەنها تەوەکولمان بە خوای پەروەردگارە. تەوەکول بە خوودی پێغەمبەر و هیچ پێغەمبەرانێک، جائیز نییە و شیرکە، چجای ئەوە پیاو چاک و خەڵکی دیکە.

وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ﴿٢٢﴾ الأحزاب. کاتێک ئیمانداران ئەو هەموو دەستە و گرۆهانەیان بینی وتیان: ئەمە ئەوەیە کە خوا و پێغەمبەرەکەی بەڵێنی پێداوین (کەئاوا دژایەتی ئایینەکەی دەکرێت و کافران و دووڕووەکان نەخشەو پیلان دەکێشن بۆ ڕیشەکەن کردنی)، دیارە خوا و پێغەمبەرەکەی ڕاستیان فەرموو لەپێش هاتنیدا، بێگومان ئەو دژایەتییە باوەڕو ملکەچی نەبێت هیچی تری بۆ زیاد نەکردن (واتە سوورتر بوون لەسەر ئیمان)



﴿ٱلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ لِلَّذِينَ أَحۡسَنُواْ مِنۡهُمۡ وَٱتَّقَوۡاْ أَجۡرٌ عَظِيمٌ ١٧٢﴾ (بە تایبەت) ئەوانەی بەدەم بانگەوازی خواو پێغەمبەرەوە ﷺ چوون دوای ئەوەی تووشی ناخۆشی و زام و ئێش بوون، بۆ ئەوانەیان کە چاکەیان کردو پارێزکار بوون پاداشتی زۆر گەورەو بێ سنوور ئامادەیە.

﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ إِنَّ ٱلنَّاسَ قَدۡ جَمَعُواْ لَكُمۡ فَٱخۡشَوۡهُمۡ فَزَادَهُمۡ إِيمَٰنًا وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣﴾ آل عمران. ئەوانەی (هەندێک لە) خەڵکی پێیان دەڵێن: بەڕاستی خەڵکی هەمووی خۆیان بۆ ئێوە کۆکردۆتەوە و خۆیان بۆ ئێوە ئامادە کردووە، لێیان بترسن (خۆتان تووشی بەڵا مەکەن)، بەڵام ئەوان (واتە ئیمانداران) زیاتر باوەڕیان دامەزراو بوو، وتیان: خوامان بەسە کە یاریدەدەر و یارمەتیدەرمان بێت.

﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱلۡحَيِّ ٱلَّذِي لَا يَمُوتُ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِهِۦۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ٥٨﴾ الفرقان. تۆ (ئەی محمد ﷺ, ئەی ئیماندار) پشت ببەستە بەو زاتەی کە هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێت، بەردەوام تەسبیحات و سوپاس و ستایشی بکە، ئەوەندە بەسە بۆ (سەلماندنی دەسەڵاتی ئەو زاتە) کە بە هەموو گوناهەکانی بەندەکانی ئاگایەو (هیچی لێ پەنهان نییە).

﴿قَالَتۡ لَهُمۡ رُسُلُهُمۡ إِن نَّحۡنُ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ يَمُنُّ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۖ وَمَا كَانَ لَنَآ أَن نَّأۡتِيَكُم بِسُلۡطَٰنٍ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١١﴾ إبراهیم. پێغەمبەرانیان پێیان وتن: ئێمە تەنها بەشەرێکین وەکو ئێوە و هیچی تر، بەڵام خوا ویستی هەر کەسێکی ببێت لە بەندەکانی خۆی منەت دەخاتەسەری (هەڵیاندەبژێرێ بۆ گەیاندنی



پەیامە پیرۆزەکەی)، ئێمە بۆمان نەبووە هیچ بەڵگە و موعجیزەیەکتان بۆ بهێنین مەگەر بە ویست و مۆڵەتی خوا نەبێت، دەبا ئەوانەی ئیماندارن هەر پشت بەخوا ببەستن.

﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُتَوَكِّلِينَ ١٥٩﴾ آل عمران. (ئەی محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِۦوَسَلَّمَ) بەهۆی ڕەحمەتی خواوەیە تۆ نەرم و هێمنی لەگەڵ ئەواندا، خۆ ئەگەر توڕەو دڵڕەق بویتایە، هەموو لە دەورت بڵاوەیان دەکرد، کەواتە چاوپۆشیان لێ بکەو لێیان ببورەو داوای لێخۆشبونیان بۆ بکە، لە کارو پێشهاتا پرس و رایان پێ بکە، (دوای مەشوەرەت و پرس و ڕا) ئەگەر بڕیارت دا (کارێک ئەنجام بدەی، ئەنجامی بدەو) پشت بەخوا ببەستە چونکە بەڕاستی خوا ئەوانەی خۆش دەوێت کە پشتی پێ دەبەستن.

﴿وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ بَٰلِغُ أَمۡرِهِۦۚ قَدۡ جَعَلَ ٱللَّهُ لِكُلِّ شَيۡءٖ قَدۡرٗا ٣﴾ الطلاق. لە شوێنێکەوە ڕزق و ڕۆزی پێ دەبەخشێت کە حسابی بۆ نەکردبێت و بە خەیاڵییدا نەهاتبێت، جا ئەوەی پشت بە خوا ببەستێت، ئەو زاتەی بەسە بۆ ئەوەی یاریدەدەری بێت، چونکە بەڕاستی خوا ئەوەی بڕیاری لە سەری هەبێت بە ئەنجامی دەدات، وە بۆ هەرشتێک کاتی دیاریکراوی بڕیارداوە.

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتۡ قُلُوبُهُمۡ وَإِذَا تُلِيَتۡ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتۡهُمۡ إِيمَٰنٗا وَعَلَىٰ رَبِّهِمۡ يَتَوَكَّلُونَ ٢﴾ الأنفال. بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووەم) کاتێکیش ئایەت و



فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێیەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن..

هەروەها ئەم چەند ئایەتەی کە وەکو نموونە ئاماژەمان پێیداوە بۆ پاڵپشتی باسەکەمان، هەموو ئەو یەقین و تەوەکولە دەردەخەن بۆ موسوڵمانان و پێچ دانەوەی مونافیقە دووڕووەکان چۆن بەرخوردیان لەگەڵ موسڵمانان کردووە لە جەنگی ئوحودو لە جەنگی خەندەق-دا.

لە غەزوەی بەدردا موسڵمانان زۆر نەبوون بەڵکو لەچاو کارەکاندا زۆرکەم بوون کافرەکان (١٠٠٠) کەس بوون، موسوڵمانان (٣١٤ یان ٣١٦) کەس بوون، ئەوەندەی توانیان لەچەک هەڵیان گرتبوو هێزو و توانایان زۆر لاواز بوو بەڵام ئەوەی لە توانایاندا بوو ئەنجامیان دابوو لەڕووی هێز و چەکەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو یاسا شەرعییەکانیان ڕەچاوکردبوو لە ئیخلاص، یەقین و تەوەکول، ڕاستگۆیی و تەقوا و دوعا، کارکردن، گوێ ڕایەڵی لە پێناو خوادا خاڵێک نەمابوو لە خاڵە یاساییەکان(شەرعی و کەونی) ئەنجامی نەدەن، ئەنجامەکە سەرکەوتنی موسوڵمانان بوو بەسەر قوڕەیشی خاوەن چەکی دەوڵەمەند و زۆر و زەبەند، بەڵکو خوای پەروەردگار یارمەتی بێ شوماری دان لەوەی کە ئیمانداران بە خەیاڵیشاندا نەهاتبوو، وەکو سەربازانێک هاوکاری ئیمانداران بوو لەوانە هاوکاری فریشتەکان، باران، ئەمن و ئاسایش لەسەر دڵ و دەروونی موسوڵمانان لە بەدر دا.. هتد

پێچەوانەکەی لە غەزوەی ئوحود دا، زیاتر بوون لە هێزی ڕابوردویان، سەرەتا هەموو یاسا کەونی و شەرعیەکانیان ڕەچاو کرد، سەرکەوتن بەسەر کافرەکاندا، موسوڵمان(٧٠٠ کەس) بوون کافرەکان نزیکەی (١٥٠٠) کەس



بوون له جوڵەی یەکەم باش سەرکەوتن بەسەر کافراندا، بەڵام کە دونیاو دەست کەوت و غەنیمەت، نییەتی گۆڕین و گوێڕایەڵی ئەمیرەکەیان نەکرد کە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ بوو, نەک سەرنەکەوتن، بەڵکو توشی موصیبەت بوون ئەمە سونەتی خوای گەورەیە، بۆ هیچ کەسی ناگۆڕێت، خۆ خوای پەروەردگار لەناو چاوی نەنوسیبوون دەبێت توشی موصیبەت و هەڵهاتن بن لەو جەنگەدا، بەڵکو خەتای خۆیان بوو، خوای گەورە بۆمان باس دەکات، هۆکاری چی بوو تووشی ئەو بەڵاو موصیبەتە بوون، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿وَلَقَدۡ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعۡدَهُۥٓ إِذۡ تَحُسُّونَهُم بِإِذۡنِهِۦۖ حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ وَعَصَيۡتُم مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٥٢﴾ آل عمران. بێگومان خوا بەڵێنی خۆی بۆ ئێوە بەڕاستی بردە سەر (لەسەرەتای جەنگی ئوحود)دا، هەر بە مۆڵەت و یارمەتی ئەو (دوژمنانتان) بەگیر هێناو تێکتان شکاندن، هەتا ئەو کاتەی کە ساردی ڕووی تێکردن و بوو بە کێشەتان لەسەر هەندێک شت، و یاخی بوون (لە فەرمانی پێغەمبەرو صلى الله عليه وسلم سەنگەرتان چۆڵ کرد)دوای ئەوەی کە هەندێ شتی نیشان دان کە حەزتان لێ دەکرد، هەتانە دنیای دەوێت و هەتانە قیامەتی مەبەستە، لەوەودوا دەستی ئێوەی کۆتا کرد (لە دوژمنان) تا تاقیتان بکاتەوە، بێگومان لەوەودوا خوا چاوپۆشی لێکردن و لێتان خۆش بوو، وە خوا فەزڵ و ڕێزی هەیە بۆ ئیمانداران.

بە ڕوونی و ئاشکرا باسی ئەوەمان بۆ دەکات هۆکاری شکستان، هەوڵدان بوو بۆ دونیا.



هەروەهــا لە جەنگــی ئەحــزاب موســڵمانان (٣٠٠٠) کەس بــوون، کافرەکانی عەرەب بەهەموو گەل و هۆزەکانیانەوە هێرشیان هێنا بۆ سـەر شاری مەدینە بە (١٠٠٠٠) کەس، موسـڵمانان خۆیـان ئامـادەکردو هێزیـان کۆکردەوە ئەوەندەی لە توانایاندا بوو، خەندەقیان هەڵکەند و گوێ ڕایەڵی ئەمیرەکەیان بوو زۆر بە ئاسانی خوای گەورە سەری خستن و تەنانەت ئەو دوو هەزار سەربازەی هاتبوون بۆ جەنگی موسـوڵمان خـوای پەروەردگـار وەکو دیاریەک بەخشـییەوە بە پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ و توانی بە (١٠٠٠٠) موسوڵمان دوای چەنـد سـاڵێک فەتحـی مەکـکەی پـێ بکـات، لە ڕاسـتیدا موسـوڵمانان لەنـاو چاویـان نەنوسرابـوو دەبێـت هەر سـەربکەون، بەڵکـو هەمـوو هۆکارەکانیـان گـرتەبەر لە یاسـا کەونـی و شەرعیەکان، ئینجا خوای گەورە سەریخستن.

پـێچەوانەکەی جەنگـی حـونەین بـوو موسـوڵمانان نـزیکەی (٣٠٠٠٠) کەس بوون، چونکە خۆشەویستی دنیاو سەروەت و سامان چوو بە دڵیان و بە زۆریاندا دەنازین، لەگەڵ یاسای کەونی و شەرعیدا ڕێگایان نەبڕی، بۆیە لە ماوەیەکی کورتدا هەمووی ڕایکرد، تەنها چەند کەسێکی کەم بە دەوری پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ مانەوە تـا نیـیەت و ئیخلاصـیان گـۆڕی و چونەوە سەر یاسا کەونی و شەرعیەکان خوای گەورە هەمـوو سـەروەت و سامان و ماڵ و منداڵی گەلی (هەوازن و سەقیفە)ی خستە بەردەسـتیان و لە شکستەوە ڕاستەوخۆ بۆ سەرکەوتن.

زۆر بە سادەیی ئەمەش چیرۆکـی ژیـانی هەمـوو کەسـێک و گـروپ و لایەنـێکە کە خـوای پەروەردگـار بە یاسـا نەگۆڕەکـان موسـوڵمان و غەیـرە موســوڵمانیش ســەردەخات چــونکە پەروەردگــار هەمیشــە فەرمــان بەدادپەروەری و چاکەخوازی دەکات هانی مرۆڤەکان ئەدات دوور بـن لە



خراپەکاری و فەساد و بەدکاری، لێرەوە ئەمەمان بۆ دەردەکەوێت، کە تاوانە، خەڵکی زینا بکات یان دزی بکات، بڵێ لەناو چاوم نوسرابوو ئەم جۆرە عەقیدەیە یەقین و تەوەکول ناهێڵێت، بەڵکو خەڵکی فێری تاوان و خراپەکاری و تەمەڵی دەکات، دەڵێت خۆمن لەناو چاوم نووسراوە، ئیتر بۆ خۆم ماندوو بکەم.

بەپێوەری عەقڵانیش بێت، ئەگەر مرۆڤ ناچار نەبێت بە کردنی کارە خراپەکان، وەکو ڕۆبۆت بەرنامەی بۆ دارێژرابێت، ئیتر بۆچی سزا دەدرێت لەسەر تاوانەکەی، خۆ وەکو ئەو گروپەی دەڵێن لەناو چاومان نووسراوە، کەی ئەوان تاوانبارن، بەڵکو پەنا بە خوا ئەم جۆرە قسانە و بیر و باوەڕە، خوای پەروەردگار تاوانبار دەکەن، لە کاتێکدا لە دەیان جێگا لە قورئان و سونەتدا خوای گەورە فەرمان بە چاکە دەکات و یەقین و تەوەکولمان داوا لێ دەکات، ئاخیر ئەوە چ عەقیدەیەکە، بڵێت خوا لەناوچاوی نوسیوم من درۆ بکەم، دزی بکەم، زینا بکەم، پیاو بکوژم!! جا کەوایە بەهەشت و دۆزەخ بۆ دانراوە، ئەم بیروباوەڕە لە یاری ماڵە باجێنەی منداڵان دەچێت.

تەنانەت تاقی کردنەوەکانیشمان، لەسەر چاکەیە نەک خراپەکاری وەک خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلۡمَوۡتَ وَٱلۡحَيَوٰةَ لِيَبۡلُوَكُمۡ أَيُّكُمۡ أَحۡسَنُ عَمَلٗاۚ وَهُوَ ٱلۡعَزِيزُ ٱلۡغَفُورُ ٢﴾ الملك. هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە، تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە (بەسەر بێ باوەڕاندا)، وە لێخۆشبووە (لە ئیمانداران).

ئالێرەدا خەممە خراپ حاڵی بونێک ڕو بدات، بۆیە پێویستە خەمەکە بڵێم و ڕاستیشی بکەمەوە، کە ئەڵێم تەنانەت تاقی کردنەوەشمان لەسەر

چاکەیە نەک خراپە مەبەستم ئەوەیە خوای گەورە چاکە و چاکەکاری لە ئێمە ئەویت ئەگەر مرۆڤ بیەوێت و خراپەو خراپەکاری لە ئێمە ناوێت ئەگەر بمانەوێن نەیکەین، ئەگینا تاقیکردنەوەی ئێمە ئەکرێت بە شتی باش و خۆش و جوان بێت وەک دەوڵەمەندی و زانست و تواناو هتد ئەشکرێت بە شتی خراوو ناخۆش و ناجوان تاقیمان بکاتەوە وەک نەخۆشی و هەژاری و بێ کەسی و هتد. پێشتریش ئەم قسەم کردوە بەڵام هەر ئەم تەفسیرەم مەبەستە. چونکە شەریعەت داوای ئەوە ئەکات کەچاکەکان بژاردەی هەمیشەمان بێت و کە خراپەو حەرامیش هاتەڕیمان لێی دوربکەوینەوە، خوای گەورە ئەفەرموێت:

﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِۗ وَنَبْلُوكُم بِٱلشَّرِّ وَٱلْخَيْرِ فِتْنَةًۖ وَإِلَيْنَا تُرْجَعُونَ ٣٥﴾ الأنبياء. واتە: هەمو نەفسێک مردن ئەچێژێت و بە بە خراپ و چاکیش تاقی ئەکرێنەوەو گەڕانەوی ئێوەش بۆ لای خوای گەورەیە.

یاخود لە ئایەتێکی تردا دەفەرمووێت:

﴿۞ إِنَّ ٱللَّهَ يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَٱلْإِحْسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ وَٱلْبَغْيِۚ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ٩٠﴾ النحل. بەڕاستی خوا فەرمان دەدات بە دادپەروەری و چاکەکاری و یارمەتیدان و بەخشندەیی بە خزمان، وە قەدەغە لە گوناهو تاوان و دەستدرێژی دەکات (بۆ سەر ماڵ و نەفس و نامووس) وە ئامۆژگاریتان دەکات بەڵکو یاداوەری وەرگرن و تێفکرن و (هەر چاکە بکەن).

یەقین لە ئەنجامی باش ناسینی خوای پەروەردگارەوە دێت و تەوەکولیش بە ناسینی یاساو ڕێساکانی خوای پەروەردگار دەبێت.





# بەردەوام بوون لەسەر خواناسی و دینداری - استقامة

بە دڵنیاییەوە هەموو ئەم پێکهاتانەش تەواوکەری یەکترن، چونکە وەکو ملوانکە مرواریەکەیە کە ئاماژەمان پێداوە، مرۆڤ دەبێتە خاوەن ئیستقامە لەسەر دین، کە خاوەن (یەقین و تەوەکول و ئیخلاص و نیەت صاف و ڕاستگۆ..هتد)بێت.

ئیستیقامە لە کون فەیەکونێکدا دروست نابێت، بەڵکو کەرەستەو پێداویستی خۆی هەیە، ئاماژەمان پێدا ئیمان بە: خواناسی، قورئان خوێندن, مزگەوت, هاوڕێی باش، ئیمان، لاوازو کەم ناکات.

بەردەوام بوون و ئیستقامە لەم تەوەرەدا زیاتر کاردەکات، مرۆڤی ئیماندار پێویستە پابەندبێت بە نوێژو مزگەوت و خوێندنی قورئان و هاوڕێی باش و خۆ ڕۆشنبیرکردن لە هەموو بوارەکانی دینی ئیسلام، تایبەتمەندێتی لە بوارێک داو، هەوڵدان بۆ بانگەواز بۆ ئەم ئایینە پیرۆزە.

ئەمانەی باسم کرد و چەندێکی تر هۆکاری ئیستقامەن و بەردەوامی دەبەخشن بە مرۆڤی موسڵمان، پێچەوانەکەشی دوورکەوتنەوەیە لە ژینگەی مزگەوت و موسڵمان و خواناسی بەگشتی.

پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١١٢﴾ هود. جا چۆن فەرمانت پێ دراوە، هەروا بەڕاست و بەڕێکی بەجێیان بهێنە، هەروەها ئەو کەسانەش لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆلای خوا، نەکەن لە سنووری فەرمانی خوا دەرچن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن.

ڕاوەستاو و بەردەوام بە وەکو ئەوەی خـوای پەروەردگـار فەرمـانی پـێ کردوویت.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ٣٠﴾ فصلت.

ئەوانەی دەڵێن پەروەردگارمان (الله)یە لەوەودوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە دەبن، (لە سەرەمەرگدا) دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆلایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکمان نەبێ (لە داهاتوو) هیچ غەم و پەژارەیەکتان نەبێ (بۆ ڕابردوو) مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا..

کەسـێک هـاتە خزمەتـی پێغەمـبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمـووی یارسولی خوا لە ئیسـلامدا شـتێکم فێـربکە کە ئیـتر پرسـیار لە کەس نەکەم بێجگە جەنابـت، پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمـووی: بڵـێ ئیمانم بەخوا هەیەو پاشان ڕاوەستاو خۆڕاگر بە لەسەر خواناسی.

دەقی فەرمودەکە: (عن أبي عَمْرو، وَقِيلَ: أبي عَمْرَةَ، سُـفْيَانَ بْـنِ عَبْدِاللـه الثّقَفِيَ رضي الله عنه قَال: قُلْتُ: يا رَسُولَ الله، قُلْ لي في ئيسلام قَوْلًا لاَ أَسْأَلُ عَنْهُ أَحَدًا غَيْرَك، قَال: "قُلْ: آمَنْتُ بالله ثُمّ اسْتَقِمْ).[٢٠]

لێرەبەدواوە تەنهـا وتنـی ئـیمان نیـیە بەدەم و زمـان، بەڵکـو ئەو باسـە گرنگەیە کە شیمان کردۆتەوە و لەسەری بەردەوام بێت.



---

[٢٠] رواه مسلم.

﴿مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٧﴾﴾ النحل. ئەوەی کارو کردەوەی چاکە بکات، پیاو بێ یا ئافرەت، وە ڕێبازی ئیمان بەرنەدا (لەهەر بارودۆخێکدا بێت) بەڕاستی بە ژیانێکی کامەران و ئاسوودە (دنیا دەباتە سەر لە قیامەتیشدا)، بەجوانترین شێوە پاداشتی چاکترین کردەوەی باشی (ئەو جۆرە کەسانە) دەدەینەوەو چاوپۆشی دەکەین لە هەڵەو گوناهیان.

## ئامۆژگاری و برایەتی

ئامۆژگـاری، بـێ برایەتـی و خۆشەویسـتی ڕوونـادات، کاتێـک مـرۆڤ دەست دەکات بە پیادەکردنی پێکهاتەیەکی ئیمانـی کە ئامۆژگـاریە، پـێش هەموو کارێک پێویستە هەسـتی برایەتـی خۆشەویسـتی دروسـت بکـات، چونکە مرۆڤ ناتوانێت ئامۆژگاری بەرامبەر بکات بە شێوەی دوژمنکـارانە شتی وا ئەستەمە، دەبێـت برایەتـی و خۆشەویسـتی دروسـت بکرێـت، تـا ئامۆژگاریەکە بگات.

هەر بۆیە خوای پەروەردگار بە ئەداتی ئیسپات دەفەرمووێت:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا۟ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿١٠﴾﴾ الحجرات. لەڕاستیدا ئیمانداران هەر برای یەکن، کەواتە هەرکاتێک لە نێوان دوو براتاندا (ناکۆکی پەیدا بوو) ئێوە نێوانیان چاک بکەن و ئاشتیان بکەنەوە، هەمیشە لە خوا بترسن و پارێزکار بن، بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت.

لە ڕاستیدا ئامۆژگـاری کـاری پێغەمـبەرانە ئەگەر تەماشـا بکەیـن نـوح پێغەمبەر -علیه السلام- بە گەلەکەی دەڵێت:

﴿أُبَلِّغُكُمۡ رِسَٰلَٰتِ رَبِّي وَأَنصَحُ لَكُمۡ وَأَعۡلَمُ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا تَعۡلَمُونَ﴿٦٢﴾﴾ الأعراف. پەیامەکانی پەروەردگارمتان پێ ڕادەگەیەنم، من دڵسۆزیتان لەگەڵ دەکەم، ئەوەی من دەیزانم دەربارەی گەورەیی و باڵادەستی خوا، ئێوە نایزانن..

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (الدين النصيحة) واتە: ئـاینی ئیسـلام ئامۆژگـارییە یـان ئـاین هـەموی ئیخلاسـە. کەواتە گەیاندنی ئایینی پەروەردگار بەگشتی بریتییە لە ئامۆژگـاری، گەیانـدنی بە هەرکەس دەبێـــتە ئامۆژگـــاری و بـــۆیە پێغەمـــبەری نـــازدار صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویـت: (بَلِّغُـوا عَنِّـي ولـو آيَـةً) واتە: ئەگەر ئـایەتێکیش بـوو لەمـنەوە بـڵاوی بـکەنەوە و بیگەیـەننە خەڵکـی. خـوای گەورەش دەفەرمووێت:

﴿وَذَكِّرۡ فَإِنَّ ٱلذِّكۡرَىٰ تَنفَعُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴿٥٥﴾﴾ الذاريات. (بەڵکو تۆ هەمیشە) یادیان بخەرەوە چونکە یادخستنەوە سوود بە ئیمانداران دەگەیەنێت.

## سیلەی ڕەحم

پێکهاتەیەکی سەرەکییە، زۆرجار نەبونی لەگەڵ شرک و هاوبەش دانانـدا باسکراوە بەتایبەت سیلەی ڕەحم لەگەڵ دایک و بـاوک دا, ئەبـو هـورەیرە پرسی لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ کێ باشـە چـاکەی لەگەڵ بـکەم پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمـووی: دایکـت، پاشـان ئەبـو هورەیرە وتی کێی تر پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمـووی:



دایکت، سێ بارەی کردەوە ئەبو هورەیرە وتی: کێی تر؟ پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دایکت، پاشان دوای ئەوە فەرمووی: باوکت.

ئەم دوو کەسە وەکو کتێبێک وان بەڵام چاپی دووەمی نییە، بەتایبەت دایکمان پێویستە قاچی ماچ بکەین بەتایبەت بنی پێکانی، چونکە سوێن بەخوا بۆنی بەهەشتی لێ دێت، باوک ئەو هێز و تواناو کۆڵەکە و پایەیە کە خانەوادە لەسەر پەروەردە دەبێت. تەنانەت چاکەکردن سیلەی ڕەحم لەگەڵ دایکو باوکدا لە جیهاد لە پێناوی خوای گەورەدا ئەگەر گەورەتر نەبێت وەکو یەکن.

پیاوێک هاتە خزمەتی پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: ئیجازەم بدە بڕۆم بۆ جیهاد پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمووی: دایک و باوکت زیندوون؟ فەرمووی: بەڵێ, پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: بڕۆ خزمەتیان بکە ئەوە جیهادە. جاء رجل إلى النبي ﷺ فاستأذنه في الجهاد، فقال ﷺ: (أحي والداك؟). قال: نعم. قال ﷺ: (ففيهما فجاهد).[21]

هەروەها لەگەڵ خزم و کەس و کاردا بە گشتی و سەردان کردنیان و سەردانی نەخۆش و ڕێزی میوان و سیلەی ڕەحم چاکە لەگەڵ دراوسێ.. هەموو ئەمانە لە ئیمانەوە سەرچاوەی گرتووە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[21] رواه مسلم.



خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿فَهَلۡ عَسَيۡتُمۡ إِن تَوَلَّيۡتُمۡ أَن تُفۡسِدُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَتُقَطِّعُوٓاْ أَرۡحَامَكُمۡ ٢٢﴾ (ئایا ئەگەر ئێوە لە بەرنامەی ئیسلام سەرپێچی بکەن) سەرئەنجامی ئەوە نابێت کە فەسادو تاوان لە زەویدا بەرپا بکەن و، هەرچی پەیوەندی خزمایەتی هەیە بیپچڕێنن و لەناویبەرن؟!

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ فَأَصَمَّهُمۡ وَأَعۡمَىٰٓ أَبۡصَٰرَهُمۡ ٢٣﴾ محمد. (سەرپێچکەران) ئەو کەسانەن کە خوا نەفرینی لێکردوون و کەڕی کردوون و کوێرایی هێناوە بەسەر چاویان دا (ڕاستییەکان وەک خۆی نابینن).

هەروەها خوای پەروەرگار دەفەرمووێت:

﴿وَٱلَّذِينَ يَنقُضُونَ عَهۡدَ ٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ مِيثَٰقِهِۦ وَيَقۡطَعُونَ مَآ أَمَرَ ٱللَّهُ بِهِۦٓ أَن يُوصَلَ وَيُفۡسِدُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ أُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱللَّعۡنَةُ وَلَهُمۡ سُوٓءُ ٱلدَّارِ ٢٥﴾ الرعد. (بەڵام) ئەوانەی کە پەیمانی خوا دەشکێنن دوای ئەوەی کە پێشتر توندو تۆڵ بوو (لە سەروو هەموویانەوە پەیمانی فیترەت و بەندایەتی)، هەرچی پەیوەندیەکیش خوا فەرمانیدا بەگەیاندنی ئەوان دەیبڕن و دەیپچڕێنن، هەروەها تۆوی فەسادو گوناهو تاوان دەچێنن لە زەویدا، ئا ئەوانە نەفرەت و خەشمی خوایان لەسەرەو هەروەها جێگە و ڕێگەی ناخۆش و نالەبار (لەدۆزەخدا) بۆ ئەوان هەیە.

پاشان خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿۞ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعۡبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَٰنًاۚ إِمَّا يَبۡلُغَنَّ عِندَكَ ٱلۡكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوۡ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفّٖ وَلَا تَنۡهَرۡهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوۡلٗا كَرِيمٗا ٢٣﴾ پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لەو کەسی تر



نەپەرستن، هەروەها چاکەکاریش بن لەگەڵ دایک و باوکتاندا، هەرکاتێ یەکێکیان یان هەردووکیان بەپیری کەوتنە لای تۆ (تەنانەت) ئۆفیان لەدەست مەکەو (هەرگیز) پیایاندا هەڵمەشاخێ، بەردەوامیش قسەو گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاک و جوان و بەجێ بێت.

﴿وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا﴿٢٤﴾﴾ الإسراء. باڵی میهرەبانی خۆتیان بەسەردا بکێشەو ملکەچ بە بۆیان، (نزا بکەو) بڵێ: پەروەردگارا ڕەحمیان پێ بکەو میهرەبان بە بۆیان، هەروەکو چۆن ئەوان منیان پەروەردەکردووە بە بەچوکیی و منداڵیی.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: (ألا أنَبِّئُكمْ بِأكبرِ الكبائر؟ ثلاثاً، قُلْنا: بَلَى يا رَسولَ اللَّه، قالَ: الإشْراك باللَّه، وعُقُوقُ الوالِدَيْنِ، وكانَ مُتَّكِئًا فَجَلَسَ فقالَ: ألا وقَوْلُ الزّورِ، وشَهادَةُ الزّورِ، ألا وقَوْلُ الزّورِ، وشَهادَةُ الزّور).[٢٢]

واتە: پێتان بڵێم چ گوناهێک گەورەی گوناهە گەورەکانە؟! سێ جار دوبارەی کردەوە, هاوەڵان فەرموویان بەڵێ یا رەسول الله، فەرمووی: شرک دانان بۆ خواو، پێشێل کردنی حەقی دایک و باوک، پاشان شانی دادابوو هەڵسا دانیشت و فەرمووی قسەی درۆ و پڕو پوچ بۆ خەڵکی - شاهیدی درۆ لە دژی خەڵک،قسەی درۆ و پڕو پوچ بۆ خەڵکی- شاهیدی درۆ لە دژی خەڵک.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٢] متفق علیه.

# هەوڵدان بۆ کاری چاکەو چاکسازی

کاری چاکە لە سێ خاڵ بەدەرنییە ئەم هەوڵدانە بۆ چاکسازی یان بەلاشەیە یاخود بەپارەیە  یان لەنێوانی هەردووکیاندایە، زانایان ناویان ناوە بە (المرکب) هەوڵدان بۆ کاری چاکە بە لاشە نموونەی: نوێژ - ڕۆژو- جیهاد .. هتد

نموونەی کاری باشە بە پارە: زەکات- خێر- قوربانی- کەفالەتی منداڵانی بی باوک و بێ سەرپەرشتان.. هتد

نموونەی سێیەم وێنەی هەردووکیان چوون بۆ جیهاد بە پارەو سامانی خۆت خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَۖ قُلۡ مَآ أَنفَقۡتُم مِّنۡ خَيۡرٖ فَلِلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَٱبۡنِ ٱلسَّبِيلِۗ وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٞ ٢١٥﴾ البقرة. لە تۆ دەپرسن (ئەی پێغەمبەر) کەچی ببەخشن و بەکێی ببەخشن، پێیان بڵێ: هەر خێرێک دەکەن سەرەتا دایک و باوکتان فەرامۆش مەکەن هەروەها خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانی نەداریش. هەر خێرو چاکەیەکیش ئەنجام دەدەن، دڵنیا بن کە خوا زاناو ئاگادارە لێی.

﴿وَلِكُلّٖ وِجۡهَةٌ هُوَ مُوَلِّيهَاۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ أَيۡنَ مَا تَكُونُواْ يَأۡتِ بِكُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًاۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٤٨﴾ البقرة. بۆ هەر گەل و میللەتێک ڕوگەو قیبلەیەک هەیە ڕووی تێدەکات (دەی ئێوەی موسوڵمان) پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکاری دا. ڕوو لە هەرکوێ بکەن و لەهەر کوێ بن



خوا هەموتان کۆ دەکاتەوە، چونکە بەڕاستی ئەو خوایە بەتوانایە بەسەر هەموو شتێکدا.

﴿فَٱسۡتَجَبۡنَا لَهُۥ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ يَحۡيَىٰ وَأَصۡلَحۡنَا لَهُۥ زَوۡجَهُۥٓۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ وَيَدۡعُونَنَا رَغَبٗا وَرَهَبٗاۖ وَكَانُواْ لَنَا خَٰشِعِينَ ٩٠﴾ الأنبياء. ئێمەش نزامان گیرا کردوو (یحیى)مان پێ بەخشی، هاوسەرەکەشیمان بۆ چاک و دیندار کرد، بەڕاستی ئەوانە هەموویان چالاک و گورج و گۆڵ بوون لە ئەنجامدانی هەموو خێرو چاکەیەکدا، وە نزای بەکوڵیان دەکرد، بەڕاستی ئەوانە (ڕەحمەت و بەهەشتی ئێمە، وە لە دۆزەخ و خەشمی ئێمە) دەترسان، وە ئەوان هەمیشە ترسی ئێمەیان لەدڵدا بوو، زۆر مەبەستیان بوو کە ئێمە لێیان نەڕەنجێین.

کەسێک هاتە خزمەت پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی باشترین کردار چییە بیکەم؟ پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بڕوابوون بە خوای پەروەردگار و جیهادکردن لە پێناویدا، لە فەرمودەی تردا هاتووە کە خۆشەویسترین کار، کردنی نوێژە لەکاتی خۆیدا. کەواتە هەرکردەوەیەکی چاک سەرچاوەی لە پێکهاتەی ئیمانەوەیە بۆیە مرۆڤی موسوڵمان دەبێت هەوڵی بۆ کرداری: جوان، باش، چاک بدات، تا ئیمانی تەواو بکات.



## خۆ ساغ کردنەوە بۆ ئەم ئیسلامە

زۆرێک لە خەڵکی لە ژیانیدا بێ هودەیە، وا دەزانێت هەروا بۆ خۆشی دروست کراوە، نازانێت بەرپرسیاریەتی سەرشانی چییە، تەمەنێکی زۆر بە کاری پڕ و پوچ و بێ بەرەکەت بەسەر دەبات، بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەرکی سەر شانی خزمەت کردنە بە دینی خوا.

مرۆڤ ئەگەر لێنەبڕێت بۆ ئەوەی خزمەت بکات ئەی ژیانی لە چیدا سەرف کردووە کە لە قیامەت لێی بپرسن تەمەنی لاویشی بەچی سەرف کرد؟ ئەو پارەی دەست کەوت لە چیدا سەرفت کرد؟ و لە کوێت هێنا؟ ئەگەر وەڵامی ئەم سێ پرسیارە توانی بداتەوە، بەهەشتی مسۆگەر کردووە ئەگەر خۆی ساغ کردبێتەوە بۆ دینی خوای پەروەدگار.

خەڵکانێک هەن خۆیان ساغ کردۆتەوە بۆ حیزبەکەی یاخود بۆ مۆسیقا و گۆرانی، هەیە بۆ شانۆ، فیلم و هتد، ئایا چەند خزمەت بە ئایینی خوای پەروەردگار دەکات کارەکە؟ گرنگە مرۆڤ ئەوەی لەبەر چاوبێت، بۆ ئەرکێک هاتووە پێی سپێردراوە تا چەند دەتوانێت ئەرکەکەی ئەنجام بدات، کەواتە خۆت ساغ بکەرەوە بۆ دینی خوا تا ئیمان تەواو بکەیت.

## جیهاد و کۆشش لە پێناوی خوادا

لێرەوە ئەم پێکهاتەیە مانای چونە جەنگ و شەڕ نییە لە پێناوی خوادا بە تەنها، بەڵکو هەموو ئەوانەی پێشتر باسمان کرد بریتییە لە جیهاد و کۆشش کردن، هەواڵدان بۆ بەدەستهێنانی ئیخلاص و نیەت باشی و ڕاستگۆیی و یەقین و تەوەکول و..هتد، هەموو ئەم پێکهاتانە پێویستی بە



جیهادە، ئەم جیهادەش لە چوار بەشی سەرەکیدا خۆی دەبینێتەوە کە پێکهاتەی مرۆڤە، بریتییە لە: ڕۆح، ئەقڵ، لاشە و نەفس.

ڕۆح: پێویستی بە تێرکردن هەیە، خۆراکی ڕۆح بریتییە لە ذکر و بەندایەتی خوای پەروەردگار.

ئەقڵ: پێویستی بە فێرکردنی هەیە، ئەویش خۆراکی زانستە، زانستیش بە هەردوو جەمسەرەکەی زانستی دینی و زانستی تیۆری.

لاشە: خۆراکی خواردن و خواردنەوەی پاکە کە مەبەست پێی حەڵاڵە، چونکە هەموو پاکێک حەڵاڵە و هەموو پیسێکیش حەڕامە.

نەفس: ئەگەر بێت و وەرزشی پێ نەکەیت، کۆشش و جیهاد نەکەیت لەگەڵیدا، هەموو شتێک بۆ خۆی دەبات و ئەنانییەت فێری خاوەنەکەی دەکات.

ئەم چوار بونیادە پێویستی بە کۆشش و جیهاد هەیە، تا بتوانێت مرۆڤێکی ساغ و سەلیم لەم ئیسلامە بەرهەم بهێنێت.

# بەندی پێنجەم

کاتێک کە قورئان ئەکەیتەوە نورێک لە زانست و ئیمان ڕووبەڕوت دەبێتەوە ئەگەر بەهای پێبدەیت و ڕێگای بدەیت بێتە بەرنامەی ژیانت،

ئەوا ئەو نورە هەم ژیانت ڕووناک دەکاتەوە،

هەم دەتگەیەنێتە لوتکە!

# پاکێجی قورئان، سونەت و جەماعەت

ئەم سێ چەمکە مانای زۆر ئەدات بەدەستەوە، قورئان، سونەت و جەماعەت.

هەریەک ماناو مەدلولی زۆی هەیە و تەواوکەری یەکترن.

کۆمەڵێک بەناوی قورئانی تەنها بڕوایان بە قورئان هەیە و سونەت وەلا دەنێن و هیچ بڕوایان بە (جەماعەت) نییە. زانراوە قورئان کتێبی خوای پەروەردگارە ئوممەتی ئیسلامی بەهەموو گروپ و فیرقە و مەزهەبەکانەوە کەسیان ڕاجیاوازییان لەسەری نییە.

سونەت: واتا ڕێگای پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لای زانایانی شەرعناس بەگشتی.

جەماعەت: واتا هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ڕای زۆرینە موسوڵمانان کۆکن لەسەرئەوەی مانای جەماعەت هاوەڵانە، بەڵام هەندێک دەڵێن جیلی دوای هاوەڵانیش واتا تابعینیش دەگرێتەوە لەگەڵ تابیعی تابعین، ئەم ڕایەش هەیە کە ناسراون بە ئەهلی سەلەف. جەماعەت بوەتە ناونیشان بۆ ئەو سێ جیلە بەڕێزە، بەڵام ئەکرێت ئەم ناوە بدرێتە هەر جیلێکی دواتر ئەگەر وەکو ئەوان خواپەرست بون و بەتەنها ئەویان بەشایستەی پەرستن ئەزانی، ئەنجا دەستیان گرتبو بە قورئان و سوننەتەوە وەک یاساو ڕێسای ژیان، پاشان وەحدەتی ڕیزی ناوخۆییان پاراست و پارچەپارچەیان نەکرد.



# پاکێجی قورئان و سوننەت

ئەم دوو چەمــکە تەواوکەری یەکــترن، بەبــێ یەک نــاتەواون ڕاســتە گومانمان لەقورئان نییە کە کەلامــی خــوای پەروەردگــارە و بەیــانی هەمــوو شتێکی تێدا کراوە، بەڵام قورئــان لەســەر ژیــانی کەســێک هــاتووە کەنــاوی محمدە و پێغەمــبەری ئەم ئــوممەتەیە صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِوَسَلَّمَ، قورئــان بــۆ ئەو هــاتووە ڕاســتەخۆ لەســەر ژیــانی ئەو پێغەمــبەرە دابەزیــووە. کەواتە هەرئەویش ئەتوانێــت ڕۆشــنی بکــاتەوە، واتــا مامۆســتای ئەم ئــوممەتەیە، لەڕووی عەقلانێتەوە مادام ئەو خــاوەنی قورئــانەکەیە و لە قوتابخــانەکەی ئەوەوە سەرچاوەی گرتووە کەواتە ڕۆشنکەرەوەی پەیامەکە خۆیەتی.

لێرەدا هەندێک لەو گروپ و فیرقانە هەنجەتــی ئەوەیــان هەیە گــوایە پێغەمــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِوَسَلَّمَ فەرمــوودەی هەیە، بەڵام کــێ دەڵێــت ڕاستە، ئەوە قسەی جەنابیانە!

ئەم هەنــجەت و بیــانووە دوو فیــرقەی گەورە لە ئیســلام کردوویــانەتە بەڵگەی خۆیان، فیرقەی خەواریج کە تەنها و تەنها بە قورئان کــاردەکەن و فەرموودەیان وەلاناوە، موعتەزیلەش جۆری دووەم. فەرمــوودە وەردەگــرن بەڵام ئەوەی لەگەڵ عەقڵیاندا دەگونجێت.

گروپەکــانی تــر بەگشــتی وەکــو شــیعە و جۆرەکــانی وەکــو قورئــانی و جۆرەکانی وەکو ئەحمەدی و ئەهلی حەق و هەندێک لەوانەی سـۆفین و سەرلێشێواون و گروپە مەزهەبیەکانی تر هەموو لەم دوو بەشە و بەشێکی تــر کە ناویــان (مــورجیئە)یە واتــا بنەمــای جــۆری هەمــوو گــروپ و فیــرقە جیــاوازە فریوخواردوەکــان لە نــاو مێــژووی ئیســلامدا لەم ســێ فیــرقەوە سەرچاوەیان گرتووە کە بریتین لە خەوارج و مورجیئە و موعتەزیلە.

بەگشتی تا ئەم گروپ و مەزهەبە فیکری و بیروباوەڕیانە دروست نەبووبوون، هەموو خۆیان ناونابوو ئەهلی ئیسلام، خۆ ئەم گورپ و فیرقانەش هەربەخۆیان دەڵێن ئەهلی ئیسلام، گومانیشی- تێدا نییە کە ئەهلی ئیسلامن. هەرچەندە زانایان یەک بڕیارنین وەکو یەک لەسەر هەموویان، بۆ نمونە لەسەر موعتەزیلە و بڕوایان بە سیفاتەکانی خوای گەورە، بەڵام هەندێکیان داهێنان و بیدعەی وایان هەیە کە پڕیەتی لە گومڕایی و سەر لێشێواوی، کەواتە لەناو ئەم گروپانەدا دەبێت ئەهلی ڕاستی و حەق بناسرێن بۆیە ئوممەتی ئیسلام ئەوەی حەقە و ڕاستە ناونراون بە ئەهلی سونەت و جەماعەت.

## ئەهلی سونەو جەماعە چین وکێن؟

ئەهلی سونەت و جەماعەت ئەو کۆمەڵەن شوێنکەوتووی قورئان و سونەت و فەرمودەی پێغەمبەرن صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، پێیان وایە هەموو هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دادپەروەر و ڕاستگۆن و زۆرینەی زانایان لەم کۆمەڵەیەن کە چوار مەزهەبیان پێکهێناوە، مەزهەبی فیقهی ئیسلامن و بریتین لە (مالکی، حەنەفی، شافعی، حەنبەلی) سێ مەزهەبی عەقیدەییان پێکهێناوە کە بریتین لە (ئەحمەدی و ئەشعەری و ماتوریدی) بەگشتی بەمانە دەوترێت ئەهلی سونەت و جەماعەت. لەناو ئەم ئوممەتەدا کۆمەڵێک یاخود طائفەیەک هەن کە پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ناوی لێناون بە (طائفە منصورە) واتا (تایەفەی سەرکەوتووەکان) مەرتەبەیان لە عەقیدە و جیهادیەکاندایە و زیاتر لە داهاتوودا چەمک و زاراوەکان ڕۆشن دەبێتەوە.



ئەهلـــی ســـونەت بـــۆ پاراســـتنی ســـونەتی پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ زانســـتێکیان داهێنـــا کەوا نـــاسراوە بە زانســـتی فەرموودەوانی ئەم زانستە چەند بەشێک لەخۆ دەگرێت.

ئەویــش ســێ زانســتی ســەرەکین، لە نێــوان ئەم ســێ زانســتەدا بە دڵنیاییەوە بەشــی تــری لێــدەبێتەوە، بەنــاوی (الجـرح والتعـديل، و الروايـة والدراية، علم رجال الحديث).

(عن ئيبنو عمر رضي الله عنهما قال: على المرء المسـلم السـمع والطاعـة فـيما أحـب وكـرِهَ، إلا أن يـُؤمر بمعصـية، فـإذا أُمِـرَ بمعصـية فـلا سـمع ولا طاعة).[٢٣]

واتە: لەسەر موسڵمانە کە گوێگرو جێبـەجێکار بێـت، مەگـەر فـەرمانی خراپەی پێبکرێت، ئەگەر فەرمانی خراپـەی پێکـرا نـە گـوێگرتن هەیـەو نـە جێبەجێکردن.

لەگەڵ ئەوەشــدا گــرنگە بزانیــت دەرچــوون لەئەمــری دەســەڵاتداری موســـــوڵمانان تـــــاوانێکی گەورەیە، پێغەمـــــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێــت: هەرکەس لە ئەمیــر و دەســەڵاتدارەکەی شــتێکی بینــی و حەزی پێنەکرد و ڕقی لێی بوو با ئارامبگرێت لەسەری، خۆ ئەگەر لەئەمری دەرچوو و بەقسەی نەکرد لە دەسـەڵاتەکەی یـاخی بـوو ئەگەر بسـتێکیش بێت ئەگەر مرد ئەوا مردنێکی جاهیلانەی بۆ دەنوسرێت.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٣] متفق عليه.

( عن ئیبنو عَبّاسٍ رضـی اللـه عـنهما عـن النبـی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ قال: من رَأى من اَميرِهِ شيئا يَكرَهُهُ فَلْيَصْبِرْ عليـه فانـه مـن فَـارَقَ الْجَمَاعَـةَ شِبْراً فَمَاتَ الا مَاتَ مِيتَةً جَاهِلِيّةً).[٢٤]

ئەمەش مانـای ئەوەمـان بـۆ دەردەخـات کە سـەرەڕۆیی و خۆویسـتی لەناو سوپا و ڕیزی موسـوڵمانان نەمێنێـت هەمـوو بەیەک گیـان و ڕیـز لە پێنـاوی خـوای گەورەدا بجەنگـن بەهۆکـاری تاوانێـک یـان هەڵەیەکـی ئەمیـرەوە ڕیزەکـان تێکـنەیەن بـۆ ئەوەی تەفـرەقە و پـارچە پـارچەیی نەکەوێتە ناو موسوڵمانان.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِهِۦ صَفّٗا كَأَنَّهُم بُنۡيَٰنٞ مَّرۡصُوصٞ ٤﴾ الصف. بەڕاستی خوا ئەو کەسانەی خۆش دەوێت کە دەجەنگن لە پێناویدا بە یەکڕیزو یەکپارچەو یەک دڵ، هەروەک دیوارێکی بەرزی قایمی تێهەڵکێش و ڕێکوپێک.

هەموو ئەمانە بۆ پاراستنی ڕیزی موسوڵمانانە بە تایبەت لەنـاو سـوپای ئیسلام، پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێـت: هەرکەس گوێڕایەڵی من بکات ئەوا گـوێڕایەڵی خـوای پەروەردگـار دەکـات (چـونکە پێغەمـبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ لەخـۆیەوە قسـە ناکـات و هەمـووی وەحییە) پاشان فەرمووی هەرکەس سەرپێچی بکات ئەوا سەرپێچی خـوای پەروەردگار دەکات، هەرکەس گوێڕایەڵی ئەمیرەکەی بکات ئەوا گوێڕایەڵی منی کردووە، هەرکەس سەرپێچی ئەمیرەکەی بکـات ئەوا سـەرپێچی منـی کردووە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٤] متفق علیه.



عن أبي هريرة - رضي الله عنه – (أن رسول اللـه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ قال: من أطاعني فقد أطاع الله، ومن يعصني فقـد عصىـ اللـه، ومـن يطـع الأمير فقد أطاعني، ومن يعص الأمير فقد عصاني).[٢٥]

كۆتايى ئەم باسە بەوە دێنين كە دەشێت وەلى ئەمرى بۆ وڵاتێک بێت، ياخود سـوپايەک بێـت، يـان کەتيـبەيەک و مەفـرەزەيەک، هەرکەس بـووە دەسـەڵاتدار دەبێـتە وەلـى ئەمـرى موسـوڵمان لەسـنوورى دەسـەڵاتى ديارێکراوى ئەو وەلى ئەمرەدا بەمەرجێـک بە حـوکمى خـواى پەروەردگـار کاربکات.

## زانايانى ئەهلى حديث

هەرلەسـەرەتاوە چـۆن قورئـان نـووسراوەتەوە کاتـب وەحـى تـايبەت بەخـۆى هەبـووە، بەهەمـان شـێوەش فەرمـوودەى پێغەمـبەرى خـواش صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ نـووسراوەتەوە ئەو هـاوەڵانەى کە زيـاتر سـەرقاڵ بوون بە نووسينەوەى فەرموودەکـان نـزيکەى ٢٠٠هـاوەڵ دەبـوون، بەڵام ناسراوترينيـان (عبـداللەى کـوڕى عەمـرى کـوڕى عـاص، عبـداللەى کـوڕى عومەر، عبداللەى کوڕى مسعود، عبداللەى کوڕى عەباس، عبداللەى کـوڕى زوبێـرى کـوڕى عەوام) ئەم پێـنج نـاوە عبـداللەيە لە ئيسـلامدا بەگشـتى ناسروان بە (عەباديلەى ئيسلام).

ناوەکانى تر وەکو (ئيبنو شاة اليمني، اسرائيـل ئيبنـو يـونس، أبـوهريرة، أبى الدرداء، أبى جندب، أبى ذر الغفاري، سلمان الفارسى، على کوڕى ئەبى

---

[٢٥] رواه مسلم.

طالب، حسن کوڕی علی کوڕی ئەبی طالب) و زۆرێکی تـر لە هـاوەڵان، لە ئافرەتـانیش (خـاتوو عائیشــە و خــاتوو حفصــە) لەکۆتـایی تەمەنیانــدا بەهاوکاری قوتابیەکانیان ئەوانیش فەرموودەیان نوسیوەتەوە.

زانایان بەگشتی لەمـانەوە فەرموودەیـان وەرگرتـووە، زیـاتر دەمـاودەم دەگێـڕدرانەوە و دواتـر و لەگـەڵ زۆربـونی موسـڵمانان و تێکـەڵ بوونیـان لەگەڵ گەلانی دونیای ئەو سەردەمە خەڵکی درۆیەکی زۆریـان کـرد بەدەم پێغەمبەرەوە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

هەندێک لە زانایان وەکو (زوهری، سوفیانی ثوری، عەلقەمـی، ئیمامـی مالک، ئیمامی طحاوی) و زۆرێکی تر هەڵسان بە نووسـینەوەی فەرمـوودە لەسەر ئەمری والی مەدینـە کە (عمـری کـوڕی عبـدالعزیز) بـوو ئەوکـاتە، نەبوو بە خەلیفە بەڵکو والی شاری مەدینە بوو.

کاتێک زانستی فەرموودەوانی دامەزرا پێکهات لە سـێ فلـتەر، فلـتەری یەکەم ئەو کەسەیە کە فەرموودەکەی لێوەردەگیرێـت، پێویسـتە بناسرێـت لە دینداری و خواناسیدا، پشکنینی تەواو بکرێت بۆ کەسایەتی کە زانسـتی (الجرح و التعدیل)ە.

فلتەری دووەم دەقی فەرموودەکە وەک دەق و کێ ڕیوایەتی کـردووە، ئەو فەرموودەیەی وەردەگیرێت لەکام پلەبەندی دادەنرێت، وەکو زانـراوە پلەکان بریتین لە یەکەم: فەرمـوودە ڕاسـت و دروسـتەکان کە نـاسراون بە فەرموودەی (صحیح).

پلەبەنـدی دووەم: فەرمـوودەی لاواز کە نـاسراون بە (ضـعیف). واتـای ئەوە نییە کە وەرنەگیرێت و کاری پێ نەکرێت، بەڵکو عیلەتێک هەیە یـان



له دەق یــاخود ڕشــتەی ڕاویەکانــدا، ئەمەش دەبێــتە هۆکــاری لاوازی فەرموودەکە.

لەنێوانی ڕاست و و لاوازی فەرموودەکانـدا پلەبەنـدی زۆری تـر هەیە. نموونەی (صحیح لذاته، صحیح لغیره، حسن لذاته، حسن لغیره) هەروەهـا فەرموودەی (عزیز، غریب، شاذ) هتد.

بۆیە بە سەرپێیی لێرەدا باسمان کردن بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێـت هـیچ زانستێک نییە ئەوەندەی زانستی فەرموودە ناسی ورد و پشکنینی زیـاد له پێویستی بۆ بکرێت، بەڵگەش بـۆ ئەم وتەیە ئەگەر تەماشـا بکەیـت چـۆن فەرموودەکان پشکنینی بۆ دەکەن و پلەی ڕاستی و دروستی یاخود لاواز و ماماناوەندی دەدرێتێ، ئەمەش ئەوپەڕی وردی لێکـۆڵینەوە و پشـکنینە بـۆ فەرموودەکان.

زانایانیش ڕەوەند بە ڕەوەند و جیل لەدوای جیل ئەم زانستە ڕادەسـتی یەکتریان کردووە، ئاگـاداری فەرمـوودەوان و جـۆری فەرموودەکـان بـوون، مێژووی ژیانی هەندێکیان دەنووسین  یان لە سەردەمێک بەیەکەوە ژیاون یـاخود جیلـی دوای خـۆی بـووە، بـۆ ئەوەی بزانرێـت زانایـانی شـەرع زان هەموو فەمموودەوان بوون.

نموونەی ئیمام مالیک خاوەنی کتێبی (موطأ) بوو کە تەنها فەرمـودەیە، ئیمامی نعمانی ئەبو حەنیفە خـاوەنی کتێبـی موسـنەدی ئەبـو حەنـیفەیە، ئیمامـی شـافیعی محمـدی کـوڕی ئیـدریس خـاوەنی کتێبـی موسـنەدی شـافیعیە، هەروەهـا ئیمامـی ئەحـمەدی کـوڕی حەنـبەل خـاوەنی کتێبـی موسنەدی ئیمامی ئەحمەدە و زانایانی عەقیـدە بەهەمـان شـێوە خـاوەنی

زانستی فەرموودەوانی بوون هەموویان لەبارەی فەرموودەوە دانراویان هەیە.

نموونەی (ئیمامی طەحاوی خاوەنی موسنەدی سونەی طەحاوییە، ترمذی، بوخاری، موسلیم، ئەبی داود، نەسائی، ئیبن ماجە، دار قوطنی، حاکمی نەیسابووری، ئیمامی زەهەبی، ئیبن حەجەری عەسقەلانی، ئیبن حەجەری هەیثەمی، ئیبن حەجەری قەسطەڵانی، ئیمامی نەوەوی..هتد).

لەموفەسیرەکان: زوهری عەلقەمی، سوفیانی ثوری، عیکرمە، قورطبی، طبری، ئیبن کثیر، ئیبن عطیە..هتد ئەمانەش هەموویان فەرموودەوان بوون.

کەواتە ناکرێت کەسێک بێ زانست و زانیاری و شارەزایی نەبوون لە زانستی فەرموودە لە خۆیەوە فەرموودە ڕەد بکاتەوە و بەئەقڵی خۆی بڵێت کێ دەڵێت ڕاستە؟

لەڕاستیدا لەهەموو سەردەم و سەدەیەکدا زانایانی تر هەڵدەستنەوەو دەست دەکەنەوە بە پشکینین و چاودێری کردنی فەرموودەکان بەسەر هەموویانەوە بە (محقق) ناسراون، چاودێری کتێبی کۆن و نوێ، لەو عیملاقانە (ئەحمەد شاکر، ئەلبانی،..هتد).

کەواتە ئەو کەسەی بەبێ شارەزای و دوور لە زانستی فەرموودەوانی، فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ ڕەت بکەنەوە گومانی تێدا نییە لەتاوانە گەورەکانە، هەڵبەت مەبەستم یەک فەرموودەیە ئەگەر بڵێ لەگەڵ عەقڵمدا ناگونجێت، تەکفیر ناکرێت بەهۆکاری جەهلی، بەڵام دەچێتە بەشی گوناهە گەورەکان، وەکو سیحر و زیناو ڕیبا و هەڵهاتن لە جیهاد.



بەڵام ئەوانەی کە فەرمـــوودە بەگشـــتی ڕەد دەکەنەوە گومانمـــان لە کافربوونیان نییە، وەک فیرعەون، قارون، هامـان، ئەبـو جەهـل و وەلیـدی کوڕی موغیرەن.

پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویـت: ڕۆژێـک دێـت کەسێک لەسەر شان لێی پاڵ کەوتووە بە کیبرو بـوغزەوە دەڵێـت نـازانین تەنها ئەوەی لە قورئاندا هاتووە ئەوەمان بەسە و ئەوە وەردەگرین.

(لا أُلْفِيَنَّ أحدَكمْ متكئًا على أريكته يأتيه أمرٌ مما أمرتُ بِهِ أو نهيتُ عنـهُ فيقولُ: لاَ أدرِي. ما وجدنَا فِي كتابِ اللهِ اتبعناه).[٢٦]

سونەت لای ئەهلی فەرمووده بەواتای کۆی فەرموودەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ دێت، مەبەست لەوتارو کـردار و دانپیادانـانی پێغەمبەرە صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ.

سـونەت لای ئەهلـی ئوصـول بەواتـای ئەمـر دێـت واجـبە لەسـەر موسوڵمانان بڕوای پێ بهێنن و کاری پێبکەن. بە ڕویـەکیتردا سـوننەت لای ئوصولیەکان ئەو سەرچاوەیە کە دوای قورئان حوکمی لێ وەرئەگیرێت، یانی ئەیانەوێت وەک سـەرچاوەی دوەم بیناسـێنن لـەو ڕووەوە کـار ئەکـەن لـە پێناویدا. جا چ بۆ بابەتە فیقهیەکان یان عەقەدیەکان.

وەکـو خـوای پەروەدگـار لە ئاسـماندایە، ئەم فەرمـوودەی پێغەمـبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓالِهِوَسَلَّمَ واجبە موسوڵمان بڕوای پێ بکـات، یـاخود ژمـارەی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٢٦] رواه أبوداود و الترمذي و ئيبنو ماجة عن أبي رافع.

ڕکعتەکانی نوێژ و یاخود ڕێژەی زەکات و بۆراقی ئیسراء و میعراج و چۆنێتی.. هتد.

لای زانایانی مێژوو و سونەت بەواتای سیرەت و نووسینەوەی ژیانی دێت، لە منداڵییەوە تا وەفاتی.

لای زانایانی فیقهی ئیسلامی سونەت لە بەرانبەر واجبدایە، هەروەها مانای ڕەواتب و نەوافیل ئەگەیەنێت.

لە سونەتدا هاتووە گۆشتی گوێدرێژی ماڵی حەڕامە، ئەمە واجبە. یاخود زەواجی موتعە حەڕامە، ئەمانە هەموو واجبن. نە دەخورێت و نەدەکرێت واتا نەکردنیان فەرزە لەسەر موسوڵمانان.

رواتب: واتا فەرز نییە، بەڵام پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ هەمیشە کردوویەتی، وەکو دوو ڕکعات نوێژی پێش نوێژی بەیانی، یان نوێژی شفع و وتر. ئەمانە پێغەمبەر هەمیشە کردوویەتی بە نەکردنی تاوانبار نابیت.

ئەوانی تر هەموو دەکەونە خانەی ئەوەی کە کورد پێی دەڵێت سوننەتە، واتا ئازادی لە کردن و نەکردنی.

هەڵبەتە ئەم بوارە زانستێکی زۆر قوڵ و ئاڵۆزە، ئەوەی لێرەدا باسم کردووە کەمترە لە مشتێک لە خەروارێک لەو زانستە، تەنها بۆ بەرچاوڕوونی خوێنەر ئەم باسەم کردۆتەوە، چونکە کاری من نییە، بەڵکو ئەوەندە لێرەدا پێداویستی پەرتووکەکەمە.

کورت و پوخت دین بێ سونەت ناتەواوە و جێگای قبوڵ کردن نییە، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویت: هەرکەس لە ئێوە



بژی (واتا هاوەڵان) جیاوازییەکی زۆر ئەبینێت، ئەفەرمووێت دەست بگرن بە سوننەتەکەمەوە واتا بەو ڕێگایەی من کە گرتوتانەتە بەر هەروەها سوننەتی خولەفای ڕاشیدین، واتا ڕێگای خولەفای راشدین لە ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، علی و حەسەنی کوڕی علی، باوەشی پێدا بکەن و بە چنگ و ددان ئەو سوننەتە بگرن. شوێن داهێنراو لەدیندا مەکەون، چونکە هەموو داهێنراوێک بیدعەیە و گومڕاییە، ئەگەر سەرنجی فەرموودەکە بدەیت باسی قورئان ناکات، چونکە هەموو لاکان کۆکن لەسەر قورئان، کەواتە ئەوەی شوێنکەوتووی پێغەمبەرە صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ واتا شوێنکەوتەی ڕێگا و شێوازەکەیەتی کەناوی سوننەتە. (إنَّهُ مَن يعشْ منْكم بعدي فسيَرى اختلافًا كثيرًا فعليكم بسنَّتي وسنَّة الخلفاء الرَّاشدينَ المَهديِّينَ من بعدي تمسَّكوا بِها وعضُّوا عليها بالنَّواجذِ وإيَّاكم ومُحدَثاتِ الأمورِ فإنَّ كلَّ بدعةٍ ضلالةٌ).[٢٧]

## حوکم و شەریعەت لە سونەت وەردەگیرێت

گومانمان نیە لەوەی کە حوکم و شەریعەت و یاسا لە قورئان وەردەگیرێت، بەڵام هاوشێوەی قورئان سونەتیش ئەحکام و یاسا و شەریعەتی لێوەردەگیرێت بەبەڵگەی خوودی قورئان.

چونکە پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەخۆیەوە قسەی نەکردووە، بەڵکو هەمووی وەحی بووە لای خوای پەروەردگارەوە هاتووە.

---

[٢٧] رواه ابوداود و الترمذي عن العرباض بن سارية.

﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ۝٣﴾ قسەو گوفتاریشی لە ئارەزوبازیی و هەواو هەوەسەوە نییە.

﴿إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ۝٤﴾ النجم. (ئەمەی کە ڕایدەگەیەنێت) بەدەر نییە لە نیگاو (وەحی خوایی).

بۆنموونە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ کاتێک نوێژی سونەتی پێش بەیانی و سونەتی نیوەڕۆ، عەسر و مەغریب و عیشا خۆ ئەمانە هیچی لە قورئاندا نەهاتووە، بەڵکو بەوەحی لەلایەن خوای گەورەوە فێرکراوە، یاخود ٧ جار طەواف بەدەوری کەعبەدا و یان ڕۆشتنی صەفا و مەروە ٧ جار، ئەحکام و یاسا و ڕێسا و شەریعەتێکی زۆر لە سوننەتەوە وەرگیراوە.

﴿مَّآ أَفَآءَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ مِنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰ فَلِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ كَىْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ ۚ وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعِقَابِ ۝٧﴾ الحشر. ئەو دەستکەوتانەی خوا بەخشی بە پێغەمبەرەکەی لە خەڵکی دێهات و شارەکانی (جوو) ئەوە خوا بڕیاری لەسەر داوە کە بۆ پێغەمبەرو خزمەکانییەتی، بۆ هەتیوان و هەژاران و ڕێبوارانیشە، تا ئەو سامانە گیر نەخوات لە نێوان دەوڵەمەندەکاندا، جا ئەوەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيْهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ پێی بەخشین وەری بگرن، هەر فەرمانێکی پێدان بەگوێی بکەن، قەدەغەی هەر شتێکی لێ کردن مەیکەن، لەخوا بترسن چونکە بەڕاستی خوا بەتوندی تۆڵە دەسێنێ.

کۆمەڵێک ئەوە دەکەنە هەنجەت و بیانوو گوایە ئەم ئایەتە بۆ دابەشکردنی پارە و (فيء) هاتووە، سەرچاوەی وتەکە ڕاستە تایبەت بەو



حاڵەتە هاتووە، بەڵام ماناو حوکمەکەی گشتییە، بۆ هەموو کارێکە کە پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ بفەرمووێت بیکەن یان وازی لێ بهێنرێت.

لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرۡجُواْ ٱللَّهَ وَٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرٗا ﴿٢١﴾ الأحزاب. سوێند بەخوا بەڕاستی لەپێغەمبەری خوادا چاکترین نموونەی تەواو ڕێک پێک هەیە تا چاوی لێ بکەن و شوێنی بکەون، بەتایبەت بۆ ئەو کەسانەی ڕەزامەندی خوایان مەبەستە، سەرفرازی قیامەت ئاواتیانە، هەمیشە و بەردەوام یادی خوا بە زۆری ئەنجام دەدەن و زمانیان پاراوە بەیادی ئەو.

گومانمان لە پێشەنگی و قودوەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ نییە، هەموو پێشەنگ و کاریزماتیکێک چاوی لێدەکرێت، چونکە پێشەنگ لەبەرئەوەی کاری چاکە دەکات و خراپەش واز لێ دەهێنێت.

تەنانەت خوای پەروەردگار خۆشویستنی بەندەکانی کە بانگەشە دەکەن بۆ خۆشەویستی خوا بەوستوە بە خۆشەویست پێغەمبەرەوە، هەرچی ڕاستگۆیە یان شوێنکەوتەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ.

قُلۡ إِن كُنتُمۡ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحۡبِبۡكُمُ ٱللَّهُ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡۚ وَٱللَّهُ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿٣١﴾ آل عمران. (ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆش دەوێت شوێنی من بکەون و لە فەرمانی من دەرمەچن، ئەوکاتە خوایش ئێوەی خۆش دەوێت و لە گوناهو هەڵەکانیشتان خۆش دەبێت، (چونکە ئەو) خوایە لێخۆشبوو و میهرەبانە.

ئەمە تەنها لەبواری دینیدا نییە، بەڵکو لەهەموو بوارەکانی ژیاندایە. دەبێت خوا و پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ حوکم بکەن و یاسا و ڕێسا هەر لە دوو سەرچاوەوە وەردەگیرێت و هەرکەس ڕازی نەبوو بەو دوو سەرچاوەیە و وتی بەکەڵک نایەت یاخود وتی بۆ ئەم سەردەمە ناگونجێت، یان هەر بیانویەکی تری دۆزییەوە بۆ ئەوەی قورئان و سونەت جێبەجێ نەکات وەکو یاسا و ڕێسا حوکمی پێنەکات و لەتاک و لە کۆمەڵگا و دەسەڵاتدا ئەوا بە کافر و طاغوت هەژمار دەکرێت، مەبەست لە تاک وەکو تاکەکەس، کۆمەڵگا، ئەو کۆمەڵە کەسەی کە شەریعەت ڕەت دەکەنەوە، دەسەڵات، حوکومەت و ئەو هێزانەی کە هەمان قسە دەکەن گومانمان لە طاغوتان و کافر بوونیان نییە.

## کوفر بە طاغوت واتای چییە؟

طاغوت: هەرچی لەجێگای خۆی بترازێت لەزمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت، طاغوت کاتێک ئاو لە جێگایەکەوە ڕێدەکات یان طەی دەکات، ئەگەر ڕێگای گۆڕی عەرەب دەڵێت ئاوەکە طاغوتە لە ڕێگای خۆی دەرچووە، ئەمە لەڕووی زمانەوانیەوە.

لە ڕووی زاراوەوە: هەرکەس ڕازی نەبێت بە شەریعەتی خوا و شەریعەتێکی تر پیادە بکات پێی دەوترێت طاغوت، موسوڵمانیش دەبێت کوفر بکات بە طاغوت، بە بەڵگەی سورەتی النساء.

يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ



وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ﴿٥٩﴾ النساء. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خوودی خۆتانن، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان، ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ، (کە پیادە کردنی قورئان و سونەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتار کردنتان) بەو شێوەیە چاکترو ڕونترو ڕەوانترە.

أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ﴿٦٠﴾ النساء. ئایا نابینیت و سەرسام نیت لەو (جولەکانەی) کەوا نیشان دەدەن باوەڕیان هێناوە بەوەی بۆ تۆ ڕەوانە کراوە، بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانە کراوە (بۆ پێغەمبەران) کەچی دەیانەوێت ڕوو بکەنە زۆردارو جادوگەرو خوانەناسان تا دادوەرییان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لە کاتێکدا کە فەرمانیان پێ دراوە کە باوەڕیان بە شتی ناڕاست و نادروست نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت بەرەو گومڕاییەکی دوورو بێ سنوور بیان بات.

کافر لە ڕووی زمانەوانییە واتا پەردە یاخود داپۆشینی حەق.

لە ڕووی زاراوەوە: هەرکەس بڕوای بە ئیسلام نەبوو پێی دەوترێت کافر لە نێوانی ئەو و ئیسلامدا پەردەیەک هەیە.

جا ئەو کافرە ئەهلی کیتاب بێت، وەکو نەسارا و یەهودی هەر کافرن، ئەگەر بوزی و هیندۆسیش بن هەر کافرن، واتا موشریک و ئەهلی کیتاب بە کافر ناوزەد کراون، بە بەڵگەی قورئان سورەتی البینة.

إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ وَٱلۡمُشۡرِكِينَ فِي نَارِ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمۡ شَرُّ ٱلۡبَرِيَّةِ ٦ البينة. بەڕاستی ئەوانەی کافرن لە خاوەن کتێبەکان و موشریک و هاوەڵپەرستان دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوەو بە نەمریی تیایدا بۆ هەمیشە دەمێننەوە، چونکە ئەوانە تاوانبارترین کەس و خراپترینی خەڵکانی سەرزەوین.

کەواتە هەرکەس لەڕووی باوەڕەوە بڕوای بە ئیسلام نەبوو کافرە لە ڕووی حوکم و یاساوە بڕوای پێ نەبوو یان کاری پێ نەکرد طاغوتە.

هەرکەس حوکمی ئیسلام هەبێت و بڕوات لای کافر و طاغوت حوکم و دادوەری بکات بە ئیسلام ڕازی نەبێت گومانمان لە کافربوونی بە طاغوت بوونی نییە.

ئەمە بەتایبەت لە ئەوروپا زۆر دەبینرێت ئافرەتان داوای تەڵاق دەکەن بە شەرعی خوا ڕازی نابن دەچنە لای یاسای طاغوتەکان، بۆ پارەی زۆرتر قیامەت دەفرۆشن و دەبنە طاغوت و کافر، یاخود نموونەی تر زۆرە.

کافریش دوو جۆرە: کافری شەڕانی واتا (کافری محارب) کە لەگەڵت ئەجەنگێت لەگەڵ کافری لاشەڕ واتا (کافری موسالم) ئەمەش دیارە لەڕووی بیروباوەڕەوە کافری شەڕانی دەجەنگی لەگەڵیدا و پێچەوانەکەشی کافری لاشەڕ و سالم و ئاشتیخواز، وەکو مرۆڤێک تەماشای دەکەیت و ڕێزی دەگریت و چاکەکەشی لەگەڵ دەکەیت، دەبێت دادپەروەر بیت لەگەڵیدا، بەبەڵگەی سورەتی الممتحنة.

إِنَّمَا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ قَٰتَلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَأَخۡرَجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ وَظَٰهَرُواْ عَلَىٰٓ إِخۡرَاجِكُمۡ أَن تَوَلَّوۡهُمۡۚ وَمَن يَتَوَلَّهُمۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩



الممتحنة. بەڵکو خوا تەنها قەدەغەی ئەوەتان لێدەکات کە پشتیوانی بکەن لەوانەی کە جەنگیان بەرپاکرد دژی ئایین و دەریانکردن لە شوێنەواری خۆتان، وە زۆر بە زەقیی دەوریان هەبوو لە دەرکردنتاندا، جا ئەوەی پشتیوانییان لێ بکات بەڕاستیی ئائەوانە لە ڕیزی ستەمکاراندان.

پاشان خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا﴿٦١﴾ النساء. کاتێ پێیان دەوترا وەرن بەدەم بانگەوازی خواوە، بۆ لای ئەو (قورئانەی) خوا ناردویەتی و ڕوو بکەنە پێغەمبەرەکەی (بۆ چارەسەری کێشەکانتان) کەچی دەبینی دووڕووەکان پشتت تێ دەکەن و ڕوت لێ وەردەگێڕن.

## وەلی ئەمر چییە و کێیە؟

وەلـــی ئەمـــر دوو بەشـــن بەشـــێکیان زاناکـــان و بەشێکیشـــیان کاربەدەستەکانن، هەردووکیان هاوکاری یەکترن. زاناکـان شـەریعەت ڕوون دەکەنەوە، یاسـاو ڕێسـاکان دەخەنە بەردەم ئەمیـر و کاربەدەسـتەکان بـۆ ئەوەی جێبەجێی بکەن.

هەرچەنـــدە لەســـەردەمی پێغەمـــبەردا ئەمیرەکـــانی زانـــا بـــوون بە شەریعەتی خوا و هاوەڵە بەڕێزەکانی بوون، بەڵام لە دواییدا زانایان وەلـی ئەمری سەرەکی بـوون بـۆ ڕوونکـردنەوەی شـەریعەت و یاسـاو ڕێسـاکان. ئەوانەشی کە پیادەیان دەکرد بەدەست و دەزگاکانی خیلافەت بوو.

خوای پەروەردگار لەبارەی وەلی ئەمر دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلۡأَمۡرِ مِنكُمۡۖ فَإِن تَنَٰزَعۡتُمۡ فِي شَيۡءٖ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمۡ تُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۚ ذَٰلِكَ خَيۡرٞ وَأَحۡسَنُ تَأۡوِيلًا ٥٩﴾ النساء. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرو فەرمانڕەواکان بکەن کە لە خوودی خۆتانن، خۆ ئەگەر لە شتێکدا بوو بە کێشەتان، ئەو کێشەیە بگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەرەکەی صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، (کە پیادە کردنی قورئان و سونەت دەگەیەنێت)، ئەگەر ئێوە باوەڕتان بە خواو ڕۆژی قیامەت هەیە، (ڕەفتار کردنتان) بەو شێوەیە چاکترو ڕونترو ڕەوانترە.

پێویستە موسوڵمان باش ئەوە تێبگات دەسەڵاتی عەلمانی نـابێتە وەلـی ئەمر ئەو کەسەی وەلی ئەمرە لەکاربەدەستان و پیـادەی شـەریعەتی خـوا نەکات، بڵێ دیموکراسی باشە، کەچی هەندێک ئەوەندە گێلو سەرلێشیوا و بێت، بڵێ ناموشکیلە نییە تۆ هەروەلی ئەمری.

ئەمە بە ئارەزووی من و تۆ نابێت، ئەمە شەرعی خوای پەروەردگارە.

وشەی وەلی ئەمر  هاتووە لە قورئاندا بەکـۆ هـاتووە و نادیـارە، تەنهـا مەرج بــۆ وەلــی ئەمــر شــوێنکەوتووی قورئــان و ســوننەتە، زانــیمان لەژێردەسەڵاتی قورئان و سـونەت پیـادە دەکرێـت، ئەگەر خۆیشـی تـاوان باربوو، مەی خـۆر بـوو، هەر گـوێڕایەڵی دەکەیـن تـاکوفری لـێ نەبینیـت، مادام نەمانتوانی باشـترێک بخەینـە شـوێنی، ئەمەش فەرمـانی پێغەمـبەری خوایە. ئەگەر پیادەکەری شەرعی خوانەبـوو، بـەڵکو ڕوون بـوو کـە یاسـاو ڕێسایەکی دژ بەشەریعەت بوو، ئەوەی کەو کەسەی بەوەلی ئەمر زانـی و گوێڕایەڵ و ملکەچی یاساکەی بوو بە دڵنیاییەوە کافرە.

أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ مَا فِي قُلُوبِهِمۡ فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ وَعِظۡهُمۡ وَقُل لَّهُمۡ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ قَوۡلَۢا بَلِيغٗا﴿٦٣﴾ ئا ئەو جۆرە کەسانە خوا خۆی چاک دەزانێت چی لە دڵ ودەروونیاندا حەشار دراوە، ڕەفتاری ئەوانە پشت گوێ بخە (بەڵام) ئامۆژگاریان بکە، وە قسەی بە پێزومانا داری وایان پێ بڵێ کە بە قوڵایی دەروونیانا بچێتە خوارەوە.

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ وَلَوۡ أَنَّهُمۡ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ جَآءُوكَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسۡتَغۡفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابٗا رَّحِيمٗا﴿٦٤﴾ النساء. هیچ فرستادەیەکمان نەناردووە کە فەرمان نەدرابێت بە گوێڕایەڵی بۆی، وە بڕیاری ملکەچی بۆ نەدرابێت بە فەرمانی خوا (چونکە فەرمانبەرداری پێغەمبەر فەرمانبەرداری خوایە). خۆ ئەگەر (ئەو خەڵکە کاتێ ستەمێکیان لەخۆیان کرد (دوایی بەخۆیانا چونەوەو) هاتن بۆ لای تۆو (پەشیمان بوون) وە داوای لێخۆش بوونیان لەخوای گەورە دەکرد، پێغەمبەریش داوای لێ خۆشبونی بۆ کردن، بێگومان ئەوکاتە دەبینن کە خوا تەوبە و پەشیمانی وەرگرەو میهرەبان و دلۆڤانە (ئەگەر بەڕاستیان بێت).

هەروەها دەفەرمووێت:

لَّا تَجۡعَلُواْ دُعَآءَ ٱلرَّسُولِ بَيۡنَكُمۡ كَدُعَآءِ بَعۡضِكُم بَعۡضٗاۚ قَدۡ يَعۡلَمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ يَتَسَلَّلُونَ مِنكُمۡ لِوَاذٗاۚ فَلۡيَحۡذَرِ ٱلَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنۡ أَمۡرِهِۦٓ أَن تُصِيبَهُمۡ فِتۡنَةٌ أَوۡ يُصِيبَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴿٦٣﴾ النور. (ئەی یاوەران) نەکەن بانگی پێغەمبەر بکەن، وەک ئەوەی خۆتان لە نێوان یەکتردا بانگی یەک دەکەن (چونکە دەبێت قەدری پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم تایبەتی بێت) بێگومان خوا دەزانێت بەوانەی کە خۆیان پەنهان دەکەن و خۆ دەدزنەوە لە کارو فرمان، دەبا ئەوانەی کە سەرپێچی لە فەرمانی

دەکەن بترسن لەوەی کە تووشی تاقی کردنەوەیەکی سەخت، یان تووشی سزایەکی بە ئێش ببن.

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێتت (ئەوەی بۆم بەجێ هێشتوون دەستی پێوە بگرن، ئەوانەی پێش ئێوە لەناوچوون بە هۆکاری پرسیاری زۆریان، هەروەها بەهۆکاری ئیختیلافیان لەسەر پێغەمبەرانیان، ئەوە کە وتم مەیکەن و وازی لێبهێنن، جا هەرشتێک بێت خۆتانی لێ دووربخەنەوە، ئەوەشی ئەمرم پی کردن بەهەرشتێک کە بیکەن هەوڵ بدەن بەگوێرەی تواناتان بیکەن).

(دَعُونِي ما تَرَكتُكمْ، إنَّما هَلَك مَن كانَ قَبلَكمْ بِسُؤَالِهِمْ وَاخْتلَافِهِمْ علَى أنْبِيَائهِمْ، فَإذَا نَهَيْتُكمْ عن شيء فَاجْتَنِبُوهُ، وإذَا أمَرْتُكمْ بِأمْرٍ فَأْتُوا منه ما اسْتَطَعْتُمْ).[٢٨]

کەواتە وەلی ئەمر کاتێک گوێڕایەڵی دەکرێت کە فەرمان بەتاوان و گوناه و کوفر نەکات، خۆی ئەگەر تاوان باربوو پێویستە خەڵکانی تایبەت ئامۆژگاری بکەن.

خۆئەگەر لە سنوور دەرچوو دەبێت لە ئەمیرایەتی بخرێت و بەدار و شمشێر و سیلاح بهێنرێتە خوارەوە.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: لەسەر موسوڵمانە کە گوێڕایەڵی و گەردن کەچ بێت بۆ وەلی ئەمر، جا هەر کارێکی پێ بسپێرێت لەسنووری شەرع دا بێت خۆشی بێت یان ناخۆش،



---

[٢٨] متفق عليه.

تەنیاحاجی

**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel



Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایەن { ئازیزێکی چەناڵ }
کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

t.me/tanyahaji7

Invite Link



بەڵام ئەگەر ئەمری کرد بە تاوان و گوناه بەهیچ شێوەیەک گوێڕایەڵی و گەردن کەچ نابێت بۆی.

## سونەت و جەماعەت

سونەت ڕوون و ئاشکرایە مەبەست ڕەسولی ئەکرەمە ﷺ جەماعەت ئاماژەیەکی کورتمان پێداوە پێش وەخت، واتا هاوەڵانی پێغەمبەری خوا ﷺ، هاوەڵان کە ١١٣٠٠٠ کەس بوون و لە فەرموودەشدا هاتووە کە ١٢٤٠٠٠ کەس بوون.

ئەو جیلە لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ دا ژیاون، مەرجی بوون بە هاوەڵی پێغەمبەر موسوڵمان بوون بووە واتا ئیمانی هێنابێت بە پێغەمبەر ﷺ و پێغەمبەری بینیبێت بەچاو یان بە خزمەتی گەیشتبێت، هاوەڵ هەبووە کوێر بووە نەی بینیووە، بەڵام بەخزمەتی گەیشتووە لەگەڵیدا کۆبوەتەوە بەو شێوازە پلەی هاوەڵییان دراوەتێ.

هاوەڵان پلەو مەرتەبەیان جیاوازە، لەدوای هەموو پێغەمبەران -علیهم السلام- بەڕێزترین کەس و بەرزترین پلە (ئەبوبەکری صدیقە) پاشان (عمری کوڕی خەطاب، عوسمانی کوڕی عەففان و علی کوڕی ئەبی طالب)ە پاش ئەم هاوەڵانە کۆمەڵێک دێن پێیان دەوترێت (عشرة المبشرة) دوای ئەمان ئەهلی بەدر و دوای ئەوان ئەهلی ئوحود، پاشان ئەوانەی بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر ﷺ لە حودەیبیە، دوای ئەوان موهاجرین بەگشتی، پاشان هاوەڵانی ئەنصار و هاوەڵانی پێش



فەتح. واتا ئەوانەی پێش فەتحی مەککە موسوڵمان بوون پاشان هاوەڵانی تر بە گشتی.

هەرکەس تانەیان لێبدات و بەدرۆزن یاخود ناپاک ناویان بینێت و زانابێت بەوەی هاوەڵی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ بوون، بێگومان کافر دەبێت، وەکو ئیبن تەیمیە کە تەکفیری ئیمامەکانی شیعەی کردووە لەسەر ئەوەی قسە بە دایکی ئیمانداران و خولەفای ڕاشدین و هاوەڵانی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەڵێن و جنێو و قسەی ناشرینیان دوادەخەن، بێگومان کافرن.

هۆکاری کافر بونیشیان ئەوەیە کە هاوەڵان دوای پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ ئەم دینەیان گەیاندووە و ئەنجا بەڕوون و ڕەوان قورئان تەزکیەی هاوەڵانی کردوەو مژدەی بەهەشتی پێداون، کەواتە تانەدان لەوان بەدرۆ زانینی قورئان و بێ متمانەییە بە دینی خوای پەروەردگار و شایەتیدانی خێری پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ بۆیان.

خولەفای ڕاشدین پێنج کەسن وەکو قورئان و سونەت دەتوانن تەشریع بکەن بە پێی ئیجتیهادی خۆیان،بە بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: عَلَيكمْ بِسُنَّتِي وَسُنَّةِ الْخُلَفَاء الرَّاشِدِينَ.

ئەو پێنج خەلیفەیە بریتین لە: ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، علی و حسن- ڕەزامەندی خوا لە سەر هەموویان بێت- تانەو تەشەر و قسەی ناشرین بەهەریەکێکیان کافر بوونە. وەکو وتمان چونکە قورئان و



فەرمووده تەزکیەی کردوون و هەڵشاخان بە قورئان و فەرموودەدا لە ئیسلام پێی ئەچیتە دەرەوە.

کەواتە وشەی جەماعەت دەگەڕێتەوە بۆ هاوەڵانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ.

## حوکم بە قورئان و سونەت

ئەم بەشەی کە من و تۆ قسەی لەسەر دەکەین ترسناکترین بەشە لە عەقیدە و بیروباوەڕدا، بەتایبەت لەم سەردەمی جاهیلیە و کوفر و شیرک و زەمەنی هەموو بیروبۆچونێکە. مەنهەجی ئیسلامی مەنهەجێکی تەواوە و پڕە لەهەموو سیستەمەکانی ژیان، ئیسلام سیستەمی حوکم و ژیانە.

قورئان و سونەت هەر لە منداڵی تا پیر بوون و مردن یاسا و ڕێسای بۆ تاکەکەس دیاری کردووە، لە ژنهێنان و دروستکردنی خێزان و گەڕەک و کۆمەڵگا و شارو شارستانییەت دا، یاسا و سیستەمی حوکمی دامەزراندووە بەشێوەیەک لەگەڵ ئەم گەردوونەدا یەکانگیرە. پاشان دەستور و یاسای سەربازی و ئیمارەت، قاضی دەسەڵاتدار تا خەلیفە، هەمووی دەست نیشان کراوە، پاکێجێکی تایبەت بە سیستەمی حوکمڕانی لە ئیسلامدا و خوودی پێغەمبەرەکە صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ حاکم بووە، وەزیری هەبووە کە ئەبوبەکر و عومەر بوون -ڕەزامەندی خوایان لەسەربێت-.

لێرەدا کە دەڵێین ئەم باسە ترسناکە، چونکە بۆ گیانی حاکم و دەسەڵاتداری ئەمڕۆ وەک بۆمبی ئەتۆمە، بەڵکو لەوەش ترسناکترە لە نەهاتنی خۆر بۆ سەر زەوی. بەتایبەت بۆ ئیشتراکیەت و سەرمایەداری و

دیموکراسی و لیبراڵـی کە بەئـاگر و ئاسـن و پـارە و بانـک، ڕۆژنـامەنوس و تەلەفزیـۆن، چەک و هەرچـی تواناییـان هەیە بـۆ دژایەتـی ئەم بەشــە لە عەقیدە دایناوە، بەردەوام لە جەنگ دا خەو لە چاویاندا زڕاوە

چۆن دەبێت و چۆن بیر بکەینەوە، چۆن دەژیت و هەرچـی دەکەیـت بـیکە، بەڵام داوای حـوکمی خـوا مەکە! ئەمـە کورتـەی هـاوارو بەرنامـەی ئەوانە.

سەیرە لە هەموو دنیادا هەرچی بیروبۆچوون و عەقیـدە و مەزهەب و فیکـر و فەلسـەفە و تەنـانەت دینـی دروسـتکراوی مـرۆڤ ئـازادە، ئەوەی سەیرە تەنها نابێت داوای حـوکمی خـوای گەورە بکەیـت، لای ئەوان هـیچ کێشەیەک نییە موسوڵمان بیت، دەڵـێن موسـوڵمان بە لەمـاڵی خۆتـا کەس حەقی بەسەرتەوە نییە.

لەڕاستیدا جێگای پێکەنینە لە ماڵەکەی خۆمدا ئازادیم پێ دەبەخشێت، چونکە کاریگەری دروست ناکـات، بەڵام هەر بەیاسـا درۆزنەکـانی خۆیـان مەبەست دیموکراتیە ڕای خۆم دەرببـڕم، ئەوا ئیـتر مـن ئیرهـابی چـاوزەقم، چـونکە وەکـو هەمـوو ئەوانەی دەنگیـان بەرزە بەداوای خۆیـان، منـیش دەنگ بەرز دەکەمەوە دەڵێم شەریعەتی خوام دەوێت. لەوەڵامـدا دەڵـێن نا، یان بۆ زیندان یان پەتی سێدارە یان کوشتن لە پەنایەکدا.

ئەی ئەپرسـم ئەو خەڵـکە بـۆ ئـازادن، بـۆ مـن ئـازادیم نەبێـت، زۆر ڕاشـکاوانە دەڵـێن ئەوان هـیچ زەرەریـان بـۆ (پەزەکـان نیـیە) واتـا هـیچ کـاریگەریەک لەسـەر سیسـتەمی نـوێی جیهـانی دادانێـت کە جیهـانگیری (عەولەمە)یە.



ئەی ئیسلام بۆ زەرەر بە ئێوە ئەدات، ڕۆژئاوا بەگشتی بۆ دەترسن لە ئیسلام و لە حوکمی ئیسلام وەڵاممان بدەنەوە؟!

لەوەڵامدا دەڵێن: ئیسلام بانکی ڕیبای قبوڵ نییە، ئیسلام مۆنۆپۆل و ئیحتیکاری قبوڵ نییە، ئیسلام سنووری قبوڵ نییە، ئیسلام نەتەوە و عنصوری و دەمارگیری قبوڵ نییە، ئیسلام کات زۆر ئەدات بە کرێکار و فەرمانبەر لەسەر کارکردن ئەوەش بەکەڵکی ئێمە و سەرمایەداری نایەت، ئیسلام خێزانی دەوێت، ئێمە نامانەوێت، ئیسلام دادپەروەری ڕاستەقینەی دەوێت، ئێمە تەنها بۆ هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی باسی دادپەروەری دەکەین.

ئێمە ئافرەتمان دەوێت لە کایەی سەرمایەداریدا کاڵا بێت، ئیسلام ئافرەت دادەپۆشێت و وەکو مرۆڤ تەماشای دەکات، سایت و دەزگای پۆرن و هەموو سەماکردن و قومارخانە و شەوانی مەی خواردنەوە ناهێڵێت، ئێمەش قبوڵی ناکەین ژیانمان لەسەر ئەوانە بیناکردووە، زۆری تر کە ئیسلام و ئەوان دژن بەیەکەوە.

لە پشتی حوکمی ئیسلامییەوە کە بریتییە لە حوکم و دادپەروەری و پیادەکردن، ئەمەش لەسەر بنەمای تەوحیدی ئولوهیەت و ئیمان دادەمەزرێت.

ئیسلام دژی حاکمیەتی هەموو فیکر و یاساکانی دەستکردی مرۆڤە و خوای پەروەردگار یاسا بۆ مرۆڤ دادەمەزرێنێت و لە کۆیلایەتی مرۆڤ ئازاد دەکات و دەیانکاتە بەندی خۆی، کۆیلایەتی سەردانەواندنی مرۆڤ بۆ مرۆڤ ئەوپەڕی نەنگییە، چونکە هەموو وەکو یەکن. هەر هۆکاری ئەم



ئازادیەیە هەرچی دەسەڵاتداری ملهوڕی جیهانە دژی یاسای حوکمی خوای پەروەردگارن.

﴿وَكَيْفَ يُحَكِّمُونَكَ وَعِندَهُمُ ٱلتَّوْرَىٰةُ فِيهَا حُكْمُ ٱللَّهِ ثُمَّ يَتَوَلَّوْنَ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ ۚ وَمَآ أُو۟لَـٰٓئِكَ بِٱلْمُؤْمِنِينَ﴿٤٣﴾﴾ (سەیرە) ئەوانە چۆن دێن و تۆ دەکەن بە دادوەر لە کاتێکدا خۆیان تەوراتیان لایەو فەرمانی خوای بەڕوونی تیایە، پاشان پشتی تێ دەکەن دوای ئەوەی (حوکم و فەرمانی خوایان بۆ دەردەکەوێت) دیارە ئەوانە هەر ئیماندارن نین (لە مەدینەدا یەکێک لە ناودارانی جوو زینای کردبوو، حوکمی زینا کەرێک کە هاوسەری هەبێت لە تەوراتدا بەردباران کردنە، تا بەڵکو حوکمەکەی لە قورئاندا ئاسان تر بێت، هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر ﷺ، بەمەرجێ باوەڕیان بە پێغەمبەرو بە قورئان نەبوو، کاتێ کە پێغەمبەر گێڕانییەوە بۆلای حوکمی تەورات پشتیان هەڵکردو بە دڵیان نەبوو).

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ ۚ يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟ لِلَّذِينَ هَادُوا۟ وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ وَكَانُوا۟ عَلَيْهِ شُهَدَآءَ ۚ فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ وَٱخْشَوْنِ وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا ۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ﴿٤٤﴾﴾ ئێمە کاتێ تەوراتمان ڕەوانە کردووە ڕێنموییی تیا بوو (بۆ هەموو خێرو چاکەیەک)، نوورو ڕووناکیش بوو (لەناو تاریکستانەکاندا) ئەو پێغەمبەرانەی کە ملکەچ و فەرمانبەردار بوون حوکمی جولەکەیان پی دەکرد، هەروەها زانا پەروەردگار ناسەکانیان و زانا شەرع ناسەکانیشیان، ئەوەی لایان بوو لە کتێبی خوا دەیان پاراست و لەبەریان دەکردو پەیڕەویان دەکرد شایەتیش بوون لەسەری (کەواتە ئەی زانایانی جولەکە، ئەی ئیمانداران) لە خەڵکی



مەترسن بەڵکو تەنها لە من بترسن و ئایەتەکانی من بە نرخێکی کەم مەفرۆشن (ئەگەر هەموو دنیاش بێت هەرکەمە) جا ئەوەی حوکم و داوەری بەو بەرنامەیە نەکات کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئەو جۆرە کەسانە لە ڕیزی کافراندان.

﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌۚ فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥۚ وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾

لە تەورات دا بڕیارمان داوە لەسەریان (ئەگەر) یەکێک کەسێک بکوژێت دەبێت بکوژرێتەوە، چاوی یەکێک کوێر بکات، دەبێت کوێر بکرێت، لوتی یەکێک عەیب دار بکات دەبێت لوتی عەیبدار بکرێت، گوێی یەکێک ببڕێت دەبێت گوێی ببڕێت، دانی یەکێک بشکێنی دەبێت دانی بشکێنن، برین و زامەکانیش هەروەها تۆڵەیان بەگوێرەی خۆی بۆ دەسەنرێت، جا ئەوەی لە تاوانبار خۆش ببێت، ئەو چاوپۆشی و لێخۆشبوونەی دەبێتە کەفارەتی گوناهانی، (بێگومان) ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئا ئەوانە لە ڕیزی ستەمکاراندان.

﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِم بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِۖ وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾﴾ ئەوجا بەشوێن پێغەمبەرانی (نەوەی ئیسرائیل دا) عیسای کوڕی مەریەممان ڕەوانەکرد، کە ڕاستیی تەوراتی دەردەخست و پشتیوانی لێ دەکرد، ئینجیلیشمان پێ بەخشی کە هیدایەت و نوورو ڕووناکی تیایە، پشتگیریی تەوراتی پێش خۆیەتی، هیدایەت و ڕێنمویی و ئامۆژگارییە بۆ ئەو کەسانەی کە لە خوا دەترسن و پارێزکارن.

﴿وَلۡيَحۡكُمۡ أَهۡلُ ٱلۡإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِۚ وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ﴿٤٧﴾﴾ دە با شوێن کەوتوانی ئینجیل بەو ڕێنمونیی و ئامۆژگاریانە هەڵسوکەوت بکەن کە خوا تیای دا ڕوونی کردۆتەوە (کە گرنگترینیان شوێنکەوتنی ئایینی ئیسلام و پێغەمبەری ئیسلامە) جا ئەوەی حوکم و داوەری نەکات بەو بەرنامەیەی کە خوا ڕەوانەی کردووە، ئا ئەوانە ناپاک و تاوانبارو گوناهکارن.

﴿وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِۖ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَكُمۡ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمۡۖ فَٱسۡتَبِقُواْ ٱلۡخَيۡرَٰتِۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرۡجِعُكُمۡ جَمِيعٗا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ فِيهِ تَخۡتَلِفُونَ﴿٤٨﴾﴾ (ئێمە) قورئانمان هاوڕێ لەگەڵ هەموو حەقیقەت و ڕاستیەکدا بۆ تۆ دابەزاندووە، ڕاستیی و دروستیی کتێبەکانی پێش خۆیشی دیاری دەکات، وە نیگابانە بەسەر هەموویاندا (کاتێ کە خاوەنانی کتێب لە گاورو جوو گیروگرفتیان دێنن بۆلای تۆ) بە بەرنامەی خوا داوەریی بکە لە نێوانیاندا، وە شوێنی ئارەزواتی ئەوانە مەکەوە، لەو حەقە لامەدە کە بۆت ڕەوانە کراوە، بۆ هەر لایەکتان (موسوڵمانان و خاوەنانی کتێب) بەرنامەو پرۆگرامی تایبەتمان بڕیارداوە خۆ ئەگەر خوا بیویستایە هەر هەموتانی دەکردە ئوممەت و گەلێکی یەک پارچە، بەڵام (ویستی وایە) تاقیتان بکاتەوەو (سەربەستان بکات تا بەهۆی عەقڵ و ژیریتانەوە ڕێبازی ڕاست بدۆزنەوە) و لە بەخششەکانی سوود وەرگرن، دەی کەواتە زۆر بە پەلە و تاڵوکە بن و پێشبڕکێ بکەن بۆ هەموو خێرو چاکەیەک، دڵنیاش بن کە هەموتان دەگەڕێنەوە بۆ لای خوا، ئەو کاتە هەواڵی تەواوتان دەداتێ دەربارەی ئەو شتانەی کێشەتان لەسەری هەبوو.



﴿وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ۝٤٩﴾ (کاتێ هەندێک لە زاناکانی جوو، هاتن بۆلات تا داوەریی بکەی لە نێوانیاندا)، داوەری بکە بەو بەرنامەیەی کە لە لایەن خواوە بۆت ڕەوانە کراوە، شوێنی ئارەزواتی ئەوان مەکەوە، وریایان بە نەوەکو ڕێت لێ هەڵە بکەن لە هەندێک لەو ڕێنموونییانەی کە خوا بۆی ناردووی (جا ئەگەر ئەو جولەکانە ڕازیی نەبوون و) پشتیان تێ هەڵکرد، ئەوە دیارە خوا دەیەوێت گیرۆدەی سەرئەنجامی هەندێک لە گوناهەکانی خۆیانیان بکات، بێگومان زۆربەی خەڵکی یاخیی و سەرکەش و تاوانبارن.

﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ۝٥٠﴾ المائدة. ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامی یان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاک و بەجێ بێت، (بەتایبەتی) لای ئەو کەسانەی بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە.

ئەم ئایەتانە وانەیەکی گرنگە بۆ هەموو موسوڵمانێک، پێت دەڵێت حوکمی شەریعەت پەیمانی هەموو پێغەمبەران بووە لەگەڵ خەڵکەکەیاندا بۆ پیادەکردنی لەسەر زەویدا تا دادپەروەری بەرقەرار بێت، ئەستەمە دادپەروەری لەڕووی خوای پەروەردگار.

ئەم باسە هەروا ئاسان نییە، بەڵکو گرنگترین پرسە، چونکە جیاوازی دەکات لەنێوان کوفر و ئیمان و ئیسلام و جاهیلیەت دا.

پیادەکردنی شەرعی خوا و هەواو ئارەزووی ملهوڕاندا، لەم پرسە گرنگە و باسە پڕ بایەخەدا نێوەند گیری ناکرێت، یاخود هودنە و موفاوەزات،

یان صوڵحی عەشایەری لەگەڵ ئیماندارا، بەڵکو کۆنکرێتی و چەقیوە کە حوکمی خوای پەروەردگار ١٠٠٪ دەبێت پیادە بکرێت، ئەوەی پێی ڕازی نەبێت و بڵێ بەکەڵک نایەت طاغوتە، ملهوڕە، کافرە، فاسقە، زاڵمە، ئیبلیسە، ئەبوجەهلە، فیرعەنە، قارونە، هامانە و نەمرودە..هتد.

حوکم بەوەی خوای گەورە ناردویەتی بۆ پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەبێت بەبێ دوودڵی پیادە بکرێت، گۆڕینی یەک پیت دەرچوونە لە دین وەکو ئەو کەسانەیە کە ئاماژەمان پێ کردن، ئەگەر بە حوکمی خوای گەورە ڕازی نیت، واتا بەحوکمی ئەوانە ڕازیت خوای گەورە ڕێگای پێ نادات. تۆش ئەو حوکمە هەڵدەبژێریت بەهەربیانوویەک بێت جاهیلیەتە و کوفرە و فاسقی و زاڵمیە. ئەمەش جنێو یاخود تانە و تەشەر نییە، بەڵکو حوکمی خوای پەروەردگارە یان هەواو ئارەزووی خەڵکە یاخود حوکمی خوا و پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەڵدەبژێریت و دەڵێت تێکەڵی دەکەم لەگەڵ دیموکراتی، ئەوا خراپترە لەکاری یەکەم، بەڵکو لەگەڵ هەموو حوکمە شەرعیەکان پلەیەکی زیاتر بەدەست دەهێنێت لە تەنیشت کوفر و زوڵم و فاسقی دا. ئەویش شەریک و هاوبەشی دانانە بۆ خوای پەروەردگار کە دەبێتە موشریک.

لەڕووی عەقڵانییەتەوە هیچ خاوەن موڵکێک ڕازی نابێت کە سواڵکەرێک بێتە شەریک و هاوبەشی لە سەروەت و سامانیدا (ولله المثل الأعلى).

تێگەیشتن و ڕازی بوون بە حوکمی خواو پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ لەچوارچێوەی ئیسلامداین و پاراستنی ژیان و سەروەت و سامان و خێزانە. هەمووی پارێزراوە خۆ ئەگەر بەناوی



مەسڵەحەت و بەرژەوەندی بڵێت حوکمی تر هەڵبژێرێت خوای گەورە زاناترە بە بەرژەوەندی مرۆڤ تا مرۆڤەکان کە خوای پەروەردگار دروستی کردوون.

خۆ ئەگەر هەرکەس وتی من بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکان یاسا دادەنێم بەدڵنیاییەوە دەرچووە لە چوارچێوەی ئیمان.

جا بۆیە دەڵێم ئەم پرسە ترسناکە، چونکە دەقی ڕاستەخۆ و ڕاشکاوانەی لەسەر هاتووە، هیچ کەس ناتوانێت تەفسیر و تەئویلی هەواو ئارەزووی بۆ بکات، زۆر کۆنکرێتیە و جوان و ئاشکرا و ڕاشکاوانەیە لەو کۆمەڵە ئایینەدا ئەوە دەردەکەوێت کەخوای پەروەردگار تەواوی ئایینەکانی ناردووە بۆ حوکم و فەرمانڕەوانیی کردنە جیاوازیی نێوان کوفر و ئیمانە، چونکە ژیان لەسەر شەریعەت دادەمەزرێت و سیستەم و پێکهاتەکەی لە ئێستادا ئیسلامە.

سەرەتا باسی تەورات دەکات کە هیدایەت و نور بووە، هەموو پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیل بەوە فەرمانڕەواییان کردووە، پاشان ئینجیل کە پێغەمبەر عیسای کوڕی مەریەم -علیه السلام- فەرمانڕەوایی پێ کردووە، وە بۆ محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم قورئانەمان ناردووە کە دەسەڵاتی هەیە و حوکم فەرمانڕەوایی تێدا کۆکراوەتەوە، ئەوانەی گەلن و ئەوەشی کە حاکم و حوکومەتە، دەبێت بە قورئان حوکم بکەن. خۆ ئەگەر لە دەسەڵاتدا هەرکەس ڕازی نەبێت بەحوکمی خوا و قورئان، ئەوا خوای گەورە کافر و فاسق و زاڵمی کردوون بەوەش ترسناکترین و دژوارترین کێشەیە کە مرۆڤ فاسق و زاڵم بێت پانا بەخوای گەورە.

ئەوەی ڕازی بێـت بە حـوکمی خـوای گەورە و پیـادەی ئولـوهیەت و ڕبوبیەتی پەروەردگاری کردووە دانی بە یەکتاپەرستی دا نـاوە بە کـردار و گوفتار، دوبارەی دەکەینەوە لێرەدا جیاوازی لەنێوان کوفر وئـیمان دەکـات ئەم پرسە، یاخود لە نێوان جاهیلیەت و ئیسلامەتی قەرارت پێ دەدات یان موسوڵمان بە یان جاهیل.

خـوای پەروەردگـار دروسـتکەری ئەم گەردونەیە، پاشـان دروسـتکەری مـرۆڤە کە ئەم ئاسـمان و زەوییەشـی لەنێوانـدایە، هەمـووی خسـتۆتە بەردەستی مرۆڤ و بۆی موسەخەر کردووە، هیچ شـەریک و هاوبەشـێکی نییە لە کەم و لە زۆر هەرخۆی خاوەنی هەموویەتی.

خـۆی خـاوەن مـوڵکە واتـا (مالیـک) و خـاوەنی هەمـوویەتی و دروستکەری هەموویەتی کەواتە خالقە لەکەم و زۆر هاوبەشی نییە. زاتـی پاکی ڕزق و ڕۆزی ئەدات، ئەم سێ سیفاتە (المالک، الخالق و الـرازق) واتـا خوای پەروەردگار سوڵتانە کە بڕوات بە سـیفاتی ئولـوهیەت و ڕوبـوبیەتی کرد، ئۆتۆماتیکی سوڵتانی کەون ئەدۆزیتەوە ئەویش مادام سوڵتانە خاوەن حوکمە.

کە مادام خاوەنی حوکم و فەرمـانڕەوایی ڕەهـایە، کەواتە خۆشـی یاسـا دانەرە.

خـوای گەورە بـۆ ئەم کەونە یاسـای دانـاوە و لە کتێبێکـدا هەمـووی ڕونکردۆتەوە.



## ئوممەت چییە؟

ئوممەت زاراوەیەکی ئیسلامییە کە خەڵکی لەسەر بنەمای ئیسلام و خواناسی و دینداری کۆدەکاتەوە، جیاوازی لەنێوانی سپی پێست و ڕەش پێست ناکات، جیاوازی لەنێوان نەتەوە و گەل و هۆز و عەشیرەت و هیچ تیرەیەک ناکات. زمان و وڵات و پاسپۆرت و ناسنامەی مرۆڤ کە دێتە ناو ئیسلام موسوڵمانە و لەخاکی ئیسلامدا ئازادە.

ئوممەت ئینتیمایە و خۆشەویستییە بۆ ئایینی ئیسلام و سیستەمەکەی لەسەربنەمای هاونیشتیمانی خەڵک دروست ناکات، بەڵکو لەسەربنەمای برایەتی کار دەکات و مرۆڤ دەکاتە برای یەکتری، ئەوانەشی موسڵمان نین لەناو خاکی ئیسلامدا بە هاوڵاتی تەماشا دەکرێن، مافی وەکو موسوڵمان پارێزراوە.

ئایینی ئیسلام فەرمانڕەوایی لەسەر نەتەوە دانامەزرێنێت، بەڵکو ئەگەر عەرەب حوکم بە ئیسلام بکات هەموو عەجەم بۆی گەردن کەچ دەبێت و بەپێچەوانەشەوە ئەگەر عەجەم حوکمی بە ئیسلام کرد هەموو عەرەب بۆی گەردن کەچ دەبێت.

لەمێژووی ئیسلامدا (عەرەب، فارس، تورک، ئەمازیغی، ئەفریقی، هیندی، تورکمان، ئەفغانی و مالیزی) هەموویان حوکم و فەرمانڕەواییان بە ئیسلام کردووە و تەنانەت لەهەمووی گرنگتر (کۆیلە و عەبدەکانیش فەرمانڕەوایی ئیسلامیان کردووە کە بەسەردەمی مەمالیک ناسراوە).

ئوممەت داینەمۆی خیلافەتی ئیسلامیە، بەبێ ئوممەت ناسنامە و خیلافەت دانامەزرێت، چونکە ئوممەت ڕوکنی سەرەکی خیلافەتی ئیسلامییە پێش دروستکردنی خیلافەت پێویستە بیروباوەڕی ئوممەت لە

مێشکی خەڵکی دا زیندوو بکرێتەوە تا بتوانین خیلافەت بە ئوممەت دابمەزرێنێت.

## پێغەمبەر و هەندێک تایبەتمەندی

من و تۆی بەڕێز دەبێت یەقین و دڵنیایی تەواومان هەبێت لە پێغەمبەرێتیدا و دەبێت خوا و پێغەمبەرمان لەهەرچی شتی دنیایی و ماڵ ومنداڵ هەیە لاگرنگتر و خۆشەویستر بێت.

هەمیشە بەڕێز و حورمەتەوە باسی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەبێت بکەیت، سوێند خواردن بە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەهیچ شێوەیەک جائیز نییە، هەندێک کە سوێندنی پێ دەخۆن ئەگەر جەهلی چڕ- مورەکەز- بێت ئەوا دەکەوێتە بەر مەشیئەتی خوای پەروەردگار، خۆ ئەگەر عەمدەن بێت ئەوە شیرکە و کوفرە.

سوێند خواردن بەسەری پێغەمبەر و بە طەڵاقی پێغەمبەر و بە چاوی پێغەمبەر ئەمانە کە زۆر بڵاون لەناو کورد دا هەمووی کوفر و هاوبەش دانانە لەسەر خاوەنەکەی.

پێغەمبەر ئەمرمان پێ دەکات کە سوێند نەخۆین خۆ ئەگەر مرۆڤ سوێندی خوارد دەبێت سوێند تەنها بە پەروەردگار بخوات دەنا شیرک و کوفرە.



قـال رسـول اللـه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ (مـنْ حلـفَ بغـيرِ اللـهِ فقـدْ أشرك).[٢٩]

دەبێت بڕوای تەواومان هەبێت بە موعجیزەکانی بریتین لە کۆکراوەی هەموو موعجیزەی پێغەمبەران بەگشتی.

دەبێـت بڕوامـان هەبێـت بە کۆتـایی پەیـامەکەی و خۆشـی کە کۆتـا پێغەمـــبەرە ئەگەر ئـــادەم یەکەم پێغەمـــبەر بـــووە ئەوا محمـــد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ کۆتا پێغەمبەرە.

ئەگەر نـوح تەمەنـی زۆر بـووە، محمـد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خـوای پەروەردگار شەوی قەدری بە دیاری پێ بەخشیووە کە شەوێک لە شەوانی قەدر بە ١٠٠٠ مانگە.

ئەگەر کەسێک ٢٠ ڕەمەزان بگرێت زیاتر لە ١٧٠٠ ساڵ بەنـدایەتی بـۆ دەنوسرێت، ئەگەر نوح لە لافـاوەکە ٨٣ کەسـی بـۆ ڕزگـار بـوو پێغەمـبەر محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ئـوممەتێکی بە کەشـتی ئیسـلام ڕزگـار کـرد لەلافاوی جەهالەت.

ئەگەر ئیبراهیم مەلەکـوتی خـوای گەورەی نیشـاندرا و بـووە (خەلیلـی پەروەردگار) ئەوا پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ چووە ئیسراء و میعـراج و هەموو پێغەمبەران لەدوایەوە نوێژیـان کـرد و جەنابیـان بـوونە ئیمامـی پێغەمـبەران و چـووە ئەو جێگـایەی کە تەنـانەت مەلائیـکەش ناتوانێـت بڕوات، لەگەڵ خوای پەروەردگـار قسـەی کـردووە. بڕوامـان وایە بە بـۆراق

---

[٢٩] رواه الترمذي عن عبدالله بن عمر.

چـووەتە مزگەوتـی قـودس و لەوێشـەوە لەگەڵ جوبریلـدا تـا سـیدرەی مونتەها چوون.

ئەگەر بـۆ حەزرەتـی موسـا دەریـای کەرت کـردووە، بـۆ پێغەمـبەر صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ مانگی کەرت کرد.

ئەگەر سـولەیمان و حەزرەتـی داودی بـاوکی قسـەیان لەگەڵ گیاندارەکاندا کردووە، هەروەها پێغەمبەری خـواش صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لەگەڵ ئاسک و گورگ و وشتردا قسەی کردووە.

ئەگەر سولەیمان مەمەلکەتی سەبەئی خستە ژێردەسـەڵاتی، پێغەمـبەر صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بە ئیسـلام و عەرەب و حەجەم و تـورک و ڕۆم و ئەمازیغی و هیندی کردە ئوممەتی ئیسلام.

ئەگەر عیسا مردووی زیندوو کردەوە بە ئەمری خوای گەورە، نەخۆشی چارەسەر کرد حەزرەتی محمد صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بەردەوام خەڵکی لە مەرگـی جـاهیلیەت و نەخۆشـی جەهـالەت بەردەوام چارەسـەر دەکـرد و زیندوویان دەکاتەوە بە ئیسلام و هیدایەتەکەی.

پێغەمـبەری خـوا صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خـاوەنی تایبەتمەنـدی زۆرە، لەوانە لەگەڵ هەرکەس ڕۆشتبێت پێغەمـبەر صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بـاڵای بەرزتـر بـووە، لەهەر مەجلیسـێکدا دانیشـتبێت کەس لەجەنابیـان بەرزتـر نەبووە، هەرگیز مـێش و مەگەز پێـوەی نەنیشـتۆتەوە، هەرگیـز پیسـایی و میزی نەبینراوە و یەکسەر زەوی هەڵی لوشیوە و شاردویەتیەوە، پێغەمـبەر صَلَّ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لەدواوە چاوی هەبووە و خەڵکی بینیووە، زۆرێکی تر لە سیفات و تایبەتمەندی کەلە کتێبەکانی فەرموودەدا باسکراوە.



پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ژیانی هەمووی ئاشکرا و پاداشت کراوە، هیچی شاراوەی نییە ئەم تایبەتمەندییە لە هیچ کەسێکدا نییە تەنها لە پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دا بەدی دەکرێت، چونکە پێشەواو ڕابەرە. خەڵکی دەبێت چاوی لێبکات تەنانەت چوونە لای خێزانەکانیشی پاداشت کراوە.

هۆکاری ئەو پاداشتە بۆ ئەوەیە کە ببێتە ڕێگایەک بۆ ئەوەی موسوڵمانان بەگشتی چاوی لێبکەن، کەواتە پێغەمبەر محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هیچی شاراوەی نییە.

لەهیچ شەڕێکدا نەبووە ڕابکات و خاکی شەڕ بەجێبهێڵێت، واتا لەهیچ جەنگێکدا هەڵنەهاتووە. هەرگیز خێرو خێراتی وەرنەگرتووە لەدوای خۆشی هیچی بەجێ نەهێشتووە وەکو میرات، بەڵکو میراتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەم زانستی ئیسلامەیە کە بە ئێمە گەیشتووە.

# بەندی شەشەم

پەروەردگارا تێم بگەیەنە بەڵام نیشانم مەدە کە بەبێ زاتی بەرزت چیم بەسەر دێت.

پەروەردگارا هەم تێم بگەیەنە و هەم نیشانیشم بدە کە لەگەڵ تۆ بوون بە کوێم دەگەیەنێت.



# ناو و پێناسەی پیرۆزی خوای پەروەردگار

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: خوای پەروەردگار خاوەنی ٩٩ ناوی پیرۆزە، هەرکەس لێیوردبێتەوە و ئاماری بکات و لێی تێبگات دەچێتە بەهەشت.

عن أبي هريرة رضي الله عنه أن رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قال: (إن لله تِسْعَةً، وتِسْعِينَ، اسْمًا، مِائَةً إلا واحدا مَنْ أَحْصَاهَا دخل الجنة).[٣٠]

زۆرێک لە خەڵکی و بەتایبەت زاناکان تەفسیری (أَحْصَاهَا) بە ژماردن دەکەن، واتە هەرکەس ٩٩ ناوی پیرۆزی خوای پەروەردگار لەبەر بکات دەچێتە بەهەشت، ناو و پێناسەکان بریتین لە:

**الرّحْمن**، الـرَّحيم، المَلـك، الْقُـدُّوس، السّـلَام، المُـؤْمن، الْمُهَـيْمن، الْعَزِيـز، الْجبّار، **الْمُتَكبِّر، الْخَالق**، الْبَارِئ، الْمُصَوِّر، الْغَفَّـار، الْقَهَّـار، الْوَهَّـاب، الـرَّزَّاق، **الْفَتَّاح**، الْعَليم، الْقَابِضُ، الْبَاسـطُ، الخَـافض، الرَّافـعُ، المُعـز، المُـذل، **السَّـميعُ، الْبَصير**، الْحَكم، العَدْل، اللَّطيفُ، الْخَبِيرُ، الْحَلِيمُ، الْعَظِـيمُ، **الْغَفُورُ**، الشَّـكُورُ، الْعَلِيّ، الْكَبِيرُ، **الْحَفيظُ**، المُقيت، الْحَسيبُ، الجَلِيل، الْكَرِيمُ، الرَّقيبُ، الْمُجِيبُ، الْوَاسعُ، الْحَكيمُ، **الْوَدُودُ، الْمَجِيدُ، البَاعث**، الشَّـهِيدُ، الْحَـقُّ، **الْوَكيـلُ**، الْقَـوِيّ، الْمَتِينُ، الْوَلِيّ، الْحَمِيدُ، الْـمُحْصِي، المُبْـدئ، المُعيـد، **المُحيِـي، المُميـت**، الْحَـيّ، **الْقَيُّومُ**، الواجِد، **المَاجِد**، الْوَاحدُ، **الأَحَـد**، الصَّـمَدُ، الْقَـادرُ، **الْمُقْتَـدرُ**، الْمُقَـدِّمُ، الْمُؤَخِّر، الأَوَّلُ، الْآخرُ، الظَّاهرُ، الْبَاطنُ، **الوَالِي**، الْمُتَعَال، الْبِرّ، **التَّوَّابُ**، الْمُنْتَقمُ، العَفُو، الرّؤُوفُ، **مَالِك الْمُلْك، ذُو الْجَلَالِ والْإِكرَامِ**، المُقْسِط، الْجَامعُ، الْغَنِـيّ،

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٠] متفق عليه.



المُغني، المَانِع، الضَّار، النَّافِع، النَّورُ، الْهَادِي، **الْبَدِيعُ، الباقي**، الْوَارِثُ، **الرَّشِـيد، الصَّبُور.**

له ڕاستیدا ژماردن نییه، بەڵكو ئاماره، ئەم دوو وشەیه له زمانی كـوردی و عەرەبیدا جیاوازن، عەرەب بۆ ژماردن دەڵێت: (عـدد) بـۆ ئامـار دەڵێـت: (أحْصَــاه)، جیــاوازیەكه زۆر گەورەیه، ژمــاردن به: یەک – دوو – ســێ – چوار..هتـد دەسـت پێـدەكات و تـا ئەو جێگـایەی مەبەسـته، بەڵام ئامـار دەكۆڵێتەوه له ژمارەیەک، واتا و مانای و تێگەیشتن و شیكاری بـۆ دەكـات، دەتوانێت بڵێن ئامار بریتییه له: (واتـا، تێگەیشـتن، شـیكاری، لێوردبـونەوه، قوڵ بونەوه یان قاڵ بـوونەوه، هـەروەها بـاوەڕبون بـه هـەموویان و كـار كردن بەو ماناو مەبەستانەی كـه تایبـەت نـین بـەخوای گـەورەوه و گەڕان بەدوای حیكمەت دا..هتد).

تەنانەت له هەموو وڵاتێكدا فەرمانگەیەک دانراوه به ناوی فەرمـانگەی ئامــار، هەنــدێک وڵات وەزارەتــی بــۆ دانــاوه بەنــاوی وەزارەتــی ئامــار، بەهەرحاڵ ئەوەنده دەمەوێت تۆی بەڕێز لێی تێبگەیت   ئەم فەرمـانگەیه گرنگترین بەش یاخود وەزارەته، بەشی گرنگی سـێكتەری دەوڵەته، چـونكه زانیاری هەموو تاكه كەسێک لێرەدا هەیه، كاری ئەم جێگایه بۆ ئەوه نیـیه تەنها بیانژمێرێت نا بەڵكـو دۆسـیەی تـایبەت دەكـاتەوه بـۆ هەر سـەرۆک خێزان و منداڵ و باری گوزەران و زیاتر، ئەگەر پێویست بكات لێكـۆڵینەوه لەسەر بـاری دەروونـی و مـاددی و كـۆمەڵایەتی و سیاسـی..هتد دەكـات، چونكه پەیوەسته به وەزارەتی ناوخۆ و هێڵـی ئاسـایش و پاشـان دادگـا و.. هتد.

ئەم نموونەیەی باسم كرد بۆ تێگەیشتنی تـۆی بەڕێـزه، دەبێـت بزانیـت تێگەیشتن له ناو و پێناسه پیرۆزەكانی خوای پەروەردگـار به ژمـاردن نیـیه،



بەڵکو ئاماره، واتـا هەر ناوێـک و سـیفاتێک کە مەبەسـت پێناسـەی نـاوی پیرۆزی خوایە دەبێت لێی تێبگەیت و باوەڕت پێیان قایم بێـت و شـیکاری بۆ بکەیت و بە زانستی قورئان و سوننەت لێی تێبگەیت.

بۆ ئەوەی تۆی بەڕێز لەوە باش تێبگەیت، خـوای پەروەردگـار خـاوەنی تەنها ئەم ٩٩ ناوە نییە، بەڵکـو خـاوەنی هەزارەهـا نـاو و سـیفاتی پـاک و پیرۆزە، زانایان ئەفەرموون ناوەکان لەبەر زۆرییان لەژمارە نایەن، بەشـێکی لە قورئان و سوننەت داهاتووە، بەشێکی تر زانایان بۆیـان بـاس کـردووین، بەشی زۆری لایەقە بەخوای پەروەردگار وەکو شێخ ئیسـلام ئیبنـو تەیمیـیە دەفەرمووێت: هەر ناو و سیفاتێک جوان بوو لایەقە بەخوای پەروەردگار.

## چۆن سیفات و ناوی خوا بناسین؟!

گومان لەوەدا نییە لە هەموو زانینێکی بیروباوەڕ (عقیـدە) لە هەمـبەر خوا و دین و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ و قورئـان دەبێـت ڕەچـاوی یەکتاپەرستی بکرێت (تەوحید)، یەکتاپەرستی لە ناو و سیفاتە پیرۆزەکـانی خوای گەورە مەرجە بۆ ناسینی.

خۆی لە ڕاستیدا هەموو پێغەمبەران و ئایینی ئیسـلام بـۆ ئەوە هـاتووە کە خەڵکی فێری تەوحید بکات، بـۆ نمـوونە دەڵێـین: (بِسْـمِ اللَّـهِ الـرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) واتە: بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. واتای تەوحیدە، (الْحَمْدُ للّـهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ) واتە: سـوپاس و سـتایش بـۆ خـودای پـەروەردگاری جیهانەکان., هەموو وشەکان هەرواتای تەوحیدە، (الـرَّحْمنِ الـرَّحِيمِ) واتە: بەخشندەی میهرەبانە. هەر واتای یەکتاپەرستییە، (مَالِكِ يَوْمِ الـدِّينِ) واتە: خاوەن و سەرداری ڕۆژی سزاو پاداشـت و قیامەتـە، بەهەمـان شـێوە هەر



یەکتاپەرستییە، (إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ) خوایە تەنیا هەر تۆ دەپەرستین و تەنها داوای یارمەتی هەر لە تۆ دەکەین. هەر یەکتا پەرستییە.. هتد.

بەڵام ئەم یەکتاپەرستییە پێویستی بە ناسینی ناوە پیرۆز و سیفاتە بەرزەکانی پەروەردگارە بە پێوەرێک کە زاتی پاکی دەیەوێت، واتا سەرەتا ناسینی تەوحیدە پاشان زانینی و ناسینی سیفات و ناوەکانی پەروەردگارە، پاشان پێوەرێک هەیە بۆ ئەوەی جیهان بینینی مرۆڤ دروست بکات لە ڕێگای تەوحیدی ناو و سفاتی خوای گەورەوە، ئەویش بریتییە لەوەی ئەو زاتە لە هیچ دروستکراوێک ناچێت وەک خوای پەروەدگار دەفەرمووێت:

﴿.. لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ ..﴿١١﴾﴾ الشوری. هیچ شتێک نییە لە وێنەی ئەو زاتە، هیچ شتێک لەو ناچێت (چونکە خوایە و بەدیهێنەرە، چۆن لە بەدیهێنراوەکانی دەچێت).

## هیچ شتێک لە زاتی الله ناچێت

لە پێشتردا ئاماژەیەکی کورتمان بەم باسە داوە لێرەدا ئەوەی گرنگە باسی بکەین زاتی پیرۆزی پەروەردگار لە هیچ شتێک ناچێت و سیفات و پێناسەی بە هیچ مەخلوقێکی ناشێت و لێک ناچێت، هەروەها هیچ کردارێکی زاتی خوای پەروەردگار لە هیچ دروستکراوێکی ناچێت.

سەرەتا دەبێت بزانین ئەوەی پێیدەوترێت (شت) واتا لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت (شئ) واتا دروست کراوی خوای پەروەردگار، بەڵام بۆ تێگەیشتنی ئێمەی مرۆڤ هەندێک وشە بەکار دەهێنین و هەندێک تێز دەخەینە ڕوو تەنها بۆ تێگەیشتنە لە ناو و سیفاتی پەروەردگار تەنانەت وشەکانیش مەخلوقی خوای پەروەردگارن، بۆ ئەوەیە نزیکمان بکەنەوە لە ناسینی پەروەردگار.

ئەوی کە بۆمان باس کراوە لە قورئاندا بـۆ تێگەیشـتن و ئەقڵـی ئـێمەی مرۆڤە دەنا خوای پەروەردگار پاک و بـێگەردە لەوەی ئەقـڵ و تێگەیشـتنی ئێمە بتوانێت وێنای بکات.

وێناکردنی هەرشتێک لە مێشک و ئەقـڵ و تێگەیشـتنی مـرۆڤ ناگـاتە ئەوەی بڵێین ئەوە سیفاتە وەکو (السميع، البصير) وەکـو بینـین و بیسـتنی ئێمەی مرۆڤە یاخود هەر دروست کراوێکی تر، بەڵام دەشێت لە وشـەکەدا هاوبەشی هەبێت، بەڵام حاشا بینینی خوا و بینینـی مـرۆڤ بەیەک پێـوەر ناکرێت، یاخود بیستنی مرۆڤ و خوای پەروەردگار بە یەک ناچوێنرێت.

خۆی دەفەرمووێت:

﴿.. لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞۖ ..﴿١١﴾﴾ واتە: هیچ شتێک نییە لە وێنەی ئەو زاتە. ئەمەش ڕەد دانەوەی ئەوانەیە کە دەیانەوێت خودا بە مەخلوق بشوبهێنن، پاشان دەفەرمووێت: ﴿..وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ..﴿١١﴾﴾ واتە: لەهەمان کاتدا زاتێکی بیسەرو بینایە. لەهەمان کاتدا ڕەد دانەوەی ئەو جۆرە بۆچوونانەیە کە زاتی پەروەردگار دوور دەخەنەوە لە توانای بیستن و بینین کە ناسراون بە (المعطلة).

دەڵێین ئەو پێناسەو وەسـفەی خـوای گـەورە بـۆ خـۆی کـردووە، وەکـو خۆی وەریدەگرین و ئەوە لایەقە بە پەروەردگار. بەڵام مرۆڤ هاوبەشە لە هەندێک سیفات و پێناسەدا، بۆ خوای پەروەردگار ڕەهایە، بەڵام بۆ مرۆڤ سنوردارە.

بینـین و بیسـتنی مـرۆڤ سـنوردارە و تـا ڕادەیەک توانـای ئەو دوو سیفاتەی هەیە لە ڕێگای چاو و گوێ وە، بەڵام بۆ زاتـی پـاکی پەروەردگـار ناتوانین جێگا و شـوێنی بیسـتنی بـۆ دیـاری بکەیـن و سـنورداری بکەیـن،



بەڵکو ڕەهـایەو ئەو زاتە دەبینێـت هەمـوو شـتێک و دەبیسـتێت هەمـوو دەنگێک.

نموونەی سیفاتە هاوبەشەکانی مـرۆڤ تـایبەتە بە مـرۆڤ و سـنوردارە، بەهەمـان شـێوە خـوای گەورە خـاوەنیەتی و بـۆ خـۆی زاتـی ڕەهـایە و هاوشێوەی نییە، بۆ نموونە خوای پەروەردگار لە سورەتی الـذاريات ئـایەتی ٢٨دا دەفەرمووێت:

﴿فَأَوۡجَسَ مِنۡهُمۡ خِيفَةٗۖ قَالُواْ لَا تَخَفۡۖ وَبَشَّرُوهُ بِغُلَٰمٍ عَلِيمٖ ٢٨﴾ الذاريات. ئیبراهیم ترسێکی لێنیشت (چونکە وای زانی شتێکیان لەژێر سەردایە) بۆیە خێرا وتیان: مەترسە (ئێمە فریشتەین)، مژدەشیان پێدا کە خوا منداڵێکی زانایان پێ دەبەخشێت (کە ئیسحاقە).

هەروەها لە سورەتی الصافات ئایەتی ١٠١ دەفەرمووێت:

﴿فَبَشَّرۡنَٰهُ بِغُلَٰمٍ حَلِيمٖ ١٠١﴾ الصافات. ئێمەش مژدەی منداڵێکی حەلیم و خۆگرو (ژیرمان) پێ بەخشی کە (ئیسماعیل)ە

لە سورەتی التوبة ئایەتی ١٢٨دا دەفەرمووێت:

﴿لَقَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولٞ مِّنۡ أَنفُسِكُمۡ عَزِيزٌ عَلَيۡهِ مَا عَنِتُّمۡ حَرِيصٌ عَلَيۡكُم بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ رَءُوفٞ رَّحِيمٞ ١٢٨﴾ التوبة. (ئەی خەڵکینە) سوێند بە خوا بێگومان پێغەمبەرێکتان بۆ ڕەوانە کراوە کە هەر یەکێکە لە خۆتان، زۆر سەختە بەلایەوە تووش بوونتان بە بەڵاو ناخۆشی، زۆر بەتەنگیشتانەوەیە و پەرۆشە لەسەرتان، زۆر دڵسۆزی ئیماندارانە و میهرەبان و دلۆڤانە بۆیان.

لە سورەتی الإنسان ئایەتی ٢دا هاتووە:

﴿إِنَّا خَلَقْنَا ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ أَمْشَاجٍ نَّبْتَلِيهِ فَجَعَلْنَٰهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴿٢﴾﴾ الإنسان. (پاشان) ئێمە ئینسانمان دروست کرد لە تێکەڵەیەک (لە سەرەمێکوتەیەکی بچوک و هێلکۆکەیەک) ئینجا دەسگای بیستن و بینینمان پێبەخشی.

سورەتی یوسف ئایەتی ٥١.

﴿قَالَ مَا خَطْبُكُنَّ إِذْ رَٰوَدتُّنَّ يُوسُفَ عَن نَّفْسِهِۦ ۚ قُلْنَ حَٰشَ لِلَّهِ مَا عَلِمْنَا عَلَيْهِ مِن سُوٓءٍ ۚ قَالَتِ ٱمْرَأَتُ ٱلْعَزِيزِ ٱلْـَٰٔنَ حَصْحَصَ ٱلْحَقُّ أَنَا۠ رَٰوَدتُّهُۥ عَن نَّفْسِهِۦ وَإِنَّهُۥ لَمِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ﴿٥١﴾﴾ یوسف. (پاشان هەموو ئەو ئافرەتانەی کۆ کردەوەو پێی وتن): ئەو ڕووداوە چی بوو، چی پێش هاتبوو کەوا ئێوە ویستتان یوسف لە خشتە بەرن (ئایا ئەو هیچ تاوانێکی هەبوو؟)، هەموو وتیان: پەنا بەخوا (ئێمە بوختانی بۆ بکەین) ئێمە هیچ جۆرە هەڵەو ناشرینییەکمان لێ نەدیووە، (شاژنیش) وتی: ئێستا ئیتر حەق ڕوون و ئاشکرایەو (دەبێ دان بەڕاستیدا بنێم)، خەتای من بوو دەمویست لە خشتەی بەرم، یوسف ڕاست دەکاو (پاک و بێتاوانە).

سورەتی الکهف ئایەتی ٧٩.

﴿أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا﴿٧٩﴾﴾ الکهف. (یەکەم) ئەو کەشتیەی (کە عەیبدارم کرد، خاوەنی) چەند هەژارێکە لە دەریادا کاردەکەن، جا بۆیە ویستم عەیبداری بکەم چونکە لە پشتیانەوە پاشایەک هەبوو کە هەموو کەشتیەکی (چاک و ڕێکوپێکی) داگیر دەکرد.

سورەتی السجدة ئایەتی ١٨



﴿أَفَمَن كَانَ مُؤۡمِنٗا كَمَن كَانَ فَاسِقٗاۚ لَّا يَسۡتَوُۥنَ ١٨﴾ السجدة. ئايا ئەو کەسەی ئیمانداره وەک ئەو کەسەیە کە تاوانبارو بێدینییە؟ بێگومان هەرگیز چونییەک نین.

سورەتی غافر ئایەتی ٣٥

﴿ٱلَّذِينَ يُجَٰدِلُونَ فِيٓ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ بِغَيۡرِ سُلۡطَٰنٍ أَتَىٰهُمۡۖ كَبُرَ مَقۡتًا عِندَ ٱللَّهِ وَعِندَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْۚ كَذَٰلِكَ يَطۡبَعُ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ قَلۡبِ مُتَكَبِّرٖ جَبَّارٖ ٣٥﴾ غافر. ئەو کەسانەی کە (مجادله)و گفتوگۆ دەکەن دەربارەی ئایەت و بەڵگەو نیشانەکانی خوا، بێ ئەوەی هیچ زانست و زانیارییەکیان هەبێت و پێیان بەخشرابێت، (ئەم حاڵەتە) زۆر بێزراوو تاوانە لای خواو لای ئەوانەش کە ئیمانیان هێناوە، هەر بەو شێوەیە خوا مۆر دەنێت بەسەر هەموو (خاوەن) دڵێکی فیزاوی و ڕق ئەستوورو ستەمکاردا.

ئەم ناو و سیفەتانە وەکو علیم و حلیم و ڕەؤف و رحیم و ملک و هتد پێوەر ناکرێت بە ناو و سیفاتی خوای پەروەردگار، خوا سیفەتی ڕەهایە و مرۆڤیش سنوردارە، ئاخر علمی خودا لە کوێ و علمی خەڵک لە کوێ؟.

خوای پەروەردگار لە سورەتی البقرة دا ئایەتی ٢٥٥دەفەرمووێت:

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ مَن ذَا ٱلَّذِي يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦۚ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيۡءٖ مِّنۡ عِلۡمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَۚ وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٢٥٥﴾ البقرة. خوا زاتێکە جگە لەو خوایەکی تر نییە، ئەو هەمیشە زیندووەو چاودێرو ئاگادارە (بەسەر هەموو دروستکراوانیدا)، ئەو نە وەنەوز

دەیباتەوەو نە خەو زۆری پێ دێنێت، هەرچی لە ئاسمان و زەوی دا هەیە ئەو زاتە خاوەنیانە، کێ هەیە تکا کار بێ لەلای ئەو، مەگەر خۆی مۆڵەتی دابێت، دەشزانێت چی لە ئێستاو داهاتوو ڕابردوودا ڕووی داوەو ڕوودەدات، دروستراوانی  هیچ زانست و زانیارییان نییە، دەربارەی زانیاری و زانستەکانی ئەو، مەگەر بەوەی کە خۆی بیەوێت فەرماندەیی و فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە، پاراستنیان بەلای ئەوەوە هیچ گران نییە و ئەو خوایە بەرزو بڵند و فراوان و گەورەیە.

یاخود خوای پەروەردگار لە سورەتی ئایەتی ١٥دا دەفەرموویێت:

﴿فَأَمَّا عَادٌ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَقَالُواْ مَنۡ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةًۖ أَوَلَمۡ يَرَوۡاْ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِي خَلَقَهُمۡ هُوَ أَشَدُّ مِنۡهُمۡ قُوَّةٗۖ وَكَانُواْ بِـَٔايَٰتِنَا يَجۡحَدُونَ ١٥﴾ فصلت. ئەوسا قەومی عاد خۆیان بەزل و گەورە زانی و فیزیان بە ناحەق کرد بە سەر زەویدا وتیان: کێ هەیە بە ئەندازەی ئێمە هێزو دەسەڵاتی هەبێت؟ باشە. ئایا ئەوە نەیان دەبینی ئەو خوایەی کە دروستی کردوون، ئەو لەوان هێزی زۆر زیاترە (بەڵکو هەر بەراورد ناکرێت) و ئەوانە هەر ئینکاری ئایەت و (معجزة)کانی ئێمەیان دەکرد.

گرنگی ئەم باسە لەوەدایە کە ئەوەی تۆ لە مێشکتا وێنای دەکەیت جا هەرچی بێت، خوای پەروەردگار لەوەناچێت، ئەوەی تۆ بە خەیاڵت دێت لە زاتی پاکی ئەو ناچێت و دەبێت ئەم بۆچوونەت بۆ دروست بێت کە مێشکی مرۆڤ وێنای شتێک دەکات کەوا بینیوویەتی، بۆ نموونە کە دەڵێن ئامێری تەلەفۆن یان تەلەفزیۆن، یاخود سەیارە یان بەرد، دار، مرۆڤ یان هەرچی شت هەیە، پێشتر وێنەو ڕەسمی لە مێشکتا کێشراوە، بۆیە خێرا مێشکت پەی پێدەبات.

بەڵام کە دەڵێین خوای پەروەردگار لە هیچ شتێک ناچێت ناتوانێت وێنای بۆ دابتاشێت لە مێشکتدا، خۆ ئەگەر پەنا بەخوا ئەو کارەت ئەنجام داو وێنەت بۆ دروست کرد، ئەوا وەکو موشریک پەیکەرت بۆ داتاشێوە یان وەکو هندۆسەکان وێنەت بۆ کێشاوە، یان وەکو نەسارا و مەسیحییەکان شێوەت داوەتێ، پەنا بەخوا هەمووی کوفرە و سەرلێ شێواوییە.

تەنانەت کاتێک پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ هات عەرەب هەندێک شت هەبوو نەیاندەزانی تا خوای پەروەردگار بە هەندێک وشە بۆی وێنا کردن و پێغەمبەری صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ فێرکرد، تاکو ئەوانیش فێربکات.

بۆ نموونە هەندێک وشە هەبوو عەرەب بۆ مانایەکی تایبەت بەکاری دەهێنا، بەڵام ئیسلام وێنای بۆ کردن بۆ تێگەیشتن, بەڵام لەیەکتر نەدەچوون نموونەی:

(الكفْر) عەرەب وشەی کوفری بەکاردەهێنا بۆ کاتێک کە جوتیار زەوی دەکێڵێت، یان بەمانای پەردەو جیاکردنەوەی دوو شت لە یەکتری بەکاریان دەهێنا، یاخود وشەی نوێژ، یان وشەی ڕۆژو، یان زەکات هەموو ئەم وشانە مانای تری هەبوو، ئیسلام هات بەکاری هێنا بەرگی ئایینی ئیسلامی کرد بەبەریدا.

عەرەب وشەی شەیتانی بەکاردەهێنا، بەڵام نەک بۆ ئیبلیس بەڵکو زیاتر بۆ ئافرەت و شتی ترسناک کە ئاسایشی خەڵکی بخاتە مەترسی یان وشەی ئیمان - یاخود بەهەشت، بۆ نموونە بەهەشت لە زمانی عەرەبی واتە (جنة) بە مانای باخ و باخات دێت، بەڵام بەهەشتی خوا ناشوبهێنرێت بە باخ و باخاتی سەر زەوی، وشەکە تەنها هاوبەشە بۆ تێگەیشتن، بەهەشتی



خوایی پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت نە چـاو بینیـویەتی، نە خەیاڵ وێنای کردووە.

ئیتر مـرۆڤ ناتوانێـت وێنـای بکـات، هەرچۆنێـک بیـری لـێ بکەیـتەوە خەیـاڵ و فەنتازیـای بـۆ بەکاربهێنیــت، لەوەناچێــت لەبەر ئەوەی چـاو، مێشــک، گــوێ نە بینیــوییەتی نە بیســتویەتی، هەواڵەکە هــاتووە بۆمــان شوبهاندنمان بەو باخ و باخاتەیە کە لەم ژیانەو لەم زەویەدا بینیومانە.

کەواتە ڕاستە وشەی هاوبەش لە نێوان سیفات و نـاوی پیـرۆزی خـوای پەروەردگاردا هەیە لە مەخلوقاتیدا، تەنها لە وشـەکان لە یەک چـونن نەک چۆنیەتی وشەکان لە ڕووی واقیع و کردار و پێناسەوە.

هەروەک ئیمامی بەڕێز ڕەبیعەی کوڕی ئەبی عەبـدولڕەحمان دەڵێـت: خەڵکـی لەبەردەم زانایانـدا وەکـو منـداڵ وان لەبەردەم باوکیانـدا، زانایـان وەکو منداڵ وان لە بەردەم پێغەمبەراندا.

کەواتە بۆ ئەوەی لەم باسە بەجوانی تێبگەیت پێویستت بە سێ خـاڵی گرنگ هەیە:

یەکەم: دەرکی تۆی مرۆڤ بەواتای حاسەکانت بۆ ٦ حاسەکەت.

دووەم: دەرکــی تــۆی مــرۆڤ بەواتــای ئەقڵــی تــا ماناکــان بەگشــتی تێبگەیت.

سێیەم: پێناسەی دەربڕین کە شیکاریت بۆ بکات لە واتای حاسـەکان و ئەقڵیەکان.

بەم سێ پێوەرە دەتوانیت نێوانی خالق و مەخلوق جیا بکەیتەوە.



دەزانم تا ڕادەیەکی زۆر بۆتۆی بەڕێز ئەم باسە قورسە، بەڵام لەگەڵم بەردەوامبە بە پشتیوانی خوای پەروەردگار تێدەگەیت، مەڵێ قورسە و تێناگەم هەوڵبدە، پرسیاری زیاتری لەسەر بکەو خۆت ماندوو بکە، زیاتر تێدەگەیت، منیش هەوڵئەدەم زیاتر ڕوونی بکەمەوە، وەکو ئەوانە مەبە شت لەسەر خۆیان قورس دەکەن، گەش بین بە خوای گەورە بۆت ئاسان دەکات، بەڵام خۆ ئەگەر بڕیار بدەیت کە قورسەو لێی تێناگەیت، دڵنیا بە خوای گەورە زیاتر قورسی دەکات لەسەرت، بەبەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ کە دەفەرمووێت: عن أنس بن مالک ("لا تشددوا على أنفسكم يشدد الله عليكم؛ فإن قومًا شددوا على أنفسهم فشدد الله عليهم؛ فتلك بقاياهم في الصوامع والديارات: رهبانية ابتدعوها ما كتبناها عليهم").[31]

واتە: قورسی مەکەن لەسەر خۆتان باخوا قورسی نەکات لەسەرتان، پێشتر خەڵکانێک زۆر قورسیان کرد لەسەرخۆیان خوای گەورە لەسەری قورس کردن، هەندێکیان چونە زنج و کوخ و چیاکان و هەندێکیش بوون بە ڕاهیب و قەلەندەر کە خۆیان بۆخۆیان دروستیان کرد و فەرمانی ئێمە نەبوو.

مەبەستم بەگشتی لەسەر ئەوەیە ئەم باسە لە ڕاستیدا قورسە، سادە نییە من بۆخۆشم ترسم لە نووسین ی هەبوو، بەڵام کەسەرچاوەکانم پشکنی و چاوم بە هەموویاندا خشاند، لێرەدا بۆ تۆی بەڕێزم کردوە بە پار و بابۆڵە بۆ ئەوەی با ئاسانی قوتی بدەیت، بڕۆینە ناو پێناسەو سیفاتێکی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[31] رواه أبو داود.

تـری گشـتی بـۆ کـردن بەپێـوەر بـۆ تێگەیشـتن لە هەمـوو نـاو و سـیفاتە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار.

## هیچ شتێک بەربەست و ڕێگر نییە لە زاتی پەروەردگار

خاوەنی کەماڵ و ڕەهاییە لەوەی دەیەوێت زاتی پاکی ئەنجامی بدات، زاتی پاکی توانا و هێزی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە ماندوو نابێت و بێزار نابێـت هەرگیـز، خـوای موتەعـال لەوەسـف و پێناسـەی زاتـی پـاکی دەفەرمووێت لە سورەتی البقرةدا ئایەتی ٢٠:

﴿.. إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ۝٢٠﴾ البقرة. بەڕاستی خوا دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

هەروەهـا خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی الکهـف ئـایەتی ٤٥ دەفەرمووێت:

﴿.. وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقْتَدِرًا ۝٤٥﴾ الكهف. خوای گەورە هەمیشەو بەردەوام دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە

و هەروەهـا خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی فـاطر ئـایەتی ٤٤ دەفەرمووێت:

﴿.. وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيُعْجِزَهُۥ مِن شَىْءٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ عَلِيمًا قَدِيرًا ۝٤٤﴾ فاطر. وەنەبێ خوا هیچ شتێکی لەدەست دەربچێت لە ئاسمانەکان، یان لە زەویدا، چونکە بەڕاستیی ئەو زاتە زۆر زانایەو زۆریش بەدەسەڵات و بە توانایە.

لە سورەتی البقرة ئایەتی ٢٥٥ دەفەرمووێت:



﴿.. وَسِعَ كُرۡسِيُّهُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَۖ وَلَا يَـُٔودُهُۥ حِفۡظُهُمَاۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيُّ ٱلۡعَظِيمُ ٢٥٥﴾ البقرة. فەرماندەیی و فەرمانڕەوایی و دەسەڵاتی ئەو زاتە هەموو ئاسمانەکان و زەوی گرتۆتەوە، پاراستنیان بەلای ئەوەوە هیچ گران نییە، ئەو خوایە بەرزو بڵند و فراوان و گەورەیە. لە ڕاستیدا مانای کورسی لای زانایان هەر ئەوە نییە کە وترا، بەڵکو مانای تری هەیە وەک ئەوەی ئەفەرموون کورسی بریتییە لەعەرش..هتد ئەمەش جێی جیاوازییەکی فراوانە.

خـوای پەروەردگـار ڕەهـایە لە توانـا و هێـز و دەسـەڵاتی، هـیچ پێچەوانەیەک نیـیە بـۆ ڕەهـابوونی، هـیچ شـتێک توانـای دژ بـوونی نیـیە بەرامبەر زاتی پەروەردگاری باڵا دەست (سبحانه وتعالى)

هەرگیـز پەروەردگـار زوڵـم ناکـات و بە کـاردانەوە و ڕق کـار ناکـات و مانـدوویەتی و وەنەوز نایبـاتەوە، هەرگیـز ناخەوێـت، زینـدووە بە هەمیشەیی و هیچ چاو و ئەقڵ و هۆشێک پەی پـێ نابـات و دادپەروەرە، ئەوەی بیەوێت دەیکات و پێویستی بەکات و زەمەن نییە و کات و زەمەن مەخلوقی خوای پەروەردگارن.

لەم بارەوە لە پێناسەو وەسفی خۆیدا (سبحانه وتعالى) دەفەرمووێت:

﴿.. وَلَا يَظۡلِمُ رَبُّكَ أَحَدٗا ٤٩﴾ الكهف. بێگومان پەروەردگاری تۆ ستەم لە هیچ کەس ناکات

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێت لە سورەتی سبأ ئایەتی ٣:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَأۡتِينَا ٱلسَّاعَةُۖ قُلۡ بَلَىٰ وَرَبِّي لَتَأۡتِيَنَّكُمۡ عَٰلِمِ ٱلۡغَيۡبِۖ لَا يَعۡزُبُ عَنۡهُ مِثۡقَالُ ذَرَّةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَآ أَصۡغَرُ مِن ذَٰلِكَ وَلَآ أَكۡبَرُ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٣﴾ سبأ. ئەوانەی کافرو

حەقپۆشن دەڵێن: قیامەت هەر نایەت و نامانگاتێ، (ئەی پێغەمبەر ﷺ) پێیان بڵێ: (وانییە) ئەرێ!! سوێند بە پەروەردگارم هەر یەخەتان دەگرێت (چونکە ئەو زاتە) زانایە بە نهێنی و شاراوەکان و (هەر خۆی دەزانێ کەی بەرپای دەکات)، بەقەدەر ئەتۆمێک-زەڕەیەک لە ئاسمانەکان و زەویدا ناتوانێت لەو پەنهان بێت، وە لەوەش بچووکتر بێت یان گەورەتر (چونکە هەموو شتێک) لە کتێبی تایبەتیدا (لوح المحفوظ)دا ڕوون و ئاشکرایە کە وەک دەسگایەکی کۆمپیوتەری وایە،لەگەڵ جیاوازی بێسنووری نێوانیان، هەموو شتێک لەوێ تۆمارە.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿.. لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ ..﴾ البقرة. ئەو نە وەنەوز دەیباتەوەو نە خەو زۆری پێ دێنێت

هەروەهـا خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی الأنعـام ئـایەتی ١٠٣ دەفەرمووێت:

﴿لَّا تُدۡرِكُهُ ٱلۡأَبۡصَٰرُ وَهُوَ يُدۡرِكُ ٱلۡأَبۡصَٰرَۖ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ﴾ الأنعام. دەزگای بینایی و (بۆچوونی ئادەمیزاد) ناتوانێت ئەو زاتە ببینێت، زانیاری ئەو خوایە هەموو شتێکی گرتۆتەوە، ئاگاداریشە بە هەموو دەسگاکانی بینایی، ئەو زاتە بە لوتف و بە کارو ئاگایە.

هەموو ئامانەی بۆ تۆی بەڕێزم باس کـرد دەلالەتە لەسـەر گەورەیـی و عەضەمەت و کیبریائی خوای پەروەردگار.

لە قورئاندا سیفات و پێناسەی خوای پەروەردگـار بەگشـتی زاتـی پـاکی پێناسـەی خـۆی بـۆ کـردووین، ئەوەی کە دەفەرمووێـت بـڕواو یەقـین و دڵنیاییـان لەسـەری دەبێـت هەبێـت، ئەوەش مانـای بڕوابـوون بە



پەروەردگارە، وەکو ئەوەی باسکراوە ئیتر ناکرێت لەم بوارەدا (بۆ ناسینی زاتی خودا و ناوو سیفەتەکانی) ئەقڵ و فیکر و فەلسەفە و ئەم جۆرە زانستانە بەکاربهێنێت، مادامێک ئەو عەقڵە سنووری خۆی ڕەچاو نەکات، چونکە هیچ ئەنجامێک نادات بەخاوەنەکەی نە بە غەیری ئەویش، تەنها دەچێتە بواری کوفر و فاسقی و ئیلحاد و بێ ئەدەبی بەرامبەر بەخوای پەروەردگار.

چ پێویست دەکات وەکو موعتەزیلە بڵێین خوای پەروەردگار، لاشەی نییە، سێبەری نییە، شێوەی وێناکراوی نییە، گۆشتی نییە، خوێنی نییە، کەس نییە، ناوەڕۆک نییە، پانتایی نییە، ڕەنگی نییە، بۆنی نییە، تامی نییە، ناگیرێت، گەرمای نییە، سەرمای نییە، شێی نییە، ناپێورێت، بەرزی نییە، درێژی نییە، قوڵی نییە، کۆنابێتەوە و جیانابێتەوە، ناجوڵێت و لاو لایەنی نییە، خاوەن ڕاست و چەپ نییە، دواو پێشی نییە، سەرو ژێری نییە، هیچ چواردەوری نەداوە، جێگا و مەکانی نییە، کات و زەمەن بەسەریدا تێپەڕ نابێت، زۆری تر لەم وتە بێمانا و بێ ئەدەبییانە دەکرێت دەرحەق بە پەروەردگار، کە لە ڕاستیدا نەفی ئیسپاتی وجودی خوای پەروەردگارە، لە ڕێی لێدان لە ناوو سیفاتەکان ئەگەر نیازیشیان نەبێت، گرنگ وتەکان و سووربونیانە لەسەر سنوورشکاندنی شەریعەت و عەقڵی پاپەند.

بۆ تێگەیشتن لەم باسە بۆ ئەوەی بزانرێت ئەم جۆرە قسانە دەچێتە بواری بێ ئەدەبی کردن بەرامبەر بە خوای پەروەردگار، بۆ نموونە:

ئەگەر کەسێک بە سەرۆکی وڵاتێک، یان پادشاو مەلیکێک بڵێت تۆ لە پینەچی ناچیت و لەو کەسانە ناچیت کە خۆڵی ماڵان فڕێ ئەدەن و لەوانە ناچیت کە شاگردی چێشتخانەن و.. هتد، ئەم قسەیە بێ ڕێزییە بە پادشا



یان سەرۆک، ئەگەر بوترێت تۆ لە هیچ کام لە ژێر دەستەکانت ناچیت لەم مەملەکەتەدا، ئەمەیان دروستتر و بە ئەدەبانە ترە.

کورت و پوخت سیفات و پێناسەی خوا کامڵ و ڕەهایە، مرۆڤ بە سروشتی خۆی ناتەواوە و ناتوانێت پەی بەرێت بە سیفات و ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگار، تەنها ئەوەندە بۆئێمە بەسە کە وەسفی بکەین بەوەی خوای پەروەردگار وەسفی خۆی کردووە، تەنانەت پێغەمبەرانیش ناتوانن بێجگە ئەوە وەسف و پێناسەیەی خوای موتەعال بۆخۆی کردووە زیاد و کەمی بکەن، هەروەکو خۆی باسی دەکات، پێغەمبەری ڕاستگۆ و ئیمامی پێغەمبەران محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لەکاتی دوعای نارەحەتی و ناسۆریدا دەفەرموویت:

(اللهمّ إني أسألُک بکلِّ اسمٍ هو لک سميتَ به نفسَک أو أنزلتَه في کتابِک أو علمته أحدًا من خلقِک أو استأثرت به في علمِ الغيبِ عندک, أن تجعلَ القرآنَ العظيمَ ربيعَ قلبي ونورَ صدري وجلاءَ حزني وذهابَ همّي وغمّي).[٣٢]

واتە: خوای پەروەردگار داوات لێ دەکەم بە هەموو ناوێک کە زاتی پاکت لەخۆتت ناوە و وەسفی زاتی پەروەردگارە، یاخود ناردوتە لە کتێبەکانتا بۆ بەندەکانت، یان بەتایبەت یەکێک لە بەندەکانت فێرکردووە لەو سیفات و ناوە پیرۆزانە، یان نهێنیەو کەس پەی پێنەبردووە تا ئێستا، لە زانستی غەیبیدایەو کەس نایزانێت، پەروەردگارا ئەم قورئانە بکە بەهاری

---

[٣٢] رواه ئەحمەد و أَخْرَجَهُ الألباني في الأحاديث الصحيحة.



دڵم و نور و ڕۆشنایی سینەم و لابردنی غەم و پەژارە و ببێتە هۆکاری توانەوەی ناسۆر و ناڕەحەتیم.

لێرەدا بەتەواوەتی ئەوەش دەردەکەوێت پێغەمبەر ﷺ سیفات و ناوە پیرۆزەکانی خوای تەنها بەوە پێناسەکردوە کە خوای موتەعال داویەتە پەنای خوودی خۆی و بێ (تەشبیهو تەئویلو تەعطیل و تەجسیم) واتا ناکرێت هاوشێوەی هیچ شتێک بێت و یان بە ئەقڵ مانای بۆ بدۆزیتەوە لە بنەڕەتی خۆی دەری بکەیت (تجرید) بکرێت، و یان نەفی ناوو سیفاتی بکرێت و یاخود لاشەدار بکرێت وەکو لاشەی مەخلوق، ئەمەش بەکورتی مانای ئەوەیە کە خوای گەورە لە هیچ شتێک ناچێت و هیچ ڕێگر نییە لە ئەنجامدانی هەرکارێک بیەوێت، لەبەر ئەوەی تەنها و تەنها خوودی زاتی پاکی خودایە.

## هیچ خوایەک نییە بێجگە زاتی پاکی الله

هەموو پێغەمبەران لە ئادەمەوە هەتاکو خاتەم محمد ﷺ بۆ وشەی یەکتاپەرستی هاتوون، لێرەدا مەبەست لەبەشی ناو، سیفاتە پیرۆزەکان بەو واتاو مانایە باسی دەکەم وجودی خواکان زۆرن لەسەر زەوی دەپەرسترێت، لێرەدا دەڵێن هیچ خوایەکی دەستکردی مرۆڤەکان و ئایینەکان پێوەر ناکرێت بە ناو و سیفاتی خوای پەروەردگار.

کەواتە لە ڕووی زانینی ئوصول و عقیدە، دەڵێن لەم کەونەدا یان لەم بونەدا هیچ خوایەک نییە، خاوەنی ناوو سیفاتی پیرۆزی خوای پەروەردگار



بێت وشەی (الله) زانراوە و لەفزی گەورەی و جەلالەتی خوای پەروەدگارە، خۆی خاوەنی هەموو تواناو دەسەڵاتێکی ڕەهایە.

لەوانەیە تۆی بەڕێز بڵێیت پێشتر باسکراوە، یەکتاپەرستی و تەوحید چییە لێرەدا زیادەیە باسەکە!

لە ڕاستیدا بەشێک لە بۆچونەکە ڕاستە، بەشەکەی تری لێرەدا تەواوکەری باسەکانی ڕابوردووە،

لەبەر ئەوەی زۆرێک لە ئایینە دەستکردەکان و دەستکاری کراوەکان هەریەکەیان بڕوایان بە وجودی خوایەک هەیە لە ئاسماندا، بەڵام دەسەڵاتی ئەو خوایان لەگەڵ هاوبەشەکاندا دابەش کردووە بۆ نموونە ئایینی مەسیحی یاخود نەسارا ئەوان عیسای کوڕی مەریەم بەخوا دەزانن یان بوذایەکان، یاخود کرشنایەکان، تەنانەت ئەوانەشی بڕوایان بە وجودی (کارما) هەیە پەنا بەخوا سیفاتی خوایەتی پێ دەبەخشن، خوای پەروەردگار لە سورەتی البقرة ئایەتی ١٦٣دەفەرموویێت:

﴿وَإِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ١٦٣﴾ البقرة.
خوای ئێوە خوایەکی تاک و تەنهایە، وە جگە لەو زاتە خوایەکی تر نییە، وە ئەو خوایە بەخشندەو میهرەبان و بەبەزەیی یە. یاخود: ﴿ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ﴾ جا بەدوایدا سیفات و ناوە پیرۆزەکان دێت وەکو ﴿ ٱلرَّحۡمَٰنُ ٱلرَّحِيمُ ﴾ یان ﴿الْحَيُّ الْقَيُّومُ﴾.. هتد



## خوای موتەعال هەر هەربووە و سەرەتایە هەمیشەییە، بێ کۆتاییە

ئەم باسە واتای هەر هەبووە، بێ سەرەتا بەمانای ئەولەویەتەو هەمیشەییە، بێ کۆتایی واتا زاتی پاکی ئەخیرە، خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿هُوَ ٱلۡأَوَّلُ وَٱلۡأٓخِرُ ... ٣﴾ [الحديد] ئەو خوایە یەکەمینەو کەس پێش ئەو نەبووە، دواهەمینەو، کەس دوای ئەو نامێنێت

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

(اللَّهُمَّ أَنْتَ الأوَّلُ فليسَ قَبْلَك شَيءٌ، وَأَنْتَ الآخِرُ فليسَ بَعْدَك شَيءٌ).[٣٣]

خوای پەروەردگار زاتی پاکت یەکەمینی و پێش تۆ هیچ شتێک نەبووە، پەروەردگارا زاتی پاکت کۆتاییە و لەدوای زاتی پاکت هیچ شتێکی تر نییە.

ئەم فەرمودەیە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمانی پێکردووین کە چووینە ناو جێگای خەو ئەم دوعایە بخوێنین.

ئەم بەشە زیاتر فەیلەسوفەکان کە خاوەنی باوەڕن لەگەڵ ئەوانەی ئەهلی کەلام زیاتر تێیدا قاڵ بوونەتەوە و بەرامبەر بە مولحید و دەهرییەکان بەکاری دەهێنن و لە شێوەی گەڕانەوە بۆ سەرچاوەو سەرەتا ئەو دوو کۆمەڵەی پێ دەم کوت دەکەن و لە ڕێگای ئەوەی کە هەموو

---

[٣٣] رواه مسلم.



شتێک سەرەتای هەیە، خوودی خوا پێداویستی حەتمیـیە و بـوونی واجـب الوجـودە لە ڕووی زاتـی پەروەردگـارەوە قسـەکەیان تـا ڕادەیەک ڕاسـتەو پێکاویانە ئەو بەشەی کە بەندە لێی ڕازی نیـیە ئەوەیە هەنـدێک سـیفاتی تری لە بیردەکەن وەیان لێ دادەبڕێن.

بەڵام ئەهلی سونەت، بەدڵنیاییەوە ئیسپاتی سەرەتاو کۆتایی بـۆ خـوای پەروەردگار دەکات و بەو واتایەی کە زاتی پاکی واجب الوجودە بۆ زاتی و بۆ خوودی و ڕازی نابێت بەهیچ عەدەم بوونێک لە ناو و سیفاتی پیـرۆزی دا واتا لە عەدەم دا نەبووە هاتبێتە وجود و خۆی خۆی دروست کردبێـت، بەڵکو هەر بووە و (قدیم) و بێ کۆتاییە (دائم بلا انتهاء).

خوای پەروەردگار لە سورەتی الطور ئایەتی ٣٥ دەفەرموویێت:

﴿أَمْ خُلِقُواْ مِنْ غَيْرِ شَىْءٍ أَمْ هُمُ ٱلْخَـٰلِقُونَ ﴿٣٥﴾﴾ الطور. ئایا ئەوانە بەبێ هیچ شتێک، هیچ هۆیەک هاتوونەتە کایەوە؟! یان هەر خۆیان دروستکارن؟!

مەبەستم لە تەفسیرەکەی ئەوەیە هەرشتێک دروسـت کرابێـت توانـای بەسەر نەفسی خۆیدا نییە.

جـا بـۆیە قسـەی فەیلەسـوف و ئەوانە لە زانسـتی کەلام ئەدوێـن، بۆچونەکانیـان لەبـارەی فەلسـەفەی ئیلاهیـاتەوە هەڵەیە، چـونکە ئەگەر دروسـت کەرێـک لە عەدەمەوە واتـا لە نەبـوونەوە خـۆی خەلـق بکـات بهێنێتە بوون و توانای بەسەر نەفسی خۆیـدا نەبێـت، کەواتە ئەم وجـودە توانای دروست کردنی خۆیشی نییە لە بنەڕەتدا، هەربۆیە بنەمای وتەکە و گریمانەکە هەڵەیە.



لێـرەدا پێویسـتە باسـی وشـەی (القـدیم) کە هەنـدێک لە فیـرقە و گروپەکان پێیان وایە ناو و سیفاتی پیرۆزی خـوای پەروەردگـارە، لەڕاسـتیدا هـیچ پەیوەنـدی بە ناووسـیفاتی خـواوە نیـیە، زیـاتر ئەهلـی کەلام و فەیلەسوفەکان بەکاری دەهێنن وشەی (القدیم) واتـای بە کـوردی: (کـۆن) لەڕووی زمـانەوانیەوە، بەڵام لەڕووی زاراوەوە دەڵـێن واتـای (قەدیـم) (هەربـوونە)، بەڵام زانایـان دەڵـێن قەدیـم بەشـتێکی عەتیـق دەوترێـت مابێتەوە و بەرامبەری (حدیث) بۆ شتێکی نوێ بەکاردێت، بەکارنایەت بـۆ زاتی اللـه چـونکە بەکاردێـت بۆشـتێک پـێش خـۆی لە عەدەمـدا وجـودی هەبـووە بـۆ نمـوونە خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی یـس ئـایەتی ٣٩ دەفەرمووێت: حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ

هـەتا (سـەرئەنجام هـەموو مانگێـک لـە ڕواڵەتـدا) وەک چیلکەیـەکی وشکی باریک دەنوێنێت.

بەمانای گەڕانەوەی مانگ دێت بۆ جێگـاو شـێوەی پێشـتری، مـانەوەی گەڕانەوەی بۆ جێگای کۆن وابەستەیە بە جاری دووهەمەوە، واتا وا ئێسـتا گەڕاوەتە ئەو جێگـایە پێشـتر مانـگ بە هیلالـی بیـنراوە، بەڵام لەڕاسـتیدا هەمان جێگا نییە، گۆڕانکاری لە کۆنەوە بەسەرهاتووە بۆ نوێ بوونەوە.

یاخود خوای پەروەردگار لە سورەتی الاحقاف ئایەتی ١١ دەفەرمووێت:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوۡ كَانَ خَيۡرٗا مَّا سَبَقُونَآ إِلَيۡهِۚ وَإِذۡ لَمۡ يَهۡتَدُواْ بِهِۦ فَسَيَقُولُونَ هَٰذَآ إِفۡكٞ قَدِيمٞ ١١﴾ الأحقاف. جا چونکە خۆیان هیدایەت و ڕێنمونیی قورئان وەرناگرن دەڵێن: ئەمە هەڵبەستراوو (ئەفسانەیەکی) کۆنە!

کەواتە بە وجودی نوێ ئەوەی پێشتر بووە بە کۆن و قەدیم!

یـاخود خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی الشـعراء ئـایەتی ٧٥-٧٦دا دەفەرمووێت:

﴿قَالَ أَفَرَءَيْتُم مَّا كُنتُمْ تَعْبُدُونَ ۝٧٥﴾ (ئیبراهیم) وتی: باشە ئاخر ئێوە نابینن چی دەپەرستن (کەی ئەو شتانە شایستەی پەرستنن).

﴿أَنتُمْ وَءَابَآؤُكُمُ ٱلْأَقْدَمُونَ ۝٧٦﴾ الشعراء. (بەڕاستی) ئێوەش و باوانی دێرینیشتان (بەهەڵەدا چوون).

ئەمەش مانای موبـالەغەیە لە کۆنیـدا کەواتە ئەگەر وتـرا کـۆن چـونکە هەرچی نوێیە بەدوایدا هاتووە، دەنا وجودی کۆن دروسـت نابێـت، وەکـو دەڵێت ڕای کۆن و نوێی شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت.

کەواتە وشەی ئەوەڵ و ئەخیر (الاول و الاخیر)، باشترینە بۆ بەکارهـاتن بۆ ناو و سیفاتی پیرۆزی خوای پەروەردگار.

## خوای پەروەردگار نە لەناو دەچێت نە دەفەوتێت، ئەوەی دەیەوێت دەبێت ببێت

وشەی نەلەناو دەچێت و نە دەفەوتێت هەردووکیان لەیەکەوە نـزیکن لە ڕووی واتاوە، بەڵام بۆ دڵنیا بـوون بەکارهـاتووە (لایفنـي ولا یبیـد)، (نە فەنا دەبێت وە نە ئیبادەش دەبێـت) هەروەکـو بڵێـین هەمیشـەییە بەبـێ کۆتایی (دائم بلا انتهاء) تەنها لە بواری دڵنیاییدا وشـەکان سـازدراون. دەنـا خوای پەروەردگار خۆی دەفەرمووێت لە سورەتی الرحمن.

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ۝٢٦﴾ هەموو ئەو کەسانەی کە لە سەر ڕووی زەویدا هەن، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن.



﴿وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ﴿٢٧﴾﴾ الرحمن. تەنها زاتی پەروەردگاری تۆ خاوەن بڵندی و ڕێزەو بۆی دەمێنێتەوە.

ئەوەیە خـوای پەروەردگـار دەیەوێـت و ئیـرادەی لەسـەریەتی، هـیچ بەربەسـتێک لەم بـوونەدا ناتوانێـت ڕێگـری لە ویسـت و ئیـرادەی خـوای موتەعال بکات، ئەمەش بەشێکی گرنگـی سـتراتیژی ئەم کەونەیە و بەشـی هەرەزۆری غەیبەو مـرۆڤ و جنـۆکە و فریشـتەکانیش پەی پـێ نـابەن، لە ڕابردوودا لەباسی قەزاو قەدەر ئاماژەمان پێداوە، بۆیە لێرەدا لەڕووی نـاوو سیفاتی پیرۆزی خوای پەروەردگار زیاتر تیشک دەخەینە سـەری و ڕوونـی دەکەینەوە بە پشتیوانی خوای گەورە.

سەرەتا دەبێت هاوکێشەیەک هەیە ڕوونبکرێتەوە وەکو زانستی حەتمی وکۆنکرێتی بجەسپێت لەم بڕگەی ناوو سیفاتە پیرۆزانەوە ئەویش ویست و ئیـرادەی خـوای پەروەردگـارە لە گەردوون و شـەریعەت و کـاردانەوەی مرۆڤەکاندا.

## ویستی خوای پەروەردگار لە گەردووندا

لێرەدا کە باسی گەردوون دەکەین مەبەسـتمان ئاسـمان و ئەسـتێرەکان نیـیە بەتەنهـا، بەڵکـو مەبەسـتمان هەمـوو دروسـتکراوەکانی خـوای پەروەردگـارە لە ئەلەکترۆنـێکەوە تـاوەکو گەورەتـرین گالاکسـی و گەلە ئەستێرە و کونە ڕەشەکانی کەون.

ئەم گەردوونە خـوای پەروەردگـار داهێنـانی تێـدا کـردووە (البـدیع)ە لەگەڵ داهێنـانەکە بە یاسـا ڕێکـی خسـتووە، چەنـدین سـاڵە کە زانایـان دەگەڕێـن و یاسـای ئەم گەردوونە دەدۆزنەوە کە هەمـووی ویسـت و



ئیـرادەی خـوای پەروەردگـارە و ناگۆڕێـت و چەسـپاوە، ئەم گەردوونەی لەسـەر ڕێکخـراوە، یاسـاکان بە ملیۆنەهـا یاسـای گەردوونـین لەهەمـوو بوارەکاندا.

لە کۆسمۆلۆجی و فیزیا و کیمیـا و پزیشـکی و هەندەسـی و ماتماتیـک و..هتد بۆنموونە، ئاو لە پلەی ١٠٠ی سەدی دا دەکولێت، هێزی ڕاکێشـانی زەوی یاخود بلوتـوس یـان هێڵـی ڕادیـۆ و تەنە ئەلیکترۆنەکـان، هەروەهـا هەموو ئەم یاسایانە بە ویست و ئارەزووی پەروەردگارە، هیچ مەخلوقێـک توانای دەستکاری کردنی نییە.

خوای گەورە لە سورەتی فاطر ئایەتی ٤٣ دەفەرمەوێت:

﴿.. فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلًاۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَحۡوِيلًا ٤٣﴾

فاطر. (کاتێ کە بڕوایان بە پێغەمبەران نەهێناوە، لەناوبران) ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لە یاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لە نەخشەی خۆیان لابدەن (کە بەشێکی ڕیسوا کردنی پیلان گێڕانە).

زانایـان تەنهـا لە دۆزینەوەیـدا بەهرەمەنـد بـوون، دەنـا هەمـوو دروسـتکراوی پەروەردگـارن، هەر ڕوداوێکـی کەونـی یـان گەردونـی یـان سروشتی کە ڕوو ئەدات بێ گومان ویست و ئیرادەی پەروەردگارە، چـونکە ئەم یاسایانە نوێ دەکاتەوە و لەبار تری دەکات بـۆ ژیـان بـۆ حـیکمەت و حـوکمەکەی کە خـوای پەروەردگـار دەیەوێـت هـیچ هێـز و توانـایەک بەربەستی نابێتەوە، لە لافاو، بورکان, تەقینەوەی خۆرەکان..هتد

هەموو ئەو مەخلوقـانەی لە گەردوونـدا بە یاسـای خـوای پەروەردگـار ڕێکخراوە، قەزاو قەدەری خوای پەروەردگارە و ستراتیژی ئەم گەردونەیە.





خوای پەروەردگار لە سورەتی البروج ئایەتی ١٦دەفەرموویّت:

﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ البروج. هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات، هەرچی بیەوێت کەس ناتوانێت دەست بێنێتە ڕێی.

بەڵام مەرجی ئەم ئایەتە لەوەی پەروەردگار دەیەوێت، ڕەحم و بەزەیی و لێ خۆش بوونە چونکە زاتی پاکی دروستی کردووە و لەکوێدا بیەوێت دروستی دەکات و لە کوێدا بیەوێت لەناوی دەبات و خاوەنی توانا و هێز و دەسەڵاتە و خۆی حاکمی ڕەهایە و خاوەن عەرشی پادشای گەورە و عەزەمەتەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و ئەوەی بیەوێت ئەنجامی ئەدات.

خوای پەروەردگارسورەتی البروج ئایەتی ١٢-١٦دەفەرموویّت:

﴿إِنَّ بَطْشَ رَبِّكَ لَشَدِيدٌ﴾ بەڕاستی تۆڵەی پەروەردگارت (ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) زۆر توندو تیژوو بەهێزە.

﴿إِنَّهُۥ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾ بەڕاستی هەر ئەو زاتەیە سەرەتا (هەموو شتێکی دروستکردووە)، دوای نەمانیشی (زۆر لای ئاسانە) دووبارە دروستی بکاتەوە.

﴿وَهُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلْوَدُودُ﴾ هەر ئەویش زاتێکی زۆر لێ خۆش بوو بە سۆزو دلۆڤان و دڵسۆزە (بۆ ئیمانداران).

﴿ذُو ٱلْعَرْشِ ٱلْمَجِيدُ﴾ خاوەنی تەختی بڵندو بەرزو پایەدارە.

﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾ البروج. هەرچی بیەوێت ئەنجامی دەدات، هەرچی بیەوێت کەس ناتوانێت دەست بێنێتە ڕێی، بەڵام سیفاتی ناوی پیرۆزی خوای موتەعال، ڕەحم و بەزەیی و بەخشندەیی و خۆشەویستییە



بۆ مرۆڤەکان هەرگیز زوڵم ناکات، کاری نابەجێ لەخودای موتەعال ناوەشێتەوە، هەرچی بیەوێت ئەنجامی بدات بەدڵنیاییەوە لە سوود و کامەرانی و بەردەوامی ژیانە بۆ مرۆڤەکان، نەوە لەدوای نەوە، جیل لەدوای جیلو ڕەوەند لەدوای ڕەوەند، هەربۆیە بە بەزەیی و ڕەحمی خۆی ڕێزی لەمرۆڤ گرتووە، پەیام و پەیامبەری بۆناردووە، کەواتە ئەوەی ڕوو ئەدات لەم گەردوونەدا قەزاوقەدەری خوای پەروەردگارە و خوای گەورە وا دەخوازێت و وا دەیەوێت.

## ویست و ئیرادەی خوای موتەعال لە شەریعەتەکەدا

قەزاو قەدەری خوای پەروەردگار لە ویستن و ئیرادەو عیلمیدا هەستی پێ دەکرێت، خوای گەورە دەیەوێت و دەخوازێت کە قورسایی لەسەر مرۆڤەکان لە ڕووی بەندایەتی و مەنهەج و شەریعەتەوە دانەنێت، ئەمە ویستی پەروەردگاری بەڕەحم و بەبەزەییە.

زاتی پاکی لە سورەتی هود ئایەتی ٣٤ دەفەرمووێت:

﴿وَلَا يَنفَعُكُمْ نُصْحِيٓ إِنْ أَرَدتُّ أَنْ أَنصَحَ لَكُمْ إِن كَانَ ٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يُغْوِيَكُمْ ۚ هُوَ رَبُّكُمْ وَإِلَيْهِ تُرْجَعُونَ ﴿٣٤﴾﴾ هود. هەمیشە ویستوومە ئامۆژگاریتان بکەم و ڕێگەی ڕاستتان نیشان بدەم، ئەو زاتە پەروەردگارتانە گەر بیەوێت بتانفەوتێنێت (زۆر لای ئاسانە) هەر بۆلای ئەویش دەگەڕێنەوە.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی النساء ئایەتی ٢٦-٢٧ دەفەرمووێت:



﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ٢٦ وَٱللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيْلًا عَظِيمًا ٢٧﴾ النساء. بێگومان خوا دەیەوێت (بەم شیوەیە) هەموو شتێکتان بۆ ڕوون بکاتەوەو ڕێنموویی تان بکات بۆ ئەو یاساو بەرنامانەی پێش خۆتان (لە جیهانی کۆمەڵایەتی و پەیوەندیەکاندا) وە تەوبەو پەشیمانیتان لێ وەربگرێت، وە خوا زاناو دانایە، خوا دەیەوێت تەوبەو پەشیمانیتان لێ وەربگرێت و لە هەڵەکانتان خۆش ببێت، (بەڵام) ئەوانەی کە شوێن ئارەزوات و هەوەسرانی کەوتوون دەیانەوێت لە خشتەتان بەرن و تووشی لادانێکی گەورەتان بکەن، خوا دەیەوێت (بەم بەرنامەو ڕێبازانە) کاری ئێوە ئاسان بکات چونکە ئادەمیزاد بەلاوازی دروست کراوە (لەبەرامبەر ئارەزواتیەوە کەم خۆڕادەگرێت).

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی المائدة ئایەتی ٦دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قُمْتُمْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ فَٱغْسِلُواْ وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى ٱلْمَرَافِقِ وَٱمْسَحُواْ بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى ٱلْكَعْبَيْنِۚ وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَٱطَّهَّرُواْۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُم مِّنْهُۚ مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ وَلِيُتِمَّ نِعْمَتَهُۥ عَلَيْكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ٦﴾ المائدة. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە هەرکاتێک ویستتان هەستن بۆ نوێژ (پێش ئەوە دەست نوێژ بگرن، بەم شێوەیە: سەرەتا ڕوخسارتان بشۆن، ئەوجا دەستەکانتان تا ئانیشکتان، ئینجا دەستی تەڕ بێنن بەسەر

هەموو سەرتانا یان بەشێکی قاچەکانیشتان بشۆن تا قولەپێتان، ئەگەر لەشتان گران بوو ئەوە خۆتان خاوێن بکەن و خۆتان بشۆن، ئەگەر نەخۆش بوون یا لەسەفەردا بوون یا دەستان بەئاو گەیاندبوو (تارەتتان گرتبوو) یا چووبونە لای ژنانی هاوسەرتان، یا دەستان بەریان کەوتبوو ئاوتان دەست نەدەکەوت (بۆ خۆشتن یان دەست نوێژ) (ئەو کاتە دەتوانن) بە خاکێکی پاک تەیەموم بکەن (واتە بەری دەستان بەئاستەم بماڵن بە خاکدا) بیهێنن بە ڕوخسار و دەستانا (تا ئانیشکتان). خوا نایەوێت لە ئاییندا تووشی سەغڵەتی و نارەحەتیتان بکات بەڵکو دەیەوێت پاک و خاوێنتان بکات (لە ڕواڵەت و ناوەرۆکدا)، دەیەوێت نازو نیعمەتی خۆیتان بەسەردا تەواو بکات بەڵکو سوپاسگوزار بن.

خوای پەروەردگار لەسورەتی الأحزاب ئایەتی ٣٣ دا دەفەرموویت:

﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ وَأَقِمْنَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتِينَ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِعْنَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥٓ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ ٱلرِّجْسَ أَهْلَ ٱلْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا ٣٣﴾ الأحزاب. ئەی هاوسەرانی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەماڵەکانی خۆتاندا بەسەنگینی و سەلاری بسرەون، زینەت و جوانی خۆتان دەرمەخن وەکوو سەردەمی نەفامی یەکەم، نوێژەکانیشتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکات بدەن (لەماڵ و سامان) فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەرەکەشی بکەن، چونکە بەڕاستی خوا تەنها دەیەوێت هەموو ناپاکی و ناسازی و نادروستیەک لە ئێوە دوور بخاتەوە ئەی خاوخێزانی ماڵی پێغەمبەرو بەتەواوی پاکتان بکاتەوە (دوور لەهەموو ناتەواوی و قسەو قسەلۆکێک).

کەواتە خوای پەروەردگار ویستی وایە بۆ بەندایەتی ئاسانکاری بکات بۆ بەندەکانی و قورسای نەخاتە سەرشانیان مەگەر ئەوەی کە خۆی لەسەرخۆی قورس و گران دەکات وەکو ئەوانەی دەبنە ڕاهیب و دەچنە



زنج و  خەڵوەتەوە یان وەکو پرسیارکردنی زۆری بەنی ئیسرائیل لەسەر سەربڕینی مانگاکە و باسی مانگاکە بەگشتی لە قورئانی پیرۆزدایە.

## ویست و ئیرادەی پەروەردگار بۆ کرداری مرۆڤ

خوای پەروەردگار پاکە و زاتی بەرزی پاکە و بێ گەردەو بەدڵنیاییەوە پاکو بێگەردی ئەوێت و خوای موتەعال جوانەو کامڵە و بەندە کامڵەکانی خۆش دەوێت، خوای پەروەردگار فەرمان بەچاکەو بەڕاستگۆیی و بەئیمان و بە یەکتاپەرستی و چاکەکاری بەگشتی دەکات، هەروەها زوڵم و درۆ و لوتبەرزی و کاری قێزەون و زشتی ناوێت و ڕقی لێ دەبێتەوە، ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگارە بە وەرگرتنی دینەکەی تامرۆڤ چاکە خوازبێت و دوور بکەوێتەوە لە زەرەردان لە خەڵکی بەگشتی و مرۆڤێکی چاکەخوازی لێ دەربچێت، ئەم ویستەی خوای گەورە بۆ هەموو مرۆڤەکانە، بەڵام مرۆڤەکان ئازادن لەوەرگرتنی ویستی خوای پەروەردگار لەم دنیایەداو لەگەڵیشیدا پەروەردگار پاداشت دەبەخشێت بەوەی کرداری چاکە دەکات، بەڵام ئەگەر مرۆڤ سەرە ڕۆو یاخی بوو لە ئەمرۆ ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگار، ئەوە دەبێت بەرپرسیاریەتی هەڵبگرێت لەوەی کە ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگاری قبوڵ نەکردووە، دەبێت سزاکەی وەربگرێت لە دنیاو قیامەتدا بەبەڵگەی قورئان.

وەک خوای پەروەردگار لەسورەتی الکهف ئایەتی ٢٩دا دەفەرمووێت:

﴿وَقُلِ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّكُمۡۖ فَمَن شَآءَ فَلۡيُؤۡمِن وَمَن شَآءَ فَلۡيَكۡفُرۡۚ إِنَّآ أَعۡتَدۡنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمۡ سُرَادِقُهَاۚ وَإِن يَسۡتَغِيثُواْ يُغَاثُواْ بِمَآءٖ



كَٱلۡمُهۡلِ يَشۡوِي ٱلۡوُجُوهَۚ بِئۡسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتۡ مُرۡتَفَقًا﴿٢٩﴾ الكهف. پێیان بڵێ: حەق هەر ئەوەیە لەلایەن پەروەردگارتەوە بۆتان ڕەوانەکراوە، (هەموشتان سەربەستن) ئەوەی دەیەوێ با باوەڕ بێنێ، ئەوەی دەیەوێ با کافرو بێ باوەڕ بێ، بێگومان ئێمە دۆزەخێکمان ئامادەکردووە بۆ ستەمکاران کە لەهەموو لایەکەوە دەورەیان دەدا، بەدیوارو بەربەستی سەخت ئابڵۆقە دراون، ئەگەر هاوار بکەن و داوای ئاو بکەن، کانزایەکی تواوەیان بۆ دەهێنرێت ئەوەندە گەرمە دەموچاویان هەڵدەکرٍوزێنێ و دەیانبرژێنێ، ئای کەچەند خواردنەوەیەکی نالەبارو ناخۆشە، چەندە جێگەو ڕێگەیەکی نالەبارو پڕ لە ئازارە.

لێرەدا پرسیارێک دروست دەبێت، خوای پەروەردگار لە سورەتی الأنعام ئایەتی ١٢٥دا دەفەرمووێت:

﴿فَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يَهۡدِيَهُۥ يَشۡرَحۡ صَدۡرَهُۥ لِلۡإِسۡلَٰمِۖ وَمَن يُرِدۡ أَن يُضِلَّهُۥ يَجۡعَلۡ صَدۡرَهُۥ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي ٱلسَّمَآءِۚ كَذَٰلِكَ يَجۡعَلُ ٱللَّهُ ٱلرِّجۡسَ عَلَى ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ﴿١٢٥﴾﴾ الأنعام. ئەوەی (خێری تیابێت) و خوا بیەوێت هیدایەتی بدات سینەی ساف و پاک و ئامادە دەکات بۆ ئایینی ئیسلام، ئەوەش بیەوێت گومڕای بکات، دڵی دەگوشێت و سنگی توند دەکات و هەناسەی سوار دەبێت، هەروەک ئەوەی بەرەو ئاسمان بەرز بێتەوە (چۆن تووشی تەنگە نەفەسیی و دڵە تەپێ و خوێن بەربوون دەبێت)، ئا بەو شێوەیە خوا ئەوانە سووک و ڕیسوا دەکات کە باوەڕ ناهێنن.

لێرەدا هۆکاری کردار و ناپەسەندی مرۆڤەکان خۆیانە، خوای پەروەردگار یان ئەیەوێت هیدایەتیان بدات یان گومڕایان بکات.



نموونە: چەندی چاکەخواز و هەوڵدەر بۆ چاکەکاری گەڕان بەدوای ئیماندا، لەبنەڕەتدا کافر و بێ باوەڕ بوون، بەڵام بە هۆکاری چاکەخوازی و سەرڕاستی، خوای پەروەردگار دەیەوێت هیدایەت وەربگرێت، وەکو نموونەی (کیثمۆر، کانت ستیڤنس، قەشە داود، بنجامین عبدالأحد..هتد).

پێچەوانەکەشی زۆرێک لەوانەی دین و خواناسینیان وەکو کاڵا بەکارهێناوە بۆ سومعەو ڕیا، لەکۆتاییدا خوانەناس و سەرەڕۆ دەرچوون، نموونەی وەکو بەلعامی کوڕی باعورا، ئومەیەی کوڕی صەڵت و هەزارەهای دیکە لە مێژوودا تۆمار کراون.

کەواتە وەکو شاعیر دەڵێت: خودا کاری نابەجێ ناکات - تا کێو نەبینێت بەفری تێ ناکات

ئەو کەسەی خوای گەورە دەیەوێت هیدایەتی بدات، ئەوە لە زانستی خوای گەورەدا زانراوە کە ئامادەیە بۆ وەرگرتنی هیدایەتەکە و پێچەوانەکەشی.

بەم پاوپێوەندە هاوکێشەکانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە، ویستی خوای پەروەردگار بۆ چاکەو کاری پاک و جوان و ڕاستی و دروستی تەندروستییە، هەرگیز خوای گەورە نایەوێت و نەیویستووە کاری نابەجێ و زشت و خراپ و پیس، بەڵکو خوا پاکە و پاکی دەوێت.(إن الله طيبٌ لا يقبل إلا طيباً) رواه مسلم عن أبي هريرة.

## نەخەیاڵ، نە بیر و تێگەیشتن و دەرک بەخوا ناگات

خەیاڵی مرۆڤ و تێگەیشتنی مرۆڤ ناتوانێت دەرک بە سیفات و نـاوی پیرۆزی خوای پەروەردگار بکـات، لەبەرئەوەی وتمـان لە هـیچ مەخلوقێـک نابێت و وێنەو هاوشێوەی نییە (لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ) ناتوانیت پەی بەریت بە دەستی خـوای پەروەردگـار، ئەگەر تەئـویلی دەکەیـت و دەڵێـت بەمانـای هێـزو قـودرەت و توانـای خـوای پەروەردگـارە، دەبێـت ئەم قسـەیە لە سەرچاوەیەکی دروست لە قورئان یاخود لە سونەت وەرگیرابێت، تەنـانەت هاوەڵانیش لەسـەر ئەم جـۆرە باسـانە نەپرسـیاریان کـردووە نە تەئویلیـان کردووە، مادام خوای پەروەردگار دەستی بۆخۆی بڕیـارداوە ئـێمەش وەکـو موسڵمان دانی پێدا دەنێین و بەڵکو یەقینمان هەیە بەدەستی پەروەردگار، بەڵام چۆن و چۆنیەتی نازانین ئەوەندە بەسە بیزانین و بڵێـین ئەو دەسـتە لایەقە بەخوای پەروەردگار، یاخود پەنجەی خـوای پەروەردگـار، دڵنیـاین و یەقیـــنمان هەیە کە پەروەردگـــار خـــاوەنی پەنـــجەیە، بەڵام چـــۆنە ئەو پەنجەیە؟ نە دەتوانین بە خەیاڵ وێنای بکەین نە دەتوانین لێـی تێـبگەین، چونکە زانستی ئێمە سنورداره بەڵام پەروەردگار لە هیچ شتێک ناچێت، تـۆ خەیاڵ و ووێناکردنت بۆ هەرچی شتێک بڕوات هەر هەڵەیە چونکە (لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٌ) هیچ زانستێک توانای بەسەردا ناشکێت (وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلۡمًا)

لەبەر ئەوەی تاکەو تەنهایە بێگەردە و پێویستی بەهـیچ نـیـە، هەمـوو پێویستیمان بەزاتی خوایە لەکەس نەبووە و لەکەس نابێت و کەسـیش لەو نەبووە، ئیتر چۆن وێنەو خەیاڵ و تێگەیشتن زانست و مەعریفە و تەنانەت گریمانەش پەی پێ دەبات.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:



﴿قُلۡ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ ٢ لَمۡ يَلِدۡ وَلَمۡ يُولَدۡ ٣ وَلَمۡ يَكُن لَّهُۥ كُفُوًا أَحَدُۢ ٤﴾ الإخلاص. (ئەی محمد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: ئەو خوایە تاک و تەنهایە (بێ هاوەڵ و هاوتایە)، خوا زاتێکی پایەدارو دەسەڵاتدارە، نیازی بە کەس نییە و هەمووان ئاتاجی ئەون، هەر ئەوە دەتوانێت بەڵاو ناخۆشی لابەرێت و پێویستی و داخوازییەکانمان جێبەجێ بکات، نە کەسی لێ بووە و نە کەسی لێ دەبێت، خۆیشی لە دایک نەبووەو دایک و باوکی نییە، هەرگیز هاوتاو هاوشێوەو بە دەسەڵاتێکی تر نییە کە لە بەرانبەریەوە بوەستێت و هاوشانی بێت.

کەواتە (نەفی کردن= بەدورگرتن) دەکەینە نموونەو پێوەر لەسەر ناو و سیفاتی پیرۆزی خوا کە لەسەر شێوەی مەخلوق نەبووەو نابێت و ئیسپاتکردن و دانان بەهەموو ناو و سیفاتە پیرۆزەکانی دەکەینە پێوەر بەو شێوەی لە قورئان و سونەتدا هاتووە، بێ شوبهاندن بە مەخلوق یان لەگەڕخستن و تەعطیل کردن و یان شێوەدار و لاشە داری بکەین، نموونەی (ئیستیواء)ی خودا لەسەر عەرشی، بڕیار ئەدەین خوای پەروەردگار لەسەرووی عەرشی خۆیەتی، بەڵام چۆنیەتی نازانین پرسیار کردنیش لەسەری هیچ ئەنجام و تێگەیشتنێک نادات بە ئەقڵی مرۆڤ بۆیە زانایان دەڵێن پرسیارکردن لەو بارەوە (بیدعەیە).

مەگەر بۆ تێگەیشتن و ڕوونکردنەوە هەندێک نموونە باس بکرێت، ئەویش ڕاستەخۆ دەبێت بوترێت وەک خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿.. وَلِلَّهِ ٱلۡمَثَلُ ٱلۡأَعۡلَىٰۚ .. ٦٠﴾ النحل. خوای پەروەردگار شایستەی هەموو نموونەیەکی بەرزو بڵندو پیرۆزە.



# خوای موتەعال زیندووە و نامرێت و ڕاوەستاو بەئاگایە و ناخەوێت

زانراوە کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ٱلۡحَيُّ ٱلۡقَيُّومُۚ لَا تَأۡخُذُهُۥ سِنَةٞ وَلَا نَوۡمٞۚ ..﴿٢٥٥﴾﴾ البقرة.

خوا زاتێکە کە جگە لەو خوایەکی تر نییە، وە ئەو هەمیشە زیندووەو چاودێرو ئاگادارە (بەسەر هەموو دروستکراوانیدا)، ئەو نە وەنەوز دەیباتەوەو نە خەو زۆری پێ دێنێت.

ئەم بڕگە باسە زیاتر بۆمان ڕووندەکاتەوە کە خوای پەروەردگار کاملەو ڕەهایەو لە دروستکراوەکانی ناچێت.

بۆ نموونە مرۆڤی کامڵ یان گیانداری کامڵ بەگشتی، دەبێت بخەوێت ماندوو دەبێت، برسی دەبێت، پاشەڕۆی دەبێت.. هتد.

هەربۆیە دەڵێین هیچ شتێک لەخوای پەروەردگار ناچێت و هیچ زانست و خەیاڵ و مەعریفەیەک پەی پێ نابات بە سیفات و ناوە پیرۆزەکانی (لێرەدا مەبەست وجودی خوای پەروەردگار نییە، وجودی خوای موتەعال حەتمییە بە نەقڵ و زانست و ئیمانە) مەبەست ناو و سیفاتی پەروەردگارە.

ڕەهای و کاملی خودا لەوەدایە کە ناخەوێت، کە نامرێت هەمیشە بەئاگایە ئەگەر ئەم سیفاتانەی نەبێت کەواتە خوا نییە، هەر بۆیە کەماڵ و جەماڵی پەروەردگار ڕەهایە لە شێوەی هیچ مەخلوقێکی ناچێت.

خوای پەروەردگار دەفەرمووێت:

﴿الٓمٓ﴿١﴾﴾ آل عمران. چەند پیتێک لە سەرەتای هەندێ لە سوورەتەکانی قورئاندا هاتوون ژمارەیان (١٤) پیتە نیوەی کۆی پیتەکانی



زمانی عەرەبین، بۆ سەلماندنی (اعجاز) و مەزنی و گرنگی قورئان کە لە توانای هیچ کەسدا نییە بەو پیتانە کتێبێکی ئاوا بێ وێنە دئیبنوێت، بەڕادەیەک هەتا ئەگەر هەموو گرۆی ئادەمیزاد و پەری کۆببنەوە بۆ ئەو مەبەستە بێگومان ناتوانن، هەروەها چەندەها نهێنی تریشی تێدایە، زاناکان لە هەندێکی دواون، هەندێکیشیان وتوویانە: هەر خوا خۆی زانایە بە نهێنی ئەو پیتانە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی طه ئایەتی ١١١دا دەفەرمووێت:

﴿۞ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَيِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا ﴿١١١﴾﴾ طه. هەرچی ڕووخسارەکانە (لە ڕۆژی قیامەتدا) ملکەچ و فەرمانبەردان، بۆ ئەو زاتەی کە هەمیشە زیندووەو دەسەڵاتی بێ سنووری هەیە، بێگومان ئەوەی ستەمی کردووە ڕەنج بەخەسارو نائومێدو بێ هیوایە.

هەروەها لە سورەتی الفرقان ئایەتی٥٨دا دەفەرمووێت:

﴿وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱلْحَيِّ ٱلَّذِى لَا يَمُوتُ وَسَبِّحْ بِحَمْدِهِۦ ۚ وَكَفَىٰ بِهِۦ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًا ﴿٥٨﴾﴾ الفرقان. تۆ (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) پشت ببەستە بەو زاتەی هەمیشە زیندووەو هەرگیز نامرێت، بەردەوام تەسبیحات و سوپاس و ساتیشی بکە، ئەوەندە بەسە بۆ (سەلماندنی دەسەڵاتی ئەو زاتە) کە بە هەموو گوناهەکانی بەندەکانی ئاگایەو (هیچی لێ پەنهان نییە).

خوای پەروەردگار لە سورەتی غافر ئایەتی ٦٥دا دەفەرمووێت:

﴿هُوَ ٱلْحَىُّ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ فَٱدْعُوهُ مُخْلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ ۗ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٦٥﴾﴾ غافر. ئەو زاتە هەمیشە و بەردەوام هەر زیندووە، جگە لەو خوایەکی تر نییە، هاناو هاوارو نزاتان ڕوو بەو بێت، ملکەچ و

فەرمانبەرداری بەرنامەو ئایینەکەی ئەو بن سوپاس و ستایش بۆ خوا، پەروەردگاری هەموو جیهانەکانە.

پێغەمبەری خوا دەفەرمووێت: (إنَّ اللهَ لا ينامُ, ولا ينبغي له أن ينامَ).[٣٤]

خوا ناخەوێت و لەخوا ناوەشێتەوە کە بخەوێت

(الْحَـيّ، الْقَيـّومُ) ئەم دوو نـاوە لە (ئەسـمائی ئەعـزەمە) نـاوە پـیرۆزە گەورەکانی.

## خوای پەروەردگار دروستکەرە (خالقە) بەبێ پێداویستی ڕزق و ڕۆزی ئەدات بەبێ ئەوەی پێویستی بە هاوکاری بێت

لێرەدا زیاتر مەبەست لەوەیە هەموو مەخلوق پێداویستی بەخوایە، لە نەبوون هەمووی دروست کـردووە، پێویسـتی بە هیچیـان نیـیەو لە کـاتی دروستکردنیشدا ماندوو نەبووە، پێویسـتی بەهـیچ شـتێک نەبـووە، ڕزق و ڕۆزی هەمـوو مەخلـوقی زینـدوو دەدات و بـێ ئەوەی لە مـوڵکی کەم بێتەوە و پێویستی بەهیچ هاوکاری و یارمەتیەک بێت.

خوای پەروەردگار لە سورەتی الذاريات ئایەتی ٥٦-٥٨دا دەفەرمووێت:

﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ﴿٥٦﴾﴾ (بێگومان) من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە بۆ ئەوە نەبێ کە (هەمیشەو بەردەوام) هەر من بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٣٤] رواه مسلم.



﴿مَآ أُرِيدُ مِنۡهُم مِّن رِّزۡقٖ وَمَآ أُرِيدُ أَن يُطۡعِمُونِ۝٥٧﴾ ئیتر نه ڕزق و ڕۆزیم لێیان دەوێت، نه خواردن و خواردنەوە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلۡقُوَّةِ ٱلۡمَتِينُ ۝٥٨﴾ الذاريات. چونکه بەڕاستیی هەر خوا خۆی ڕۆزی بەخشەو خاوەنی هێزو دەسەڵاتی پتەوو بەهێزە.

بەهەمان شێوە خوای پەروەردگار لە سورەتی فاطر ئایەتی ١٥دا دەفەرمووێت:

﴿۞ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ أَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُ إِلَى ٱللَّهِۖ وَٱللَّهُ هُوَ ٱلۡغَنِيُّ ٱلۡحَمِيدُ۝١٥﴾ فاطر. ئەی خەڵکینە ئێوە هەژارو نەدارن و هەمیشە ئاتاجی خوان (لە هەموو کاتو شوێنێکدا، وە بۆ هەموو شتێک) هەر تەنها خوایە کە بێ نیازەو شایانی سوپاسە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی الأنعام ئایەتی ١٤دا دەفەرمووێت:

﴿قُلۡ أَغَيۡرَ ٱللَّهِ أَتَّخِذُ وَلِيّٗا فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَهُوَ يُطۡعِمُ وَلَا يُطۡعَمُۗ قُلۡ إِنِّيٓ أُمِرۡتُ أَنۡ أَكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَسۡلَمَۖ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ۝١٤﴾ الأنعام. پێیان بڵێ: (بە عەقڵ و ژیری ئێوە ڕەوایە) کە جگە لەخوا کەسێکی تر بکەمە پشت و پەنای خۆم (بەمەرجێک ئەو خوایە) بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە، هەر ئەوە کە ڕۆزی بەخشە و بێ نیازە لە هەموو ڕزق و ڕۆزییەک، دووبارە بڵێ: من فەرمانم پێ دراوە کە یەکەم کەس بم کە تەسلیمی ئەو زاتە بم و موسوڵمان بم وە (من پێت ڕادەگەیەنم کە): هەرگیز نەکەی لە موشریک و هاوەڵپەرستان بیت.



## هەروەها لە فەرموودەیەکی قودسیدا هاتووە:

ئەی بەنـدەکانم ئەگەر لە یەکەم مـرۆڤەوە تـا کۆتاییتـان، هەروەهـا جنۆکەکان بەگشتی کۆببنەوە لە لاشەو دڵی کەسێکدا بـۆ بەنـدایەتی هـیچ لە موڵـک و سـامانم زیـاد ناکـات، بە پـێچەوانەوە خـوای پەروەردگـار دەفەرموویت، ئەی بەندەکانم لە یەکەم مرۆڤەوە تـا کۆتاییتـان، هەروەهـا جنکۆکەکانیش کۆببنەوە بۆ خراپەکاری لە لاشـەو دڵـی مرۆڤێکـدا هـیچ لە موڵک و سامانم کەم ناکات، هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموویـت لە یەکەم مـرۆڤەوە تـا کۆتـا مـرۆڤ لەگەڵ جنۆکەکانـدا کـۆببنەوە لە لاشـەی مرۆڤێکدا  داوام لێ بکەن بە هەموتان دەبەخشم، هـیچ لە هێـز و توانـا و دەسەڵاتم کەم نابێتەوە وەکو ئەوەی سەری دەرزیەکی دورمان بکەیـت بە زەریایەکدا، نە پێویستم بە هاوکاریە نە قورساییم دەکەوێتە سەر نە تواناى بۆبەکار دەهێنم. ئەی بەندەکانم ئەوانە هەموی کاری خۆتانـەو لەسـەرتان تۆماری ئەکەم، دوایش وەڵامتان ئەدەمەوە هەریەکەو بە پێی کاری خـۆی، هەرکەس خێری بینی با سوپاسی خوا بکات و هەرکەسێکیش پێچەوانەکەی بینی با تەنها لۆمەی خۆی بکات.   يَا عِبَادِي: لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَانُوا عَلَى أَتْقَى قَلْبِ رَجُلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا زَادَ ذَلِكَ فِي مُلْكِي شَـيْئًا، يَـا عِبَادِي: لَوْ أَنَّ أَوَّلَكُمْ وَآخِرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ كَـانُوا عَـلَى أَفْجَـرِ قَلْـبِ رَجُـلٍ وَاحِدٍ مِنْكُمْ مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِنْ مُلْكِي شَيْئًا، يَا عِبَادِي: لَـوْ (أَنَّ أَوَّلَكُـمْ وَآخِـرَكُمْ وَإِنْسَكُمْ وَجِنَّكُمْ قَامُوا فِي صَعِيدٍ وَاحِدٍ فَسَأَلُونِي، فَأَعْطَيْتُ كُلَّ وَاحِدٍ مَسْـأَلَتَهُ، مَا نَقَصَ ذَلِكَ مِمَّا عِنْدِي إِلَّا كَمَا يَنْقُصُ الْمِخْيَطُ إِذَا أُدْخِلَ الْبَحْرَ. يَـا عِبَـادِي:



إِنَّمَا هِيَ أَعْمَالُكُمْ أُحْصِيهَا لَكُمْ، ثُمَّ أُوَفِّيكُمْ إِيَّاهَا، فَمَنْ وَجَدَ خَيْرًا فَلْيَحْمَدْ اللَّهَ، وَمَنْ وَجَدَ غَيْرَ ذَلِكَ فَلَا يَلُومَنَّ إِلَّا نَفْسَهُ"). [٣٥]

## خوای موتەعال دەمرێنێت بێ ترس و زیندودەکاتەوە بێ ئەرک

مــردن ســيفەتێکی ئەم وجــودەیە، مانــای لەنــاوچوون و عەدەم ناگەیەنێت، بەڵکو دوای مردن قۆناغی ژیانی تر دەست پێ دەکات.

خوای پەروەردگار لە سورەتی الملک ئایەتی ٢دا دەفەرموویت:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ الملك. هەر ئەو خۆی مردن و ژیانی بەدی هێناوە تا تاقیتان بکاتەوە، کێتان کردەوەی چاکترو پەسەندترە، هەر ئەویش زاتێکی باڵادەستە (بەسەر بێ باوەڕاندا) وە لێخۆشبووە (لە ئیمانداران).

خوای پەروەردگار سیفاتی مرێنەر و زینـدوکەرەوەی هەیە و بـێ هـیچ ترس و ئەرکێک، مـرۆڤ نـاچێتەوە دۆخـی لەنـاوچوون واتـا عەدەم بـوون، چونکە عەدەم مەخلوق نییە و واتا مانای نەبوونە، بەڵکو مرۆڤ لە کەونی خوای پەروەردگار دەرناچێت و بە هەمیشەی دەمێنێتەوە

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت:

(يُجاءُ بالمَوْتِ يَومَ القِيامَة، كَأنَّهُ كَبْشٌ أمْلَحُ، زادَ أبو كُرَيْبٍ: فيُوقَفُ بيْنَ الجَنَّةِ والنَّارِ، واتَّفَقا في باقِي الحَديثِ، فيُقالُ: يا أهْلَ الجَنَّةِ هلْ تَعْرِفُونَ

---

[٣٥] رواه مسلم.

هذا؟ فَيَشْرَئِبّونَ ويَنْظُرونَ ويقولونَ: نَعَمْ، هذا المَوْتُ، قالَ: ويُقالُ: يا أَهْلَ النّارِ هلْ تَعْرِفُونَ هذا؟ قالَ فَيَشْرَئِبّونَ ويَنْظُرونَ ويقولونَ: نَعَمْ، هذا المَوْتُ، قالَ فيُؤْمَرُ به فيُذْبَحُ، قالَ: ثُمَّ يُقالُ: يا أَهْلَ الجَنَّةِ خُلُودٌ فلا مَوْتَ، ويا أَهْلَ النّارِ خُلُودٌ فلا مَوْتَ قالَ: ثُمَّ قَرَأَ رَسولُ اللهِ صَلَّى اللَّهُ عليه وسلَّمَ: ﴿وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِى غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾﴾ مريم. وأشارَ بيَدِهِ إلى الدُّنْيا).[٣٦]

لە ڕۆژی قیامەتدا مردن لە شێوەی بەرانێکدا دەهێنرێت و لە نێوانی بەهەشت و دۆزەخدا سەردەبڕێت، واتا دوای قۆناغی بەهەشت و دۆزەخ مردن نییە.

خوای پەروەردگار هەموو مەخلوقاتی لەناودەبات، تەنها و تەنها خۆی زاتی پاکی دەمێنێتەوە، پاشان هەموو مرۆڤ جنۆکە و فریشتە و ئاژەڵ و گیاندارێک زیندو دەکاتەوە لە کون فەیەکونێکدا (کن فیکون) بێ هیچ ئەرک و ماندووبونێک ئەمەش سیفات و ناوە پیرۆزەکانی خوای پەروەردگارە.

خوای گەورە لە سورەتی التکویر ئایەتی ٥دا دەفەرموویێت:

﴿وَإِذَا ٱلْوُحُوشُ حُشِرَتْ ﴿٥﴾﴾ التکویر. کاتێک گیانلەبەرانی کێوی و وەحشی و دڕندە بەدەووری یەکدا کۆکرانەوە (ئەوانیش دڕندایەتی خۆیانیان لەبیر چۆوە لە سامناکیی ئەو ڕۆژە).

هەروەها لە سورەتی الزمر ئایەتی ٦٨-٦٩داهاتووە:

---

[٣٦] صحيح مسلم.

﴿وَنُفِخَ فِي ٱلصُّورِ فَصَعِقَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَن فِي ٱلۡأَرۡضِ إِلَّا مَن شَآءَ ٱللَّهُۖ ثُمَّ نُفِخَ فِيهِ أُخۡرَىٰ فَإِذَا هُمۡ قِيَامٞ يَنظُرُونَ ﴿٦٨﴾﴾ لەو ڕۆژەدا فوو دەکرێت بە - صور - دا، (مەگەر هەر خوا خۆی بزانێت چ دەزگایەکە) هەر کەس لە ئاسمانەکان و زەویدا مابێت خێرا دەمرێت، مەگەر کەسێک خوا ویستی لەسەر مردنی نەبێت، لەوەودوا فوویەکی تری پیادا دەکرێتەوە، جا دەستبەجێ هەرهەموو خەڵکی هەستاونەتە سەرپێ و بەسەرسامیەوە چاوەڕوانن.

﴿وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَقُضِيَ بَيۡنَهُم بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ﴿٦٩﴾﴾ الزمر. (دیارە کە خۆری دنیا نەماوە، زەوی بۆتە گۆڕەپانێکی فراوان) ئەوسا بەنوورێک کە خوا فەراهەمی دەهێنێت زەوی ڕووناک دەبێتەوە، کارنامەو و دۆسیەکانیش دانراون، سەرەتا پێغەمبەران و شەهیدان دەهێنرێن و دادوەری لە نێوانیاندا ئەنجام دەدرێت بەشێوەیەکی حەق و ڕاستی، بێگومان ئەوان هیچ جۆرە ستەمێکیان لێ ناکرێت.

پاشان لە سورەتی الحدید ئایەتی ٢ دەفەرمووێت:

﴿لَهُۥ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ﴿٢﴾﴾ الحدید. هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدا هەیە هەر ئەو خاوەنیانە، ژیان و مردنیشی بەدەستە هەر خۆی دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی الرحمن ئایەتی ٢٥-٢٦دا دەفەرمووێت:

﴿فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢٥﴾﴾ سەرنجی ئایەتی ١٣ بدە.

﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ﴿٢٦﴾﴾ الرحمن. هەموو ئەو کەسانەی کە لە سەر ڕووی زەویدا هەن، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن.

## خوای پەروەردگار سیفاتی ئەزەلیە و هەر لە سەرەتاوە تا بێ کۆتایی

دەبێت بڕواداری ڕاستەقینە بڕوای وابێت خوای پەروەردگار هەموو سیفاتەکانی ئەزەلیەو پەیوەستە بەزاتی پەروەردگارەوە هەندێک لە گروپ و کۆمەڵەکانی ناو ئیسلام زۆر زیادەڕۆیان کردووە لەم باسەدا بەتایبەت (جەهمیە و موعتەزیلەو بەشێک لە شیعە شوێنکەوتوی ئەم مەزهەبە فیکریانەیە) دەڵێن، خوای گەورە لەسەرەتاوە سیفاتی خەلقی نەبووە یان سیفاتی کەلام و گفتوگۆی نەبوو، کە مەخلوقاتی دروست کردووە سیفاتی پیرۆزی خەلق ڕوویداوە یان قورئانی ناردووە یاخود قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسا -عليه السلام- کردووە ئەم سیفاتی قسەکردنە ڕوویداوە، هەروەها بۆ سیفاتەکانی پیرۆزی زاتی پەروەردگار وەکو ڕەحم و ڕەزاق و.. هتد.

لێرەدا من نەهاتووم جۆری ڕا جیاواز و بۆچونەکان بخەمەڕوو، بەڵکو کاری من لەگەڵ تۆدا دانی زانیاری ڕاست و دروستە لە قورئان و سوننەت و هاوەڵان و ئەهلی سەلەف، حوکمیش بەسەر کەسدا نادەین بۆ کوفر.

ڕاستی ئەم باسە ئەوەیە ئەگەر قسەی ئەو فەیلەسوف و ئەهلی کەلام و گریمانانە وەربگرن بە گریمان، دەبینین نەفی هەموو سیفاتەکان دەکەن کە نەفی هەموو سیفات کرا، ئۆتۆماتیکی نەفی زاتی پەروەردگار دەکرێت، چۆن؟! ئەگەر خوای پەروەردگار لەکاتی دروست کردنی مەخلوقدا،



سیفاتی خالقی (وەرگرتبێت) وشەی وەرگـرتن لەخۆیـدا واتـا هەر خـاوەنی سـیفاتەکە بـووە، تەنهـا بـێ ئەدەبییەکـە لـەوتنی ئەو وشـەیە و لە ئاسـتی خوای پەروەردگار ناکرێت بەکاربێت. ئەگەر بڵێین (ڕوویداوە) وەکو زۆرێک دەڵێن (حدث) ئەم ڕوودانە دەبێتە مەخلوق، خـۆ ئەگەر نەبێـتە مەخلـوق پەکخستنی واتە (تەعطیل)کردنی سیفاتی پەروەردگارە، لە کاتێـک بـاس لە نـاو و سـیفاتی پەروەردگـار دەکەیـن، دەبێـت ڕەهـاو کامـڵ بێـت، ئەگەر وانەبوو ئەوە (خوانییە) جا بۆیە مرۆڤی ئیماندار دەبێـت، بـڕوا و یەقـین و دڵنیایی هەبێت بەناو و سیفاتی پەروەردگار کە لە ئەزەلەوە خاوەنی بووە، هەندێک زانا وشەی (قەدیم)یـان بـۆ بەکارهێنـاوە, خـۆ ئەگەر دواتـر ئەو سـیفاتانەی کە خـوای گەورە لەدوای مەخلوقـاتی بـۆی زیـاد بـووە (پەنـا بەخوا) ئەوە وەکو زیادە بۆ خوای پەروەردگار، کەواتە پێویسـتی پـێ بـووە پێشـتر پێویسـتی پـێ نەبـووە و نەی بـووە ئەم سـیفاتە پیـرۆزانە، ئەمەش بەهەموو شێوەیەک مرۆڤ بەرەو مەیلی گومڕایی و ئیلحاد دەبات، کەواتە خوا خاوەن پێداویستییە.

پێشـتر غیرەتـی نەبـوو دواتـر غیرەتـی بـۆ دروسـت بـووە، نەیتوانیـوە ببیسـتێت یـان ببینێـت، لەدوای پێداویسـتی بـۆی دروسـت بـووە، ئەمەش بەپێوەری ئەو گروپ و کۆمەڵانە بێت - سـوێند خـواردن بە سـیفاتی خـوا کوفرە چـونکە بـۆی زیـاد بـووە و بەشـێک نیـیە لە خـوای پەروەردگـار، لە ڕاسـتیدا سەرلێشـێواییە ئەم جـۆرە بیرکـردنەوانە، ئەوەتـا پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ سوێند بە سیفات و ناوی پیرۆزی خوای پەروەردگار دەخوات یان پەنا دەگرێت بە سیفات و ناوی پیرۆزی پەروەردگار.

کەسێک بەناوی عوسمانی کوڕی ئەبی عـاص سـەقەفی هـاتە خزمەتـی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ و فەرمووی ئەی پێغەمـبەری خـوا ئـازارم

هەیە لە لاشـــــەمدا لەو ڕۆژەوەی موســـــڵمان بـــــووم، پێغەمـــــبەر ﷺ فەرمووی: دەستت بخە سەر جێگای ئازارەکەو سێ جار بڵێ: بسم الله یان حەوت جار، پاشان بڵێ: (أعوذ بعزة الله وقدرته من شر ما أجد وأحاذر).[٣٧] لێرەدا پەنا بەسیفاتی پەروەردگار گیراوە بە عیزەتی.

یان پێغەمبەری خوا ﷺ سوێند و پەنـا دەگرێـت بە کەلامی خوای پەروەردگار وەک دەفەرمووێت: (أعوذ بكلمات الله التامـات من شر ما خلق).[٣٨]

یاخود دەفەرمووێت: (اللَّهُمَّ أعُوذُ بِرِضَاک مِنْ سَـخَطِک وَبِمُعَافَاتِـک مِـنْ عُقُوبَتِک وَأعُوذُ بِک مِنْک).[٣٩]

هەروەها دەفەرمووێت: (أعوذ بنور وجهک الذي أشرقت له الظلمات).

هەموو ئەم ناو و سـیفاتە پیـرۆزانە خـوای پەروەردگـار کە پێغەمـبەری خوا ﷺ سوێندی پێ خـواردووە، زانراویشـە و یەقـین و دڵنیـــایی تەواومـــان هەیە کە پێغەمـــبەری خـــوا ﷺ سوێندی تەنها و تەنها بەخوای پەروەردگار دەخوات، کەواتە ئەم سـیفاتانە زاتی پاکی خودای موتەعالن، ناکرێت بڵێین خوای پەروەردگار تەنهـا نـاوی (الله)یە ئەم وشانە عەرەبین، بەڵام الله لە ئەزەلەوە الـلە-یە و ئەونـاوانەی کە بە زمانەکانی تر هەمو دەلالەت لە پێناسەی الله دەکەن.

---

[٣٧] رواه مسلم.
[٣٨] رواه مسلم.
[٣٩] رواه مسلم.



هەموو لایەقە بەخـوداى پەروەردگـار کەسـێکى عەرەب دەڵێـت الـلە، کوردێک دەڵێت خوا، فارسـێک و ئەفغـانیەک دەڵێـت خـودا، ئـازەریەک دەڵێت یەزدان، ئینگلیزێک دەڵێت God هەر لایەو بەزمانى خـۆى وشـەى الله دەردەبڕێت مادام بیروباوەڕى موسڵمان و خواناس یەکتاپەرستە، هیچ کێشە نییە لە دەربڕینى ناوەکانى خواى گەورە گرنگە لایەق بە پەروەردگار بێت.

کەواتە خـواى پەروەردگـار خـالقە لە ئەزەلەوە فـاطرە لە ئەزەلەوەى الباریە لە ئەزەلەوە، ئەم سیفاتانە ئەزەلین ڕاستە هەرسـێ مانـایەکى هەیە تاڕادەیەک بەڵام بۆ ناو و سیفاتى پیرۆزى پەروەردگار جیاوازە خواى گەورە خالقە، دروستکەرى هەموو بوونە، ئەم سیفاتە بۆخوا ڕەهایە، دەشـێت بـۆ مـرۆڤ بەکاربێـت کە دروسـت کەرى ئـامێرێکە، بـۆ وشـەى فـاطر بەکارهاتووە بۆ دروست کردنى زەوى و ئاسمان (فَاطِرِ السَّـمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ) خـواى گەورە پێویسـتى بەهاوکـارى نیـیە بـۆ دروسـت کـردن، لەهەردوو سیفاتەکە سیفاتى سێیەم بەهێزترە وەکو ماناى زمانەوانى، ئەویش (البارئ) واتا دروسـتکارە بـێ هاوکـارى و لە نەبـوونەوە هەمـوو شـتێک دەهێنێـتە بوون! کەواتە سیفاتى هەمووى ئەزەلییە وەکو زاتى پـاکى لە قورئـان-دا لە سورەتى النحل ئایەتى ١٧ دەفەرموێت:

﴿أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ١٧﴾ النحل. (باشە ئەى هۆشمەندەکان) ئایا ئەو کەسەى (ئەم هەموو دروستکراوە سەرسوڕهێنەرانەى) بەدیهێناوە، وەکو ئەو کەسە وایە ناتوانێت هیچ بەدى بێنێت، ئایا لێکى نادەنەوەو یاداوەرى وەرناگرن؟

داهـاتوو و ڕابـوردوو ئێسـتا بـۆ ئەو زاتە کە خـواى پەروەردگـارە هـیچ سـنوورێک بـۆ خـوا دانـانێن و مانـاو واتـایەکى سـنورداکردن بـۆ خـوا

هەڵناگرێت، هەموو مەخلوقن و پێوەرن بۆ ئێمەی مرۆڤ، زۆرجار خوای گەورە بە ڕابوردوو قسەمان لەگەڵ دەکات کە باسی قیامەتەو، نەهاتووە و ڕووی نەداوە، ئەمەش مانای وایە کات و زەمەن بۆ ئێمەی مەخلوقە کات و زەمەن بۆ پەروەردگار هەژمار ناکرێت، ئەوە مرۆڤە دەڕوات و دەمرێت، زەمەن و کات لە جێگای خۆیدایە، ئێمەین ئەو پێوەرانەمان لایە، بەڵام خوای موتەعال ڕەهاو هەمیشەییەو پێویستی بەهیچ شتێک نییەو لەهیچ شتێک ناچێت هەر پەروەردگار بووە واتە (رَبّ) پێش ئەوە مەخلوقات پەروەردە بکات واتە (مربوب) بێت، هەر خالق بوو پێش ئەوەی مەخلوق دروست بکات.

## خوای پەروەردگار زانستی هەیە بەسەر هەموو دروستکراوەکانیدا

لە زمانەوانیدا کە دەڵێت (خَلَقُ اللَّهُ) واتە: داهێنان و دروستکردن و کواڵێتی و باشترین، هەروەها بەمانای تواناو دەسەڵات بەسەردا شکانیش دێت.خلق: أي اوجد أنشأ وأبدع-قدر.

ئەگەر وتمان خوای پەروەردگار دروستکەری هەموو دروستکراوەکانیەتی بەزانستی واتە: (بعلمە) واتە: دروستکردن و زانستی ڕەهاو تەواوەتی هەیە بەسەریاندا وەک خوای پەروەردگار لە سورەتی الملک ئایەتی ١٤ دەفەرمووێت:

﴿أَلَا يَعۡلَمُ مَنۡ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلۡخَبِيرُ۝١٤﴾ الملك. مەگەر خوا نازانێت کێی دروستکردووەو چۆنی دروستکردووە، لە کاتێکدا کە ئەو زاتە وردکارو بەسۆزو ئاگایە.





هەروەهــا خــوای پەروەردگــار لە ســورەتی الأنعــام ئــایەتی ٥٩-٦٠دا دەفەرمووێت:

﴿۞ وَعِندَهُۥ مَفَاتِحُ ٱلۡغَيۡبِ لَا يَعۡلَمُهَآ إِلَّا هُوَۚ وَيَعۡلَمُ مَا فِي ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۚ وَمَا تَسۡقُطُ مِن وَرَقَةٍ إِلَّا يَعۡلَمُهَا وَلَا حَبَّةٖ فِي ظُلُمَٰتِ ٱلۡأَرۡضِ وَلَا رَطۡبٖ وَلَا يَابِسٍ إِلَّا فِي كِتَٰبٖ مُّبِينٖ ٥٩﴾ کلیلی هەموو شاراوەکان و زانینی هەموو نهێنییەکان بەدەست خوایە و لای ئەوە، کەس هیچی لێ نازانێت جگە لەو زاتە هەرچی لەسەر ووشکانییە (لە گیاندارو بێ گیان و گیاو دارو زیندەوەرانی وردو درشت لەسەر زەوی و لەتوێی خاکدا) خوا پێی دەزانێت، هەروەها هەرچی لە دەریاکانیشدا هەیە (لە زیندەوەری هەمەجۆرو ماسی سەیرو سەمەرە) ئاگای لێیەتی، هیچ گەڵایەک لە هیچ دارێک بەرنابێتەوە پێی نەزانێ، هەروەها دەنکێک یا تۆوێک لە تاریکستانی زەویدا نییە (کە پێی نەزانێت)، ئەو دەنکە چ شێدار بێت یا تەڕ بێت، هیچ شتێک نییە لە خوا پەنهان بێت و لە (لوح المحفوظ)دا، یاخود لە دۆسیەی تیابەت دا تۆمار نەکرابێت.

﴿وَهُوَ ٱلَّذِي يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ لِيُقۡضَىٰٓ أَجَلٞ مُّسَمّٗىۖ ثُمَّ إِلَيۡهِ مَرۡجِعُكُمۡ ثُمَّ يُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمۡ تَعۡمَلُونَ ٦٠﴾ الأنعام. هەر ئەو زاتەیە کە بەشەو خەوتان لێ دەخات و دەتان مرێنێت (لەم ساڵانەی دوایی دا زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە خەو جۆرە مردنێکە)، هەروەها دەزانێت لە ڕۆژیش دا چ کارو کردەوەیەک ئەنجام دەدەن، هەموو ڕۆژێک ژیانتان پێ دەبەخشێت و زیندوتان دەکاتەوە تا وادەی دیاری کراو، کە (ڕۆژانی تەمەنتان) تەواو دەبێت و (خەوێکی گەورەتان لێ دەکەوێت) لەوەودوا گەڕانەوەتان بۆ لای ئەو زاتەیە، ئەوجا هەواڵی ئەو کارو کردەوانەتان پێ ڕادەگەیەنێت کە ئەنجامتان داوە.

زانیـاری و زانسـتی خـوای پەروەردگـار ڕەهـایە، عـاڵمە بەسـەر هەمـوو دروست کراوەکانەوە، پێش دروستکردنیشی زانیاری تەواو ڕەهای هەبـووە بەسەر مەخلوقاتدا.

## بەقەدەری هەموو دروست کراوەکانی زانایەو قەدەری بۆداناون

خوای پەروەردگار قەدەری بۆ هەموو مەخلوقاتی داناوە لێـرەدا قەدەر بەمانای قەدەری کەونی دێت، ڕۆشتن و برسـێتی و تینـوێتی و نەخۆشـی و تۆفـان و بـاران و بورکـان و..هتـد. خـوای پەروەردگـار لە سـورەتی القمـر ئایەتی ٤٩ دەفەرمووێت:

﴿إِنَّا كُلَّ شَيۡءٍ خَلَقۡنَٰهُ بِقَدَرٖ ﴿٤٩﴾﴾ القمر. بێگومان ئێمە هەموو شتێکمان بە ئەندازەی دیاریکراو دروستکردووەو بەدیمان هێناوە.

هەروەهـــا خـــوای پەروەردگـــار لە ســـورەتی الأحـــزاب ئـــایەتی ٣٨ دەفەرمووێت:

﴿مَّا كَانَ عَلَى ٱلنَّبِيِّ مِنۡ حَرَجٖ فِيمَا فَرَضَ ٱللَّهُ لَهُۥۖ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِي ٱلَّذِينَ خَلَوۡاْ مِن قَبۡلُۚ وَكَانَ أَمۡرُ ٱللَّهِ قَدَرٗا مَّقۡدُورًا﴿٣٨﴾﴾ الأحزاب. هیچ گوناهو هەڵەیەک لە سەر پێغەمبەر نییە لە بەرانبەر کارێکەوە کە خوا خستوویەتە سەرشانی، (وە ئەم جۆرە گۆڕانکاریانە) بەرنامەی خوایەو لە پێغەمبەران و قەومە پێشووەکانیشدا ڕوویداوە (کە عەقیدەو بیروباوەڕیان ڕاستکردووەتەوە هەروەها پەیوەندیە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاریەکانیشیان بەگوێرەی بەرنامەی خوا سازدراوە)، بەردەوامیش فەرمانەکانی خوا بەوردی و ڕێکوپێکی دەبێت جێبەجێ بکرێت.



هەروەها قەدەری هیدایەتی و ڕێنیشاندانی هەمـوو دروسـتکراوەکانی داوە بە چـاکە بـۆئەوەی لە سیسـتەمی کەونیـدا ڕێکـکەون، وەک خـوای پەروەردگار لە سورەتی الأعلی ئایەتی ٢-٣دا دەفەرمووێت:

﴿ٱلَّذِي خَلَقَ فَسَوَّىٰ﴿٢﴾﴾ ئەو زاتەی کە دروستکاری هەموو شتێکە بە جوانی و ڕێکوپێکی و تێرو تەواوی.

﴿وَٱلَّذِي قَدَّرَ فَهَدَىٰ﴿٣﴾﴾ الأعلى. ئەو زاتەی کە هەموو شتێکی بە شێوەیەکی لەبارو هاوکار لەگەڵ شتەکانی تردا (دروست کردووە، پەیوەندی بەرپا کردووە لە نێوان جیهانی ئادەمیزادو ڕووەک و ئاژەڵ و باڵندەو مارو مێروو ئاوو هەواو خۆرو گڵ و.هتد). ئەنجا هیدایەتی داون لە ڕابوردودا ئاماژەمان داوە بەجۆری قەدەرەکان کە خوای گەورە سێ جۆر قەدەری هەیە: (کەونی و شەرعی و هەڵبژاردن).

لێرەدا باسی قەدەرە بەگشـتی کە زانسـتی خـوای پەروەردگـار ئاگـادارە بەسەر هەموو قەدەری مەخلوقاتی، هەمـوو لەم کەونەدا لەسـەر بنەمـای قەدەری خــوای پەروەردگــار ڕاوەســتاوە و ســتراتیژی ئەم کەونە بەڕێــوە دەبات، بەشێکی زۆری غەیبە و ئەوەی بۆمـان ئاشـکرا کـراوە لە قورئـان و سوننەت دا بۆ زانستی مرۆڤەکـانەو کە زانایـان بۆیـان شـی کـردوینەتەوە، بەڵام هەموو قەدەرەکان خوای پەروەردگار دروستی کـردووە یـان فـەرمانی پێیانداوە و زانایە بەسەریەوە و بە ویست و ئیرادەی خوای پەروەردگارە.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (إنَّ اللَّهَ قدَّرَ مقاديرَ الخلائقِ قبلَ أن يخلقَ السَّمواتِ والأرضَ بخمسينَ ألفَ سنة وَكانَ عرشُهُ على الماء).[٤٠]

واتە: خوای پەروەردگار قەدەری هەموو مەخلوقاتی داناوە و زانایە بەسەریەوە، پێش ئەوەی ئەم کەون و گەردونە دروست بکات بە ٥٠ هەزار ساڵ پێش دروستکردنی ئەم گەردوونە، ئەوکات عەرشی خوای پەروەردگار لەسەر ئاو بوو.

## خوای موتەعال ئەجەل و کاتی لەناوبردنی بۆ هەموو دروستکراوەکانی داناوە

خوای پەروەردگار بۆ هەموو دروستراوەکانی ئەجەلی داناوە، (ئەجەل واتا کاتی لەناوچوون و مردن یان سەعاتی سفر وەکو خەڵک بەکاری دەهێنن.

جا ئەگەر مردن بێت وەکو مرۆڤ و جنۆکەو گیاندار و پەلەوەر و باڵندە و مار و مێر و خشۆک، لەناوچونی گەردوون بە کانزا و هەموو بونەوەرەکان لەم بوونەدا کاتێکی دیاری کراوی هەیە و لەدەستی هیچ کەس و توانای هیچ مەخلوقێکدا نییە، تەنها و تەنها پەروەردگار توانای بەسەریدا هەیە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی النحل ئایەتی ٦١دەفەرموویت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٠] رواه مسلم.



﴿وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ٦١﴾ النحل. خۆ ئەگەر خوا خەڵکی لەناو ببات و بیانپێچێتەوەو بیانگرێت بەهۆی ستەمیانەوە (ئەوەندە گوناهو تاوان زۆرە) زیندەوەر لەسەر زەویدا نایەڵێ (یەعنی هەر زەوی خاپوور دەکات بە هەموو گیانلەبەرانەوە)، (بەڵام ئەو خوایە ئارامی و خۆگریی بێ سنوورە) لەبەر ئەوە تا کاتێکی دیاریکراو مۆڵەتی ئەو خەڵکە دەدات، هەر کاتێ ڕۆژیان تەواو بوو نە تاوێک مۆڵەت دەدرێن و دوادەخرێن، نە پێشیش دەخرێن (بەڵکو لەچرکەی دیاریکراوی خۆیدا لەناو دەبرێن).

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی آل عمران ئایەتی ١٤٥ دەفەرمووێت:

﴿وَمَا كَانَ لِنَفۡسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذۡنِ ٱللَّهِ كِتَٰبٗا مُّؤَجَّلٗاۗ وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ١٤٥﴾ آل عمران. هیچ کەسێک نامرێت مەگەر لەسەر ویستی خوا نەبێت، لە کات و وەختی دیاری کراودا (ئەمەش خۆی هاندەرێکە بۆ ئیماندار کە لە مەرگ نەترسێت) جا ئەوەی پاداشتی دنیای دەوێت پێی دەبەخشین، ئەوەش پاداشتی قیامەتی دەوێت هەر پێی دەبەخشین، (بێگومان) پاداشتی سوپاسگوزاران دەدەینەوە بە جوانترین شێوە.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی آل عمران ئایەتی ١٨٥ دەفەرمووێت:

﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ وَإِنَّمَا تُوَفَّوۡنَ أُجُورَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۖ فَمَن زُحۡزِحَ عَنِ ٱلنَّارِ وَأُدۡخِلَ ٱلۡجَنَّةَ فَقَدۡ فَازَۗ وَمَا ٱلۡحَيَوٰةُ ٱلدُّنۡيَآ إِلَّا مَتَٰعُ



ٱلۡغُرُورِ﴿١٨٥﴾ آل عمران. هەموو کەسێک دەبێت بمرێت، هەموو کەسێک دەبێت مردن بچێژێت، تەنها لە ڕۆژی قیامەتدا کرێ و پاداشتان بە تەواوی وەردەگرن و (دەرئەنجامی کردەوەکانتان دێتەوە ڕێتان) ئەوسا ئەوەی ڕزگار بوو لە ئاگر، ئەوەی دەرباز بوو لە دۆزەخ و خرایە بەهەشتەوە، ئەوە ئیتر سەرفراز و سەرکەوتووە، ژیانی دنیاش بێجگە لەوەی کە ڕابواردنێکی خەڵەتێنەرە (شتێکی تر نییە).



# بەندی حەوتەم

﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ وَمَا ٱخۡتَلَفَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا مِنۢ بَعۡدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلۡعِلۡمُ بَغۡيَۢا بَيۡنَهُمۡۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَإِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ﴿١٩﴾﴾ آل عمران.

بە ڕاستی دین و ئایینی پەسەند لای خوا تەنها ئایینی ئیسلامە، ئەوانەی کە کتێبە (ئاسمانییەکانیان) دراوەتێ، جیاوازیان لە نێواندا پەیدا نەبووە مەگەر دوای ئەوەی کە زانستی و زانیاری تەواویان پێ گەیشتووە (دەربارەی ڕاستی و تەواوی ئیسلام، بەڵام بەهۆی دنیا پەرستی و دوورنەبینییەوە) ستەمیان کردووە لە خۆیان و (لە ئایینی خوایش)، جا ئەوەی باوەڕی بە ئایەتەکانی خوا نەبێت، ئەوە بێگومان خوا بەخێرایی حسابی خۆی دەکات و (هەر زوو بە دۆزەخیان دەگەیەنێت).

# ئایین چییە و کام ئایین ڕاستە؟

لەم بەندەدا زیاتر لەگەڵ تۆی بەڕێزدا قاڵ دەبینەوە و لێوردبـوونەوە و شیکاریەک دەکەین بۆ ئەوەی بزانین ئایین واتای چییە، بۆ نـاونراوە ئـایین کام ئایین ڕاستە، ئەم هەموو ئایینە بۆ؟

ئەم هەمـوو پرسـیارە بـۆچی، هیواخـوازم لەکۆتاییـدا تـۆی بەڕێـز لەم مەمـلەکەتەی خـۆم و خـۆت دا سـوودم پێـت گەیانـدبێتیت و ئەم باسـە تەواوکەری باســەکانی دوای خــۆیەتی بــۆ ئەوەی بتــوانم ئەو پرســیارە ئاڵۆزانەی لە مێشکی تۆدایە شیبکەمەوە و هەموو سەرەداو و دەزوولەکان جیابکەینەوە و بیگەیەنینە هێڵی ڕاست و ڕێڕەوی خۆی تا وەڵامی هەمـوو پرسیارەکانمان دەست بکەوێت کە دەڵێین وەڵامی هەموو پرسیارەکان واتـا پرسیارە بنەڕەتییەکان کە فێری مەلەوانیمان دەکەن لە دەریای باوەڕ و بیـر و فیکر و فەلسەفە و زانست و مەعریفە بەگشتی.

هەر بۆ خۆی وشەی ئایین یـاخود (دیـن) جیهـانێکی زۆر بەرفـراوانە و بەهەزارەها پەرتووک و لێکـۆڵینەوەی لەسـەر کـراوە، هەر لە وشـەی دیـن تێگەیشتی سـەرەتای کـردنەوەی دەرگـای جیهـانبینی و دنیـا بینـی تـۆیە و وەکو ئاوێک لە سوراحییەک بۆناو پەرداخێک چەندە ئاسانە تێکردنـی ئـاوا بۆت ئاسان دەبێـت جیهـانبینی و دیـد و تێڕوانینـت بـۆ ژیـان و مـرۆڤ و گەردوون کە بنەمـای ســەرەکی فیکـر و فەلسـەفەن لە دینـی ئیسـلام دا بنەمای بیروباوەڕی لەسەر دادەمەزرێت.

ئایین زۆرە لە جیهاندا بەتایبەت لە کیشوەری ئاسیا، ئەم هەبوونی فـرە ئایینیە وای کردووە کە خەڵکی تاڕادەیەک سەری لێ تێـک بچێـت و بڵێـت داخۆ کامیان ڕاست بـن. مـن کـامە هەڵـدەبژێرم، پێـوەر چیـیە بـۆ ئـایینی



ڕاست و دروست، ئاخر هەموو خەڵکی توانای ئەوەی نییە کات تەرخان بکات بۆ لێکۆڵینەوە لەم هەموو ئایینە، کەواتە خەڵکی بەگشتی و تۆی هاوڕێی من لێرەوە لەوانەیە هەمان پرسیارمان بۆ دروست بوبێت، بەڵام گرنگە من و تۆ وەڵامێکمان دەست بکەوێت.

## "دین" ئایین واتای چییە؟

خوای پەروەردگار کە زمانی عەرەبی هەڵبژاردووە بۆ کۆتا پەیامی کەوا دینی ئیسلامە هەروا شتێکی سادە و ساکار نییە، بەڵکو موعجیزە و حیکمەتەی تایبەتی تێدایە زمانی عەرەبی، گومانی تێدا نییە زمانی هێز و توانا و بەرزی و حوکم و دادگەرییە. هیچ فەیلەسوف و بیرمەند و خاوەن هێزی فیکری و توانای ژیری پێش هاتنی ئیسلام تیا نەبووە و ئەم زمانەیان بەکار نەهێناوە، بەڵکو قورئان کەلامی خوای پەروەردگارە هات هەموویانی سەرسام کرد و زانا و دانشمەند و شاعیرەکانی تووشی شۆک کرد لەگەڵ ئەوەی داوای لێکردن هاوشێوەی بنووسن نەیانتوانی، زۆر لەم باسانەمان باس کردووە درێژەی پێ نادەین لێرەدا، لێرەدا مەبەست لە وشەی "دین"ە

دین واتای یەکجار زۆرە لە ڕووی زمانەوانی و زاراوەیشەوە دین چوار مانای سەرەکی هەیە، کە ئەبو ئەعلای مەودوودی (بەڕەحمەت بێت) باسی کردووە.

دین: بەواتای ناچارکردن، دەسەڵات، حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی کردن-ە.

دینی ئیسلام واتای چییە: ئەویش چوار مانای سەرەکی هەیە.

یەکەم: ناسینی خوای خاوەن هێز و دەسەڵات و خاوەن هەموو ناوو سیفاتێکی پیرۆز کە کردگارە و خالقە و بەتوانایە و سوود و زەرەر و تەکبیری هەموو بوونەوەر دەکات و مردن و ژیانی بەدەستە..هتد. ئەم مانایە زیاتر باسی یەکتاپەرستییە لەناو سیفاتە پیرۆزەکانی خوا.

دووەم: تەسلیم بوونە بە پەروەردگار و گەردن کەچی نواندن و وەرگرتنی فەرمانە لەخاوەن ئایینەکە، کە مەبەست خوای موتەعالە و هەموو بەندایەتی و سەردانەواندن و زەلیلیەک هەر بۆ ئەو زاتەیە، ئەمەش مانای یەکتاپەرستی یە لە خودایەتی واتا ئولوهیەت.

﴿قُلْ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ﴿١٦٢﴾﴾ الأنعام.

(ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: بەڕاستی نوێژو خواپەرستی و ژیان ومردنم بۆ خوا، پەروەردگاری جیهانەکان تەرخان کردووە.

سێیەم: ئاراستەی خوای موتەعال لە ڕێباز، شەریعەت، یاسا، ڕێسا، فەرمان و بەرهەڵستکاری و ڕازی بوونە بە هەموو فەرمان و یاسا و مەنهەجەکەی لەسەرەتای تا کۆتایی بێ دوودڵی و بێ پشتگوێ خستن و یەقین. بێ ئەمەش یەکتاپەرستی دادگەری خوایە لە حوکم ڕێسا و یاسایدا (توحید الحاكمه).

چوارەم: مانای دین بڕوابوونە بە ڕۆژی قیامەت و نیشانەکانی و گەڕانەوە بۆلای خوای پەروەردگار کە هەرخۆی خالق و داناو زانایە بەسەر بوونەوەر و ئەم بوونەوە کە خۆی دروستی کردووە، بە نەوامیس و ئەمری زاتی پاکی دەڕوات و ئەو زاتە ستراتیژی بۆ داناوە، ئەمەش یەکتاپەرستی و پەروەردگارێتییە (توحید الربوبیة)و (مالک یوم الدين).



ئەگەر لەم چوار بەشەی باسمان کرد، کەسی تر هاوشێوەی لەم دنیایەدا کاری کرد ئەوە پێی دەوترێت (ئایین) ئەم خەسڵەتانەی لە ئایینی ئیسلامدا هەیە هەرکەسی تر و هەر لایەن و گروپێک بانگەشەی ئەوەی کرد دەبێت خەڵکی زەلیل بن بۆ ئاراستە، فەرمان، حوکم و یاسا و ڕێسای دارڕشت ئەوا ئەوەش پێی دەوترێت ئایین.

بۆ نموونە کە دەڵێین: دان الناس

واتا: خەڵکی ناچار دەکات بۆ گوێڕایەڵی کردن، یاخود دەڵێین: دان الرجل: بەواتای عیزەت و سەربەرز بوون. خۆ ئەگەر وتمان دِنتَ الرجل: واتا پیاوەکەی ناچار کرد

یان ئەگەر وترا: (دانَهُ) واتا: کاروباری بەڕێوە برد و خستیە ژێر ڕکێفی خۆی، یان خستیە ژێردەستی و بەڕێوەی دەبات یان وتمان: دانَ القوم: واتا سیاسەت و کاروباری ئەو گەل و نەتەوەی خستە ژێر دەستی و بەڕێوەی دەبات.

دیّان: بەواتای قاضی و حاکم و دادوەر دێت.

ئەگەر بەکەسێک وترا دیّان: واتا زاڵ بووە بەسەر خەڵکدا و خاوەن دەسەڵاتە. ئەگەر وترا: مدین: کۆیلەکان، وە بۆ ئافرەتیش دوترێت مدینة. هەمووی سەرچاوەی وشەی دینە جا لێرەدا مەبەستە تۆ کام دینت هەڵبژاردووە و تەسلیمی بویت و گەردن کەچی بۆی؟!

## خوای پەروەردگار خاوەنی دینی ئیسلامە

هەروەکـو پێشـتر لەسـەرەتای ئەم بەنـدەوە ڕوونمـان کـردەوە ئەوەی پەیوەندی بە یاسا و حوکم و مەنهەج و گـوێڕایەڵی و ئاراسـتە و عیبـادەت و..هتد هەبێت ئەوە ناوی دینە، بەبەڵگەی ئەوەی موشریکەکـانی مەکـکە پەیکەری لات و عوزایان دەپەرست، خوای گەورە ناوی ناون بە دیـن بـۆیە بە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: ئەی محمد پێیان بڵێ (لكم دينكم ولي دين).

لە ئێستادا بەرنامە دەسـتکردەکانی دەسـتی مـرۆڤ وەکـو دیمـوکراتی، کۆمۆنیستی، شیوعی، سـەمایەداری، لیبراڵی..هتـد ئەمـانە هەمـوو ئـایینن، ئاراسـتە و خـاوەنی دەسـەڵات و یاسـا و ڕێسـایان بەئـارەزووی خۆیـان دارِشـتووە و حـوکمی پـێ دەکەن، هەریەک لەم نـاوانە خـاوەنی ئـایینی خۆیەتی و بە ویستی خۆی کۆمەڵگا ئاراستە دەکـات و یاسـا و ڕێسـای بـۆ دادەنێت و خاوەنی شارستانێتی تایبەت بە خۆیانن.

هەنـدێک لە ئایینەکـانی تـر ئـایینی دروشـمی و بەنـدایەتین هـیچ پەیوەنـدیان بە ئاراسـتە و دادگـا و حـوکم و دەسـەڵاتەوە نیـیە، وەکـو ئایینەکـانی هینـدۆس، کریشـنا، میترایـی، زەردەشـتی، بـودی، لاتسـتۆیی، کۆنفۆشیۆسی و یارسانی..هتد. ئەم ئایینانە ئایینی نـاو مەعـبەد و کـونج و تەنهایی و هیوا خواسـتنن، کە زۆرێـک لە جیهانـدا خـاوەنی ئەم ئایینـانەن بەتایبەت لە ئاسیا.

ئایینەکانی تری دروسـتکراوی وەکـو یەهـودی و نەسرانـی و صـائیبی و هەندێک ئایینی تر کە بانگەشەی ئاسمانی دەکـات، ئەمـانەش هەموویـان وجودیان هەیە و خاوەن حوکم و دەسەڵاتن و ئاراستەی کۆمەڵگـا دەکەن،



نموونەی کیانی ئیسرائیل لە فەڵەستین، ڤاتیکان و هەندێک لە وڵاتانی ئەفەریقا و ئەمەریکای لاتین.

ئەمانەی باسمان کردن هیچ پەیوەندی بەخوای پەروەردگارەوە نییە و دەستکردی مرۆڤن، پەروەردگار خاوەنی ئایینی ئیسلامە، ئەم ئایینە لە ئادەمەوە دەست پێ دەکات تاوەکو بۆ خاتەم محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

واتا ئایینی هەموو پێغەمبەرانە بۆ نموونە ئایینی نەسرانی کەو ئایینێکی ئاسمانییە لە جیهاندا شوێنکەتوانی زۆرە و یەکەمینە، خوای گەورە لەسەر زمانی پێغەمبەرو شوێنکەتوان و پشتیوانانی لە سورەتی آل عمران ئایەتی ٥٢-٥٣دا دەفەرمووێت:

﴿۞ فَلَمَّآ أَحَسَّ عِيسَىٰ مِنۡهُمُ ٱلۡكُفۡرَ قَالَ مَنۡ أَنصَارِيٓ إِلَى ٱللَّهِۖ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ نَحۡنُ أَنصَارُ ٱللَّهِ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّا مُسۡلِمُونَ ٥٢﴾ کاتێ کە عیسا هەستی بە کوفرو بێ دینی ئەوانە کرد وتی: کێ پشتیوانمە بۆ لای خوا (کێ دێت تا پێکەوە بەرنامەی خوا بگەیەنین)، حەوارییەکان وتیان ئێمەین پشتیوانانی دین و ئایینی خوا، باوەڕی تەواومان بەو خوایە هەیە، تۆ بە شایەت بە کە ئێمە موسوڵمان و ملکەچ و فەرمانبەردارین.

﴿رَبَّنَآ ءَامَنَّا بِمَآ أَنزَلۡتَ وَٱتَّبَعۡنَا ٱلرَّسُولَ فَٱكۡتُبۡنَا مَعَ ٱلشَّٰهِدِينَ ٥٣﴾ آل عمران. ئەوسا وتیان: پەروەردگارا ئێمە باوەڕمان هەیە، بەوەی ڕەوانەت کردووە وە شوێنی پێغەمبەرەکەش کەوتوین، دە لە ڕیزی شایەتەکانی (گەیاندنی بەرنامەکەتا) یاداشتمان بکە.

هەروەها لە سورەتی المائدة ئایەتی ١١١-١١٢دا دەفەرمووێت:

﴿وَإِذۡ أَوۡحَيۡتُ إِلَى ٱلۡحَوَارِيِّـۧنَ أَنۡ ءَامِنُواْ بِي وَبِرَسُولِي قَالُوٓاْ ءَامَنَّا وَٱشۡهَدۡ بِأَنَّنَا مُسۡلِمُونَ ١١١﴾ وە هەروەها یادی ئەو نیعمەتەم بەسەرتەوە بکە کاتێک کە هیدایەتم دان و خستمە دڵی قوتابیە دڵسۆز و نزیکەکانتەوە کە باوەڕ بەیەکخوایەتی خوای بەرز وبڵند و پایەبەرز بهێنن و باوەڕ بەپەیامبەرێتی تۆش بکەن، ئەوانیش وتیان: ئەی پەروەردگارمان باوەڕمان هێنا و بەڕاستی دەزانین، سا تۆ شاهێدبە کە ئێمە ملکەچ و فەرمانبەرداری تۆین.

﴿إِذۡ قَالَ ٱلۡحَوَارِيُّونَ يَٰعِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ هَلۡ يَسۡتَطِيعُ رَبُّكَ أَن يُنَزِّلَ عَلَيۡنَا مَآئِدَةٗ مِّنَ ٱلسَّمَآءِۖ قَالَ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ١١٢﴾ المائدة.

وەبیری ئەوەش بکەرەوە کە حەواریەکان وتیان: ئەی عیسای کوڕی مەریەم ئایا پەروەردگارت دەتوانێت ئەگەر داوای لێ بکەیت خوانێکی پڕ لە خواردنمان بۆ دابەزێنێت لە ئاسمانەوە ؟ وەڵامی عیساش ئەوەبوو کە فەرمانی پێکردن کە لە سزای خوای بەرز وبڵند وپایەبەرز بترسن ئەگەر بەڕاستی باوەڕدارن.

هەروەها لە جێگایەکی تردا لە سورەتی آل عمران ئایەتی ٨٢-٨٥دا خوای گەورە لە ئیبراهیمەوە تا عیسا و هەموو پێغەمبەران بەگشتی دەفەرمووێت: ئایینیان ئایینی ئیسلام بووە.

﴿فَمَن تَوَلَّىٰ بَعۡدَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ٨٢﴾ جا ئەوەی پشتی هەڵکردو سەرپێچی کرد دوای ئەو هەموو پەیمانە، ئا ئەوانە لە فاسق و گوناهکارانن

﴿أَفَغَيۡرَ دِينِ ٱللَّهِ يَبۡغُونَ وَلَهُۥٓ أَسۡلَمَ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ طَوۡعٗا وَكَرۡهٗا وَإِلَيۡهِ يُرۡجَعُونَ٨٣﴾ ئایا ئەوانە بێجگە لە ئایینی خوا شتێکی تریان



دەوێت؟! لە کاتێکدا کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویدایە تەسلیم و ملکەچی پەروەردگارە بە ڕەزامەندیی بێت یا بەناچاری، هەمووانیش هەر بۆلای ئەو دەگەڕێتەوە.

﴿قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٨٤﴾ (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: باوەڕمان بە خواو بەوە هەیە کە دابەزێنراوە بۆمان، بەوەش کە دابەزێنراوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی، بەوەش کە دراوە بە موسا و عیساو پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە. ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچکامیاندا، هەموانمان تەسلیمی ئەو پەروەردگارەین.

﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٨٥﴾ آل عمران. جا ئەوەی بێجگە لە ئایینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئایینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت، لە قیامەتیشدا لە خەسارەتمەندو زەرەرمەندانە.

گرنگە بزانرێت خوای گەورە هیچ ئایینێک قبوڵ ناکات و ڕەتی دەکاتەوە بێجگە ئایینەکەی خۆی کە ئیسلامە ﴿إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ .. ١٩﴾ آل عمران.

ئیسلام بەتەنها ئەوە نییە بانگەشە بکەیت و بڵێیت من موسوڵمانم، هەڵکردنی ئاڵاکەی و دروشمەکانی نییە، یان وابزانرێت تەنها شایەتومانە بەزمان کە بوترێت و دڵت هیچ نییەت و ڕاستیەکی تیانەبێت و کردارەکانت نەبێتە ئاوێنە بۆ دڵ و گۆڕ و کفنت.



لەهەمان کاتدا بزانیت تەنها دروشمی تاکە کەسیە و بریتییە لە نـوێژ و ڕۆژو و زەکاتـدان و حەج کردن.هتـد. نـا، بەڵکـو ئیسـلام ئەوەیە کە خـوا دەیەوێت نەک کە تۆ دەتەوێت یان دەسـەڵاتدارە ڕەزا قورسـەکان پیـادەی دەکەن، ئیســلام تەســلیم بــوونە بە تەواوی ئەوەی خــوای پەروەردگــار دەیەوێت بەبێ ئەوەی لێی کەم و زیاد بکەیت. ئیسلام گوێڕایەڵی و شوێن کەوتنە، ئیسـلام دادوەرێتـی خـوای گەورەیە لەنێـوان هەمـو خەڵکیـدا بـۆ کاروباریــــــان، ئیســــــلام ئەو شارســــــتانییەتەیە کە پێغەمــــــبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هێنـایی و دوو شارسـتانێتی گەورە و زەبەلاحـی دا بەزەویدا و کە بریتی بوون لە ڕۆم و فارس. ئیسلام ئەو دینەیە بە درێژایـی ١٣٠٠ ساڵ حوکمڕانی و فەرمانڕەوایی کرد.

ئیسلام تەنها ئایینی مرۆڤەکان نییە، بەڵکو ئـایینی جنـۆکە و فریشـتە و بگرە هەموو گەردوونە،، خوای پەروەردگار بە ئیسـلام و دیـنەکەی ڕاگیـری کردووە، دینی ئیسلام ئایینی هەموو ئەم گەردوونەیە.

بەکـورتی و پـوختی ئیسـلام تەنهـا بە وتـن نیـیە بە شـایەتومان، ئەگەر شـوێن (لا إله إلا الـله) نەکەویـن کە بەیەکتاپەرسـتی لە بەنـدایەتی و لە حوکم و لە پەروەردگارێتی و لەکردار و ڕەفتارتدا ڕەنگدانەوەی نەبێت.

جۆرج بێرنارد شۆ دەڵێت: یەک ئایین هەیە، بەڵام ڕووەکانی سەد جۆرە یان یەک ئایینە و سەد وێنەی هەیە!



# مێژووی ئایین

هیچ شارستانێتیەک نییە بێ مەعبود و جێگای خواپەرستی، هیچ گوند و شارێک و شارۆچکەیەک نادۆزیتەوە بێ جێگای کڕنوش بردن و داواکاری لە هێزێک لەسەرووی توانای مرۆڤ و سروشتەوەیە.

زاناکانی زانستی (ئەنترۆپۆلۆژی) واتا زانستی مرۆڤناسی، یەک زانا لەناویانا نییە بڵێت لە سروشتی مرۆڤ نییە وا هەڵنەکەوێت و حەزی بە دینداری نەبێت و بەدوای هێز و توانایەکدا نەگەڕێت کە داوای لێبکات.

تەنانەت لە وڵاتی نەرویج و سوید کە دوو وڵاتن پڕن لە مولحید و بێباوەڕ بەخوا، کاتێک کە پرسیاریان لێ دەکەیت لەناخ و بۆچون و داوایاندا دەیان خوایان بۆ خۆیان دروست کردووە زۆربەیان بڕوایان (بە دڵداری و خۆشەویستی) هەیە وەکو خوا دەیپەرستن و بۆ بەندایەتی کردن بۆ خواکەیان مۆسیقا و سەما وەکو سروتی ئایینی تایبەت بە خۆیان دەکەن و مۆم و ڕۆمانسیەت بەکاردەهێنن کە زیاتر لەسەر ئەم باسانە دەدوێین لە داهاتوودا بە پشتیوانی خوای موتەعال.

هەر پاشماوەیەکی دێرین لە ئارکۆلۆژیا و دیکۆمێنتە مێژووییەکان بەتایبەت شارستانێتیە سەرەتاییەکانی وەکو (بابلی، ئاشوری، ئەکەدی، لۆلۆی و فیرعەونی، تەنانەت طەوتەمەکانی ئەمەریکا) هەموو باس لە پەیوەندی نێوان مرۆڤ و خوای پەروەردگار دەکەن.

لە ئاشوریەکاندا باس لە پەیوەندی مرۆڤی نەمرو خودای نەمر دەکات، هەروەها لە بابلیەکاندا باس لە هاتنی مرۆڤ لە ئاسمانەوە بۆ سەرزەوی دەکات، پاشان فیرعەونەکان باس لە ئادەم و حەوا و خوای ئاسمان دەکەن..هتد.



ئەگەر هەمـووی تەماشـا بكەیـن هەر مێـژووی ڕاسـتەقینەی ئـادەمە لەگەڵ دایكە حەوا كە دووبارە دەبێتەوە لەسەر زەوی و بەهەشت. هتد.

یاخود لە (مەلحەمەی گلگامێش)دا باسی لە نوح و لافاوەكەی دەكـات، كێشـە ئەوەیە لە لێكـۆڵەرەوانی مێـژوو هەزارەهـا سـاڵ بەدوای یەكـدا كە بەیەک واتا و جەوهەر، بەڵام بە شـێوەی گێـڕانەوەی جیـاواز نـاوی دەنـێن ئەفسانە!.

## ئەفسانەی ئایین

لەڕاسـتیدا ئەفسـانەی ئـایین زۆرە، هۆكـاری دروسـتبوونی ئەفسـانە ئایینیەكـان دەگەڕێـتەوە بـۆ ئـارەزوو هەواو نەفسـی دەسـەڵاتدار و فەیلەسوفەكان، بەشێكی تری دەگەڕێتەوە بۆ داهێنـانی مـرۆڤ لە دیـن دا ئەوەی كە پێغەمـبەری ئیسـلام صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ جەختـی لەسـەر كردۆتەوە ناوی نـاوە (بیـدعە). ئەم هۆكـارە بەئـارەزووی دەسـەڵاتدارەكان داهێـنراون، وەكـو قـوڕەیش بـۆ ئەوەی خـاوەن عەشـیرەت و پـارەدار و نەجیبەكانیان خۆش بـژین، پیـاوانی تـری عەرەب پـێش هـاتنی ئیسـلام بـۆ ئەوەی منـداڵەكانیان شـەریف و پـارەدار دەربچـن، دەچـوون خێـزان و هاوسەرەكانیان دەنارد لەگەڵ پیـاو مـاقوڵانی قـوڕەیش بـخەون بـۆ ئەوەی منداڵی نەجیب و خاوەن هێز و پارەدار لەدایـک بێـت، ئەمە نـاونرابوو بە دیـن و كـاهین و ڕاهیبەكـان پشـتگیریان دەكـرد و ئـارەزووی پیـاوانی قوڕەیشی تێردەكرد.

یان دروسـتكردنی خێزانـی خـوا لەئاسـماندا لە سـەردەمی شارسـتانێتی فیرعەونەكان و ڕۆمادا بەناوی (كرونوس و ڕیئای خێزانی و زئوسی كوڕی)



که دوای شادڵ یاخود قەشە پۆڵس ئـایینی مەسـیحی گـۆڕی بـۆ ئـارەزووی پیاوانی ڕۆم بەناوی (کوڕ و باوک و ڕۆحی قودوس) لە ئایینی نەسارادا.

یاخود مادیەتیی یەهودی و بڕوابوونیان بە بەرجەستەیی هەموو شتێک وای لێکردن دەسـتکاری ئایینەکەیـان بـکەن و خۆیـان بە یەهـود و نەوەی خوا بەگشتی بزانن و بەگەلی هەڵبژاردەی خوا ناوبنێن.

لە هیندسـتان دا ئەو هەمـوو ئـایینە هەیە لە سـەربنەمای فەلسـەفەی کـۆن دامەزراوە کە بـریتییە لە (خـاک، ئـاووهەوا و ئـاگر) هەمـوو ئەمـانە ئەگەرچی ئەفسانە کرۆکی هەڵدڕیون، بەڵام بۆ سێ چەمک کاردەکەن

* وجود  چییە؟

* زانیاری دەربارەی وجود  بوون

* ڕەوشت چییە؟

هەموو ئایینەکان لەیەک باسدا هاوبەشن ئەویـش ئەوەیە کە خـوایەک هەیە چـاودێرە و دەبێـت پەیوەنـدیمان پێـوەی هەبێـت. ئەمە جەوهەر و بـاس و داوای هەرچـی ئـایینە هەیە لەسـەرزەویدا، بەڵام هۆکـاری ئەوەی تووشـی ئەفسـانە بـوون، ڕێگـای چـوون بەرەو خـوا  یـان دروسـتکردنی پەیوەنـدی لەگەڵ ئەو هێـزە لە ئاسـماندا یـاخود لەسـەرووی مـرۆڤەوە، هەرکەسە یان هەر هۆزە و عەشـیرەت و گەل و نەتەوە و وڵاتێـک شـار و شارستانییەتێک، بە ئارەزووی خۆی ڕێگای بۆ داناوە، سـەریان  لەخۆیـان و لە خەڵکی بەگشتی تێکداوە.

پێنج نموونەی فەیلەسوفی بێباوەڕی جیهان بە کورتی باس دەکەیـن بـۆ ئەوەی بـزانین ئەفسـانەکان چـۆن سـەریان هەڵـداوە، کۆتـاییەکەی چ ئاکامێکی هەبوو. خەڵکی لە سەرەتایی هەرەتـی لاویـدا زۆر خـۆ بەزل زان

بون، ڕۆحی خوایەتیان لەخۆیاندا بەدی دەکرد، ئەم قسەیە گشتییە مەگەر ئەوانەی کە بەهۆکاری ئایینێک خۆیان لەو دەردە کوشندەیە ڕزگار بکەن، دەنا خۆیان هەربەخوا دەبینن تا لەکۆتایی دەمرن.

یەکەم: جان پۆل سارتەر: هەموو تەمەنی لەگەڕان بەدوای وجودی بوونی خوادا بەکارهێنا، ئەوەی کە نەشیا و بوو کردیان لەگەڵ خۆشەویستەکەی سیمۆن دی بۆفوار لەسەرە مەرگدا داوای کرد لە خۆشەویستەکەی کە قەشەیەکی بۆ بانگ بکات تا دان بە تاوانەکانیدا بنێت و تەوبە بکات، سیمۆن زۆری لا سەیر بوو وتی تۆ بەدوای ئەوەوە بوویت ژیان بێ خوایە و هیچ خوایەک نییە، بەڵام سارتەر زۆری لێکرد و لەکۆتاییدا قەشەیەک هات و دانی نا بە شکست و تاوانەکەیدا و ئەم فەیلەسوفە هەموو ئایینەکانی بە ئەفسانە دەزانی (وتەیەکی هاوبەشی خەڵکی بۆ ئەم جۆرە کەسانە ئەوەیە کە دەڵێن بۆیە پەشیمان دەبنەوە چونکە لە مردن دەترسن).

سیمۆن وتی: سارتەر لە مردن ترساوە و پیر بووە بۆیە کەوتۆتە ئەو هەڵەیەوە و داوای کرد کە قەشەی بۆ بانگ بکەم.

دووەم: داروین: بە پەیامبەری مولحید و بێباوەڕەکان دادەنرێت و خاوەنی کتێبی (بنەڕەتی جۆرەکانە "أصل الأنواع") و باس لە بنەڕەت و گۆڕانکاری لە بوونەوە دەکات و ناسراوە بە (ئەڤەلەیشن) ئەویش لەکۆتایی تەمەنی دانی نا بەوەی کە هەڵە بووە و پەشیمان بوویەوە لەوەی نووسیویەتی و وتویەتی سەبارەت بە خوای نەسارا لەوەڵامدا وتیان پیربووەو فشاری کڵێسای لەسەربووە بۆیە پەشیمان بۆتەوە.



سێیەم: ڤۆڵتەر: بە باوکی گۆرانکاری لە فەڕەنسا و تەنانەت لەجیهانی عەلمانی دادەنرێت لەسەرە مەرگیدا داوای کرد قەشەیەکی بۆ بانگ بکەن بۆ ئەوەی تۆبە بکات و دان بە هەڵەکانیدا بنێت، بەڵام هیچ قەشەیەک ڕازی نەبوو بچێتە لای، تەنها یەک قەشە وتی من دەچم گوێ لە قسەکانی دەگرم، بەڵام بەمەرجی ئەوەی بڕواتە کڵێسای کاتۆلیکی و لەوێ تۆبە بکات، ئەویش زۆر ناڕەحەت بوو تا پەیامێکی نووسی و لەپەیامەکەیدا دەڵێت:

من لەسەر باوەڕ بوون بە خوا و خۆشەویستیم بۆ خەڵک و هاوڕێکانم و هەروەها ڕقم لە دوژمنەکانم دەبێتەوە" کە ئەفسانەیان خزاندۆتە ناو ئایین، هەر بەم هۆکارە دەمرم." ئەم تێز و چامەیە زیاتر بۆ عەلمانیەکان باس دەکەین کە دەڵێن کاتی پیربوون و سەرەمەرگی بوو ترسا بۆیە وای وت!

چوارەم: ستیڤنس هاوکینگ: زاناو فەیلەسوفی بەناوبانگی بەریتانی لەکۆتایی تەمەنیدا کتێبێکی نووسی بەناونیشانی (پرسیارە گەورەکان) لەم کتێبەدا دیارە کەوا ستیڤنس لەترسدا دەژی و بەناڕاستەوخۆ دان بە هێزێکدا دەنێت کە لەسەروو هەموو هێز و توانا و زانستە فیزیاییەکانەوەیە، بەڵام سومعە و لوتبەرزی ڕێگای پێنەداوە بەڕاشکاوانە دان بە بوونی خوادا بنێت، بۆیە زۆرێک لە زانایان بەتایبەت پۆڵ دەیڤیس دەڵێت ترسێکی زۆر بە ستیڤنس-ەوە دیارە بۆ ئەوەی کە کۆتایی تەمەنێتی و دەگەڕێتەوە بۆلای خوا.

پێنجەم: ئەنطۆنیۆ فلو: فەیلەسوفی بەناوبانگی ئیلحاد پەنجا ساڵ بانگەشەی بۆ ئیلحاد و بێباوەڕی کرد، لە کۆتاییدا وتی خوا بوونی هەیە.

لەبەرانبەردا ئەم فەیلەسوفە ڕیچارد دوکینز دەڵێـت (سـێر ئەنطۆنیـۆ فلـو) پیر بووە و خلەفاوە بۆیە دەڵێت خوا هەیە.

جەوهەری باسـەکەمان ئەوەیە: ئەگەرچـی ئەفسـانە تـێکەڵ کرابێـت لەگەڵ ئـایین دا، بەڵام هـیچ مرۆڤێـک نیـیە لەنـاخ و هەسـت و بوونیـادی خوودی مرۆڤەکەدا بڕوای بەبوونی خوایەک نەبێت.

کەواتە بڕوابـوون بەخـوا پەیوەنـدیەکی ڕۆحـانی عـاطفی سـۆزداری ڕۆمانسیەتە، پەیوەندی ئایینی لەسەر بنەمای عەقـڵ و بڕوابـوون دروسـت دەکات.

لە کۆتاییـدا ئەگەرچـی ئاییەنەکـان ئەو قسـەیان تـێکەڵ کـراوە، بەڵام لێکچـوون ڕۆحـی سـەرەتایان پێـوە دیـارە و ناتوانرێـت جیـابکرێتەوە و هاوبەش هەیە لە نێوانیاندا، بۆ نموونە:

* هەمووی بڕوای بە خوا هەیە کە ئەبەدی و ئەزەلیە.

* لەڕێگای پەیام یاخود نامە و کتێبەوە خۆی ناساندووە.

* ڕەوانەکردنـی پێغەمـبەران بـۆ بەسـتنی پەیوەنـدی لەگەڵ خـوادا و ڕێکخستنی پەیوەندیەکە.

* باسی دروستبوونی گەردوون و مرۆڤ دەکات.

* بەشە نهێنیەکـانی گەلانـی پێشـوو و غەیـب لەخـۆ دەگرێـت لەگەڵ ڕووداوەکاندا.

* هەموویـان بەجۆرێـک لە جۆرەکـان نـوێژ و نـوێژ و ڕۆژ و حەج و زەکاتیان هەیە.

* ئایینەکان مزگەوت و مەعبەد و تەمپڵ و جێگای پیرۆزیان هەیە.





*هەموو ئایینەکان باسی ژیانی دوای ئەم ژیانە دەکەن.

*هەموو ئایینەکان پیاوانی ئایینی و دانا و زانایان هەیە.

*هەموو ئایینەکان کار لەسەر ئاراستە و سیستەمی ڕەوشتی دەکەن.

ئەم خاڵانە ئەوەمان بۆ دەردەخات ئایین هەریەک ئایینە وەکو جۆرج دەڵێت، بەڵام بەسەد وێنە خۆی نیشان ئەدات، ئەم خۆنیشاندانە هۆکاری ویست و ئارەزووی خەڵکەکان بووە کە ئەوان ناساندوویانە، بەڵام ئایین یەک ئایینە و لای خوای گەورەوە هاتووە ئەویش ئایینی هەموو پێغەمبەرانە، ناوی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، تەنها شەریعەت جیاواز بووە، بەڵکو یەک ئایین هەبووە هەر ئەو ئایینەش دەمێنێتەوە تا ڕۆژی قیامەت کە ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

## نەخشە ڕێگای دینی ڕەهاو ڕاستەقینە

من و تۆ لەم مەملەکەتەدا گومانمان نییە لەڕاستی و دروستی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەڵام خۆ دەبێت بەڵگەی ئەوتۆ و تاڕادەیەک قسەی قەناعەت پێکەرمان هەبێت بۆ خەڵکانی دیکە، کەبۆچی من و تۆ ئەم ئایینی ئیسلامەمان هەڵبژاردووە. بۆ نموونە بەندە وەکو ماکوان کەریم لەناوبنەماڵەیەکی کورد پەروەرد و نیشتمان پەروەردا لەدایک بووم کە هیچ سۆز و عاطیفەیەک بۆ ئایین نەبووە، ئەوەی گرنگ بووە تەنها چۆن نیشتمان ڕزگاری بێت لەدەستی داگیرکەران. ئەمە سەرەکیترین ئامانج بووە لەناو بنەماڵەکەماندا، ئەویش بیروبۆچوونی عەلمانی و کۆمەڵەی لینینی و مارکسی بووە، ڕۆژێک لە ڕۆژان باوک و دایک یان باپیر و نەنک بەمنیان نەوتووە نوێژێک بۆ خوا بکە، بەڵام مانای وانەبووە کە دژی ئایینی ئیسلام



بوبن، وەکو هەموو خەڵکی تر ڕێزی ئایین و ئیسلامیان گرتووە، نوێژ و ڕۆژووی سادەی خۆشیان کردووە. پرسیارە جەوهەریەکە لێرەدا ئەوەیە بەندە بۆ ئیسلامم هەڵبژارد، دەشێ یەکەمجار لەڕووی سۆزداریەوە وەرمگرتبێت. بەڵام دوایی خوێندنەوەی تایبەتم هەبوو بۆ ئایین، تێگەیشتم کە ئایین پێکهاتووە لە سێ پایە، یاخود توخمی سەرەکی ئەویش (خودا، پەیامبەر و پەیامی خوایە بە پەیامبەرەکەیدا) ئەم نەخشە ڕێگایە زۆر گرنگ بوو بۆ ئەوەی بڕواو یەقینی سەد لە سەدم بۆ دروست بێت بۆ ئەم ئایینی پیرۆزی ئیسلامە. لەوانەیە تۆی بەڕێز پرسیارێک بە مێشکتدا بێت لە ئێستادا و بڵێیت باشە هەموو ئایینەکان تاڕادەیەک پێک هاتوون لەم سێ توخمە بۆ یەهودی بێت یان زەردەشتی یان هەر ئایینێکی تر بێجگە ئیسلام؟!

منیش لەوەڵامدا دەڵێم ئەم پرسیارە زۆر لۆژیکە و وەڵامەکەی زۆر ئاسانە، چونکە هەمیشە پرسیاری چاک و جوان و لۆژیکی وەڵامی ئاسان ئەدات بەدەستەوە و وەڵامەکەش بەهۆکاری کوالێتی پەیام و پەیامبەرەکەیەتی.

نەخشە ڕێگای ئایینی ئیسلام ڕەهایی و ڕاستەقینەت پێ نیشان دەدات و باشترین کوالیتی ئایینی پێ دەبەخشێت لەوانەیە دیسان تۆی بەڕێز بپرسی چۆن؟!

وەڵامەکە ئاسانە وەرە هەڵسانگاندێکی تایبەتیانەی بۆ بکەین، ئەوکات دەرئەنجام خۆی ئەدات بەدەستەوە، چەند خاڵێک وەردەگرین لە ناسینی ئایینەکەدا، وتمان توخمی ئایین پێک هاتووە لە سێ توخم (خوا، پەیامبەرو پەیام).



ناسینی خوا ئەگەر پەیامیش یان پێغەمبەریش نەبێت، خەڵکی هەست بەبوونی خوا دەکەن. نموونەی زۆرێک لە فەیلەسوفەکان و بیرمەندەکان و خەڵکی بەگشتی.

ئەشێت خەڵکانێک بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکەن و خەڵکی جاهیل و بێ عەقل کوێرانە شوێنیان بکەون، وەکو ئەحمەد قادیانی و حبانی کوڕی مەنەالله مراکشی و موتەنەبی شاعیر.هتد.

پەیام بۆ ئایین زۆر گرنگە، دەشێ پەیامی ئایینی زۆر بێت. بەڵام ئایا کام پەیام ڕاستە و پێوەر چییە بۆ ڕاستی پەیامەکە؟

بۆنموونە یەزیدیەکان کتێبێکیان هەیە، یەرسانی و کاکەیەکان کتێبیان هەیە، ئایینەکانی هیندیستان هەزارەهان کتێبیان هەیە، یەهود و نەسارا کتێبیان هەیە، ئیسلامیش قورئانی هەیە. سەرەتا سەنگی مەحەک بۆ ناسینی ئایینی ڕەها و ڕاستەقینە پەیامەکەیەتی، پێوەرەکان چین بۆ ڕاستی پەیام؟

ئەم پرسیارە زۆر گرنگە، پێوەر چییە بۆ ڕاستی و ڕەهایی پەیامەکە؟!

یەکەم: دەبێت خوات وەکو خوا پێ بناسێنێت

پێشتر ئاماژەمان پێ داوە خوا لە مەخلوقەکانی ناچێت ﴿.. لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ۖ ..﴿١١﴾﴾ الشورى.، کەواتە پەیامەکە دەبێت خوامان وەکو حەقیقەتی خوایەتی ڕەها و ڕاستی دڵنیایی سەد لەسەدی پێ بناسێنێت.

ئەگەر تەماشای ئایینەکان بکەین بەگشتی کەماڵ و جەماڵی خوای پەروەردگار نیشان نادات، بۆ نموونە مەسیحی و یەهودی کوڕ و منداڵ بۆ خوا بڕیار نەدەن، هیندۆس و کریشنا و ئایینی سامافیدا، ئەدهەر،

هەیدەم، بفوشیا برانم و بەهرامی کچی بۆ بڕیار ئەدەن بە پێچەوانەی نەسارا و یەهودی کە ئەم ئایینانە سەرەکین، ئەگەر خوا پێویستی بە کچ و کوڕ بوو کەواتە خوانییە و ناتەواو و نوقسانە و توانای بەڕێوەبردنی نییە، ئەگەرنا چ موحتاج و پێویستی بە کوڕ و کچ هەیە.

ئایینە بتپەرستیەکانی تری جیهان وەکو بوزایی، لاوتستۆیی و کۆفۆشیوس و تەوتەم و زەردەشتی و زۆری تر لەم جۆرانە، بڕوایان بە خوایەتی خوا بەتەنهای نییە، بەڵکو بڕوایان بە مەخلوق هەیە کە هەموو پێکەوە خوایان پێکهێناوە کە بیروباوەڕێکی کۆن و پوکاوەیە.

بەڵام ئیسلام کەباس لە خوا دەکات باسی خەسڵەت و ڕاستەقینەی هەقیقەتی خوا دەکات و خوودی خوا وەکو خۆی پێ دەناسێنێت و هیچ جۆرێک لە کەموکوڕی و ناتەواوی بۆ بیرکردنەوە جێناهێڵێت، ئەم پێوەری یەکەمە، زۆر گرنگە لە پەیامی ئایینەکاندا بێجگە ئیسلام کەس خاوەنی نییە.

دووەم: دەبێت ئامانجی بوونی تۆی مرۆڤ ڕوونبکاتەوە

ئامانج ئەوەیە کە لە ژیاندا دەبێت چاکە بکەیت، بەڵام هەر ئەوە بەس نییە، بەڵکو بۆ هاتوویت بۆ کوێ دەچیت ئەم هاتوو چوویەت ئامانجی چییە؟ ئەم پرسیارانەو وەڵامەکانیان گرنگە.

لەڕاستیدا بێجگە لە ئیسلام و یەهودی لەئایینەکانی تردا بوونی نییە، کوێرانە شوێن ئایینەکە کەوتوون یان هەڵخڵەتاندنی پێوە دیارە کە لە خاچ دراو بۆ سڕینەوەی تاوانەکانی مرۆڤ لەخاچ دراوە، ئەم بیروباوەڕە کە لە دینی ئەواندا هەیە وای کردووە کەمرۆڤە نەسرانییەکان زۆر بێ مۆڕاڵ بن،



دەبینیت تەنانەت لەڕووی ئەخلاقییەوە ئایینەکانی تر باشترن و هەندێک پابەندییان پێوە دەبینیت.

لە جیهانی نەسرانی و مەسیحی دا تەماشا دەکەیت ڕەواج بەهەرچی فەساد و خراپەکاری و خواردنی بەراز و مەی و نێربازی و مێ بازی و هەرچی کاری زشتە دەیکەن، تەنانەت چۆتە ناو کڵێسا و جێگا پیرۆزەکانیان.

ئایینەکانی تر بەگشتی دیارن یەکێک مشک دەپەرستێت ئەوی تر گا و ئاگر و داروبەرد و هەیکەل و تەنانەت لە سریلانکا و هیندستان و ڤێتنام و تایلەند و ژاپۆن عەورەتی ژن و پیاو دەپەرستن.

لێرەدا کەباسی یەهودیمان کرد لەڕاستیدا ئامانجێکی دیاریکراویان هەیە لە ئایینەکەیاندا، بەڵام تا بڵێی نازی و فاشیست و ڕاسیزمانەیە، ئامانجیان تەنها ئەوەیە یەهودیەتە و پێیان وایە گەلی هەڵبژاردەی خوان بۆ جێنشین و عیبادەت هاتوون و لەکۆتاییدا تا قیامەت بەس نەوەکانی یەعقوب دەڕۆنە بەهەشت و ئەوانی تر بۆ جەهەنەم کەهەموو ناچنە ٢٠ ملیۆن کەس لە جیهاندا!

کاتێک تەماشای ئیسلام دەکەیت ئامانج دیارە بۆچی هاتوویت کە تەوحید و بەندایەتی و گەڕانەوە و ئاوەدان کردنەوەیە، جیاوازی لە نێوان سورو سپی و ڕەش جۆری پێست نییە، جیاوازی لەنێوان نەتەوە و گەل و هۆز و عەشیرەت نییە، جیاوازی لەسەر جنسی مرۆڤ دانامەزرێت، بەڵکو تەنها و تەنها کێ زیاتر خواپەرستە و لە کاروکرداریدا ڕەنگی داوەتەوە پلە و پایەی زیاترە جا لەهەرکوێی ئەم جیهانەدا بێت.

بێجگە لە ئاینی ئیسلام کە بنەماکانی نەگۆڕە و دەستکاری وشەیەک لە پەیامەکەی نەکراوە، ئەو قورئانەی لە سەردەمی عوسمانی کوڕی عەفان نووسراوە لە وڵاتی بەریتانیا لە شاری بێرمێنگهام پارێزراوە و هەمان قورئانە کە لەبەردەستی مندا هەمان ئامانج کە پەیامەکە ڕوونی کردۆتەوە، بۆ جێنشین بوونە لەسەرزەوی و چاکەخوازیە بە ڕەوشتیی یەکتاپەرستی و هاوکاری کردنی هەموو جۆرە کەسێکە لە بیروباوەڕەکانی تر، ئامانجی دنیا و قیامەت زۆر بە ڕوونی و ئاشکرا لە پەیامی ئیسلام باسکراوە کە قورئانە پیرۆزەکەیەتی، هیچ نهێنی و تێنەگەیشتنی تێدانیە و ڕوونکراوەتەوە وەکو ڕۆژی ڕووناک و هەموو کەس لێی تێدەگات و بەهەموو زمانەکان وەرگێردراوە.

سێیەم: دەبێت دەقی پەیامەکە لە چوارچێوەی تێگەیشتن و عەقڵی مرۆڤدا بێت

ناکرێت پەیامێک لەلایەن خواوە هاتبێت بۆ مرۆڤ کەخۆی دروستی کردووە، مرۆڤەکان نەتوانن لێی تێبگەن و پیاوانێک بەناوی پیاوانی ئاینی واتاکان بەبێ سەرچاوەو بە ویستی خۆیان لێکبدەنەوە بۆ نموونە ئاینی مەسیحی بیروباوەڕەکەی ئەستەمە ئەوانەی شارەزاییان لەلاهوت و ناسوت دا هەیە بتوانن شی بکەنەوە، بۆ نموونە لە شێوەی سێ گۆشەیەکدا.



ئەگەر تەماشای بکەیت باوک لەگەڵ کوڕ لەگەڵ ڕۆحی پیرۆز خودان هەریەک لەمانایەکدا خوان، بێ یەک خوانین، ئەی چین؟ وەڵام نییە؟

بۆ نموونە ئایینی یەهودی هەر لەسەرەتاوە بەتانەو تەشەر لەخوا و پێغەمبەران دەست پێدەکات لەسەرەتای سفری تەکوین لە تەورات صەحاح ٦ دەڵێت (کوڕەکانی خوا هاوسەرگیریان لەگەڵ کچەکانی خەڵکی کرد) پاشان باسی داوێن پیسی حەزرەتی لوط پێغەمبەر -علیه السلام- دەکات لەگەڵ کچەکانی خۆیدا خەوتووە یان باسی کوشتنی سەربازێکی داود پێغەمبەر -علیه السلام- دەکات بە فیتی داود و مارەکردنەوەی خێزانەکەی لەبەرئەوەی داود حەزی لێکردووە، پەنا بەخوا لەو قسە و باسە هەڵبەستراوانە.

یان نموونەی ئایینی زەردەشتی باسی دوو خوا دەکات ناویان ئەهریمەن و ئاهورا مەزدایە، هەردووکیان خوان دژی یەکن پاشان لەهەمانکاتدا ئەم دوو خوایە برای یەکترن و باوکیان ناوی (زەراوانە)، بەڵام دایکیان دیار نییە، یەکێکیان خوای شەڕە و ئەوی تر خوای خێرە.

لەم نێوانەدا زەردەشت هاتووە هیچ ئامانج و کارێکی دیاری نییە.

ئاخر لە ڕووی لۆژیک و بیرکردنەوە دوو خوای خاوەن دەسەڵات شەڕ بکەن زۆر ترسناکە، لەوە ترسناک تر باوکیان خەوبردویەتییەوە و وازی لەهەموو شتێک هێناوە، بۆ ئەو دوو کوڕەی. ئەمە نەجێگای بڕوایە وە لەهەمانکاتدا گاڵتەجاڕییە بە مێشکی خەڵکی، تەنانەت بانگەشەکەرانی ئایینی زەردەشتی ڕوویان نایەت باسی بیروباوەڕی ئایینەکەیان بکەن، تەنها لە کوردستان دا بەناوی کوردایەتی و ئایینی کورد خەڵکی فریو ئەدەن..هتد.

ئایینەکانی تر حاڵیان باشتر نییە لەم ئایینانە کە ئاماژەمان پێدان، هەریەکە و پەیامەکەی خورافی و کۆمەڵێک دەقی چیرۆکی بەرئاگردانە هەست و عەقڵ و تێگەیشتنی مرۆڤ تێرناکا، شوێنکەوتوانی زۆربەیان سۆزدار و نەخوێندەوارن بەرانبەر بە ئایینەکەیان.

لێرەدا ڕۆڵی ئیسلام زۆر عەقڵانییە لەگەڵ ناخی مرۆڤ قسە دەکات و ڕەگەزی مرۆڤی خوێندوەتەوە، ژن و پیاو جیادەکاتەوە و مافی منداڵ و پیرو پەکەوتە باس دەکات، کاتی جەنگ و ئاشتی هەیە، ژیار و شارستانییەت و یاساو ڕێساکانی عەقڵانی لەگەڵ مرۆڤەکاندا ئەدوێت. ئایینێکی واقعی و ڕاست و دروستە، ئاڵۆز نییە، پیاوانی ئایینی نییە، بەڵکو زانا و بیرمەندی هەیە و هەمووکەس دەتوانێت پێی بگات بەهەوڵدان، هیچ کەس ناتوانێت بەبێ سەرچاوە قسە بکات و بەڵگە و ئارگۆمێنت لەم ئایینەدا سەنگی مەحەکە و هیچی شاراوەی تێدا نییە، دەقەکان ئاشکران و والا کراون بۆ خەڵکی و بەهەموو زمانەکانی جیهان وەرگێڕدراوە.

لەڕووی عەقیدە و بیروباوەڕەوە ئەوەندە بەوردی و شیکاری بابەتیانە قسەی کردووە لەسەرەتای دروست بوونی گەردوونەوە کە ئوستازێکی جامعی و کەسێکی سادەی ناو کۆمەڵگا هەردووکیان لێی تێدەگەن، بەڵام تێگەیشتنی قوڵ و بەهێز ئەدات بە خاوەن زانستەکە و بەخەڵکی سادە، ئیمان و ناخ و هەستی پڕ دەکات و ئاستی بەرزدەکاتەوە بەبێ ئەوەی بەخۆی بزانێت بۆ ئاستێکی زانستی ئیرتیجالی و ئەوانەشی ئەکادیمین وەکو مەلەوانێکی لێ دێت لەچەمەوە بۆ ڕووبار و لە ڕووبارەوە بۆ دەریاچە و پاشان دەریا و زەریا و تێربوونی نییە لە زانستی.

چوارەم: دەبێت خاوەنی بەڵگەو لۆژیکی عەقڵی بێت لەسەر ئەو بنەمایانەی کەچەمکی عەقیدەن



ئاینی پیرۆزی ئیسلام ڕێکخستنێکی زۆر عەجیب و سەرسوڕمانی پێوە دیارە، تەنانەت لەڕووی ماتماتیک و ژمارەکانەوە هەروەها لەڕووی ڕێکخستنی باسە عەقائیدیەکان لەبارەی ئیمان و ئیسلام و هەموو ئەکات و پایەو پێناسەکان هەموو عەقڵی مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێت لێی تێبگات و قسە لەگەڵ هەموو چین و توێژەکاندا دەکات. پەیامی ئیسلام کەسێکی سادە و ساکاریش لێی تێدەگات و ئەبێتە هۆکاری بەرزکردنەوەی ئیمانی.

ئاینەکان جێگای پرسیارکردنیان نییە، دەڵێن ئەوەی وتم هەر ئەوەیە پرسیاری لەسەر مەکە، ئەمەش بووە هۆکاری دروست بوونی پیاوانی کلێسا لەجیاتی خوا ڕۆڵیان دەگێڕا و ناونران بە کۆمەڵەی (ئەکلریۆس) لەدژی ئەمانە شۆڕشی فەلسەفە ئەنجام درا لە ئەوروپا کە ناونراوە بە ڕێنسانس.

چونکە بەگشتی زانا و بیرمەند و فەیلەسوفەکان دەیانویست لە باوەڕ و کۆیلەبوونی پیاوانی ئاینی ڕزگاریان ببێت و بەهەشت و جەهەنەمیان دەفرۆشت بە خەڵکی.

بێجگە لە یەهود هەموو ژیانی لە فرت و فێڵ و غەشکردن و ژیان لەسەر پشتی خەڵکی و گەلانی تر و خاوەنی هیچ بیروباوەڕێکی ئاشکرا نین، تا ئەم سەردەمەی ئێستامان و هەرلایەک لە گروپ و مەزهەبەکانی تر لەهیچ شتێکدا هاوبەشیان نییە و هەمووی لەیەک جیاوازن، بێجگە لەوەی یەهوودی دەونەمە هەیە یەهوودی سەهیۆن هەیە، یەهودی لاهوت هەیە، یەهودی کەبالا و.هتد.

ئاینەکانی تریش هەریەکە گیرۆدەیە بەکێشەیەکی عەقڵیەوە، یەکێک خواکەی خەوتووە و زەنگی بۆ داناوە تا خەبەری بێتەوە، ئەم جۆرە خوایانە لە ژاپۆن زۆرە، خواکانی هیندستان کاتێک باس دەکرێن مرۆڤ

لێیان تێناگات، ئەوەی دیاردەی سروشتی بێت دەبێتە خواو مـرۆڤ دەبێـت گەردن کەچی بێت لەباران و هەوا و لافاو و ئاگر و مانگا و زەمین لەرزە و هەروەها.

ئیسلام ڕێکخستنێکی عەقڵـی و نەقڵـی لەگەڵ یەک بەتەریـب هەنگـاو دەنێت و زاناو بیرمەند و فەیلەسوفی هەیە بە پـێچەوانەی ئایینەکـانی تـر پیاوی ئایینی نییە، هەریەک لە دانشـمەندەکانی لەسـەر بنەمـای نەقڵـی و عەقڵی کار دەکەن و لەبوارە جیاوازەکاندا هەزارەهـا فەیلەسـوف و زانـا و دانشمەند و عالم و شیخولئیسلامی دروستکردووە.

نموونەی (ئیبن ڕوشد، ئەبو عەلائی مەعڕڕی) کە فەیلەسـوفانی ڕۆژئـاوا سەرسام بوون پێیان، وەکو (دانتی و جان جاک ڕۆسۆ) دانتی سەرسـام بـوو بە (رسـالة الغفـران)ی ئەبـو عەلائـی مەعـڕڕی و جـان جـاک ڕۆسـۆ سەرسامبووە بە ئیـبن ڕوشـد، ئیـتر بـێجگە هەزارەهـا فەیلەسـوف و زانـا و عەلامەی گەورەی وەکـو (ئیـبن تەیمییە، ئیـبن قەیـم، ئیـبن حەجەر و ئیـبن کەثیر..هتد). بەسەرەتای دروست بوونی گەردوون تـا نیشـانەکانی کۆتـایی ئەم گەردوونە هەموو بە لۆژیکی و مەنطقی عەقڵی باس کراوە.

پێنجەم: چەمکی ئایینەکە لەگەڵ یەکتردا دژ بەیەک نەبن

یەکێـک لە کێشـە گرنگەکـانی هەمـوو ئایینەکـانی دیـکە ئەوەیە کەوا دژبەیەکی زۆری تێدایە، ڕەحمەتی خوا لە (ئەحمەد دیدات) بێت دەڵێـت: لەگەڵ قەشـە و گاردینالەکانـدا کە قسـەم دەکـرد تـاکە شـتێک زۆر لێـی دەترسـان ئەوەبـوو دژ بەیەک لە تەورات و ئینجیـل بـێ شـومار بـوو بەهۆکاری ئەوەی کە بەدەستی خەڵکی نوسرابوو.



گرنگـی دەقە قورئانیەکـان لەوەدایە جێگـای بـایەخی نەیارانیشـیەتی کەسێکی وەکـو (ویـل دیورانـت) دەڵێـت: قورئـان گرنگـی لەوەدایە هـیچ دژبەیەکێکـی تێـدا نیـیە، هەروەهـا (ڤـۆڵتێر) هەمـان قسـەی دووبـارە کردۆتەوە.

لەکاتێکدا ئینجیلی (مەتـا، لوقـا و مورقـوس) دەڵـێن کـاتژمێر ٦ لەخـاچ دراوە لە کـاتژمێر ٩ هـاواری کردبێـت و گیـانی دەرچووبێـت، پـێش گیـان دەرچوونی دەڵێت خوا بۆ بەجێت هێشتم! خۆشیان لەنێوان مرۆڤ بـون و خـوا بـوونی حەزرەتـی عیسـادا یەکـلا نـابنەوە، بـێجگە ئەوەی کـاتژمێر لەسەردەمی هارونە ڕەشید دروست کراوە.

لەکاتێکدا ئیسلام لەگەڵ کات و زەمەن و ساڵدا بەگوێرەی زەمەن قسـە دەکات و هەموو پێغەمبەران بە ڕێزەوە نیشان ئەدات و لە شێوەی مرۆڤی پلەباڵا و چـاک، جنـۆکە و شـەیتان و فریشـتەکان هەمـوو وەکـو پێناسـەی خۆیـان نیشـانیان ئەدات و خـوودی زاتـی پـاکی (اللـه) صـیفات و نـاوە پیرۆزەکـانی هەسـت پـێ دەکرێـت بـێ ئەوەی مـرۆڤ لێوردبونەوەشـی هەبێت دەزانێت هەمووی لایەقە بەزاتی پەروەردگار، هیچ دژ بەیەکـیەک لە دەقەکانی و قسـەکانی پێغەمـبەر ﷺ و پەیـامەکەدا نییە، هەدووکیان تەریب و تەواوکەری یەکترن.

شەشەم: دەقی ئـایینەکە و یاسـاکانی لەگەڵ سروش و ڕەوشـتی مـرۆڤ تێکنەگیرێت

ئەم واتایە زۆر گرنگە یاساکان گونجاو بێت لەهەموو سەردەم و کاتێک دا لەگەڵ مرۆڤـــایەتی ڕێ بکـــات، نەک بەئـــارەزووی مرۆڤەکـــان هەر سەردەمەو یان شوێنێک بیەوێت بەئارەزووی خۆی گۆڕانکاری تێدا بکـات.



وەکو نموونەی یاسای هاوڕەگەزبازی لەئایینی نەسارا و قومار و ڕیبا و سوو لە ئـایینی یەهودیـدا یـان هەڵگرتنـی ئـافرەت لە ئـایینی زەردەشـتی واتـا ڕەدوکەوتن کە یاساکە ناوی "فیودەت"ە..هتد.

لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام دا یاساکان گونجاونترن لەگەڵ ناخی مرۆڤەکان و سروش، هەر لە یاسـاکانی سـزا سـەپاندن و یاسـای مـردو و میـرات و دەوڵەت و..هتد.

هەموو لەگەڵ ڕەوشت و ناخ و سروشتی مرۆڤدا یەکدەگرێتەوە و هیچ دژ بەیەک نیـیە لەگەڵ فیطرەتـی دا، بەڵکـو ئەزمـوونی ئیمپراتـۆریەت، خیلافەت و دەوڵەت و ئەمارەتی هەیە بەدرێژایی چوار سەدە.

حەوتەم: وەحی و چەمکی ئایینەکە لەگەڵ چەمکی زانستی ڕاستەقینە دژ بەیەک نەبن

تـاکە ئایینێـک لەسـەرزەویدا بانگەشـەی زانسـت و ئیعجـازی زانسـتی پەیـامەکەی دەکـات و دەیـان و سـەدان زانـا و فەیلەسـوف بڕوایـان پـێ کردبێت، تەنهاو تەنها ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، بانگەشەی هەموو پیرۆزی و بنەڕەتەکانی دروست بونی گەردوونـی هەمـوو لەخـۆ گرتـووە نمـوونەی و چۆنییەتی گەردوون و ئاسمان و خۆر.هتـد. Bigbang theory هەمـوو لە دەقە قورئانیەکاندا چەسپاوە بە ئاشـکرا و ڕوونـی باسـی کـردووە، بـێجگە زانستەکانی وەکو جیۆلۆجی و بایەلۆجی و مێژووی.هتد.

تـا ئێسـتاش لە ئایینەکـانی وەکـو هیندۆسـی و ئایینەکـانی ڕۆژهەڵاتـی ئاسـیا باسـی لەوە دەکەن گەردوون و زەوی لەسـەر پشـتی گـاو ماسـییە!، بێجگە لەوەی ئیسلام دەستی داهێنان و خێری زۆری هەیە بەسەر هەمـوو مرۆڤـایەتییەوە، بانگەشـەی زانسـت و هەوڵـی زۆری ئـاایینەکە بـۆ



دامەزراندنی ژیار و شارستانییەتەو دژی نەخوێندەواریە و فەرزی کردووە لەسەر هەموو پیاو و ژنێک کە خوێندەوار بێت و داوای سەرەکی بۆ خیلافەت بوونی مرۆڤ لەسەر زەوی زانستە، تەنانەت یەکەم ئایەت کە هاتووە باسی خوێندن و قەڵەم و ئەداتی زانست دەکات.

یەکەم پێغەمبەر بۆ مرۆڤ هاتووە بە زانست هەموو فریشتە سوجدەی ڕێزیان بۆ بردووە لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار فێری زانستی کردووە هۆکاری سوجدە بردنی ڕێز لەناو مەخلوقەکاندا هۆکاری زانستە. خوای گەورە یەکەم مەخلوق دروستی کردووە قەڵەم-ە، تەنانەت هەندێک دەڵێن پێویستە ڕێزو هەموو جۆرە قەڵەمێک و ئەداتێکی نووسین بگیرێت.

ئیسلام لە هاتنیەوە هەتاکو ئەم ساتە وەختەوەی من بۆ تۆ دەنووسم خەریکی نووسین و داهێنانە، بێجگە زانایانی تایبەت بە خوودی ئایینەکە بە ملیۆنەها یاخود باشترە بڵێین ملیاردەها کتێب و لێکۆڵینەوەیان لەسەر خوودی ئایین و ڕێسا و یاساکانی نووسیوە. تەنها نموونەیەک وەربگرین لە کتێبخانەی بەغداد لەسەردەمی هێرشی تەتار و مەغۆل دا کتێبەکانی موسوڵمانیان کرد بە پرد و خستوویانەتە ناو ئاوی دیجلە و سوپای شەڕەنگێزی مەغۆل بەسەر کتێبەکاندا پەڕیونەتەوە لە کەرخەوە بۆ ڕەصافە.

هەشتەم: لە واقیعی ژیانی مرۆڤ جیانەبێتەوە.

تاکە ئایین لەگەڵ ژیانی خەڵکیدا بەگشتی ئاوێتە دەبێت تەنها و تەنها ئایینی پیرۆزی ئیسلامە، ئەگەر بەچاوی ڕەخنەگرانە تەماشای هەموو ئایینەکانی جیهان بکەین و بەپێوەر لەگەڵ ئیسلام دەبینین منداڵ و گەنج

و پیر هەمووی تێدایە وەکو یەک دینداری دەکەن، بەڵام تەماشای ئایینی نەسرانی یاخود یەهودی بکەین نەوەکانی نازانن چ باس و خەبەرە لە یاساکانی ئایینەکەیاندا، ئەوە پەیڕەوانی ئایینەکانی هیندستان هیچیان ئایینی بەندایەتی نین، بەڵکو تەنها کلتورێکە بۆیان ماوەتەوە، ئایینی بوزا و لاوتستۆی و کۆفۆشیوسی هەمووی ئایینی کۆمەڵەیەکن و دابڕاون لە ژیانی خەڵکی بەگشتی.

بەڵام ئیسلام لەگەڵ واقیع و ژیانی خەڵکە، لەنان خواردن و خەوتن و هەموو هەڵسوکەوتێکی ئاداب و نەریتەکانەوە ئاوێتە بووە بە ژیانی خەڵکیەوە لێی جیانابێتەوە، پەیوەستە بە کات و ڕۆژ و مانگ و ساڵ تا مردن لەگەڵیدایە، ئیسلام لە ناونانەوە لەگەڵیدا دەبێت تا ناوگۆڕ و کفن کردنی.

بەگشتی ڕەنگدانەوەی هەیە لەبوارە کۆمەڵایەتی و سیاسی و بەندایەتی و خێزانی و تاکەکەسی و دەسەڵات.هتد.

هیچ ئایینێک لەسەر ئەم زەویەدا هاوشێوەی واقیعی بوونی وەکو ئیسلام نییە، ئیسلام لە لوتکەدایە.

نۆیەم: دەبێت دەقی پەیامەکە لەگەڵ گۆڕانکاری گەلان و سەردەم دا بگونجێت.

هێنری کیسینجەر دەڵێت: تەنها ئیسلامە توانیوویەتی لەبەردەم شارستانییەتی ڕۆژئاوا بوەستێت، هەرچی لەگەڵ بکەیت زیاتر خۆی دەنوێنێت. گلنەر فەیلەسوفی هیندی بەریتانی دەڵێت: تەنها ئیسلامە توانیوویەتی لەبەرانبەر لێشاوی شارستانییەتی ڕۆژئاوا خۆی بگرێت.



تاکە ئایینێکە لەڕووی عەلمانییەتدا وەستاوەتەوە و ئارگۆمێنتی بەهێزی پێیە.

هەروەها فرانسیس فۆکۆیاما فەیلەسوفی ئەمەریکی دەڵێت: کەوتم کۆتایی مێژووە لێی پەشیمان بوومەوە کە دیموکراسی توانای ڕووبەڕووبوونەوەی ئیسلامی نییە.

هەربۆیە دەتوانین بە یەقین و ڕەهایی بڵێین ئایینی ئیسلام تاکە ئایینی ڕاستەقینەیە، چونکە خوای پەروەردگار ناردوویەتی ڕەچاوی زانست و شارستانییەت و پێشکەوتن و سیاسەتی نێودەوڵەتی کردووە، لەگەڵ هەموو ڕەهەندەکانی ژیان لەهەموو کات و سەردەمێکدا گونجاوە، بەڵکو پێداویستی ژیانە ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

دەیەم وکۆتایی: ئەو کەسەی پەیامەکە هەڵدەگرێت دەبێت ئاشکرا و ناسراو بێت.

لە ئیسلامدا زانراوە پێغەمبەری کۆتا زەمان دێت دەبێت جێگا و شوێن و گۆڕی دیار بێت، لەکاتێکدا هیچ کام لە پێغەمبەرانی پێشوتر شوێنیان دیار نییە.

ئەوەش موعجیزەی ئەم ئیسلامەیە، هەموو گەورەیی و سەردەمی منداڵی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ تا وەفاتی دەزانێت و شەفاف ترین و ئاشکراترین ژیان لەسەرزەویدا ورد و درشتی نوسرابێتەوە تەنها محمد پێغەمبەرە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ.

هەروەکو پەیامەکە خاوەن تایبەتمەندییە لە ئایینەکاندا دەبێت بۆ هاتووەکەی یان نێردراوەکەی خاوەنی خەسڵەت و تایبەتمەندی بێت و

بزانێــت خــاوەنی ئایینەکــان  پەیامەکەیــان پیــادا نێــردراوە بە چــاوی شیکارییەوە تەماشای بکەین و بزانێت دەرئەنجام کامە ڕاستی و دروستی ئایینەکەمـان بـۆ دەردەخـات. ناکرێـت بڵێـین کـام پێغەمـبەر ڕاسـتە بە دڵنیـاییەوە هەمـوو پێغەمـبەران کە خـوا نـاردوونی بڕوامـان پێیـانە، بەڵام نیشانەی ئـایینی ڕاسـتەقینەو هەمیشـەیی و کـامڵترین ئەوەیە کە هەمـوو پێغەمبەران مژدەی هاتنی کۆتا پێغەمبەریان پێدراوە.

## خەسڵەتی پەیامبەرەکە

یەکەم: دەبێت لە جنسی مرۆڤ بێت.

ئـایینی ڕاسـتەقینە دەبێـت پێغەمـبەرەکەی لە نەوەی مـرۆڤ بێـت و هۆکاری سەرەکی بۆ ئەم مەبەستە ئەوەیە خەڵکی دەبێت چاوی لێ بکەن و ببێتە پێشەنگ بۆ هەموو خەڵکی و شوێنکەوتوانی، ئەگەر ئایینێـک وتـرا پەیامهێنەرەکەی فریشتەیە وەکو زۆرێک لە ئایینەکانی هیند ئەوا خەڵکـی دەڵێن من ناتوانم چاوی لێبکەم و لاسـایی بـکەمەوە، چـونکە مـن نەوەی مـرۆڤم و ئەویـش فریشـتەیە و ئەوان ڕۆحانییەکانیـان بە قسـەی خۆیـان لەگەڵ فریشتە مامەڵە دەکەن.

یـاخود نەسرانیەکـان دەڵـێن عیسـای کـوڕی مەریەم خـوایە، یـاخود بوزاییەکان و تەنانەت یەرسانییەکانیش ئەم بیرۆکەیـان هەیە کە هەرکەس چووە دەسەڵات ئەوە ڕۆحی خوایەتی بەبەردا کراوە، یەهودیش هەمـووی خۆی بە گەلی هەڵبژاردە دەزانێت یان بە نەوەی خوا پەنـا بە خـوا دەگـرم لەم کوفرە گەورەیە.



لە ئایینەکانی تر پەنا بەخوا زۆر خراپترە ئەویش پەرستنی بت و هەیکەل و ڕەمزە بۆ خوا زۆرجار بۆ پێغەمبەر و پیاوچاکانیان.

تاکە ئایین لەسەرزەویدا جەخت لەسەر هەموو پێغەمبەران دەکات بەوەی هەموو مرۆڤن و بەندەی خوای پەروەردگارن، ئەمەش لای هەموو پێغەمبەران بەرزترین پلەی بەندایەتییە کە خوای پەروەردگار بە بەندە و مرۆڤ ناوی بردوون. هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەر دەبێت چاوی لێبکرێت بۆ نموونە ئەگەر پێغەمبەر نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و حەج و جیهادی کردووە منیش دەتوانم بیکەم، چونکە پێغەمبەر لەنەوەی ئادەم بووە و مرۆڤ بووە. ئەگەرچی هەر جنسێکی تر بێت ئەوکات بەڵگە و بیانوو و هەنجەتی ئەوەم هەیە کە بڵێم ناتوانم نوێژ بکەم یان جیهاد بکەم..هتد بەهۆکاری ئەوەی پێغەمبەر لە جنسی من نییە ئەو بۆیە دەتوانێت بیکات لەبەرئەوەی مرۆڤ نەبووە، بەڵام ناردنی پێغەمبەر لەجنسی مرۆڤ واتا مرۆڤەکان دەبێت لێی تێبگەن و کاری پێبکەن و قسە لەگەڵ ناخیاندا بکات.

نموونەی ئایەتی قورئانی زۆرە لەوبارەیەوە سەرەتای سورەتی الكهف و الإسراء

﴿سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ١﴾

الإسراء. پاکیی و بێگەردیی و ستایش بۆ ئەو زاتەی کە شەوڕەویی کرد بە بەندەی خۆی (محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ) لە مزگەوتی (حرام) (کەعبەی پیرۆزەوە) بۆ مزگەوتی (اقصى) لە (بيت المقدس) کە دەوروبەریمان پیرۆزو پڕ بەرەکەت کردووە، تا هەندێ نیشانەو بەڵگەی

(دەسەڵاتداریی و توانایی) خۆمانی نیشان بدەین، بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بیسەرو بینایە.

﴿ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ ۝١﴾

الكهف. سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە قورئانی بۆ سەر بەندەی خۆی (محمد صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ) ڕەوانە کردووە، بەڕاستی هیچ کەم و کوڕی و ناتەواویەکیشی تیا بەدی ناکرێت.

دووەم: کاری پێغەمبەر تەنها گەیاندنی ئایینەکەیەتی

هیچ کەس بەتوانا و زانست و بەندایەتی زۆر ناتوانێت بگاتە پلەی پێغەمبەرایەتی ئەم پلەیە خوای گەورە دەیبەخشێت، واتا خوای پەروەردگار هەڵیدەبژێرێت.

لەگەڵ ئەوەی کە ئایین هەموو ڕەهەندەکانی ژیانی تێدایە و دەبێت پێغەمبەرەکە لەکردارو ڕەفتاریدا ڕەنگ بداتەوە و ئەنجامی بدات، بەڵام بە ئاراستەی ئایینەکە داوای سەرەکی ئایینی خوایی ناساندنی خوای تاک و تەنهایە.

لەهەموو سیستەمە کۆمەڵایەتی و ڕەهەندەکانی ژیان جا سیاسەت، ئابووری، سەربازی بێت بە ڕێگای ڕاست و دروست و بێ فرتوفێڵ و چاوبەست کردن لەخەڵک.

زۆرێک لە ئایینەکان لە ئەمڕۆدا ئایینی تەنها گۆشەگیرییە، دوورە لە ژیانی مرۆڤەکان هەندێکی تر وەکو یەهود خەریکی فرتوفێڵ و کاری ساختەن بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو گەلە تەنانەت ئایینەکانی تری دنیا هەموو چوونەتە مۆزەخانە.



تاکە ئایینی ڕاست و دروست کە ڕێزی هەموو پێغەمبەران و کاری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ خۆی کە تەواوی کرد و بانگەواز و سیستەمی کۆمەڵایەتی و ئابوری و بازاڕ و دەوڵەت و حکومەتی دامەزراند و سوپای بەهێزی ڕێکخست ئایینی ئیسلامە، تا ئەم ساتەوەختەش نەوەکانی بەدوای گەڕانەوەی خیلافەتی ئیسلامن بۆ ئەوەی هاوشێوەی بانگەوازی پێغەمبەرەکان بکەنەوە. ئەگەرچی لێرەو لەوێ هەندێک وڵاتی زلهێز بانگەشەی دەوڵەتی ئیسلامی دەکەن وەکو سعودیە و ئێران.

بەئاشکرا پەیامی ئیسلامکاری، ئیسلام و کاری پێغەمبەرەکەی هیچ جۆرە بانگەوازی نەتەوەچێتی، قاڵبێکی ئابووری نەگۆڕو سیستمێکی سیاسی ڕەق وتەقی پۆڵایین نەسەپاند بۆ دامەزراندنی دەوڵەت و دەسەڵات و شێوەی نوسینەوەی دەستور، بەڵکو دوای ئەوەی کاری یەکەمی ناساندنی یەکتاپەرستی بوو بە ئاراستە و وەحی پەروەردگارو دواتر بنچینەکان و بەهاکان و مەبادیئەکانی ڕاگەیاند هەتا موسڵمان پێوەی پابەند بێت لە کاتی ئیجتیهاد کردنی بۆ جێبە جێکردنی سیستەمە سیاسی و ئابوری و دەوڵەتدارییەکان.

سێیەم: پەیامبەرەکە دەبێت ئایینەکە بناسێنێت نەک خۆی

کاری پەیامبەری ڕاستەقینە بۆ بانگەشەی ئایینەکەی تەنها ناساندی خوودی ئایینەکەیە، نابێت هەوڵی بۆ ناساندی خۆی و کەسوکار و بنەماڵەکەی بێت.

بۆ نموونە یەزیدیەکان، ئەوەی لە بنەماڵەی (عودەی کوڕی موسافیر) نەبێت ناتوانێت شێخایەتی و گەورەیی بکات لەناو یەزییدیەکاندا.

لەناو ئایینی ئیسلامدا ئەوەی بەڕاستی دەبینرێت ئەوەیە پێغەمبەر محمد صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ هیچ کات هەوڵی خۆناساندنی نەبووە هەرگیز لەسەر خۆی تۆڵەی نەسەندووە و توڕە نەبووە، ئەوەشی بەناوی بنەماڵەکەی پێغەمبەرەوە خۆی بە پیرۆز و ئەولادی پێغەمبەر دەزانێت هەمووی خۆ زل کردن و هیچ بنەمایەکی لەناو ئایینی ئیسلامدا نییە، بەڵکو لە فەرموودەیەکدا باوکی خۆی بەکافر ناودەبات لە جەهەنەمدا، مامی ئەبوجەهل ئایەتی قورئانی لەسەردابەزیووە توندترین ئایەتە و شکاندنییەتی، مامێکی تری کە ئەبو طالیبە بەکافری مردووە و بەڕاشکاوانە لە ئیسلامدا باسی کراوە، لە جەنگی بەدردا مامی بەدیل دەگرێت. هەرکەس داوای هۆز و عەشرەت چێتی کردبێت بە جاهیل و بۆگەن ناوبراوە. لەدوای خۆی ئەبوبەکر و عومەر بوونە جێنشینی موسوڵمانان، هەردووکیان لە دوو تیرە و هۆزی بچوکی قوڕەیش بوون.

هەرگیزاو هەرگیز بۆ خۆناساندن کاری نەکردووە و سادە و ساکار بووە لەناو خەڵکی دا، زۆرجار لەناو خەڵکیدا نەناسراوەتەوە تا پرسیاریان کردووە کامە پێغەمبەر محمدە صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ، جلوبەرگی سادە و ساکار بووە، خۆی لەهاوڕێکانی جیانەکردۆتەوە، بەدوای ناو و ناوبانگدا نەگەڕاوە، لوت بەرزنەبووە، وەڵامی پیر و جوان و منداڵی داوەتەوە، ڕێزی لادێی و شاری وەک یەک لابووە، هەژارانە ژیاوە و هەژارانە وەفاتی کردووە، بەڵام سەردار و سەروەری هەموو مرۆڤایەتییە.

چوارەم: پەیامبەر نابێت لەدوای خۆی باڵەخانە و سەروەت و سامان بەجێبهێڵێت.



نیشـانەکانی پێغەمـبەران ئەوەیە لەدوای خۆیـان قەسر و باڵەخـانە و قەڵای بەهێــز و جێگـــای پادشـــا بەجێناهێڵێـــت، بـــێجگە پێغەمـــبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ هیچ پێغەمبەرێکی تر شوێن و جێگـای دیـار نیـیە، بەدوای ئەودا نەگەڕاون کەنـــاو و ناوبانگیـــان لەســـەر بەردوو مێـــژوو و باڵەخـانە و سـەروەت و سـامانیان بوێـت، بەڵکـو خـاوەنی پەیـام بـوون و گەیانـدوویانە کۆتـا پێغەمـبەر لەدوای خـۆی نەک هیچـی بەجێنەهێشـت، بەڵکو لە ڕیوایەتـدا هـاتووە قەڵغـانێکی بە ڕەهـن لابـووە تـا خێزانەکـانی داویانەتەوە. لەدوای خۆی هیچ زەوی و زار و باڵەخانە و بـاخ و باخـاتێکی بەجێنەهێشتووە.

هیچ میراتێکیان نییە پێغەمبەران تەنها زانست نەبێت، واتا هیچ کام لە نەوەکانی میرات ناگرن، ئەمەش مەرجی پێغەمبەر بوونە لە ئیسلامدا.

پێــنجەم: ئەوەی داوای دەکــات خــۆی پــێش هەمــوو کەس ئەنجـامی ئەدات.

پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەوەی داوای کـردووە پـێش هەموو کەس خۆی ئەنجامی داوە، لە نوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، جیهاد و فەرمان کردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە.هتد.

هەربـۆیە کە نموونە دەهێنێـتەوە لەسـەر باشـترین پیـاوی چـاکەخواز پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە لوتکەدایە، باشـترین سیاسـی خـوودی پێغەمـبەری ئیســلام باشــترین سیاســی بــووە، باشــترین بــاوک بــووە بــۆ منداڵەکانی، باشترین هاوسەر بووە بۆ خێزانەکانی، باشـترین هـاوڕێ بـووە بۆ هاوەڵەکانی، باشترین و ئازاترین سەرباز بووە لەناو سەربازەکانی. بـۆیە

خۆی کراوە بە پێشەنگ، چونکە ئەوەی داوای کردووە خۆی بەباشترین شێوە ئەنجامی داوە.

کاری پێغەمبەران لەدوای گەیاندنی پەیامی خوای پەروەردگار پێویستە خۆی پێشەنگ بێت لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، پێغەمبەرایەتی پۆست و مەقام و سەرۆک و دەسەڵاتدار نییە، بەڵکو بەرپرسیارێتی و مامۆستایی و چاودێری و دڵسۆزایەتیە بۆ گشت مرۆڤایەتی.

شەشەم: پەیامەکە دەبێت خاوەنی موعجیزە بێت.

گومان لەوەدا نییە ئەوەی پێغەمبەر بووبێت خاوەنی موعجیزە بووە، بەڵام موعجیزەکانیان کۆتایی هاتووە. پێغەمبەری ئیسلام خاوەنی موعجیزە و خاوەنی ئیعجاز بووە، موعجیزە واتا لەسەردەمی خۆیدا خەڵکی بینیویەتی لەیار و نەیاری شاهیدیان بۆ داوە بە جۆرێک لە جۆرەکان، بەڵام ئیعجاز واتا بەردەوام موعجیزەکەی لەگەڵ مرۆڤایەتی ڕێ دەکات و ساڵ بە ساڵ و سەدە لەگەڵ سەدە، وەکو پەیامەکەی قورئانە و فەرموودە شیرینەکانی کە خوای پەروەردگار ئاراستەی کردووە.

موعجیزەی پێغەمبەری ئیسلام صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەزۆرێک لەبوارەکانی ئەم ژیانەدا بوونی هەبوو، لەبواری گەردوونی، جیۆلۆجی، پزیشکی، مێژووی و بزوتنەوەی گۆڕانکاری..هتد.

تەنانەت کاریگەری موعجیزەکانیشی تا ئەم سەردەمەی ئێستامان و داهاتووشمان هەر بەردەوامە ئەگەرچی موعجیزەی سەردەمی زۆری بووە، بەڵام وەکو ئیعجاز ماوەتەوە.

موعجیزە واتا لەتوانای مرۆڤ دا نییە و لەتوانای تەکنەلۆجیای هیچ سەردەمێکدا نییە.





نموونەی موعجیزەکانی پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ

کەرتبوونی مانگ لەبەرچاوی خەڵکیدا.

چوونی بۆ ئاسمان و مزگەوتی قودس لەماوەی چەند کاتێکی کەمدا لە شەودا.

قسەکردن لەگەڵ ئاژەڵدا، وەکو ئاسک و گورگ.

هاتنی ئاو لەنێوانی پەنجەکانی و بینینی بە چاوی سەری هاوەڵانی.

تێرکردنی سەربازانی خەندەق کە زیاد لە ١٠٠٠ کەس بوون بە موعجیزە قاپێک خواردن.

ئاشکرا کردنی نهێنی دڵ و نێوانی دوو کەس یاخود چەند کەسی دوورڕووەکان و زۆرێکی تر لە موعجیزە.

حەوتەم: دەبێت ڕاستگۆ، ئازا و بەخشندە بێت.

هەڵبەت سیفات و سلوک و ئاکاری پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ زۆرە، بەڵام ئەو سێ دانەیە کەوەکو سەردێڕ نووسیومانە بۆ چوونە ناو باسی ئەم بڕگەیە دەنا لەگەڵ چاونەترسی و ڕاستگۆیی، بەخشندەیی دەبێت وەرنەگرێت و هەمیشە ببەخشێت و هەوڵی بۆ دەسەڵات نەبێت واتا مولکی لێ زەوت کرابێت و بەناوی پێغەمبەرایەتی بیگەڕێنێتەوە. دەبێت لەناو خەڵکەکەیدا واتا کەسوکار و شار و مەنزڵگاکەیدا ناسراوبێت و خاوەنی نەسەب بێت و خەڵکی ناسیبێتی پێشتر.

باسی هەرچی سیفاتی جوان و باشە بیکەین لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دا کۆبونەتەوە، بەسە بۆی کە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴿٤﴾﴾ القلم.

پێش ئەوەی بانگەشەی پێغەمبەرایەتی بکات بە ڕاستگۆ و دەست پاک ناسراو بووە، هەرگیز نەترساوە لەجەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا ڕای نەکردووە و پشتی نەکردۆتە دوژمن، لەهەموو کەس بەخشندەتر بووە، داوای هەرچی لێبکرایە هەیبوایە دەیبەخشی بەدوای موڵک و سامان و دەسەڵاتدا نەگەڕاوە، بەڵکو قوڕەیش داوایان لێ کرد ببێتە سەرۆکی هەموویان بەس واز لەم بانگەوازی پێغەمبەرایەتیە بهێنێت. لەوەڵامدا فەرمووی: مانگ لە شانی چەپم دابنێن و ڕۆژ لای شانی ڕاستم، واز لەم بانگەوازە ناهێنم!.

باشترین کەسێک کە ویسترا بێت هەڵبژێردرێت لە جیهاندا هەمیشە پێغەمبەری ئیسلام هەڵبژێردراوە، ئەگەرچی ئەوەی بە کارەکە هەڵساوە یان یەهوودی یاخود ڕۆژئاوایی نەسارا یان بێباوەڕ بە ئایین بووە، هەمیشە لەکتێب و کتێبەکانیاندا محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ یەکەم کەس و باشترین کەس بووە. هەربۆیە یەقین و دڵنیاییمان زیاتر دەبێت بە ئایینی پیرۆزی ئیسلام، هەموو لایەنی ئایینەکە لە خوا، پەیام و پەیامبەر تەواو و بێ کەموکوڕین.

هەشتەم: نابێت لە پاڵەوان و چیرۆکی خورافی و داستان بچێت.

پێغەمبەران بە گشتی و پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ بەتایبەتی هیچمان وەکو سوارچاک و پاڵەوانی چیرۆکەکان بەرخوردیان نەکردووە، ئەگەر تەماشای ژیانی پێغەمبەری ئازیز صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ



بکەیـن زۆریـنەی ژیـانی بەسـواری وشـتر  و گوێـدرێژ بـووە، لەکاتێکـدا دەیتوانی باشترین و جوانترین ئەسپی (جواد)ی عەرەبـی سـوارچاکی بێـت، بەڵام سادە و ساکار بووە. سیفات و پێناسەی پێغەمبەرانـی هەڵگرتـووە لە سـەرکەوتنەکانیدا، سـەمای نەکـردووە و شـەرابی نەخـواردۆتەوە، بەڵکـو سوجدەی بۆ پەروەردگاری بـردووە و هەرگیـز لـوت بەرز نەبـووە، زوڵمـی نەکردووە بە ئازایەتی نەنازیووە، کـاری بڵاوکـردنەوە و ناسـاندنی ڕەوشـتی جوان و ئاکاری بەرز بووە (إنما بعثت لأتمـم مكـارم الأخـلاق)رواه ئەحـمەد عن أبي هريرة. وەکو خۆی دەفەرمووێت صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ هاتووم بۆ تەواو کردنی ئەخـلاقە جوانەکـان هیچکـات دەوری پـاڵەوان و سـەرکردەی نەبینیـووە، بەڵکـو تەنهـا پێغەمـبەر بـووە و بەوەحـی خـوای پەروەردگـار ئاراستە بووە.

نۆیەم: دەبێت لەناو خەڵکیدا ئاشنا بێت و گۆشەگیر نەبێت.

کاری پێغەمبەران گەیاندنی پەیامە، پەیامەکەش بۆ خەڵکیـیە، ناکرێـت کەسـێک بانگەشـەی پێغەمبەرایەتـی بکـات و تـێکەڵاوی نـاو کۆمەڵگـا و خەڵکی نەبێت بە گشتی، پێویستە تێکەڵاوی هەموو چین و توێژەکانی ناو کۆمەڵگە ببێت و بانگەوازیان بکات.

بـۆ پێغەمـبەران ناشـێت هاوشـێوەی ڕاهیـب و گۆشـەگیرەکان لەنـاو خەڵکی دا نەبیـنرێن و هەر خەریکـی بەنـدایەتی بـن، ئەم شـێوەیە دوورە لەکاری پێغەمبەران.

هەروەها ناکرێت هاوشێوەی پادشا و قەیسـەر و کیسراکان لە قەسر و قەڵا وباڵەخانە دابنیشێت و تێکەڵاوی خەڵکی نەبێت.



پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ هەرگیز دابڕاو نەبووە و هەمیشە لەگەڵ هاوڕێ و هاوەڵ و خەڵکەکەیدا بووە لە خۆشی و شادی بەشدار بووە لە نارەحەتی و ناسۆرییان وەکو ئەوان ژیاوە و خواردنی وەکو خەڵکی سادە و ساکار بووە، بەڵکو ژیانی زۆر هەژارنەی بەسەر بردووە.

دەیەم و کۆتایی: دەبێت لەماوەی ژیانیدا پەیامەکەی گەیاندبێت.

هەموو پێغەمبەران پەیامی خۆیان گەیاندووە، بێجگە حەزرەتی عیسای کوڕی مەریەم (سەلامی خوایان لێ بێت) کە پەیامەکەی بە تەواوەتی نەگەیاندووە، پاشان دەگەڕێتەوە و بەنەساراکان دەڵێت ئێوە خیانەتان کردووە و خاچەکەیان دەشکێنێت و ئەو بەرازانەی ئامادەکراون بۆ سەربڕین لە کێڵگەکانی نەساراکان هەموویان تەفرو تونا دەکات، بەڵام پێغەمبەران بەگشتی پەیامی خۆیان گەیاندووە بە تایبەت پێغەمبەری ئیسلام صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ.

لەتەمەنی ٤٠ساڵییەوە وەکو بووە بە پێغەمبەر تا تەمەنی ٦٢ ساڵی هەموو پەیامەکەی گەیاند و لەناو خەڵکیدا لەساڵی حەجی ماڵئاوایی ڕاگەیاند، کە کۆتایی پەیامەکەی هاتووە بەواتای تەواو بووە.

ئەم بەندە کۆتایی هات، دەچینە سەر بەندێکی نوێ من و تۆ باسی پرسێکی گرنگی دیکە لە سێ ژیان کە پێنج جۆر ڕۆح ڕۆڵی تێدا دەبینێت و کەپێی دەوترێت (ماڵی ژیان و ماڵی بەرزەخ و ماڵی نیشتەجێ بوون و کۆتایی).



# بەندی هەشتەم

وَ مَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ

کێ هەیە لە گوناهان خۆش ببێت جگە لە خوا؟!

# پاکێجی ژیان و مردن و زیندوبوونەوە
# ماڵی ژیان و ماڵی بەرزەخ و ماڵی نیشتەجێبوونی کۆتایی

## پێکهاتەکانی ناو ماڵی ژیان

ژیان ئەو وشە یاخود ئەو زاراوە نهێنییە کە هەرچی زانای سەدەی ٢٠-٢١ سەرقاڵ کردووە و هیچ ئەنجامێک یاخود زانیاریەکیان دەربارەی ژیان نییە.

ئەشێت باسی چۆنیەتی ژیان بکات، بەڵام لەکوێ سەرچاوەی گرتووە؟ زانست زۆر داماوە لە ئاستیدا، بەڵام پێناسە و خاسیەتی ژیان ئەوانەی باسکراوە.

ئەو خاڵانەی کە گرنگن:

- دەبێت ئامانج هەبێت و پارێزگاری لەخوودی خۆی یاخود جۆری مانەوەی بکات، بتوانێت خۆراک و بەگشتی پێداویستی ژیان دابین بکات.

( Goal Seeker)

- ئەوەی ژیانی تێدایە دەبێت زۆربێت لەجۆری خوودی جنسی خۆی.

(Self Replicator)

- ئەو بونەوەرە زیندووە دەبێت لە سیستەمی کۆدەوە سەرچاوە بگرێت، کەواتە چالاکیە کیمیاییەکانی (Coding System) بەڕێوەی ببات.

لە هەمووی پێکەنیناوی ترو نوکتە ئامێز و ئابڕوبەرانەی مولحید ئەوەیە ئەگەر لێیان بپرسیت ئەمە چۆن دروست بووە، دەڵێن بەهۆکاری



پەرەسەندن و کاری جادوگەرانە! بۆ زانیاری ئەمە وتەی زانا مولحیدەکانە بەناوی "ڕچارد داوکینز". ژیان زۆر جیاوازە لەگەڵ ڕۆح، لە پێکهاتەی ئەم ژیانە ڕۆح و نەفس و مردنە، خوودی ژیان نهێنییە کە ئەو سێ نهێنییە گەورەی لەخۆگرتووە کە زانست نەک نەیتوانیوە قسەی لەسەر بکات، بەڵکو زۆر دوورکەوتوانەوە لێی ڕادەکات، ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی ئەو نهێنیانەمان بۆ ڕوون بکاتەوە.

## ڕۆح و نەفس چییە؟

ئەم باسە ڕی جیاوازی زۆری لەسەر دروست بووە، ئایا ڕۆح چییە؟ واتای نەفس دەگەیەنێت، داخۆ ڕۆح مەخلوقە یان ئەمری خواییە؟ ئەی ئەو سێ جۆرە نەفسە چییە؟ نەفسی خراپ و لۆمەکار و چاکەخواز. ئایا ڕۆح دەمرێت؟ زۆرێکی تر لەم باسانەیە، دەیان بەرگی کتێبی لەسەر نووسراوە، لێرەدا لەم مەملەکەتی من و تۆدا ئەوەی بۆتۆم چنییەوە سەرتۆپی باسەکانە وە ئەوەی کە ڕای زۆرینەی زانایانی لەسەر کۆبوەتەوە.

گومانمان نییە کە ڕۆحیش مەخلوقی خوای پەروەردگارە، چونکە خوای پەروەردگار لە سورەتی الرعد ئایەتی ١٦ و سورەتی الزمر ئایەتی ٦٢دا دەفەرموێت:

﴿ٱللَّهُ خَٰلِقُ كُلِّ شَيۡءٖۖ..﴿٦٢﴾﴾ الزمر. خوا بەدیهێنەری هەموو شتێکە.

لە دوو سورەتدا دوبارەی کردۆتەوە، ئەوانەشی کە دەڵێن ڕۆح ئەمری خوایە واتا بەشێکە لە سیفاتی خوای گەورە داوویەتی بە مرۆڤ، بەڵگەیان ئەم ئایەتەیە کە خوای پەروەردگار لە سورەتی الحجر ئایەتی ٢٩دا دەفەرموێت: وَنَفَخْتُ فيه من رُّوحِي. لەو ڕۆحە تایبەتیەی کە من (بەدیهێنەری ئەوم)، پێمبەخشی.

یاخود خوای پەروەردگار لە سورەتی الإسراء ئایەتی ٨٥دا دەفەرموویێت:
﴿وَيَسۡـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِۖ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنۡ أَمۡرِ رَبِّي وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلۡعِلۡمِ إِلَّا قَلِيلٗا ٨٥﴾ الإسراء.

پرسیارت لێ دەکەن دەربارەی ڕۆح (کە چییەو چۆنە؟) بڵێ: ڕۆح فەرمانی پەروەردگارمەو بەدەست ئەوە (من نازانم چییەو چۆنە) وە ئێوە لە عیلم و زانست (چەندە بەهرەمەندبن) هەر کەمتان پێ بەخشراوە.

لە ڕاستیدا باسەکە هیچ پەیوەندی نییە بەسەر ئەوەی کە ڕۆح سیفاتی خوای پەروەردگار بێت، چونکە خوای پەروەردگار سیفاتی ڕۆحی نییەو پێویستی بە ڕۆح نییە تا بەڕۆح زیندوو بێت، یانی ناکرێت ڕۆحی مرۆڤ بشوبهێرێت بەخوای گەورە ئەگەر خاڵی هاوبەشیش هەبێت لە نێوانیان وەک نهێنی بوون و نەبینین، بەڵکو خوای پەروەردگار خۆی زاتی پاکی زیندووە وە هەرگیز نامرێت و بەراورد ناکرێت بە هیچ کەسێک و بە هیچ شتێک، هەروەها ئایەتی ٨٥ سورەتی الإسراء هیچ پەیوەندی نییە بەسەر ڕۆڵی مرۆڤەوە بەڵکو باسی قورئانە کە ناوی ناوە بەڕۆح، هەروەها خوای گەورە ناوی جوبرەئیلی بە (ڕۆح) ناوبردووە، بە هەندێک مانای تریش لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

بەهەرحاڵ وەکو هەموو دروستکراوەکانی تری خوای گەورەیە، ڕۆح لە لاشەی مرۆڤدا یان لە دەرەوەی لاشەدایە، خوای گەورە توانای بەرسەریدا هەیە و لەناوی دەبات و زیندووی دەکاتەوە، وەک خوای پەروەردگار لە سورەتی الرحمن ئایەتی ٢٦ دا دەفەرموویێت:

﴿كُلُّ مَنۡ عَلَيۡهَا فَانٖ ٢٦﴾ الرحمن. هەموو ئەو کەسانەی لە سەر ڕووی زەویدا هەن، هەر هەمووی فەوتاوو تیاچووەو دەبێت بمرن.

مرۆڤ ڕۆژانێک بوو هەر ناویشی نەبووە بە دڵنیاییەوە ڕۆحەکەشی بۆ دروست بووە،



وەک خوای پەروەردگار لەسورەتی الإنسان ئایەتی ١دا دەفەرموویت:

﴿هَلۡ أَتَىٰ عَلَى ٱلۡإِنسَٰنِ حِينٞ مِّنَ ٱلدَّهۡرِ لَمۡ يَكُن شَيۡـٔٗا مَّذۡكُورًا ١﴾ الإنسان. ئایا زەمانێک بەسەر ئینساندا نەهاتووە کە شتێک نەبووبێت، ناوو ناونیشانێکی نەبوبێت؟! (چ باوکە گەورەمان، چ تاکە تاکەمان، زەمانێک هەبووە، کە نەبوین و ناونیشانمان نەبووە).

یاخود خوای پەروەردگار بە حەزرەتی زەکەریا دەفەرموویت لە سورەتی مریم ئایەتی ٩دا:

﴿قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٞ وَقَدۡ خَلَقۡتُكَ مِن قَبۡلُ وَلَمۡ تَكُ شَيۡـٔٗا ٩﴾ مریم. (خوای گەورە) فەرمووی: پەروەردگاری تۆ هەر خۆی ئەو بڕیارەی داوەو فەرمووشیەتی کە ئەو کارە لای من زۆر ئاسانە، پێش تریش تۆم دروستکردووە کە هەر هیچ نەبوویت.

## ڕۆح چییە؟

ڕۆح هێزێکی شەفاف و ناسکەو هەموو کەس یەک جار لە ژیانیدا دەیبینێت، بەڵام کە بینی ناتوانێت بۆ خەڵکی بگێڕێتەوە ڕۆحی چۆن بووە، ئەویش ئەو کاتەیە کە دەردەچێت لە لاشەی، بە بەڵگەی فەرمودەی پێغەمبەری نازدارمان صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ کە دواتر لەباسی ژیانی بەرزەخ زیاتر ڕوون ئەکرێتەوە ان شاء الله.

قسە زۆرکراوە لەسەر ڕۆح کە پێکهاتەی لاشە خوودی ڕۆحە، سوڕی خوێنە لەناو لاشە، یان وتراوە ئەو گەرمایی و تەزووە کارەباییەیە لە نێوان دەمارەکان یان دەڵێن خودێکە لە ناخی مرۆڤ و گیانداران بەگشتی..هتد.

لە ڕاستیدا کەس نازانێت چییە، قسەکردن لەسەری هیچ ئەنجامێکی زانستی یاخود شەرعی نادات بەدەستەوە، هەر وتیان و پێموایەیە، هیچ سەرچاوەی ڕاست لەبەردەست نییە.

ئەوانەشی کە دەڵێن، خوای گەورە لە ڕۆحی خۆی داوە بە ئادەمی، مانای وانییە بەشێک بێت لە پەروەردگار وەکو پێشتر ئاماژەم پێیدا، بەڵکو دوو جۆر زیادکراومان هەیە بۆلای خوای پەروەردگار واتە (مضاف)ە بۆلای خوا، یەکەم بۆ سیفات و ناوی پیرۆزی وەکو (سمع الله، یدالله، وجه الله، الکلام الله، العلم الله) ئەمانە هەموو سیفات و ناوی پەروەردگارە. جۆری دووەم لەژێر فەرمانی ڕاستەوخۆی خوای پەروەردگارە واتە جیاوازی لە زاتی پاکی وەکو (ناقة الله، رسول الله، بیت الله، عبدالله..هتد).

کەواتە بەشێکە لە مرۆڤ و لەناو مرۆڤدا هاتووچۆ دەکات و دەردەچێت و دەگەڕێتەوە، کارەکتەرێکی سەرسوڕهێنەرەو لەو مەخلوقەیە کە هیچ زانیاریمان دەربارەی نییە، خۆ قسەکردن لەسەری خۆ ماندووکردنە و تۆ ماندوو کردنە، هیچ زانیاری ئەوتۆ لەبەردەست نییە، مەگەر ئەوەی خواو پێغەمبەری صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ باسیان کردووە.

بەڵام باشترین قسە لەسەری ئەوەیە بڵێین مەخلوقێکی خوای پەروەردگارە کە هەڵسوڕێنەری لاشەی مرۆڤەو جیاوازە لە وشەی ژیان.

ژیان زیندویەتی دەبەخشێت، ڕۆح ئەبەدی دەبەخشێت!!

بۆ نموونە دار و درەخت و گژوگیا بەگشتی زیندوون، خاوەنی ڕۆح نین یاخود ئاژەڵ زیندووە بەڵام ڕۆحی نییە، هەرچەندە بۆ ئاژەڵ ڕای جیاوازی لەسەرە، بەڵام بەگشتی من لەسەر ئەو ڕایەم کە ڕۆح تەنها لە جنۆکەو مرۆڤ و مەلائیکەتدایە، ئەوانی تر ژیان و زیندوێتییان هەیە، هەموو ئەم چەمکانە هیچ زانست و زانیاریەک دەربارەی نییەو کەس خۆی لێ نەداوە واتا (ڕۆح و ژیان و زیندوێتی و مردن و نەفس).



# نەفس چییە؟

زۆرێـک لە زانایـان دەڵـێن نەفـس و ڕۆح هەریەکـێکە، هەنـدێکی تـر دەڵێن جیاوازە، هەندێک دەڵێن کاتێک لەلاشەی مرۆڤ دایە نـاوی نەفسـە کە دەردەچێت پێ دەوترێت ڕۆح.

هەنـدێکی تـر دەڵـێن نەفـس بەشـێکە لە لاشـەی مـرۆڤ و پێکهـاتەی غەریزەییە لەگەڵ هەڵمژینی هەوادا (نەسیم)ی ناوبراوە بەدانەوی هەوای تر بۆ دەرەوە واتە هەڵمژینی ئۆکسجین نـاوی (نەسـیمە) دانەوەی دووەم ئۆکسیدی کـاربۆن پێـی دەوترێـت (التـنفس) لەم دوو وشـەوە وەرگیـراوە، بووە بە (نەفس) و ناوی مرۆڤ بە هەمووی دەوترێت.

ئەوەی کە من زیاتر جێگای تێڕامان و وەرگرتنیەتی لام ئەوەیە لەلاشەی مرۆڤدا ناوی نەفسەو لە دەرچـوونی لەلاشـەی مـرۆڤ بە ڕۆح ناودەبرێـت پێناسـەی ئەم نەفـس و ڕۆحە لەوەی کە ئامـاژەی بـۆکراوە لە قورئـان و سوننەت (ئیجماعـی صـەحابە) کـۆڕای هـاوەڵان بـریتییە: لە لاشـەیەک کە جیاوازە لەم لاشەو بەدەنەی ئێستا هەمانە، لاشـەیەکی نـورانی بەرزەو زۆر ناسکەو زیندووە و دەجوڵێت، بەئاسانی لەناو لاشە دەردەچێت و وەکو ئاو چۆن طەی دەکات و بەخـوڕ لە جێگـای خـۆیەوە دەڕوات ئـاوا بەو شـێوە دەڕوات و وەکـو زەیـت وایە  لە زەیتـون جیـا دەبێـتەوە، وەکـو ئـاگری گەشاوەی خەڵوزە، لەناو لاشەی چاک و باشدا لاشەی کەسێکی چاکەخوازدا خۆشەویسـتە، پـێچەوانەکەی قـورس و عەبـوس و هەمیشـە بەدوای فەسادەوەیە  چونکە لاشەکە پیسە.

کەواتە ڕۆح بەسێ قۆناغ تێدەپەڕێت:

جۆری یەکەم: کاتێک مرۆڤ حەزی بەخۆشی ژیانە بێ ئەوەی ڕەچاوی چاکە و خراپە بکات ئەوەی دەیەوێت بۆ خۆی حەزی پێ دەکات، ئەم جۆرە ڕۆحە یاخود نەفسە - بەدوای حەزی لاشەدا دەگەڕێت و هیچ بەلاوە گرنگ نییە تەنها تێرکردنی ئارەزووەکانی خۆی لە لاشەی مرۆڤەکەدا

لە قورئاندا ناوی بە (نەفسی خراپەکار) هاتوە ﴿.. إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ ..﴿٥٣﴾﴾ یوسف. نەفسی (ئینسان، ئەگەر بە نووری خواناسی ئاوەدان نەبێت) بەڕاستی فەرمان بە گوناهو هەڵەو تاوان دەدات.

جـۆری دووەم لە ڕۆح و نەفـس، بـۆیە نـاوی هەردووکیـان بەیەکەوە دەهێنـین مەبەسـتمان هەردوو وشـەکە هەریەک شـتە، ئەویـش ڕۆح و نەفسی (لۆمەکەرە) خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ﴿٢﴾﴾ القيامة. سوێند دەخۆم بەو نەفسەی کە لۆمەی خۆی دەکات (ئەگەر گوناهو هەڵەیەکی کرد)، ئیمان تێکەڵ بە لاشەو ڕۆح دەبێت گەر تاوان بکات لۆمەی خوای خۆی دەکات.

جۆری سێیەم: ڕۆح و نەفسی باش پەروەردەکراو لە قورئاندا بە نەفسی ئاسایش و چاک و پاک ناوزەندکراوە.

﴿يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ﴿٢٧﴾﴾ الفجر. (شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفەراز لەسەرەمەرگدا دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامیی (ئەی ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەند لە تەمەنی کۆتای دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانیی دەتپەرست.).

ڕۆح و نەفس وەکو لاشەو ئەقڵ پێویسـتی بە خـۆراکە، خـۆراکی لاشـە خـواردن و خـواردنەوەیە، خـۆراکی ئەقـڵ زانسـتە، خـۆراکی ڕۆح زیکـر و فیکری خوای پەروەردگارە لە هەموو بوارەکانی ئایین واتە لە نوێژ و ڕۆژوو و قورئان خوێندن و چاکەکردن و خێر و خێرات و حەج و جیهاد، ئەمـر بە چـاکەو وازهێنـان لە خراپە..هتـد، ئەوە بەگشـتی خـۆراکی ڕۆح و نەفسـە، هەرسێ پێکهاتەکەی مرۆڤ لە ڕۆح و ئەقڵ و لاشـە پەیوەنـدیان بەیەکەوە هەیە، ئەگەر ئەقڵ خۆراکی باشی نەبوو لە زانسـت، ڕۆح و نەفـس توشـی شـوبهات و شـەهوات دەبێـت، ئەگەر ڕۆح بـاش پەروەردە نەبـوو ئەگەر ئەقڵ زانستی جیهانی لەبەر کردبێت هیچ ئاکامی نییە، هەر بەدوای حەزی



لاشەو بەدەنەوەیە، بەگشتی پەیوەندیەکی تەواو لە نێوانیاندا هەیە زیاتر ئەم باسە دەچێتە بوارەکانی وەرزشی ڕۆح و تەزکییەی نەفس و..هتد.

بۆیە لەسەر ئەم باسە دەوەستم و دەچمە ناوباسی مردنی ڕۆح و چوونی بەرەو گۆڕانکاری ژیان بۆ بەرزەخ و دەرچوونی لەلاشەدا، ئاکام و سەرئەنجامی دەچێتە جیهانی ڕۆحەکان و لەگەڵ ئەوان ئاشنایی پەیدا دەکات.

## مردنی ڕۆح

ڕۆح و نەفس هەردوو زاراوەکە بەیەک مانا دێت، کەواتە ڕۆح دەمرێت بێ گومان دەمرێت، جیاوازی لەنێوان مردن و لەناوچوون دەبێت بکرێت کەوترا نەفس دەمرێت  واتای ئەوەنییە کە لەناو دەچێت، بەڵکو جیا دەبێتەوە لەلاشەی مرۆڤ، یان لە خۆشی و شادی دەژی، یان لە دۆزەخ و شیوەکانی دۆزەخ.

خوای پەروەردگار لەباسی مردنی ڕۆحدا لە سورەتی الزمر ئایەتی ٤٢دەفەرموویێت:

﴿ٱللَّهُ يَتَوَفَّى ٱلۡأَنفُسَ حِينَ مَوۡتِهَا ..﴿٤٢﴾﴾ الزمر. هەر خوایە کە گیانەکان دەکێشێت لەکاتی مردنیاندا. کەواتە ئەم ئایەتە بەڵگە لەسەر ئەوەی لە لاشە جیادەبێتەوە.

پاشان خوای پەروەردگار لە سورەتی الأنعام ئایەتی ٩٣دا دەفەرموویێت:

﴿.. وَلَوۡ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ فِي غَمَرَٰتِ ٱلۡمَوۡتِ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ بَاسِطُوٓاْ أَيۡدِيهِمۡ أَخۡرِجُوٓاْ أَنفُسَكُمُۖ ..﴿٩٣﴾﴾ الأنعام. خۆ ئەگەر ئەو ستەمکارانە ببینی چۆن لە سەرەمەرگدا (گیرێکیان خواردووە) کاتێ فریشتەکان دەستیان لێ

دەکەنەوەو لێیان دەدەن و (پێیان دەڵێن) ئادەی گیانتان بدەن بە دەستەوە، دەی ڕۆحتان دەرکەن.

لێرەدا جوانتر و باشتر ڕونکراوەتەوە کە ڕۆح دەردەچێت و فریشتەکان ڕۆحەکە دەگرن و دەینێرنە جیهانی ڕۆحەکان.

گەڕانەوەی ڕۆح بۆ لاشە، خوای پەروەردگار ڕۆژانە بیرمان دەخاتەوە لەکاتی خەودا پاشان ڕۆحەکەمان بۆ دەگەڕێنێتەوە، لەم بارەیەوە خوای پەروەردگار لە سورەتی الأنعام ئایەتی ٦٠دەفەرموویێت:

﴿وَهُوَ ٱلَّذِى يَتَوَفَّىٰكُم بِٱلَّيۡلِ وَيَعۡلَمُ مَا جَرَحۡتُم بِٱلنَّهَارِ ثُمَّ يَبۡعَثُكُمۡ فِيهِ ..٦٠﴾ الأنعام. هەر ئەو زاتەیە کە بەشەو خەوتان لێ دەخات و دەتان مرێنێت (لەم ساڵانەی دوایی دا زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە خەو جۆرە مردنێکە)، هەروەها دەزانێت لە ڕۆژیش دا چ کارو کردەوەیەک ئەنجام دەدەن، هەموو ڕۆژێک ژیانتان پێ دەبەخشێت و زیندوتان دەکاتەوە تا وادەی دیاری کراو.

لێرەدا مەبەست کاتی خەوە کاتێک مرۆڤ دەخەوێت ڕۆحی دەردەچێت و بۆی دەگەڕێتەوە.

و ڕۆحە پاک و باش و چاکەخوازەکان کە بە نەفسی هێمن و ئاسایش ناوبراوە، دەگەڕێتەوە بۆلای خوای پەروەردگار، کە زیاتر مەبەستی جێگای نیعمەت و خۆشی ڕۆحی بەندە چاکەکانی خوایە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی الفجر ئایەتی ٢٧-٣٠ دەفەرموویێت:

﴿يَـٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفۡسُ ٱلۡمُطۡمَئِنَّةُ٢٧﴾ (شایانی باسە بە ئیمانداری سەرفەراز لەسەرەمەرگدا دەوترێت) ئەی خاوەنی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامیی (ئەی ئادەمیزادی ژیرو هۆشمەند کە لە تەمەنی کۆتای دنیادا پەروەردگارت ناسی و بەجوانیی دەتپەرس)



﴿ٱرۡجِعِيٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةٗ مَّرۡضِيَّةٗ ٢٨﴾ بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت (ئەو زاتەی کە تۆی) ڕازی وخۆشنود کردووە و لە تۆ ڕازی و خۆشنوودە.

﴿فَٱدۡخُلِي فِي عِبَٰدِي ٢٩﴾ دە، بچۆرە ڕیزی بەندە (چاکە نازدارو بەڕیزەکانمەوە).

﴿وَٱدۡخُلِي جَنَّتِي ٣٠﴾ الفجر. وە بچۆرە بەهەشتە (خۆشە ڕازاوەکەمەوە).

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت: (إنَّ الـرّوحَ إذَا قُبِضَ تَبِعَهُ البَصَرُ).[41]

واتە: کە ڕۆح دەردەچێت چاو تەماشای دەکات، شوێنی ڕۆحەکە دەکەوێت کە بەرز دەبێتەوە.

هەموو ڕۆحێک دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی مرۆڤ، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت لە حدیث بلال: (إن الله قبض أرواحكم حين شاء، وردها عليكم حين شاء).[42]

لێرەدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بە نەسیم باسی ڕۆحی ئیماندارانی کردووە دەفەرموویت: (إنَّما نسمةُ المؤمنِ طائرٌ تعلَّقَ في شجرِ الجنة).

واتە: ڕۆحی مرۆڤ وەکو باڵندەیەک دەفڕێت و لەسەر داری بەهەشت هەڵدەنیشێت.

---

[41] رواه مسلم.
[42] رواه البخاري.

# چون بۆ ژیانی بەرزەخ

خوای پەروەردگار ئەم گەردوونەی بە یاسا و سیستەمێک ڕێکخستووە لە دروست بونەوە بۆ لەناو چوون یاخود بۆ گەڕانەوە بۆلای زاتی پاکی پەروەردگار سەرەتا مرۆڤ هەر ناوی نەبووە لە عەدەم دا هیچ نەبووە خوای پەروەردگار لەبەر خۆشەویستی بۆ مرۆڤ و ڕەحم و بەخشندەی - مرۆڤی دروست کردووە سەرەتا لە شێوەی خانەیەک ژیان و زیندوبونەوەیەتی بۆ دروست دەکات بەپێی ڕۆح پاشان خانە کە دەبێتە چەندین خانەوە تا لەشێوەی سەرە مێکوتەی بەچکەی بۆق دا ژیانی بە تەواوەتی دەست پێ دەکات لەناو لاشەی مرۆڤی نێرینەدا، لە دواییدا دەگوازێتەوە بۆ قۆناغێکی تر لە لاشەی مرۆڤی نێرینەوە بۆ مرۆڤی مێینە ئەم ژیانەی تر نوێیە لە جیهانی ڕەحمی ئافرەتدا خۆی هەڵدەواسێت، بەچاودێری فریشتەیەک وەکو پەروەردگاری ئەو زیندەوەرەی لە داهاتوودا دەبێتە مرۆڤ، ماوەی چەند مانگ بە ڕەحمەوە خۆی هەڵدەواسێ و ژیانی گۆڕانکاری بەسەردا دێت و لاشەو جەستەی وردە وردە بەشی تری بۆ دروست دەبێت و پاشان لەوێدا ڕۆح پێشکەش بەو زیندووە دەکرێت، تا ئەو ساتەوەختە زیندووە و بەڵام بێ ڕۆح، دوای دروست بوونی ڕۆح دەکەوێتە جوڵە و لە جیهانی ڕەحمی دایکیدا ژیان بەسەر دەبات و لەناو ئاوی ڕەحمدا دەژی و لە ڕێگای ناوکەوە خۆراک و پێداویستیەکانی وەردەگرێت ئەم قۆناغە لەدوای نۆ مانگ و چەند ڕۆژێک کۆتایی دێت و بەرەو قۆناغ و ژیانێکی تر دێت.

قۆناغی دووەم کۆرپەلەیی و پلە بە پلە سەردەکەوێت بۆ منداڵی و پاشان بۆ هەرزەکاری و تێگەیشتنی تەمەن و کامڵ بوونی و پیر بوونی بەرەو مردن.



# قۆناغی مردن

مەبەست بە جیابوونەوەی ڕۆحە لە لاشە، جا بەهەر هۆکارێک بێت هەموو کەسێک و نەفسێک دەبێت بمرێت، ئەمەش یاسای خوای پەروەردگارە، ﴿كُلُّ نَفۡسٖ ذَآئِقَةُ ٱلۡمَوۡتِۗ ..١٨٥﴾ آل عمران. هەموو کەسێک دەبێت بمرێت.

لێرەدا مردن قۆناغێکی نوێی ژیانێکی ترە کە لەنێوانی ژیانی دنیای ئاسایی خەڵکییە بۆ ژیانی کۆتایی و نەبڕاوەیی قیامەت یان ڕۆژی دوایی.

گومانی تێدانیە ژیانی بەرزەخ لەگەڵ دەرچوونی ڕۆح لەلاشەی مرۆڤ دەست پێ دەکات، جا مرۆڤ بە هەرچیەک ڕۆحی دەرچوو و مرد ئەوا ڕاستەوخۆ فریشتەی ڕۆح کێشان کە ناوی (مەلەکول مەوتە) ڕۆحی دەکێشێت و ڕۆحەکە ئەداتە دەستی دوو فریشتەی تر.

جا زۆر جار مولحید و بێ باوەڕەکان ئەو پرسیارە دەکەن لە کاتێکدا لە جیهاندا ڕۆژانە و بەڵکو بەکاتژمێر خەڵکی دەمرێت، یەکێک لە ئاسیا ٢٠٠ لە ئەفریقا ١٠٠٠٠ لە جەنگدا لە ئەوروپا بۆنموونە لە ئەمەریکا ٥٠٠٠ کەس دەمرێت، یان کاتی کۆرۆنا خەڵکی لەهەموو جێگاکانی جیهان بە هەرزارەها دەمردن چۆن ئەم فریشتە فریا کەوت ڕۆحی ئەو هەموو خەڵکە بکێشێت، خۆی لەڕاستی پرسیاری ئاوا نیشانەی لاوازی و داماوی ئەقڵی خاوەنەکەی دەردەخات، لەکاتێکدا بیر لەوە ناکاتەوە کە لەیاریەکی تۆپی پێ لە جیهاندا بە هەزارەها کەس کۆدەبێتەوە و من و تۆش کە لەو ستادیۆمەدا، بەڵام بە تەلەفزیۆن دەیبینین و تەنانەت ئەوەی لە گۆڕەپان و تەماشاکەرانە من و تۆ لە شاشەیەکی بچوکەوە دەیانبینین و دەتوانین کۆنترۆڵیان بکەین، هەروەها شێوە و قەبارەیە مرۆڤ وایە لەبەردەستی فریشتەکاندا کە خوای پەروەرگاری فەرمانی پێ کردوون بە هەرحاڵ دێمەوە ناو باسەکەو دەڵێین:

ئەوکاتەی ئەدرێتە دەستی دوو فریشتەکە، ئیتر ڕۆحی مردووەکە دەست دەکات بە وەرگرتنی زانیاری لەسەر دنیای بەرزەخ - یەکەم کار کە مرۆڤ گیانی دەردەچێت بە کوردی بۆ ڕۆح گیان بەکاردێت، بەدوو شێوە زانیاری پێ ئەوترێت ئەگەر ئیماندار و خواناس بوو، ئەوا ڕۆحی بەئاسانی دەردەچێت وەکو دەرچوونی ئاو بۆناو سوراحی، بەرگێکی لە بەهەشتەوە بۆ دەهێنن یاخود کفنێک کە بۆنی لە هەرچی بۆنی خۆشی سەر ئەم زەوییە هەیە خۆشترە، ناوی بۆنەکە (حەنوطە)، پاشان بەرزدەکرێتەوە بۆ ئاسمان بە چ ناوێک پێ خۆش بێت بەو ناوە بانگی دەکەن باسی چاکەو باشەو خێر وخێراتی دەکەن تا دەچێتە بارەگای مەلەکوتی خوای پەروەردگار دەرگای مەلەکوتی بۆ دەکرێتەوە وە خوای پەروەردگار دەفەرمووێت ناوی ئەم کەسە لەگەڵ چاکەکاراندا بنووسن و جێگای خۆی نیشان بدەن لە بەهەشت دا.

ئیتر دەزانێت کە ئەهلی بەهەشتەو خۆشحاڵە و ئەم کردارەی کەڕوویدا پێچونی ماوەی دەرچوونی ڕۆح تا شۆردنی لاشەی مردووەکە ئەگەر شەهید بوو ئەوە زەردەخەنە لەسەر لێوی دەمێنێتەوە، ئەگەر پیاو چاک و خواناس بوو لەو کاتەی دەیشۆرن، هەست پێ دەکرێت کە مردووەکە زەردەخەنە لەسەر لێویەتی بۆماوەیەک و دوایی دەم و چاوی مردووەکە ئاسایی دەبێتەوە.

پاشان ڕۆحەکە لەو ماوەیەدا ئازاد دەبێت تا دەچێتە ناو گۆڕەکەی واتا لەو ماوەی تا دەشۆردرێت و کف و دف دەکرێت و دەنێژرێت.

خۆ ئەگەر کەسەکە چەتوون و کافر و لاڕێ و خراپ بوو ئەوە بە دڵنیاییەوە گیانی زۆر بە ناڕەحەت دەردەچێت، (ناحەقیشی نییە) دەزانێت ڕۆحەکە جێگای ناڕەحەتی و ناخۆشیە تا ئەبەد و کۆتایی، کە گیانی دەرچوو دوو فریشتەی زۆر ناشرین و دەموچاو ناشرین بەرگێکی لە جەهەنەمەوە بۆ دەهێنن کە بۆنەکەی لە هەرچی بۆگەنی لاکەتۆپیوی سەرزەوییە ناخۆشترە، پشکۆی لەگەڵ خۆی هەڵگرتووە کفنەکەی جا



پشکۆی جەهەنەمە، بەرگە کفنەکەی تێوە دەئاڵێنن و بە چ ناوێک پێی ناخۆش بێت بەو ناوە بانگی دەکەن، مەلائیکەتەکانی ئاسمان دەڵێن ئەم بۆگەنە پیسە کێیە، بەو شێوەیە تەریق دەکرێتەوە تا ئاسمانی حەوتەم و بارەگای مەلەکوتی پەروەردگار دەرگای بۆ ناکرێتەوە. ئەو دوو فریشتەیەی کە ڕۆحەکەیان بردۆتە ئاسمان فڕێی ئەدەن لە ئاسمانەوە بۆلای لاشەکەی لەو کاتەی خوای گەورە دەرگای ڕەحمەتی خۆی بۆناکاتەوە دەڵێت ناوی لەگەڵ خوانەناس و شەیتانەکان و کافر و ملهوڕاندا بنوسن، ئاگاداری دەکەنەوە کە ئەهلی دۆزەخەو ڕۆحەکەی لە ئاسمانەوە فڕێ ئەدەنەوە لای لاشەکەی، هاوار و ناڵەشی بەکەس ناگات لەو کاتەدا کە لەسەر بەردە شۆرەکەی دەیشۆن، دەموچاوی گرژ دەبێت و تەنانەت وا هەس دەکەن ئەوانەی لەگەڵیدان ئازاری هەیە یان زیندووە، پاش ماوەیەک دەموچاوی مردوو پێوە دەبینرێت و لەو ماوەیەدا تا دەیخەنە ناو گۆڕەکەی - یان دەیسوتێنن یان هەر مەراسیمێکی تری هەیە، ڕۆحەکەی چاوەڕوان دەکات دەگەڕێتەوە بۆلای لاشەکەی، کە ئەم قۆناغە کۆتایی هات قۆناغی دوای ئەو دەست پێ دەکات ئەویش ژیانی ناو بەرزەخە، هەندێک ناوی ناوە ژیانی ناو گۆڕ، هەردووکیان ڕاستە، بەڵام ژیانی بەرزەخ کە دەوترێت ژیانی ناو گۆڕ.

خۆ لەوانەیە چەندەها کەس هەبێت قەبری بە نسیب نەبووە، یاخود دەسوتێنرێت یان جینۆسایدی بەکۆمەڵ دەکرێن..هتد.

هەموو ئەمانە لە جیهان و ژیانی بەرزەخدان کە مرۆڤ خرایە ناو گۆڕ و ماوەی ئازادبوونی گیانەکە کۆتایی هات، دنیا بەجێ دەهێڵێت و دەڕۆن بۆ قۆناغی گۆڕانکاریەکی تر کە چوونە ناو ژیانی بەرزەخە.

ئەگەڕێینەوە بۆلای پیاوە باشەکە کە مردووە وا خەڵکی لەسەر لێواری گۆڕەکەیدا وەستاون و دایدەهێڵنە ناو گۆڕەکەی لەوکاتەدا دوو فریشتەی تر دێنە لای پرسیاری لێ دەکەن، خواکەت کێیە و پێغەمبەرەکەت کێیە و دینەکەت چییە؟



سێ پرسیاری سەرەکین و سەرەتایین بۆڵێ پرسینەوەی قیامەت، قیامەت ڕاستەخۆ خوای پەروەردگار حیساب و لێ پرسینەوەت لەگەڵ دەکات، ئەم لێکۆڵینەوەی یەکەمە (تەحقیقی) سەرەتاییە بۆ دادگایی خوایی، تەنانەت لە دنیاشدا هەروایە پێش چوونت بۆ دادگاو لێپرسینەوەت لەسەر تاوان بەڕێوبەرایەتی پۆلیس یاخود ئاسایش و ئەمن و موخابەرات پرسیارت لێ دەکات، لەبەرامبەر دادگادا داوای بەرگری لەخۆت دەکەیت و بەڵگەکانت لەسەر دەخەنە ڕوو.

بۆ زانیاری خوێنەر لێپرسینەوەی کافر تەنها لەبەرزەخدایە لە قیامەت هیچ دادگاییەک ناکرێت، چونکە دانیان ناوە بە کافربوونی خۆیاندا و بە تەواوەتی لەسەریان یەکلا بۆتەوە لە بەرزەخ بۆیە ڕۆژی قیامەت، کە لێپرسینەوە دەست پێ دەکات، تەنها بۆ باوەڕدارانە، هەرچەندە جیاوازی هەیە لەنێوان زانایاندا لەو بارەوە هەیانە ئەفەرمووێت تەنها ژماردنی گوناهەکان بۆ خۆی لێپرسینەوەیەکی سەختە و هەشیانە ڕای وایە کە تەنها ژماردن وناساندنی تاوان بۆ بەڕێ کردنی کافرانە بەرەو دۆزەخ نەک موحاسەبەکردن.

لەوەڵامدا پیاو چاکە خواناسەکە دەڵێت خوای من، خوای تاک و تەنهایە و هەر ئەوم پەرستووە بە یەکتاپەرستی و هاوبەشیم بۆ بڕیار نەداوە  ئایینەکەشم ئایینی پیرۆزی ئیسلام بووە، ئەو کەسەشی کە هاتووە ناوی محمدە نێردراوی خوای گەورەیە، فریشتەکان لێی دەپرسن، ئەی چی فێر بووی لەو پێغەمبەرە، پیاو چاکەکەش بێ ترس و دوو دڵی دەڵێت قورئانەکەیم خوێندەوە و فێری تەوحید و ئەمر بە چاکەو ڕێگری لە خراپە بووم.

لەوکاتەدا ژیانی بەرزەخ دەست پێ دەکات و دەچێتە باخ و باخاتێک کە بەشێکە لەبەهەشت، بەڵام بەهەشت نییە، چونکە بەهەشت لە قیامەت دوای لێپرسینەوە مرۆڤەکان دەچنە ناوی، دەمێننەوە تا ڕۆژی قیامەت.



خۆ ئەگەر گوزەرێک بکەین بۆلای پیاو خراپەکە دەبینین شڵەژاوە بێ کەس و زەبوون، بێ قەلەندەر، فریشتەکان دەپرسن، خواکەت کێیە، دەڵێت ها، ها .. نازانم ئەو خەڵکە چی دەوت منیش هەروام دەوت، دەڵێن دینت چییە؟ دەڵێن ها. ها نازانم هەمان وەڵامی پێشوو، ئەی ئەو کەسەی ناردمان شوێنی کەوتی؟ ئەویش وەڵامی تەنها و تەنها ها.ها.ها.یە و شڵەژاو شان داچەکاوە، لەو کاتەدا ڕۆحی دەڕوات بۆ شیوێک لە شیوەکانی دۆزەخ. دۆزەخ نییە، بەڵام لە ناڕەحەتیدایە و تا ڕۆژی قیامەت، ڕۆژی قیامەت کافر و ملهوڕان دەچنەوە دۆزەخی خوای پەروەردگار.

وعن البراء بن عازب -رضى الله عنه- قال: كنَّا في جنازةٍ في بقيعِ الغرقد, فأتانا النبيِّ, فقعدَ وقعَدنا حولَهُ, كأنَّ علَى رؤوسِنا الطَّيرَ, وهو يلحدُ لهُ, فقال: أعوذُ باللَّه من عذابِ القبرِ, ثلاثَ مرَّات, ثم قالَ: إنَّ العبدَ المؤمنَ إذا كانَ في إقبالٍ منَ الآخرةِ وانقطاعٍ منَ الدُّنيا, نزلَت إليْهِ الملائكةُ, كأنَّ علَى وجوهِهم الشَّمسُ, معَهم كفنٌ من أكفانِ الجنَّةِ, وحَنوطٌ من حَنوطِ الجنَّةِ, فجلَسوا منْهُ مدَّ البصرِ ثمَّ يجيءُ ملَكُ الموتِ حتَّى يجلسَ عندَ رأسِهِ فيقولُ: يا أيَّتُها النَّفسُ الطَّيِّبةُ اخرجي إلى مغفرةٍ منَ اللَّهِ ورضوانٍ, قالَ: فتخرجُ تسيلُ كما تسيلُ القطرةُ منَ فِي السِّقاءِ فيأخذُها فإذا أخذَها لم يدعوها في يدِهِ طرفةَ عينٍ حتَّى يأخُذوها فيجعلَوها في ذلكَ الْكفَنِ وذلكَ الحنوطِ, ويخرجُ منْها كأطيبِ نفحةِ مسْكٍ وُجِدَت علَى وجهِ الأرضِ, قالَ: فيصعدونَ بِها فلا يمرّونَ بِها يعني علَى ملأ منَ الملائكةِ إلَّا قالوا: ما هذهِ الرّوحُ الطَّيِّبةُ ؟ فيقولونَ: فلانٌ ئيبنو فلانٍ بأحسنِ أسمائهِ الَّتي كانوا يسمّونَهُ بها في الدُّنيا حتَّى ينتَهوا بِها إلى السَّماءِ فيستفتحونَ لهُ فيُفتَحُ لهُ, فيشيِّعُهُ من كلِّ سماءٍ مقرَّبوها إلى السَّماءِ الَّتي تليها حتَّى ينتَهى بِها إلى السَّماءِ الَّتي فيها اللهُ, فيقولُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: اكتُبوا كتابَ عبدي في علِّيِّينَ وأعيدوهُ إلى الأرضِ, فإنِّي منْها خلقتُهم, وفيها أعيدُهم, ومنْها أخرجهم تارةً أخرى قالَ: فتعادُ روحُهُ في جسدِه فيأتيهُ ملَكانِ, فيُجلسانه, فيقولانِ لهُ مَن ربُّكَ فيقولُ ربِّيَ اللهُ فيقولانِ لهُ: ما دينُكَ ؟ فيقولُ: دينِيَ ئيسلام, فيقولانِ لهُ: ما هذا الرَّجلُ الَّذي بُعِثَ فيكم ؟ فيقولُ: هوَ رسولُ اللَّهِ, فيقولانِ لهُ: ما علمُكَ ؟ فيقولُ:

قرأتُ كتابَ اللَّه فآمنتُ به وصدَّقتُ, فينادي منادٍ منَ السَّماء أن صدقَ هذا يومُكَ الَّذي كنتَ توعدُ, فيقولُ لهُ: من أنتَ ؟ فوجْهكَ الوجْهُ الَّذي يجيءُ بالخيرِ, فيقولُ: أنا عملُكَ الصَّالحُ, فيقولُ: يا ربِّ أقِمِ السَّاعةَ, حتَّى أرجعَ إلى أهلي ومالي قالَ: وإنَّ العبدَ الْكافرَ إذا كانَ في انقطاعٍ منَ الدُّنيا, وإقبالٍ منَ الآخرةِ نزلَ إليْه منَ السَّماء ملائكةٌ سودُ الوجوهِ معهمُ المسوحُ فيجلسونَ منْهُ مَدَّ البصرِ, ثمَّ يجيءُ مَلَكُ الموت حتَّى يجلسَ عندَ رأسه فيقولُ: أيّتُها النَّفسُ الخبيثةُ اخرجي إلى سخطٍ منَ اللَّه وغضبٍ,قال: فتتَفَرّقُ في جسده فينتزعُها كما يُنتَزعُ السَّفُّودُ منَ الصَّوف المبلول, فيأخذُها, فإذا أخذَها, لم يدَعوها في يدِه طرفةَ عينٍ حتَّى يجعَلوهَا في تلْكَ المُسوحِ ويخرجُ منْها كأنْتنِ ريحِ خبيثةٍ وُجِدت علَى وجْه الأرضِ فيصعدونَ بِها, فلا يمرّونَ بِها علَى ملإٍ منَ الملائكَة إلَّا قالوا: ما هذاَ الرّوحُ الخبيثُ ؟ فيقولونَ: فلانٌ ئيبنو فلانٍ بأقبحِ أسمائه الَّتي كانوا يسمّونه بِها في الدُّنيا حتَّى يُنتَهى به إلى السَّماء الدُّنيا فيَستفتَحُ لَه فلا يُفتحُ لَه ثمَّ قرأ رسولُ اللَّه: لا تفتَّحُ لَهم أبوابُ السَّماءَ ولا يدخلونَ الجنَّةَ حتَّى يلجَ الجملُ في سمِّ الخياطِ الأعراف: ٤٠ فيقولُ اللَّهُ عزَّ وجلَّ: اكتبوا كتابَهُ في سجِّينٍ في الأرضِ السّفلى, فتطرحُ روحُهُ طرحًا ثمّ قرأ: وَمَنْ يُشْرِكْ عبدي, فأفرشوهُ منَ الجنَّة, وافتحوا لهُ بابًا إلى الجنَّة, قال فيأتيه من رَوحها وطيبِها ويُفسَحُ لهُ في قَبرِه مدَّ بصرِه, قال ويأتيه رجلٌ حسنُ الوجْه حَسنُ الثَّيابِ طيبُ الريحِ فيقولُ: أبشر بالَّذي يسرّكَ, بِاللَّه فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ السَّمَاءِ فتخطفُهُ الطَّيرُ أو تَهوي به الريحُ في مكانٍ سحيقٍ الحج: ٣١ فَتعادُ روحُهُ في جسده, ويأتيه ملَكانِ فيجلسانه فيقولانِ لهُ: من ربّكَ ؟ فيقولُ: هاه هاه لا أدري, فيقولانِ لهُ: ما هذا الرّجلُ الَّذي بعثَ فيكم ؟ فيقولُ: هاه هاه لا أدري, فينادي منادٍ منَ السَّماء أن كذبَ فأفرشوهُ منَ النَّارِ, وافتحوا لهُ بابًا إلى النَّارِ, فيأتيه من حرِها وسمومَها, ويضيّقُ عليْه قبرُهُ حتَّى تختلفَ أضلاعُهُ ويأتيه رجلٌ قبيحُ الوجْه, قبيحُ الثِّيابِ منتنُ الريحِ فيقولُ: أبشر بالَّذي يسوؤُكَ هذا يومُكَ الَّذي كنتَ توعدُ, فيقولُ: من أنتَ ؟

فوجْهكَ الوجْهُ الَّذي يجيءَ بالشَّرَ, فيقولُ: أنا عملُكَ الخبيثُ, فيقـولُ: ربَ لا تقِمِ السّاعةَ".[٤٣]

ئەم قۆناغە جۆرێکی ترە لە ژیـانی ڕۆح لە جیهـانی بەرزەخـدا، چـونکە ڕۆح پێنج جۆر گۆڕانکاری بەسەردا دێت:

یەکەم: جۆری ژیانی ڕۆح لەناو سکی دایکدا.

دووەم: جۆری ژیانی ڕۆح لەناو جیهانی دونیادا.

سێیەم: جۆری ژیانی ڕۆح لە کاتی خەوتندا.

چوارەم: جۆری ژیانی ڕۆح لە جیهانی ڕۆحەکاندا ناسراوە بە بەرزەخ.

پێنجەم: جۆری ژیانی ڕۆح لەکاتی زیندوکردنەوەدا لە قیامەتدا.

بـۆیە پرسـیارکردن لە چـۆنیەتی، تەنهـا و تەنهـا خـوای پەروەردگـار دەیزانێت وەکو پێشتر ئاماژەمان پێداوە تەنها کات بە فیـڕۆدان و نووسـین ی وشەیە لەسەر پەڕاو بێ سەرچاوەی ڕاسـت و دروسـت، کەواتە ئیمانمـان بە هەمـوو غەیبیـات هەیە کە فەرمـوودەی خـوا و پێغەمبەرەکەیەتـی صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِوَسَلَّمَ. ئەو کەسـانەی موسـڵمانن و تاوانبـار و کـاری خراپەیان ئەنجام داوە، دەشێ لێرە تۆڵەی تاوانەکانیان لێ بکرێتەوە، چونی بۆ قیـامەت ڕاستەخۆ بـۆ بەهەشـت بـێ لێپرسـینەوە، چـونکە لە جیهـانی بەرزەخ تۆڵەی تاوانەکەی لێ کراوەتەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٤٣] رواه الإمام ئەحمەد وأبوداود، و روى النسائي وئيبنو ماجة و رواه الحاكم وأبو عوانة الإسفرائيني في "صحيحهما" وئيبنو حبان.

# ئەشکەنجەی ناو گۆڕ (عەزابی قەبر)

بەدڵنیاییەوە لەناو گۆڕدا ئازار و ئەشکەنجەی تێدایە، پێشتر باسمان کرد بەڵام، لێرەدا باسی ئەشکەنجەو ئازارێکی تایبەت دەکەین کە ناوی گۆڕەوشارە، بەدڵنیایەوە لە پێغەمبەری خواوە صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ چەندین فەرموودە لەوە بارەیەوە هاتووە ئەوەی گرنگە لێرە بۆتۆی هاورێمی باس بکەم، گۆڕەوشار بریتییە لەوەی کە گۆڕ بچوک دەبێتەوە تا ئەو جێگایەی ئیسقانی پەراسوەکانت دەگوشێت، تاکە هاوار و چارەسەر بەندایەتی خۆتە، لای ڕاستت نوێژەکانتە و لای چەپت ڕۆژووەکانت، لای سەرت زەکات وخێر و خێرات، لای قاچەکانت حەج و جیهاد و بانگەوازت، ئەگەر ئەم کارانەت هەبوو، ئەوە ڕێگری لە گۆڕەوشارت دەکات و ناهێڵێت، پاشان سەبر و ئارام گرتن لە ژیان، لەوکاتەدا وەکو پاداشت بۆ هاوکاریت ئامادە دەبێت و بۆ ئەوەی هاوکاری بەندایەتیەکان بکات، ئەگەر پێویستی کرد هاوکاریان دەکات و ئەگەر پێویستی نەبوو لەگەڵ چاکەو حەسەنات و ئیحسانەکانت، خۆیان هەڵدەگرن بۆ ڕۆژی قیامەت و زیندووبونەوەی هەموو خەڵکی لەیەکەم کەسەوە تاکۆتا کەس، کە ناخۆشترین ڕۆژە و ئازار و ئەشکەنجە زۆرە.

بۆ خۆپاراستن لەو گۆڕەوشارە مرۆڤ لەکاتی چونە تەوالێت و خۆپاکردنەوە بەچاکی جوانی وپاکی بێت وە ئەو دوعایە زۆر بکات (اللَّهُمَّ إني أعوذ بک من عذاب القبر)

واتە: پەنا دەگرم بەخوای پەروەردگار لە ئازاری گۆڕ، بەتایبەت لەکاتی خوێندنی تەحیات دا.

ئایەتەکان لەسەر عەزابی قەبر زۆرن چەند نموونەیەک کە خوای پەروەردگار لە سورەتی غافر ئایەتی ٤٥-٤٦دا دەفەرموویێت:



﴿فَوَقَىٰهُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِ مَا مَكَرُواْۖ وَحَاقَ بِـَٔالِ فِرۡعَوۡنَ سُوٓءُ ٱلۡعَذَابِ ٤٥﴾ ئەوسا خوای گەورە (ئەو ئیمانداره ژیرەی) پاراست لە پیلانی خراپ و دڕاندانەیان، داروودەستەی فیرعەونی تووشی سزایەکی زۆر سەخت کرد...

﴿ٱلنَّارُ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا غُدُوّٗا وَعَشِيّٗاۚ وَيَوۡمَ تَقُومُ ٱلسَّاعَةُ أَدۡخِلُوٓاْ ءَالَ فِرۡعَوۡنَ أَشَدَّ ٱلۡعَذَابِ ٤٦﴾ غافر. کە ئاگری دۆزەخە، بەیانیان و ئێواران، نیشانیان دەدرێت، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت، لە (مردنیانەوە تا قیامەت) لە ڕۆژی قیامەتیشدا فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەستەی فیرعەون بخەنە ناو ئێش و ئەشکەنجەو ئازاری زۆر ناخۆشەوە.

هەروەها الە سورەتی الطور ئایەتی ٤٥-٤٧ دەفەرموویێت:

﴿فَذَرۡهُمۡ حَتَّىٰ يُلَٰقُواْ يَوۡمَهُمُ ٱلَّذِي فِيهِ يُصۡعَقُونَ ٤٥﴾ وازیان لێبێنە هەتا بەو ڕۆژە دەگەن کە تیایدا تیادەچن و لاڵ و پاڵ دەکەون.

﴿يَوۡمَ لَا يُغۡنِي عَنۡهُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـٔٗا وَلَا هُمۡ يُنصَرُونَ ٤٦﴾ ئەو ڕۆژە ئیتر فێڵ و تەڵەکەیان بەهیچ جۆرێک فریایان ناکەوێ و سەرکەوتوو سەرفەراز نابن.

﴿وَإِنَّ لِلَّذِينَ ظَلَمُواْ عَذَابٗا دُونَ ذَٰلِكَ وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَهُمۡ لَا يَعۡلَمُونَ ٤٧﴾ الطور. بێگومان بۆ ئەوانەی کە ستەمکارن سزای تریش هەیە بێجگە لەوەی کە جار جار بۆیان پێش دێت پێش تیاچوونی یەکجاری، بەڵام زۆربەیان نەفام و نەزانن و(هەست بە دەستی قەدەر ناکەن لە ڕووداوەکاندا).

هەروەهـــا فەرمـــودە لەم بـــارەیەوە زۆرە، پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: (إن هذه الأمة تُبْتَلى في قبورها، فلولا أن لا تَدَافنوا لدعوتُ اللهَ أنْ يُسْمِعَكم من عذاب القبر الذي أسمع منه) [٤٤]

واتە: ئەم ئوممەتە توشی تاقیکردنەوە و نـاڕەحەتی نـاو گـۆڕ دەبێـت، ئەگەر توانای گوێ گرتن و هـاواری نـاو گۆڕتـان هەبـوایە، نـزام دەکـرد کە گوێتان لە دەنگی ئەشکەنجەو ناڵەو هاواری ناو گۆڕ بوایە.

هەرچەندە ڕایەک هەیە دەڵێت ئاژەڵەکان و گیانداران بەگشتی گوێیان لە دەنگی ناو گۆڕە.

هەروەها عەزابی گۆڕ بە لاشە و ڕۆحە، هەندێک لە زانایان وتویـانە کە تەنها عەزابی ڕۆحە، بەڵام کـۆڕای ئەهلـی سـونەت لەسـەر ڕای ئەوەیە کە عەزابی گـۆڕ بە لاشـە و ڕۆحە، جـا چـۆنیەتیەکەی نازانرێـت، وەکـو پێشـتر ئاماژەمان پێ داوە لەم سێ ژیانەدا وەکو ژیانی دونیا و بەرزەخ و قیامەت سیستەمی ڕۆح جیاوازە و بەگشتی سیستەمی ژیان لە هەرسـێ کیـانەکەدا جیاوازە چونکە لاشەی مرۆڤ لە شـێوەی لاشـەی باڵندەیەکدایـە هەڵـبەت ئیمانداران کە لە شێوەی باڵندە دەفڕن بەسەر دارەکانی بەهەشـت یـاخود خۆیان هەڵدەواسن بە عەرشی پەروەردگار، دەڵێن ڕۆحی ئیمانداران دێن و دەڕۆن چۆن بیانەوێت و هەروەها ئیمامی مالک دەڵێـت ڕۆحـی ئیمانـدار لای پەروەردگارە، هەروەها ڕۆحی کافر و خوانەناسـەکان لەنـاو بیرێکـدایە لە (بئر برهوت).[٤٥]

کەعب دەڵێت: ڕۆحی ئیمانداران لە ئاسـمانی حەوتەمـن لە بەرزتـرین جێگا (في عليين في السماء السابعة)، وە ڕۆحی کافر لە ژێرەوەی زەمینـدایە

-----

[٤٤] رواه مسلم.
(٤٥) بیرێکی مێژوویە و لە حەزرە مەوت لە یەمەن



له حەوت تەبەقەی ژێـری زەوی کە نـاسراوە بە (سـجین) کە جێگـای شەیتانە) (وأرواح الكافرين في السجين في الأرض السابعة تحت خد إبليس)

ئەمەش بەکورتی ژیان و حاڵ و گـوزەرانی بەرزەخە و وەکـو ئیمانـدار دەبێت ئیمانمان پێی هەبێت و بەشێکی سەرەکییە لە بیر و باوەڕمان، پەنا بەخوا نوقصانی لەم باوەڕە واتا بڕوا نەبوون پێی سەرلێ شێواوییە و بەرەو گومڕایی مرۆڤ دەبات.

بەرەو باسی ژیانی قیامەت دەڕۆین، کە چەند نیشـانەیەکی تـایبەت بە خۆی هەیە، ناونراوە بە نیشانە گەورە و بچوکەکانی هاتنی قیامەت.

## نیشانەکانی ڕۆژی دوایی "قیامەت"

نیشـانەی ڕۆژی قیـامەت زۆرن هەنـدێکیان بە نیشـانە گەورەکـان نـاوبراون هەنـدێکی تریـان بە نیشـانەی بچـوک، بەڵام دە نیشـانە بەدوای یەکـدا هـاتوون، ئەم نیشـانانە جیـاوازن لە هەمـوو نیشـانەکانی تـر، لەدەرەوەی سنووری ئەم گەردونەدان.

نیشـانە گەورەکـان، وەکـو هـاتنی کۆتـا پێغەمـبەر محمـد صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ پاشان کەرت بوونی مانگ وەکـو مـوعجیزەیەک بـۆ پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِۦوَسَلَّمَ، ئـازادکردنی قوسـتەنتەنییە یـاخود فەتـح کردنی کە ئێستا لە ژێر دەسـەڵاتی تورکیـادایە و نـاونراوە بە (ئیسـتانبوڵ)، محمد مەهدی، ووشک بوونی دیجلە و فورات.. هتد.

نیشـانەی گەورە و بچـوک بەیەکەوە، ڕوت بـونەوەی ئـافرەت، نەمـانی حەیا و شەرم ڕێزنەگرتن، نەمانی سیقە و ئەمانەت، لەو نیشانانەی ڕوویـان داوە هاتنی محمد قاسم ڕزگارکەری سند و هند، محمد فـاتح ڕزگـار کەری قوستەنتەنیەیە.. هتد.

نیشانە زۆر باس کراوە بەڵام ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبدەین ئەو دە نیشانەیە لە کۆتایی ئەم ژیانەدا بەدوای یەکدا دێن و وەکو ملوانکە مووروەکانی بەدوای یەکدا هۆنراونەتەوە، هەر دەزوی ئەو ملوانکەیە بپچڕێت هەموو دەنکەکانی ملوانکەکە بە زوترین کات بەدوایی یەکدا دەکەون.

جا هاتنی ئەو نیشانانە وەکو ئەو ملوانکانە وایە، لە فەرمودەی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ ئاماژەی بۆ کراوە.

١- دروست بوونی دوکەڵی زۆر لەسەر زەوی، ٢- هاتنی دەجال ٣- هاتن و دەرچونی چوار پێیەک کە وەکو مرۆڤ قسە دەکات، ٤- هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوا ٥- هاتنەوەی عیسای کوڕی مەریەم بۆ سەرزەوی، ٦- یەئجوج و مەئجوج، ٧- سێ ڕۆژ ڕۆژگیران، ڕۆژگیرانی ڕۆژهەڵات ٨- ڕۆژگیرانی تر لە ڕۆژ ئاوا ٩- ڕۆژ گیرانێک لە نیوە دورگەی عەرەبی، ١٠- کۆتایی دەرچونی ئاگرێک لە یەمەن کە خەڵکی لە جێگاو مەنزڵگایان ڕاوەدوو دەنێت بۆ دەشتەکان.

باسێکی هاتنی ئەم نیشانانە دەکەین بۆ تۆی بەڕێز و خوێنەری مەملەکەتی من و تۆ دوای ئەم ڕوداوانە قیامەت دەست پێ دەکات.

ئەو ڕووداوەی نیشانەی قیامەتە هاتنی محمدی مەهدیە، ئەم سەرکردە بەڕێزە خواناسە، وەکو هەموو سەرکردنەکانی تری جیهانی ئیسلامی وایە کە پێشتر پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ موژدەی هاتنی داوە وەکو محمد قاسم کە فەتحی سند و هیندستان دەکات، وەکو محمد فاتیح کە فەتحی قوستەنتەنییە دەکات، محمدی مەهدیش هاوشێوەی ئەم سەرکردە بەڕێزە جارێکی تر فەتحی قودس دەکات.

ژیانی ئەم پیاوە بەڕێزە خواناسە لەسەرەتادا بەکەسێکی باش ناو نەنراوە، واتا کەسێکی خراپەکارە، لەماوەی شەو و ڕۆژێکدا تەوبە دەکات و خەڵکی لەدەوری کۆدەبێتەوە، فەتحی جێگاکان دەکات.



هاتنی محمدی مەهدی، کاتێک بەتەواوەتی لە جیهانی ئیسلامیدا هیچ حکومەتێک نەماوە، بەتەواوەتی پاشا گەردانییە، خەڵکی بەدوای سەرکردەیەکدا دەگەڕێتن کە لەژێر سایەیدا جیهاد و خەبات بکات، هاوشێوەی ئەو ڕەوشە وەکو هاوشێوەی کاتی بەهاری عەرەبییە، خەڵکی هەموو دەسەڵاتە ملهوڕ و عەلمانیەکان دەهێننە خوارەوە چاوەڕوانی دروستکردنی دەسەڵاتی ئیسلامی یان حکومەتەی ئیسلامی یاخود خیلافەتی ئیسلامین ئا لەم ڕەوش و سەردەم و کاتەدا، محمدی مەهدی دەردەکەوێت و خەڵکی شوێنی دەکەوێت و خۆشی کەسێکی سەرکردەو لێهاتووە، بۆیە خەڵک دەیناسێت و شوێنی دەکەون، شەڕی محمدی مەهدی لەگەڵ ڕۆژئاوادایە و کە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ بە ناوی ڕۆژئاوای بە (بنی اصفر) ناوبردووە، کە ٨٠ دەوڵەت کۆدەبنەوە بۆ لێدانی جیهانی ئیسلامی لە ژێر ئاڵای هەر دەوڵەتێکی ڕۆژئاوا و ١٢ هەزار کەسیان لەگەڵدایە نزیکەی یەک ملیۆن سەرباز دەکات دژی موسوڵمانان وە پێشتر ئاگر بەست هەبووە لە نێوان ڕۆژئاوا و موسڵماندا، دیارە فەرمودەکە وا دەفەرمووێت، بە بۆچونی من بۆیە ئەو ئاگر بەستە ڕووی داوە بەهۆکاری ئەوەی موسڵمانان سەرقاڵی ناوخۆیان بوون کە ناوماڵی خۆیان ڕێک دەخەن ئینجا ڕۆژئاوا بە بیانوو دەبێت لە موسڵمانان و شەڕیان پێ دەفرۆشێت و ئیتر ئەو کاتە موسڵمانان لە ژێر ئاڵای (لا اله الا الله)دا کۆ دەبنەوە بەسەر پەرشتی محمدی مەهدی.[٤٦]

پاشان موسڵمانان سەردەکەون و فەتحی زۆرێک لە ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی دەکرێتەوە، بەتایبەت شاری قودس، بەدوای ئەم ڕووداوەدا

-----

٤٦ أَتَيْتُ النَّبيّ صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ فِي غَزْوَةِ تَبُوكَ وهو في قُبَّةٍ من أَدَمٍ، فَقالَ: اعْدُدْ سِتًّا بيْنَ يَدَيِ السَّاعَةِ: مَوْتِي، ثُمَّ فَتْحُ بَيْتِ المَقْدِسِ، ثُمَّ مُوتَانٌ يَأْخُذُ فيكُمْ كَقُعَاصِ الغَنَمِ، ثُمَّ اسْتِفَاضَةُ المَالِ حتَّى يُعْطَى الرَّجُلُ مِئَةَ دِينَارٍ فَيَظَلُّ سَاخِطًا، ثُمَّ فِتْنَةٌ لا يَبْقَى بَيْتٌ مِنَ العَرَبِ إلَّا دَخَلَتْهُ، ثُمَّ هُدْنَةٌ تَكُونُ بيْنَكُمْ وبيْنَ بَنِي الأصْفَرِ، فَيَغْدِرُونَ فَيَأْتُونَكُمْ تَحْتَ ثَمَانِينَ غَايَةً، تَحْتَ كُلِّ غَايَةٍ اثْنَا عَشَرَ أَلْفًا. رواه البخاري عن عوف بن مالك.

دەجال دێت، کە هێزێکی ترسناکە و هیچ پێغەمبەرێک نەهاتووە کە ئاگاداری گەلەکەی خۆی نەکاتەوە لە فیتنەی دەجال، پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت: (ما من نبي إلاّ أنذر أمته المسيح الدجال) رواه البخاري. واتە: هەموو پێغەمبەران گەلەکانی خۆیان ئاگادار کردۆتەوە لە فیتنەی دەجال.

جا دوای ڕوداوی دەجال بەدوایدا عیسای کوڕی مەریەم دەگەڕێتەوە، دەجال دەکوژێت و ماوەیەک لەگەڵ محمدی مەهدی هەردووکیان فەرمانڕەوایی دەکەن و لەو نێوەندەدا گەلی یەئجوجو و مەئجوج دێت، ئەوانیش لەناو دەبات، دەرچوونی ئەم گەلە خراپەکارە بەناوی یەئجوج و مەئجوج لەدوای کوژرانی دەجال دێت بە دەستی عیسای کوڕی مەریەم، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت: (وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه، لَيُوشِكَنَّ أَنْ يَنْزِلَ فيكمُ ئيبنو مَرْيَمَ حَكمًا عَدْلًا، فَيَكسرَ الصَّليبَ، ويقْتُلَ الخنْزِيرَ، ويضَعَ الجِزْيَةَ، وَيَفِيضَ المَالُ حتَّى لا يَقْبَلَهُ أَحَدٌ، حتَّى تَكونَ السِّجْدَةُ الوَاحدَةُ خَيْراً منَ الدُّنْيا وَما فِيهَا. ثُمَّ يقولُ أَبُو هُرَيْرَةَ: وَاقْرَؤُوا إنْ شِئْتُمْ: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾ النساء.

پاشان دوای مردنی محمدی مەهدی و عیسای کوڕی مەریەم و چەند پیاو چاکی دەسەڵات، خراپەکاری و فەسات دەکەوێتەوە ناو خەڵکی و دیارە ئەوەندە خراپەکار و فاسد دەبن، تەنانەت ژینگەی زەویش تێک ئەدەن لەدوای ئەوە چەند دیمەنێکی گەردوونی کە هەرگیز ڕووی نەداوە ڕووئەدات لەوانە:

هەڵهاتنی ڕۆژ لە ڕۆژئاوا، کە نیشانەی داخستنی دەرگای تۆبەیە لەسەر زەویدا و لەدواییدا دەرچوونی چوارپێکان و قسەکردنیان لەگەڵ خەڵکیدا و گیرانی ڕۆژ و ئیتر کۆتایی گەردوونە، هەموو کەون چۆن یەکەم جار دروست بوو سەرەتایی هەبوو، هەرواش کۆتایی هەیە و هەرچی هێزی



پارسەنگی هەیە لە گەردووندا بەتەواوەتی تێکدەچێت و هەموو خۆرەکان لەناوئەچن و هێزی نایترۆجینی زیاد دەکات و ئەستێرەکان وەکو گەڵای دار دەوەریێن و ئەو خاکە دەبێتە زەوییەکی ئاگرین و لەناو جەرگەی خاکەوە گڕ و کڵپە دەردەچێت و هەموو گەردوون لەناو دەچێت.

چەند دیمەنێکی قورئانی لەو ڕوداوانە:-

خوای پەروەدگار لە سورەتی التکویر ئایەتی ١-١٤دەفەرموویێت:

﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ١﴾ کاتێک کە خۆر بچوک بوەوەو ڕووناکیی نەما.

﴿وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ٢﴾ کاتێک کە ئەستێرەکان (لە خولگەی خۆیان) ترازان و دایان بە یەکدا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجِبَالُ سُيِّرَتۡ ٣﴾ کاتێک کە کێوەکان لە شوێنی خۆیان هەڵدەکەندرێن و بەملاولادا بران.

﴿وَإِذَا ٱلۡعِشَارُ عُطِّلَتۡ ٤﴾ کاتێک حوشترانی ئاوس کە تەمەنی بارداربیان دە مانگە گوێیان پێ نەدرا (بێگومان ئەو وشترانە لای عەرەب نازدارن).

﴿وَإِذَا ٱلۡوُحُوشُ حُشِرَتۡ ٥﴾ کاتێک گیانلەبەرانی کێوی و وەحشی و دڕندە بەدەووری یەکدا کۆکرانەوە (ئەوانیش دڕندایەتی خۆیانیان لەبیر چۆوە لە سامناکیی ئەو ڕۆژە).

﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ سُجِّرَتۡ ٦﴾ کاتێک کە دەریاکان گڕ دران (دیارە کە تەقینەوەی ناوکیی ڕوودەدات و ئاوی دەریاکان دەبنەوە بە هایدرۆجین و ئۆکسجین).

﴿وَإِذَا ٱلنُّفُوسُ زُوِّجَتۡ۝٧﴾ کاتێک کە گیانی هەرکەس دەگەڕێتەوە بۆ لاشەی و جوت دەبێتەوە لەگەڵیدا.

﴿وَإِذَا ٱلۡمَوۡءُۥدَةُ سُئِلَتۡ۝٨﴾ کاتێک کە کچی زیندە بەچاڵ پرسیاری لێ کرا.

﴿بِأَيِّ ذَنۢبٖ قُتِلَتۡ۝٩﴾ بە چ گوناهێک، بە چ تۆمەتێک کوژرا؟!

﴿وَإِذَا ٱلصُّحُفُ نُشِرَتۡ ۝١٠﴾کاتێک کە نامەی کردەوەکان واڵا کرا.

﴿وَإِذَا ٱلسَّمَآءُ كُشِطَتۡ۝١١﴾ کاتێک کە ئاسمان لابراو داماڵرا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجَحِيمُ سُعِّرَتۡ۝١٢﴾ کاتێک کە دۆزەخ داگیرسێنراو تاودرا.

﴿وَإِذَا ٱلۡجَنَّةُ أُزۡلِفَتۡ۝١٣﴾ کاتێک کە بەهەشت نزیکخرایەوە (لەخواناسان).

﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٞ مَّآ أَحۡضَرَتۡ۝١٤﴾ التکویر. ئیتر ئەو کاتە هەرکەس دەزانێت چی ئامادەکردووە، چ توێشویەکی پێیە.

هەروەها خوای پەروەدگار لە سورەتی الإنفطار ئایەتی ١-١٩ دا دەفەرمووێت:

﴿إِذَا ٱلسَّمَآءُ ٱنفَطَرَتۡ۝١﴾ کاتێک ئاسمان لەت لەت و پارچە پارچە دەبێت.

﴿وَإِذَا ٱلۡكَوَاكِبُ ٱنتَثَرَتۡ۝٢﴾ کاتێک کە ئەستێرە و هەسارەکان پەرش و بڵاو دەبنەوەو وردوخاش دەبن.

﴿وَإِذَا ٱلۡبِحَارُ فُجِّرَتۡ۝٣﴾ کاتێک کە دەریاکان دەتەقێنرێنەوە.



﴿وَإِذَا ٱلۡقُبُورُ بُعۡثِرَتۡ﴿٤﴾﴾ کاتێک کە گۆڕەکان ژێرەو ژوور دەکرێن (مردووەکانی ناوی دەهێنرێنە دەرەوەو زیندوو دەکرێنەوە).

﴿عَلِمَتۡ نَفۡسٌ مَّا قَدَّمَتۡ وَأَخَّرَتۡ﴿٥﴾﴾ ئەوسا هەرکەس دەزانێ چی پێش خستووەو چی پاش خستووە، چی دەست پێشکەری کردووەو چی هێشتۆتەوە (لە کارو کردەوەی چاک یان خراپ کە خەڵکی دوای خۆی چاویان لێ کردووە).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡإِنسَٰنُ مَا غَرَّكَ بِرَبِّكَ ٱلۡكَرِيمِ﴿٦﴾﴾ ئەی ئینسان!! تۆ چی وای لێکردویت کە سەرکەش بیت بەرانبەر بە پەروەردگاری میهرەبان و بەڕێزت؟! چی وای لێکردویت کە وەکو پێویست قەدری نەزانیت؟ (وە نافەرمان و یاخی بیت؟).

﴿ٱلَّذِي خَلَقَكَ فَسَوَّىٰكَ فَعَدَلَكَ﴿٧﴾﴾ (بە مەرجێک) ئەو پەروەردگارە تۆی دروست کردووە، بە ڕێکوپێکترین شێوە، بە جوانترین شێواز (ئەندامەکان هەموو لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا دانراون کە بتوانن کارو فەرمانی خۆیان بەچاکیی ئەنجام بدەن، وە ئەو ئەندامانەش کە جوتن قەبارەو درێژی و شێوەیان چوونییەکە، جگە لەوەی کە یارمەتی و تەباییەکی تەواو هەیە لە نێوانیانداو هەموان هاوکارن).

﴿فِيٓ أَيِّ صُورَةٖ مَّا شَآءَ رَكَّبَكَ﴿٨﴾﴾ لە هەر شێوەو شێوازێکدا کە ویستویەتی تۆی ڕێکخستووەو ئەندامەکانی بەیەکەوە لکاندووە.

﴿كَلَّا بَلۡ تُكَذِّبُونَ بِٱلدِّينِ﴿٩﴾﴾ نەخێر، (نەدەبوو وا بیت بەرانبەر ئەو پەروەردگارە جوانکارەت، سەرەڕایی ئەو هەموو ڕوونکردنەوانە) هێشتا بڕواتان بە ڕۆژی قیامەت و زیندووبوونەوە نییە!!

﴿وَإِنَّ عَلَيۡكُمۡ لَحَٰفِظِينَ۝١٠﴾ لە کاتێکدا کە ئێوە چاودێریتان لە سەر دانراوە.

﴿كِرَامٗا كَٰتِبِينَ۝١١﴾ لە فریشتە بەڕێزە تۆمارکارەکان.

﴿يَعۡلَمُونَ مَا تَفۡعَلُونَ۝١٢﴾ کە ئاگاو زانان بە هەموو ئەو کردەوەو ڕەفتارانەی کە ئەنجامی دەدەن.

﴿إِنَّ ٱلۡأَبۡرَارَ لَفِي نَعِيمٖ۝١٣﴾ (سەرئەنجام) بەڕاستی چاکان، خواناسان لەناو نازو نیعمەتدا ژیانی پڕ لە شادی و خۆشی دەبەنە سەر.

﴿وَإِنَّ ٱلۡفُجَّارَ لَفِي جَحِيمٖ۝١٤﴾ تاوانبارو تاوانکارەکانیش لە ناو دۆزەخدا ژیانی پڕ لە ئێش و ئازار دەبەنە سەر.

﴿يَصۡلَوۡنَهَا يَوۡمَ ٱلدِّينِ۝١٥﴾ کە لە ڕۆژی قیامەتدا دەخرێنە ناوی و دووچاری دەبن.

﴿وَمَا هُمۡ عَنۡهَا بِغَآئِبِينَ۝١٦﴾ (لە ناویدا) ئەوان بە هیچ شێوەیەک ڕزگاریان نابێت و ناتوانن لێی دوور بکەونەوەو خۆیانی لێ بشارنەوە.

﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ۝١٧﴾ جا تۆ ئەی ئینسان چووزانیت ڕۆژی قیامەت چیە و چۆنە.

﴿ثُمَّ مَآ أَدۡرَىٰكَ مَا يَوۡمُ ٱلدِّينِ۝١٨﴾ ئاخۆ تۆ چووزانیت ئەو ڕۆژە چۆن ڕۆژێکە، (چەند سەختە، چەند سامناکە، چەندە پڕ لە مەینەتە).

﴿يَوۡمَ لَا تَمۡلِكُ نَفۡسٞ لِّنَفۡسٖ شَيۡـٔٗاۖ وَٱلۡأَمۡرُ يَوۡمَئِذٖ لِّلَّهِ۝١٩﴾ الانفطار.
ئەو ڕۆژە کەس فریای کەس ناکەوێت، کەس هیچ شتێکی لە دەست



نایەت بۆ کەسانی تر، ئەو ڕۆژە هەموو شتێک بە دەست خوایە، فەرمان تەنها فەرمانی پەروەردگاری دادپەروەرە.

هەروەهـــا خـــوای پەروەردگـــار لەســـورەتی الزلزلـــة ئـــایەتی ١-٧ دەفەرمووێت:

﴿إِذَا زُلۡزِلَتِ ٱلۡأَرۡضُ زِلۡزَالَهَا۝١﴾ کاتێک کە زەوی تەکانی داو بومەلەزرە بەهێزەکەی بۆ پێش هات.

﴿وَأَخۡرَجَتِ ٱلۡأَرۡضُ أَثۡقَالَهَا۝٢﴾ هەرچی لە زەویدا هەبوو لە ماددە سەنگینەکانی ناوی دەرپەڕاندو هێنایە دەرەوە.

﴿وَقَالَ ٱلۡإِنسَٰنُ مَا لَهَا۝٣﴾ ئەو کاتە ئادەمیزادی (ئەو سەردەمە، بە سەرسامیەوە) دەڵێت: ئەوە چیەتی، چی ڕوویداوە (ئیماندار هەست دەکات کۆتایی دنیایەو بەرپابوونی ڕۆژی ڕەستاخێزە، بێ ئیمانیش سەری لێ دەشێوێت و نازانێت بەرەو کوێ ڕابکات).

﴿يَوۡمَئِذٖ تُحَدِّثُ أَخۡبَارَهَا۝٤﴾ هەواڵی ئەو ڕۆژە وا دەگەیەنێت.

﴿بِأَنَّ رَبَّكَ أَوۡحَىٰ لَهَا ۝٥﴾ کە پەروەردگارت (ئەی ئینسان) فەرمانی بۆ دەرکردووەو (کاتی کۆتاییە).

﴿يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ۝٦﴾ ئەو ڕۆژە خەڵکی دەستە دەستە بەرەو گۆڕەپانی لێپرسینەوە، ڕاپێچ دەکرێن، تا کارو کردەوەکانیان ببیننەوە (دیارە کە نامەی کردەوەکان تۆمار کراوە بە دەنگ و ڕەنگەوە).

﴿فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ۝٧﴾ جا ئەوەی کە بەقەدەر تۆزقاڵی ئەتۆمێک خێرو چاکەی ئەنجام دابێت دەیبینێتەوەو (پاداشتی هەیە).

﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ۝٨﴾ الزلزلة. ئەوەش کە بەقەدەر تۆزقاڵی ئەتۆمێک شەڕو خراپەی کردوە دەیبینێتەوەو(سزای هەیە)

هەروەهــا خــوای پەروەردگــار لە ســورەتی القارعــة ئـایەتی ١-١١دا دەفەرموویت:

﴿ٱلۡقَارِعَةُ۝١﴾ (ئای) بەڵا گەورەکە، دەنگە سامناکەکە.

﴿مَا ٱلۡقَارِعَةُ۝٢﴾ داخۆ ئەو بەڵا گەورەیە چی بێت؟ ئەو دەنگە سامناکە چۆن بێت؟!

﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا ٱلۡقَارِعَةُ۝٣﴾ تۆ (ئەی ئینسان) چووزانیت چ بەڵایەکە، چ سامناکیەکە!!

﴿يَوۡمَ يَكُونُ ٱلنَّاسُ كَٱلۡفَرَاشِ ٱلۡمَبۡثُوثِ۝٤﴾ ئەو ڕۆژە خەڵکی وەکو پەپولەی سەرگەردان پەرۆش و بڵاودەبنەوە.

﴿وَتَكُونُ ٱلۡجِبَالُ كَٱلۡعِهۡنِ ٱلۡمَنفُوشِ۝٥﴾ کێوەکانیش وەکو خوری شیکراوەیان لێ دێت (سوک دەبن و چاڵ و چۆڵیان پێ پڕدەکرێتەوە).

﴿فَأَمَّا مَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ۝٦﴾ جا ئەوەی تەرازووی خێری سەنگین بێت.

﴿فَهُوَ فِي عِيشَةٖ رَّاضِيَةٖ۝٧﴾ ئەوە لە بارودۆخێکی خۆش و ئاسوودەدا ژیان دەباتە سەرو زۆر پێی ڕازییە.

﴿وَأَمَّا مَنۡ خَفَّتۡ مَوَٰزِينُهُۥ۝٨﴾ بەڵام ئەوەی تەرازووی (خێرو چاکەی) سووک بێت (گوناهی زۆر بێت).

﴿فَأُمُّهُۥ هَاوِيَةٞ ۝٩﴾ دایکی ئەو دۆزەخەو (باوەشی بۆ کردۆتەوە)!!



﴿وَمَآ أَدۡرَىٰكَ مَا هِيَهۡ ١٠﴾ جا تۆ چووزانی (هاویە) چییە!! (چ بەڵایەکە، چ سزایەکە)

﴿نَارٌ حَامِيَةُۢ ١١﴾ القارعة. ئاگرێکی زۆر داخ و سوتێنەرو بڵێسەدارە (هەرگیز خامۆش نابێت و تینی کەم ناکات).

پاشان خوای پەروەردگار لە سورەتی الواقعة ئایەتی ١-٦ دەفەرمووێت:

﴿إِذَا وَقَعَتِ ٱلۡوَاقِعَةُ ١﴾ کاتێک کە ڕووداوە (سامناکەکە) پێش دێت.

﴿لَيۡسَ لِوَقۡعَتِهَا كَاذِبَةٌ ٢﴾ ڕوودانی ئەو کارەساتە حەقیقەتەو کەس ناتوانێت بڕوای پێی نەبێت و بەڕاستی نەزانێت.

﴿خَافِضَةٞ رَّافِعَةٌ ٣﴾ نە نزمکەرو بەرزکەرەوەیە، (ئیمانداران بەرزو بڵند و پایەدار دەبن، خوانەناسانیش سەرشۆڕو خەجاڵەت و ڕیسوا).

﴿إِذَا رُجَّتِ ٱلۡأَرۡضُ رَجّٗا ٤﴾ کاتێک زەوی دەشڵەقێت و بەتوندی دەلەرزێت.

﴿وَبُسَّتِ ٱلۡجِبَالُ بَسّٗا ٥﴾ کێوەکانیش وردوخاش دەبن (تەخت و ساف دەبن، بەرزییەکان نشێوەکان پڕ دەکەن).

﴿فَكَانَتۡ هَبَآءٗ مُّنۢبَثّٗا ٦﴾ الواقعة. دەبنە تەپ و تۆزێکی پەرش و بڵاو (زەویان پێ تەخت و ڕێک دەکرێت).

دوای ئەم ڕوداوانە هەموو شتێک لەناو دەچێت و کۆتایی دێت تەنها خوای پەروەردگار دەمێنێت ﴿وَيَبۡقَىٰ وَجۡهُ رَبِّكَ ذُو ٱلۡجَلَٰلِ وَٱلۡإِكۡرَامِ ٢٧﴾ الرحمن. تەنها زاتی پەروەردگاری خاوەن بڵندی و ڕێزی تۆیە کە دەمێنێتەوە.

تا چەنـد بەو شـێوەیە دەمێنێـتەوە ئەوە لە ویسـت و ئیـرادەو عیلمـی خوای پەروەردگـارە پاشـان خـوای گەورە جـارێکی تـر فریشـتەو جنـۆکە و مــــرۆڤ و گیانــــداران هەمــــوو زیانــــدوو دەکــــاتەوە، ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەستانەوەی هەموو گیاندارێکە کە خوای پەروەردگـار دروسـتی کـردووە، هەر بۆیە ناونراوە بە ڕۆژی قیامەت لەبەرئەوەی ڕۆژی هەڵسـانەوەیانە بە ویستی خوای گەورە لەدوای لەناوچونیان (القیامة) واتا هەڵسانەوە.

کەواتە قۆناغی ژیانی سێ و کۆتـایی ژیـانی قیـامەتە و ڕۆژی دوایـیە و دوای ئەم ژیانە هیچ ژیانێکی تر نییەو بەڵکو ژیانی کۆتایی ئەبەدییە.

## دەستپێکی ژیانی قیامەت و ڕۆژی دوایی

لە دوای ئەوەی خــوای پەروەردگــار هەمــوو دروســتکراوەکانی لەنــاو دەبـات و بەتەنهـا و تەنهـا خـۆی زاتـی پـاکی دەمێنێـتەوە، ئەمە چەنـدی پێدەچێت لە زانستی خـوای پەروەرگـاردایە، لە پاشـاندا بـۆ هەڵسـانەوە و زینـدوو کـردنەوەی مـرۆڤ، خـوای گەورە بارانێـک دەبـارێنێ لە شـێوەی (مەنی) پیاو، هەرچی مرۆڤ هەیە لەسەر زەوییدا لەیەکەم کەسەوە تاکۆتا کەس زینـدوو دەبێـتەوە، ئەو بـارانە لەگەڵ بەشـێک لە لاشـەی مـرۆڤ کە ناوی (عجب الذنب) یەک دەگرێـت و مـرۆڤەکە زینـدوو دەکـاتەوە وەکـو چۆن گژوگیا و دار و درەخـت سـەر لە خـاک دەردەچێـت و پـێ دەگەن و بەرزدەبنەوە بەو شێوەی مرۆڤەکان هەموو زیندوو دەکرێنەوە و ئەو ڕۆژە ناوی ڕۆژی قیامەتە واتا ڕۆژی هەڵسانەوەیە، هەمـوو ڕوت و قـوت و بـێ پارە و سەروەت وەکو یەکن مرۆڤەکان.

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:



(كلُّ ابن آدمَ يأكلُهُ التُّرابُ إلاَّ عجبَ الذَّنبِ منْهُ خلقَ وفيـه يرَكـبُ. رواه النسائي عن أبي هريرة. هەروەها دەفەرموویت: إن السماء تمطر مطرا كمني الرجل ينبتون في القبور كما تنبت النبات).[47]

ئەو ڕۆژە هـاتووچۆ هەیە لەنێـوان چەنـد جێگایەکـدا لەنێـوان حەوزی کەوثەری پێغەمبەری خوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ جێگای میزان و پێوانە و لێپرســـینەوەی تاوانەکـــانەوە پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ ئەدرەســی خــۆی داوە لەو ڕۆژەدا دەتــوانین بــی دۆزیــنەوە، هاوەڵێــک پرســـیاری لێکــرد، ئەو ڕۆژەی کە قیـــامەتە چـــۆن تـــۆ بـــدۆزینەوە ئەی پێغەمـبەری خـوا؟ رسـول الـله صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمـووی: یـان لە تەنیشت میزانم یـاخود لەسـەر حەوزی کەوثەر، یـان لای پـردی دۆزەخ کە ناسراوە بە (صراط).

مـرۆڤ توانـای هـاتووچۆی هەیە لەو ڕۆژەداو، بەڵام چارەنوســی کەس دیار نییە، کافر و موسڵمان و مونافیق، چاوەڕوانی ڕۆژی لێپرسینەوەن واتـا دوای قیامەت، کـاتی حەشر دێـت کە ڕۆژی لـێ پرسـینەوەیە خەڵکـی لەو ڕۆژەدا داوادەکەن چارەنوسیان دیاری بکرێت، دەچنە خزمەت پێغەمبەران لە ئادەمەوە تا کۆتا پێغەمبەر کەسیان توانای ئەو کارەیان نییە، تەنها کۆتـا پێغەمبەر محمد صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویت من هەڵدەسـتم بەو کارە، شەفاعەت بۆ هەموو مرۆڤەکـان دەکـات، ٤ سـاڵ سـەردەخاتە سـەر سوجدە، ئینجا خوای پەروەردگار وەڵامی ئەداتەوە، داوای پێغەمبەری خـوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قبـوڵ دەکـات، جـا چـی مـرۆڤ هەیە سوپاســی پێغەمـبەری خـوا صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەکەن کە خـاوەنی ئەو مەقـامە گەورەیەیە و (صـاحب المقـام المحمـود)ە هەربـۆیە نـاونراوە بە محمـد - چونکە لەدنیاو قیامەت سوپاسی کراوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[47] أخرجه الطبراني مرفوعاً عم ئیبنو مسعود.

پاشان خوای گەورە خۆی تەشریف دەهێنێت، وەک خـوای پەروەردگـار دەفەرمووێت:

﴿وَجَآءَ رَبُّكَ وَٱلۡمَلَكُ صَفّٗا صَفّٗا ٢٢ وَجِاْيٓءَ يَوۡمَئِذِۭ بِجَهَنَّمَۚ يَوۡمَئِذٖ يَتَذَكَّرُ ٱلۡإِنسَٰنُ وَأَنَّىٰ لَهُ ٱلذِّكۡرَىٰ٢٣﴾ الفجر. پەروەردگارت دێت و فریشتەکانیش پۆل پۆل (هاتنی پەروەردگاری مەزن خۆی نەبێت کاس نازانێت چۆنە)، ئەو ڕۆژە دۆزەخ دەهێنرێت و نیشان دەدرێت، جا ئەو ڕۆژە (ئادەمیزادی بێ باوەڕ) دەزانێت چ پەندێکی بەسەر خۆی هێناوە، بەڵام تازە بە خۆدا هاتنەوەو پەشیمانیی هیچ سوودێکی نییەو دادی نادات.

لە دواییـدا جەهەنەم پـردی بەسـەردا ڕادەکێشرـێت، پاشـان میـزان و شایان دادەنرێت و خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ لِيَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ فَلَا تُظۡلَمُ نَفۡسٞ شَيۡـٔٗاۖ وَإِن كَانَ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٍ أَتَيۡنَا بِهَاۗ وَكَفَىٰ بِنَا حَٰسِبِينَ ٤٧﴾ الأنبياء. ئێمە تەرازووی پێوەری دادپەروەریی لە ڕۆژی قیامەتدا دادەنێین، هیچ کەس بە هیچ شێوەیەک ستەمی لێ ناکرێت، ئەگەر بە قەدەر تۆوە خەردەلەیەک (کە زۆر بچوک و وردە، کارێکی چاک یا خراپ ئەنجام درابێت) دەیهێنینە مەیدان، جا ئەوەندە بەسە بۆ ئێمە کە ئاوا بە وردیی حساب و لێپرسینەوە ئەنجام دەدەین.

هەروەها خوای پەروەردگار لە سورەتی المؤمنون دەفەرمووێت:

﴿فَمَن ثَقُلَتۡ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ١٠٢﴾ ئەوەی تەرازووی چاکەی سەنگینە، ئا ئەوانە سەرفەرازو سەرکەوتوون.



﴿وَمَنْ خَفَّتْ مَوَٰزِينُهُۥ فَأُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمْ فِى جَهَنَّمَ خَـٰلِدُونَ﴿١٠٣﴾﴾ المؤمنون. ئەوەی تەرازووی چاکەی سووک بێ، ئەوانەو ئەو کەسانەن کە خۆیان لەکیس چووەو خۆیان خەسارو ڕیسوا کردووە، دەبێت هەر لەناو دۆزەخ دا ژیانی نەبڕاوە ببەنە سەر.

حیساب و لێ پرسینەوە تەنها بۆ ئیماندارانە، کافر لێپرسینەوەی لەگەڵ ناکرێت و بۆ دۆزەخ و بەدوایدا هەموو مونافیقان و دووڕووەکان، پێشتریش باسمانکرد کە خیلافەکە لەسەر وشەی حسابە، ئایا حیساب بۆ لێ پرسینەوەیە یان تەنها ژماردن و ئاگادارکردنی چەن و چۆنێتی تاوانەکانی کافرانە؟ لەبەشی خوارەوەی دۆزەخدان، موسڵمان دەبێت دۆزەخ ببینێت و بەسەر پردی دۆزەخدا تێپەڕێت وەکو هەورە بروسکە تێ دەبەڕێت و هەیە وەکو کشانی ئەستێرە ئەوەندە بەخێرایی دەڕۆن و هەیە بەخێرایی ڕادەکات و بە گوێرەی ئیمان و خواناسیەکەی، خواپەنامان بدات، هەیە دەکەوێت ناوی..هتد

خوای پەروەردگار لە سورەتی المريم ئایەتی ٧١-٧٢دەفەرموویت:

﴿وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا﴿٧١﴾﴾ ئێوە (خەڵکینە هەر هەموتان) بەسەر (دۆزەخدا) تێ دەپەڕن، (ئیمانداران بۆ ئەوەی زیاتر قەدری بەهەشت و ڕەحمەتی خوا بزانن، کافران بۆ ئەوەی بکەونە ناوی) وە ئەم (پێشهاتە) شتێکی بڕیار دراوە هەر جێبەجێ دەکرێ.

﴿ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَواْ وَّنَذَرُ ٱلظَّـٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا﴿٧٢﴾﴾ مریم. لەوەودوا ئەوانە ڕزگار دەکەین کە پارێزکارو خواناس بوون، ستەمکارانیش لەناو دۆزەخدا بەچۆکدا دێنین.

پاشان خەڵکی دابەش دەبێت بۆ دوو جێگا لەبەهەشت و دۆزەخ، ئەم دوو مەخلوقەی خوای پەروەردگار، لەناو ناچن و بەهەتا هەتایی دەمێننەوە واتا بەهەشت بۆ هەتا هەتایی خەڵکەکەش لەگەڵیدا

دەمێنێتەوە، هەروەها دۆزەخ بۆ هەتا هەتایە خەڵکە کەشی لەناویدا دەمێننەوە، پەنا دەگرم بەخوای پەروەردگار لە ئاگری دۆزەخ، سوپاس و ستایشی دەکەم بۆ نیعمەتی ئیسلام.

خۆشی و شادی بەهەشت بە خەیاڵدا نەهاتووە و بە چاو نەبینراوە و پێچەوانەی بەهەشت دۆزەخە، کە ئازار و ئەشکەنجە و ناڕەحەتی لەناو دۆزەخدا نە بەخەیاڵدا هاتووە و نە بەچاو بینراوە، پەنا بەخوا لە دۆزەخدا ژیانی تایبەت بە تاوان بارانەو لە بەهەشت ژیان و خۆشی وشادی تایبەتە بە چاکەکاران.

## بینینی خوای پەروەردگار لە بەهەشتدا

هەموو ئیمانداریک خوای پەروەردگار دەبینێت لە بەهەشتدا، بەڵام چۆنیەتی بینینەکەی نازانین بە بەڵگەی ئایەتی قورئانی وەک خوای پەروەردگار لە سورەتی القیامة ئایەتی ٢٢-٢٣ دەفەرموویت:

﴿وُجُوهٌ يَوْمَئِذٍ نَّاضِرَةٌ﴿٢٢﴾﴾ (بەمەرجێک) ئەو ڕۆژە، ڕوخسارانێک گەشاوەو ناسک و ئاسوودە بن.

﴿إِلَىٰ رَبِّهَا نَاظِرَةٌ﴿٢٣﴾﴾ القيامة. چونکە (هەریەکە بۆ خۆی) تەماشای پەروەردگاری دەکات و (لە تەماشا کردنی تێر نابێت).

هەروەها خوای پەروەردگار دەفەرموویت:

﴿۞ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُواْ ٱلْحُسْنَىٰ وَزِيَادَةٌۖ وَلَا يَرْهَقُ وُجُوهَهُمْ قَتَرٌ وَلَا ذِلَّةٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَصْحَٰبُ ٱلْجَنَّةِۖ هُمْ فِيهَا خَٰلِدُونَ﴿٢٦﴾﴾ يونس. بۆ ئەوانەی چاکەیان کردووە، پاداشتی چاک، (بەهەشتی بەرین) و زیاتریش ئامادەیە (لە ڕیوایەتێکدا کە پێشەوایان ئەحمەد و موسلیم ڕیوایەتیان کردووە، ئەو



زیاتره تەماشاکردنی ڕوخساری پڕ لە نوورو قەشەنگی زاتی پەروەردگارە)، بێگومان ڕووخساریان ڕەشی و تاڵیی و زەلیلیی و ماندوێتی پێوە دیار نییە، ئەوانە نیشتەجێی بەهەشتن و بۆ هەمیشە ژیانی تیادا دەبەنە سەر.

هەروەها فەرمووده لەو بارەیەوە زۆرە (متەواترە)، خەڵکانێک پرسیاریان کرد لە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ وتیان: ئایا پێغەمبەری خوا ئێمە خوای پەروەردگار دەبینین لە ڕۆژی قیامەت دا؟ لە وەڵامدا پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: مانگی ١٤ چۆن پڕ دەبێت بە جوانتر دەبینرێت گومانتان لە پڕی مانگ و جوانیەکەی هەیە؟ وتیان: نەخێر یا رسول الله، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: ئەی گومانتان لەبینینی خۆر هەیە کە هیچ هەورێک بەردەمی خۆر ناگرێت؟ فەرموویان: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوا، فەرمووی: دە خوای پەروەردگار دەبینن بەو جۆرە.

(عن أبي هريرة: «ان الناس قالوا: يا رسول الله، هل نرى ربنا يوم القيامة؟ فقال رسول الله صلى الله عليه وسلم: هل تضارون في القمر ليلة البدر؟. قالوا: لا يا رسول الله، قال: فهل تضارون في الشمس ليس دونها سحاب؟ قالوا: لا يا رسول الله، قال: فإنكم ترونه كذلك).[٤٨]

هەروەها هاوەڵان دەفەرموون شەوێکی مانگە شەو کە مانگ خەرمانەی دابوو واتا مانگی چواردە، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: بەچاوتان خوای پەروەردگار دەبینن وەکو ئەو مانگە و خۆی پاک و بێگەردە، بێ هیچ پەردەو لێڵی و گومانێک دەبینرێت و لە بینینی ماندو شەکەت نابن

---

[٤٨] متفق عليه.

(عـــن جريـــر بـــن عبداللـــه قـــال: كنَّـــا جُلُوسًـــا عنْـــدَ النبـــيَ صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ إِذْ نَظَـرَ إِلى القَمَـرِ لَيْلَـةَ البَـدْرِ قـالَ: إِنَّكـمْ سَـتَرَوْنَ رَبّكمْ كما تَرَوْنَ هذا القَمَرَ، لا تُضَامُونَ فِي رُؤْيَته، فَإِن اسْتَطَعْتُمْ أنْ لا تُغْلَبُـوا علَى صَلَاةٍ قَبْلَ طُلُوعِ الشَّمْسِ، وصَلَاةٍ قَبْلَ غُرُوبِ الشَّمْسِ، فَافْعَلُوا).[٤٩]

دواتر ئەفەرمووێت ئەگەر توانیتان نـوێژی بـەیانی و نـوێژی عـەسر بـێ هـیچ نوقسـایەک بکـەن ئـەوە بیکـەن. وەکـو بیـەوێت بفـەرموێت کـە نوێژەکانتان هۆکاری یەکەمی بینینی خوایە ئەگەر وەک خۆی و بێ کـرچ و کاڵی و بە جەماعەت و لە کاتی خۆیدا کردتان. والله اعلم.

فەرمودە لەم بارەیەوە زۆرە کە زیـاتر لە ٣٠ هـاوەڵی پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ فەرموودەی جیاوازیان گێڕاوەتەوە لەبـارەی بینینـی خوای پەروەردگار.

لێـــرەدا دەبێـــت باســـی ئەوە دەکەیـــن کە ئایـــا پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەکـــاتی ڕۆشـــتنی بـــۆ ئیسرـــا و میعـــراج خـــوای پەروەردگاری بینیووە؟ بەدڵنیاییەوە لە فەرموودەی عائیشەدا هاتووە، هەر کەس بڵێت کە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە گەشـتی ئیسرـا و میعراج خوای بینیووە، ئەوە درۆی بەدەم پێغەمبەری خواوە کردووە.

(عـــن عائشـــة رضي اللـــه عنهـــا قالـــت: مـــن حـــدثک أن محمـــدا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ رأى ربه فقد كذب، وهو يقول: {لا تدركـه الأبصـار} ومن حدثک أنه يعلم الغيب فقد كـذب، وهـو يقـول: لا يعلـم الغيـب إلا الله).[٥٠]

---

[٤٩] متفق عليه.
[٥٠] رواه البخاري



هەرچەندە کۆڕای زانایانی ئەهلی سوننە و جەماعە لەسەر ئەو ڕایەن کە هیچ کەس خوای نەبینیووە لەم ژیانەدا، بەڵام هەندێک لە زانایان لەسەر فەرمودەیەکی لاواز کە لە ئیبن عەباسەوە گێڕاویانەتەوە و فەرمودەیەکی (وەستاوە) واتا مەوقوفە لە سەر ئیبن عباس کە دەفەرموێت: إنه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ رآه بعينه. ئیمام ئەحمەدیش قسەیەکی موتڵەق لەوبارەوە ئەکات و دوایش ئەفەرموێت: بە چاوی دڵ بینیوێتی، ئەوەش ڕایەکە کە پشتی پێنەستراوە و بەڵگە قورئانی و حەدیسیەکان پشتیوانی ناکەن.

## شەفاعەتی پێغەمبەری خوا لە ڕۆژی قیامەت

پێغەمبەری ئازیز صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خاوەنی چەند شەفاعەتێکە، زانایان کردویانە بە ٨ جۆر شەفاعەت.

شەفاعەتی یەکەم: بۆ هەموو خەڵکیە بە کافر و موسڵمانەوە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ داوا دەکات لەخوای گەورە، کە لێپرسینەوە لەگەڵ خەڵکیدا بکات، لەم شەفاعەتەدا چوار جار شەفاعەت دەکات بۆ خەڵکی بەگشتی بۆ لێپرسینەوەیان پاشان بۆ چونە بەهەشتیان، ئەوانەی کە ئەهلی بەهەشتن دەرگای بەهەشتیان بۆ دەکاتەوە بە ئەمری خوای پەروەردگار، شەفاعەتی سێیەم بۆ ئوممەتەکەیەتی بەگشتی، شەفاعەتی چوارەم بۆ پێغەمبەر داوا دەکات دەفەرموویت:

ئوممەتەکەم ئوممەتەکەم، خوای گەورە دەفەرمووێت بێ لێپرسینەوە لە ئوممەتەکەت کێت دەوێت بیخە بەهەشت و لە یەکێک لە دەرگاکانی ڕاستی بەهەشت دەچنە ژورەوە کە گەورەیی و فراوانی دەرگاکە ئەوەندەی نێوان مەککە و بوحیرایە لە نزیک شام.



بە تەنها شەفاعەتی یەکەمی بوو بریتی بوو لە چوار داواکاری یاخود چوار شەفاعەت لەیەک کاتدا.

شەفاعەتی دووەم: بۆ ئەوانەی چاکەو تاوانیان وەکو یەکە خوای گەورە شەفاعەتی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ئەوانیش قوبوڵ دەکات دەچنە بەهەشت.

شەفاعەتی سێیەم: بۆ ئەوانەی کە چاکەیان هەیە و خراپەیان زۆرە، بڕیار دراوە لەسەریان بخرێتە دۆزەخ، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ شەفاعەت بۆ ئەوانەش دەکات کە دەچنە بەهەشت.

شەفاعەتی چوارەم: بۆ ئەوانەی چونەتە بەهەشت و پلەیان نزمە، شەفاعەتیان بۆ دەکات بۆ ئەوەی پلەی بەرزیان پێببەخشێت.

شەفاعەتی پێنجەم: لە ژیانی خۆیدا شەفاعەتی کردووە بۆ کەسانێک کە بێ لێپرسینەوە بڕۆنە بەهەشت نموونە (عوکاشەی کوڕی محصن) هەروەها ٧٠ هەزار لە ئوممەتەکەی بێ حیساب و لێپرسینەوە دەچنە بەهەشت.

شەفاعەتی شەشەم: کەم کردنەوەی عەزابە لەسەر ئەهلی دۆزەخ و کافرەکانی دۆزەخ نموونەی ئەبو طالیبی مامی، بۆ کافران تەنها کەمکردنەویە پلە سزاکەیانە، بەڵام بۆ هاتنە دەرەوە نییە لە دۆزەخ، هاتنە دەرەوە تەنها بۆ موسوڵمانە موەحیدە تاوانبارەکانە.

شەفاعەتی حەوتەم: بۆ هەموو ئیماندارانە کە بچنە بەهەشت.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: (أنا اول شفيع في الجنة) رواه مسلم عن أنس بن مالک.

شەفاعەتی هەشتەم: بۆ ئەو ئیماندارانەیە کە تاوانی گەورەیان ئەنجام داوە وەکو زیان و ڕیبا و پیاوکوشتن..هتد.



ئەمانە جۆری شەفاعەتی پێغەمبەری خوان، خوای پەروەردگار ڕێگای پێداوە و بە ئەمری خوای گەورە ئەو شەفاعەتانە دەکات و لەهەمان کاتدا شەفاعەتی مەلائیکە و شەهیدان و پیاوچاکان ڕێگا پێ دراوە لەلایان خوای پەروەردگارەوە بۆ ئەم ئوممەتە.

لە فەرموودەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ هاتووە لە شەفاعەت لە دوای هەموو ئەوانەی ڕێگایان پێ دراوە شەفاعەتیان کرد، خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی بە چنگی زاتی پاکی ئەوەی ئیمان داربووە و هیچ چاکەیەکی نەبووە، ئەوانیش لە دۆزەخ ڕزگاریان دەبێت (حدثنا سليمان بن حرب، حدثنا حماد بن زيد حدثنا معبد بن هلال العنزي قال: اجْتَمَعْنَا نَاسٌ من أهْلِ البَصْرَةِ فَذَهَبْنَا إلى أنَس بنِ مَالك، وذَهَبْنَا معنَا بثَابِت البنَانِيِّ إلَيْه يَسْأَلُهُ لَنَا عن حَدِيث الشَّفَاعَة، فَإذَا هو في قَصْرِهِ فَوَافَقْنَاهُ يُصَلِّي الضُّحَى، فَاسْتَأْذَنَّا، فأذِنَ لَنَا وهو قَاعِدٌ علَى فِرَاشِه، فَقُلْنَا لثَابِت: لا تَسْأَلْهُ عن شيءٍ أوَّلَ من حَدِيث الشَّفَاعَة، فَقالَ: يا أبَا حَمْزَةَ هَؤُلَاء إخْوَانُكَ من أهْلِ البَصْرَةِ جَاؤُوك يَسْأَلُونَكَ عن حَدِيثِ الشَّفَاعَة، فَقالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدٌ صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ قالَ: إذَا كانَ يَوْمُ القِيَامَةِ مَاجَ النَّاسُ بَعْضُهُمْ في بَعْض، فَيَأْتُونَ آدَمَ، فيَقولونَ: اشْفَعْ لَنَا إلى رَبِّك، فيَقولُ: لَسْتُ لَهَا، ولَكِنْ علَيْكُم بإبْرَاهِيمَ فإنَّه خَلِيلُ الرَّحْمَنِ، فَيَأْتُونَ إبْرَاهِيمَ، فيَقولُ: لَسْتُ لَهَا، ولَكِنْ علَيْكُم بمُوسَى فإنَّه كَلِيمُ اللَّه، فَيَأْتُونَ مُوسَى فيَقولُ: لَسْتُ لَهَا، ولَكِنْ علَيْكُم بعِيسَى فإنَّه رُوحُ اللَّه، وكَلِمَتُهُ، فَيَأْتُونَ عِيسَى، فيَقولُ: لَسْتُ لَهَا، ولَكِنْ علَيْكُم بمُحَمَّد صَلَّى اللهُ عليه وسلَّمَ، فَيَأْتُونِي، فأقُولُ: أنَا لَهَا، فأسْتَأْذِنُ علَى رَبِّي، فيُؤْذَنُ لِي، ويُلْهِمُنِي مَحَامِدَ ئەحمەدەُ بهَا لا تَحْضُرُنِي الآنَ، فئەحمەدەُ بتِلْكَ المَحَامِد، وأخِرُّ له سَاجِدًا، فيَقولُ: يا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وسَلْ تُعْطَ، واشْفَعْ تُشَفَّعْ، فأقُولُ: يا رَبِّ، أُمَّتي أُمَّتِي، فيَقولُ: انْطَلِقْ فأخْرِجْ منها مَن كانَ في قَلْبِهِ مِثْقَالُ شَعِيرَةٍ من إيمَانٍ، فأنْطَلِقُ فأفْعَلُ، ثُمَّ أعُودُ، فئەحمەدەُ بتِلْكَ المَحَامِد، ثُمَّ أخِرُّ له سَاجِدًا، فيَقَالُ: يا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وسَلْ تُعْطَ، واشْفَعْ تُشَفَّعْ، فأقُولُ: يا رَبِّ، أُمَّتي أُمَّتِي، فيَقولُ: انْطَلِقْ فأخْرِجْ منها مَن كانَ في قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ - أوْ خَرْدَلَةٍ - من إيمَانٍ فأخْرِجْهُ، فأنْطَلِقُ، فأفْعَلُ، ثُمَّ أعُودُ فئەحمەدەُ بتِلْكَ المَحَامِد، ثُمَّ أخِرُّ له سَاجِدًا، فيَقولُ: يا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وقُلْ يُسْمَعْ لَكَ، وسَلْ تُعْطَ، واشْفَعْ تُشَفَّعْ، فأقُولُ: يا رَبِّ أُمَّتِي أُمَّتِي، فيَقولُ: انْطَلِقْ فأخْرِجْ مَن كانَ في قَلْبِهِ أدْنَى أدْنَى أدْنَى مِثْقَالِ حَبَّةِ خَرْدَلٍ من إيمَانٍ، فأخْرِجْهُ منَ النَّارِ، فأنْطَلِقُ فأفْعَلُ فَلَمَّا خَرَجْنَا مِن عِندِ أنَسٍ قُلتُ لِبَعْضِ أصْحَابِنَا: لو مَرَرْنَا بالحَسَنِ وهو مُتَوَارٍ في مَنْزِلِ أبِي خَلِيفَةَ

فَحَدَّثْنَاهُ بِما حَدَّثَنَا أنَسَ بنُ مَالك، فأتَيْنَاهُ فَسَلَّمْنَا عليه، فأذنَ لَنَا فَقُلْنَا له: يا أبَا سَعيد، جِئْنَاكَ من عند أخيكَ أنَس بنِ مَالك، فَلَمْ نَرَ مثْلَ ما حَدَّثَنَا في الشَّفَاعَة، فَقالَ: هيهْ فَحَدَّثْنَاهُ بالحَديث، فَانْتَهَى إلى هذا المَوْضعِ، فَقالَ: هيهْ، فَقُلْنَا لَمْ يَزِدْ لَنَا علَى هذا، فَقالَ: لقَدْ حدَّثَني وهو جَميعٌ مُنْذُ عشْرِينَ سَنَةً فلا أدْرِي أنَسيَ أمْ كَرِهَ أنْ تَتَّكلُوا، قُلْنَا: يا أبَا سَعيد فَحَدِّثْنَا فَضَحكَ، وقالَ: خُلقَ الإنْسَانُ عَجُولًا ما ذَكَرْتُهُ إلَّا وأنَا أُريدُ أنْ أُحَدِّثَكُمْ حدَّثَني كما حَدَّثَكُمْ به، قالَ: ثُمَّ أعُودُ الرَّابِعَةَ فئەحمەدەُ بتلْكَ المَحَامد، ثُمَّ أخرُّ له سَاجِدًا، فيَقَالُ: يا مُحَمَّدُ ارْفَعْ رَأْسَكَ، وقُلْ يُسْمَعْ، وسَلْ تُعْطَهْ، واشْفَعْ تُشَفَّعْ، فأقُولُ: يا رَبِّ ائْذَنْ لي فيمَن قالَ: لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، فيَقولُ: وعِزَّتي وجَلَالِي، وكِبْرِيَائِي وعَظَمَتي لَأُخْرِجَنَّ منها مَن قالَ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ.[٥١]

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥١] رواه البخاري.

وروى الحافظ أبو يعلى عن عثمان رضي الله عنه، قال: قال رسول الله ﷺ "يشفع يوم القيامة ثلاثة: الانبياء، ثم العلماء، ثم الشهداء". وفي "صحيح" من حديث أبي سعيد رضي الله عنه مرفوعا، قال: "فيقول الله تعالى: شفعت الملائكة، وشفع النبيون، وشفع المؤمنون ولم يبق إلا أرحم الراحمين، فيقبض قبضة من النار، فيخرج منها قوما لم يعملوا خيرا قط".



# بەندی نۆیەم

پەروەردگارا ئیمانم بەهێز بکە تا لە تەنهاییم
دا زاتی بەرزتم لێ وون نەبێت!

# کۆی باسی پاکێجی کوفر و ئیمان
# پێشەکییەک بۆ کوفر و ئیمان

گرنگی ئەم پاکێجە لەوەدایە دوو ژیانی لەسەر دامەزراوە، ژیانی یەکەم ئەم ژیانەیە کە تێیدا دەژین، دەبێت بزانین چی کوفرە و کافرمان دەکات وەچی ئیمانە و ئیماندارمان دەکات، بۆ ئەوەی لەژیانی کۆتاییدا پاداشت و سزای لەسەر وەربگرین بە دۆزەخ یان بە بەهەشت. تۆی موسوڵمان پێویستە بزانیت چی کوفرە تا خۆی لێ بەدوور بگریت و چی پلەی ئیمانت و ئیمانداریە تا سنگی بۆ بکوتیت و خۆتی پێ بگەیەنیت.

ئەمەش کۆمەڵێک پاکێجی بەیەکەوە بەستراون کە کوفرو ئیمانی لەسەر دامەزراوە و بنەمای سەرەکی لەسەر یەک پێناسە دادەمەزرێت ئەویش پێناسەی ئیمانە، پێچەوانەکەی کوفرە.

ئەگەر پێشتر لە بەندەکانی ڕابردوو دا باسی جۆری تەوحید و یەکتاپەرستیمان کردبێت و ئاماژەمان بە پایە و ئەرکانەکانی ئیسلام و ئیمان دابێت، باسی خوودی ئایین و پرسیارە وجودیەکانمان کردبێت لێرەوە پێناسەی کوفر و ئیمانە کەبنەڕەتی هەموویەتی، ئەگەر ئەم بنەڕەتە وەکو بنەمایەکی کۆنکرێتی داینەڕێژین ئەوا پایەکان هەموو ڕاوەستاو نابن و لەق و جوڵاو دەبن و ناتوانین بینای ئیسلامی لەسەر بکەین. وەکو وتمان ئیمان پێناسەی تایبەت بەخۆی هەیە لای ئەهلی تەوحید و سوننەت و جەماعەت هەروەها کوفریش بۆ ئەوەی لەگەڵ ئیمان تێکەڵ نەبێت لەگەڵ خەواریج و موعتەزیلە و مورجیئە بیروباوەڕی ڕاستی ئەهلی ئەم ئیسلامە بناسین لێرەوە ڕوونی دەکەینەوە کە بریتییە لە: (گوفتار و ڕەفتار) ئیمامی شافعی دەفەرموویێت بریتییە لە (گوفتار و ڕەفتار و نییەت).



پـێچەوانەکەی ئەم ئـیمانە (کـوفر و شـەریک دانـان و نیفـاق و دووڕووییە).

کە ئەم بەشانەش چەندین بەشی لێ دەبێـتەوە بـۆ نمـوونە کـوفر پێـنج جۆرە.

* کوفری بەدرۆزانین (كفر التكذيب).

* کوفری لوت بەرزی و خۆ هەڵنان لەگەڵ بە ڕاستی و دروست زانینی (كفر إستكبار والإباء مع التصديق).

* کوفری گومان و شک لێکردن (كفر شك وظن).

* کوفری ئینکاری و خۆ لاڕێ کردن (كفر الإعراض).

* کوفری دووڕوویی (كفر النفاق).

پاشان جۆرەکانی هاوبەش دانـان بـۆ خـوای پەروەردگـار کە بـریتییە لە سێ جۆر.

- هاوبەشدانانی گەورە (شرك أكبر).

- هاوبەش دانانی بچوک (شرك أصغر).

- هاوبەش دانانی شاراوە (شرك خفي).

ئەم سـێ جـۆرە شـەریک دانـانە دژی یەکتاپەرسـتیە و تەوحیـد بەتـاڵ دەکاتەوە، هەروەها محمدم کوڕی عبـدالوهاب دەڵێـت هـاوبەش دانـانی شاراوە چوار جۆرە.

یەکەم: شەریک دانان لە نزاو پاڕانەوەدا (شرك الدعاء).

دووەم: شەریک دانان لە نییەت و ئیرادە و ویستدا (شرك النية).

سێیەم: شەریک دانان لە گوێڕایەڵیدا (شرک الطاعة).

چوارەم: شەریک دانان لە خۆشەویستیدا (شرک المحبة).

ئەوەی ئەم کوفرانە ئەنجام بدات لە ئیسلام دەردەچێت، هەروەها شەریک دانانەکە بەهەمان شێوە دەمێنیتەوە و باسی دووڕووەکان یاخود مەبەست لە دووڕووی کردن ئەویش شەش بەشە.

- بەدرۆزانینی پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ.

- بەدرۆ زانینی هەندێک لەو پەیامەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ هێناوەیەتی.

- ڕق بوون لە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ.

- ڕق لێبوونەوە لەوەی کە پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ هێناویەتی.

- هەوڵدان بۆ کوژانەوەی بانگەواز و پەراوێز خستنی دینی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ.

- پێناخۆش بوونیان بۆ سەرخستنی دینی خوا.

ئەم شەش هۆکارە خاوەنەکەی دەخاتە جێگایەک ناوی (درک الأسفل في النار)، پەنا بەخوا.

هەروەها ئەم سێ جۆرەی باسم کرد کوفر و شیرک و دووڕووی، بەشێکی تر لە کوفر مرۆڤ لە ئیسلام دەرناکات. وەکو کوفری نیعمەت کە سوپاس کردنی خوای پەروەردگارە بۆ ئەو نیعمەتانەی پێ بەخشیوویت و لە لەش ساغی و ڕزق و ڕۆزی.



یاخود شەریک دانانی بچوک وەک ڕییا، سوێند خواردن بە غەیری خوا، ئەگەر بەنەزانی بێت ئەوە تاوانە، بەڵام تاوانی گەورەیە و دەبێت تۆبەی لەسەر بکات.

هەروەها دووڕووی لەکرداردا خاوەنەکەی لە ئیسلام دەرناکات وەکو نموونەی (درۆکردن لەکاتی قسەکردن دا، تووڕەبوونی بەرانبەر بە دژی زیاد لە پێویست، خیانەتکارە لەپەیمان و بەڵێن شکێنە، دەست پیسە و ئەمانەت ناپارێزێت، خاوەنی قسەی خۆی نییە و هەرگیز پەیمان ناباتە سەر)، ئەم سیفاتانە تاوانی گەورەیە وپێویستی بە تەوبەکردن هەیە.

## کوفر و ئیمان لەسەربنەمای کردار و گوفتار

بنەمای ئیمان لەسەر (زمان، دڵ و کردار) دادەمەزرێت، هەریەک لەم بنەمایانە کەم بوو ئەوا پێی ناوترێت ئیمان لای ئەهلی سونەت و جەماعەت، چونکە لەدوای هاتنی گروپەکانی وەکو خەوارج، موعتەزیلە و مورجیئە هەریەک بەپێوەری خۆی پێناسەی ئیمان و کوفری دەکرد. بۆیە ئەهلی سونەت و جەماعەت پێوەریان بۆ دانا بۆ ئەوەی کەس بەئارەزووی خۆی بیدعە و داهێنان نەکات لەبواری ژین و ژیان و مردن و قیامەتی خەڵکی.

بۆ نموونە خەوارج دەیانوت هەرکەس تاوان بکات پێی کافر دەبێت کە زیادەڕۆیی و سەرەڕۆیی لەبواری کوفر و ئیماندا دەکرا.

یاخود موعتەزیلە دەیانوت کافر نابێت، بەڵام بە ئەبەدی لە دۆزخ دەمێنێتەوە (المنزلة بين المنزلين).

مورجیئەکان پێیان وابوو کە ئیمان زیاد و کەم ناکات و ئیمانی شەیتان و فیرعەون وەکو ئیمانی ئەبوبەکری صدیق-ە و ئیمان تەنها (گوفتارە).هتد.

هەر بۆیە زانایان هەڵسان بە پێوەری کوفرو ئیمان لە عەقیدە دا بەناوی (الأسماء و الأحكام)، هەر بۆیە شێخ و ئیسلام ئیبن تەیمیە دەفەرموێت: ناتوانین ناوی خەڵکی پۆلێن بکەین بۆ خۆشحاڵ و گومڕا یان سوپاسکراوەکان و زەم کراوەکان، یان سزا و پاداشت، بەڵکو گەورەترە لەم ناوانە و بڕتییە لە کوفر و ئیمان، شیکاری بۆ کوفر و ئیمان لەسەربنەمای ناو و ڕێسا و یاساکان دادەمەزرێت، ئەویش ئەسماء و ئەحکامە.

ئەوەی کە خاوەنی ئیمانە لەڕووی کردارو گوفتارەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت کە بریتییە لە ئەحکامەکانی ئیسلام.

## یەکەم: ئەحکامی نیکاح

هەموو ژن هێنان و شوکردنێک لە کافر و موشریک حەڕامە، بێجگە ئەوەی کە شەرع ڕێگای داوە ژن تەنها لە ئەهلی کیتاب بخوازرێت، حوکمی حەرام کردنی ژن خواستن و شوکردن بەبەڵگەی ئایەتی ١٠ی سورەتی الممتحنة حەرام کراوە، کە خوای گەورە دەفەرموێت:

يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا جَاءَكُمُ الْمُؤْمِنَاتُ مُهَاجِرَاتٍ فَامْتَحِنُوهُنَّ اللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِهِنَّ فَإِنْ عَلِمْتُمُوهُنَّ مُؤْمِنَاتٍ فَلَا تَرْجِعُوهُنَّ إِلَى الْكُفَّارِ لَا هُنَّ حِلٌّ لَّهُمْ وَلَا هُمْ يَحِلُّونَ لَهُنَّ وَآتُوهُم مَّا أَنفَقُوا وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ أَن تَنكِحُوهُنَّ إِذَا آتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَلَا تُمْسِكُوا بِعِصَمِ الْكَوَافِرِ وَاسْأَلُوا مَا أَنفَقْتُمْ وَلْيَسْأَلُوا مَا أَنفَقُوا ذَٰلِكُمْ حُكْمُ اللَّهِ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ.



ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە کاتێک کە ئافرەتە ئیماندارەکان کۆچ دەکەن و دێن بۆلاتان تاقییان بکەنەوەو بە وردیی پرسیاریان لێ بکەن (سەبارەت بە کۆچ و هۆی هاتنەکەیان)، خۆ خوا خۆی چاک زاناو ئاگایە بە ئیمانەکەیان، ئەگەر بۆتان دەرکەوت کە ئیماندارن، ئیتر مەیانگێڕنەوە بۆلای کافران، نە ئەم ئافرەتانە حەڵاڵی ئەو کافرانەن، نە ئەو کافرانەش حەڵاڵن بۆ ئەم ئافرەتە ئیماندارانە، (ئەگەر مێردەکانیان) مەسرەفێکیان کردووە (لەو ئافرەتە ئیماندارانەدا) بۆیان بگێڕنەوە، ئیتر هیچ ڕەخنەیەکیش نییە لەسەرتان ئەگەر ئەو ئافرەتانە مارە بکەن ئەگەر مارەییان بدەنێ، ئافرەتانی کافر مەهێڵنەوە لای خۆتان (واتا مارەیان مەکەن) ئێوەش (ئەی ئیمانداران ئەگەر) مەسرەفێکتان (کردووە لە ئافرەتێکی کافردا) داوای بکەنەوە، ئەوانیش (ئەگەر مەسرەفێکیان کردووە لە ئافرەتێکی ئیمانداردا) با داوای بکەنەوە، ئا ئەوە حوکم و فەرمانی خوایە کە لە نێوانتاندا بڕیاردراوە، ئەو خوایە زاناو دانایە.

هەروەها خوای گەورە دەربارەی حوکمی هێنانی ئافرەتانی داوێن پاکی ئەهلی کتاب دەفەرمووێت:

﴿ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ ۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ ۖ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ وَٱلْمُحْصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ إِذَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحْصِنِينَ غَيْرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِىٓ أَخْدَانٍ ۗ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٥﴾﴾ المائدة. لەمڕۆ بەدواوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵە، خواردنی ئەوانەی کە خاوەن کتێبن لە (گاورو جوو) بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە،

ئافرەتانی پاک داوێن  لە ئیمانداراانی سەربەست و لە خاوەنانی کتێبی پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) ئەگەر مارەییان پێ ببەخشن، بەمەرجێک پاک داوێن بن و دووره پەرێز بن لە دۆست گرتن  و داوێن پیسی، بێگومان ئەوەی لە ئیمان پاشگەز بێتەوەو مەرجەکانی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر هەموو کارو کردەوە چاکەکانیشی  پووچ دەبێتەوە و ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەت دا لە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەنداندن.

## دووەم: ئەحکامی دەوڵەتداری و سەرپەرشتیاری (الولاية)

بەهیچ شێوەیک کافر بۆی نییە دەسەڵات داربێت بەسەر ئیماندارانەوە ئەگەر حـوکمی دەوڵەتـی بێـت یـان حـوکمی سەرپەرشـتیاری تـایبەت، مەبەســت لە حــوکمی دەوڵەت وەکــو ئەوەی لە وڵاتــی موســوڵمانان بەگوێرەی شەریعەتی خـوا کارناکرێـت و کـافر حـوکمڕانە، سەرپەرشـتیاری تایبەت وەکو کاری وەسیەت و چاودێری و زەواج و وەلی ئەمر.

﴿وَمَن يَعۡصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُۥ يُدۡخِلۡهُ نَارًا خَٰلِدًا فِيهَا وَلَهُۥ عَذَابٌ مُّهِينٌ ١٤﴾ النساء. (بەڵام) ئەوەی یاخی بێت لە خواو پێغەمبەرەکەی دەستدرێژی بکاتە سەر سنوورەکەی، دەیخاتە ناو ئاگری دۆزەخەوە کە بۆ هەمیشەیی تیایدا دەمێنێتەوە و سزایەکی سەرشۆڕ کەرو خەجاڵەت هاوەری بۆ هەیە.

## سێیەم: ئەحکامی دادگەری (القضاء)

هەرچەندە دەچێتە ناو بەشی دووەم، بەڵام زانایانی عەقیدە بەم جۆرە پۆلێنیان کردووە.



بەهـیچ شـێوەک شـەهادەتی کـافر یـاخود شـاهیدی کـافر بەسـەر موسـوڵمانەوە وەرناگیرێـت، مەگەر لە حـاڵەتی جیـاواز ئەوەی کە شـەرع ڕێگای پێـدراوە، نمـوونەی هاوسـەفەری کـافر و موسـوڵمان کە موسـوڵمان وجودی نەبـوو لە لە سـەفەرەکەدا ئەوا ڕێگـادراوە وەسـیەت بـۆ کـافرەکە بکرێتەوە، تەنها بەگەیاندی ئەویش لە سورەتی المائدة ئایەتی ١٠٦-١٠٧ دا دەفەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ شَهَـٰدَةُ بَيْنِكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ حِينَ ٱلْوَصِيَّةِ ٱثْنَانِ ذَوَا عَدْلٍ مِّنكُمْ أَوْ ءَاخَرَانِ مِنْ غَيْرِكُمْ إِنْ أَنتُمْ ضَرَبْتُمْ فِى ٱلْأَرْضِ فَأَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةُ ٱلْمَوْتِ ۚ تَحْبِسُونَهُمَا مِنۢ بَعْدِ ٱلصَّلَوٰةِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ إِنِ ٱرْتَبْتُمْ لَا نَشْتَرِى بِهِۦ ثَمَنًا وَلَوْ كَانَ ذَا قُرْبَىٰ ۙ وَلَا نَكْتُمُ شَهَـٰدَةَ ٱللَّهِ إِنَّآ إِذًا لَّمِنَ ٱلْـَٔاثِمِينَ ﴿١٠٦﴾﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە: کاتێک نیشانەی مەرگ و مردن لە کەسێکتان دەرکەوت، شایەتی نێوانتان با دوو کەس بن لەکاتی وەسیەتەکەدا، دوو کەسی دادپەروەر و ئەمین بن، یان دوو کەسی تری ئەمین، ئەگەر ئێوە بۆ بازرگانی و شتی تر سەفەرتان کرد لە وڵاتدا و مردن یەخەی گرتن، ئەگەر دوو دڵ بوون لە دوو شایەتیەکە ئەوا ڕایان بگرن لە دوای نوێژی عەسر تا سوێند بخۆن بە خوا و (بڵێن) ئێمە بۆ سوێندەکەمان هیچ شتێک وەرناگرین با سوێند بۆ خوراوەکە کە نزیکترین خزمیش بێت (لەڕاستی لانادەین) ئێمە شایەتیەک کە بۆ خوا ئەنجامامان داوە نایشارینەوە و وونی ناکەین. چونکە ئەگەر بەڕاستی وا بکەین ئەوە لە ڕیزی تاوانباراندایین.

﴿فَإِنْ عُثِرَ عَلَىٰٓ أَنَّهُمَا ٱسْتَحَقَّآ إِثْمًا فَـَٔاخَرَانِ يَقُومَانِ مَقَامَهُمَا مِنَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَحَقَّ عَلَيْهِمُ ٱلْأَوْلَيَـٰنِ فَيُقْسِمَانِ بِٱللَّهِ لَشَهَـٰدَتُنَآ أَحَقُّ مِن

شَهَٰدَتِهِمَا وَمَا ٱعۡتَدَيۡنَآ إِنَّآ إِذٗا لَّمِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ﴿١٠٧﴾ المائدة. خۆ ئەگەر دەرکەوت ئەو شایەدەی پێشوو (درۆیان کردوەو) خۆیان گوناهبار کردووە ئەوا دوو کەسی تر لە خزمی نزیکی ستەملێکراوی مردووەکە بکرێن، ئینجا سوێن بە خوا بخۆن و بڵێن: بەڕاستی شایەتی ئێمە لە شایەتی ئەوان ڕاستتر و دروست ترە، ئێمە هیچ ستەم و دەستدرێژییەکمان نەکردوەو (تەماعمان لە ماڵیاندا نیە)، خۆ ئەگەر نییەتمان وابێت ئەوە ئێمەش لە ڕیزی ستەمکاراندایین.

## چوارەم: ئەحکامی کڕین و فرۆشتنی حەرام

لێرەدا دەڵێین حەڕامە بەواتای کوفر نیە واتا دەرچوون نیە لەئـیمان و ئیسلام، مەگەر بڕوای بە یاسا و ڕێسای شەریعەت نەبێت، نابێت قورئان بە کافر بفرۆشرێـت و نابێـت ڕیبـاخۆر بێـت و نابێـت بـەرتیل بـدات ئەمانـە هەموویان حەرامن و لەگەڵ ئەحکامی ئیمان یەک ناگرنـەوە نەک ئـەوەی کافر بوبێت!

## پێنجەم: ئەحکامی میرات

هـیچ کافرێـک لە موسـوڵمان میـرات ناگرێـت و بە پـێچەوانەوە هـیچ موسوڵمانێک لەکافرێک میرات ناگرێت.



## شەشەم: ئەحكامی مردوو

کافری ئەهلی یاخود هەڵـگەڕاوە لە دیـن (مـورتەد) ناشـۆرێت و کفـن ناکرێت و نوێژی لەسەر ناکرێت، لە گۆڕستانی موسوڵمانان نانێژرێت،کەس لەسەر گۆڕی ناوەستێت و داوای لێخۆشبوونی بۆ بکات.

## حەوتەم: ئەحكامی پاداشت

لە ڕاستیدا پاراستنی ماڵ و سەروەت و سـامان و ژیـان تەنهـا بە ئـیمان دەپـارێزرێن، مەگەر ئەوەی کە شــەرع ڕێگــای پێــداوە وەکــو نمــوونەی دانیشتوانی وڵات لە ئایینەکانی تر کە ناسراون بە (الـذمي) یـان ئەوەی کە داوای ئەمان و پەنابەرێتی کردووە (المسـتأمن) یـاخود ئەوەی کۆنتراکتێـک یان پەیمانێک هاتۆتە ناو ئەحکامەکە (المعاهد) هەموو ئەمانـەش دەبێـت بە مەرجی شەرعی بێـت. ئەمـە بـۆ نـاوخۆی کۆمەڵگـەی موسـڵمان، جگـە لەوەش پاراستنی بەڵێن و پەیمانی نێوان دەوڵـەتی موسـڵمانان و دەوڵـەتانیتر ئەرکە و ئەوەش ژیان و ئەمان بۆ هەردولا دەستەبەرو پارێزراو ئەکات.

## هەشتەم: ئەحكامی تاوان

هیچ موسوڵمانێک لەبری کافرێک ناکوژرێت، بەڵکو تەنها دیە وحەقـی خوێن بەماڵ ئەدات. ئەمە مانای ئەوەی نییە کـە خـوێنی ئـەوان هەڕاجـە، ئەوەتا پێغەمبـەری پێشـەوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەفـەرمووێت: (ألا مـن

قتل نفساً معاهدة، له ذمة الله وذمة رسوله، فقد أخفر بذمة الله، فلا يـرح رائحة الجنة، وإن ريحها ليوجد من مسيرة سبعين خريفاً).[٥٢]

واتا: هۆشیاربن هەرکەسێک پـەیمان پێـدراوێک بکوژێـت پـەنای خـواو پێغەمبەری پێدراوە ئەوە غـەدری لـەو پەیمانـە کـردووە و بـۆنی بەهەشـت ناکات لە کاتێکدا بۆنی حەفتا پاییز ئەڕوات.

## نۆیەم: ئەحکامی وەلائو بەرائەت

حەڕامەو کوفرە لەسەر ئیمانـدار وەلائـی بـۆ کـافر هەبێـت، هەرکەس وابکات وەکو کافرەکە هەژمار دەکرێت خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾ المائدة. لەمڕۆ بەدواوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵە، خواردنی ئەوانەی کە خاوەن کتێبن لە (گاورو جوو) بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، ئافرەتانی پاک داوێن لە ئیماندارانی سەربەست و لە خاوەنانی کتێبی پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) ئەگەر مارەییان پێ ببەخشن، بەمەرجێک پاک داوێن بن و دوورە پەرێز بن لە دۆست گرتن و داوێن پیسی، بێگومان ئەوەی لە ئیمان پاشگەز بێتەوەو مەرجەکانی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر هەموو

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٢] رواه الترمذي.



کارو کردەوە چاکەکانیشی  پووچ دەبێتەوە و ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەت دا لە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانن.

دەبێت بەئاشکرا بەرائەت لە کوفر و شەریک دانان و ڕازینەبوونی خۆت نیشان بدەیت.

﴿قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥٓ إِذْ قَالُواْ لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَءَٰٓؤُاْ مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةُ وَٱلْبَغْضَآءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُواْ بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥٓ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَٰهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَآ أَمْلِكُ لَكَ مِنَ ٱللَّهِ مِن شَيْءٍۖ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ ٱلْمَصِيرُ۝٤﴾ الممتحنة. (ئەی ئیمانداران) بەڕاستی لە ئیبراهیم و ئەوانەی لەگەڵیدا بوون نموونەیەکی چاکتان (خراوەتە بەرچاو)، کاتێک کە بە قەومەکەی خۆیانیان  وت: (دوای ساڵەها بانگەواز) ئێمە بەرین لە ئێوەو لەو شتانەش کە لە جیاتی خوا دەیپەرستن، ئێمە باوەڕمان بەو دین و ئایینەی ئێوە نییە، ئیتر دوژمنایەتی و ڕقەبەرایەتی لە نێوانماندا بەرپابووە تا ئەو کاتەی کە باوەڕ بە خوای تاک و  تەنها دێنن، جگە لەو قسەو (بەڵێنەی) ئیبراهیم دای بە باوکی و وتی: داوای لێخۆش بوونت بۆ دەکەن، بێگومان دەسەڵاتی خوایشم نییە (ئەگەر کارەساتێکت بەسەر بێنێت)، (ئینجا وتی): پەروەردگارا هەر پشت بە تۆ دەبەستین و ڕوودەکەینە دەروازەی ڕەحمەتی تۆ، گەڕانەوەشمان بۆلای تۆیە.

خۆ ئەگەر لە جەنگ دابوون بەهەموو شێوەیەک دەبێت حەز بەسەرکەوتن و سەرخستنی موسوڵمانان بکەیت بەسەر کافر و ملهوڕاندا بەبەڵگەی ئایەتی ٥٥ی سورەتی المائدة خوای پەروەردگار دەفەرموێت:

﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَهُمۡ رَٰكِعُونَ﴿٥٥﴾﴾ المائدة:. بەڕاستی خۆشەویستی و پشتیوانی ئێوە هەر بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی و ئەوانەن کە باوەڕیان هێناوە، نوێژەکانیان بەباشی دەکەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەردەکەن و هەمیشە دیاردەی کوڕنوش و ملکەچییان بۆ پەروەردگار پێوە دیارە (ئەوەندە خواناس و خواپەرستن).

ئەمەش مانای وانییە ڕێز و ئیحترام و چاکەیان لەگەڵ نەکەین لەکاتی ئاساییدا، چونکە ئەمرمان پێ کراوە بە چاکە و ڕێزگرتن، لەکاتێکدا هیچ دەست درێژییان بۆ سەر موسوڵمانان نییەو وەکو هاوڵاتی ناو دەسەڵاتی ئیسلامی ژیان بەسەر دەبەن بە بەڵگەی سورەتی الممتحنة ئایەتی ٨ کە خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿لَّا يَنۡهَىٰكُمُ ٱللَّهُ عَنِ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ فِي ٱلدِّينِ وَلَمۡ يُخۡرِجُوكُم مِّن دِيَٰرِكُمۡ أَن تَبَرُّوهُمۡ وَتُقۡسِطُوٓاْ إِلَيۡهِمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ﴿٨﴾﴾ الممتحنة. (دڵنیاش بن) کە خوا جڵەوگیری ئەوەتان لێناکات کە چاکڕەفتارو دادپەروەر بن لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە جەنگیان دژ نەکردوون و دژایەتی ئایینیان نەکردوون و لە شوێنەوارتان دەریان نەکردوون، چونکە بە ڕاستیی خوا دادپەروەرانی خۆشدەوێت.

## دەیەم: ئەحکامی وڵات

ئەمەش لەسەر بنەمای کوفر و ئیمان دادەمەزرێت کە بنەماکەی (دار الکفر و دار الإیمان)ە لەبوونی دار الإیمان دا دار الکفر حەرام دەبێت و



هیجرەت کردن بۆی بە مەرجی شەرعی دەبێت کە پەیوەستە بە بازرگانی و تەندروستی یاخود ئەمانێک بۆ موسوڵمانان دروست دەکات.

ئەحکامی تر زۆرە وەکو ئەحکامی جیهاد، کە پاراستنی موسوڵمانانە لە فیتنەی کوفر و بانگەوازیان و فەرمان بە موسوڵمانان کراوە لە جیهاد دا بن تا ڕۆژی قیامەت دژی کافر و بێباوەڕان جا بەهەر جۆر و کەرەستەیەک بێت کە لە توانای موسوڵماندا هەیە لە قەڵەم و میدیاوە دەست پێ دەکات تا قیتال و چەکداری دژی خوانەناسان بەبەڵگەی سورەتی الأنفال ئایەتی ٣٩ لێرەدا خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ فَإِنِ ٱنتَهَوۡاْ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ٣٩﴾ الأنفال. (ئەی ئیمانداران) ئێوەش بجەنگن دژ بەکافرو خوانەناسان تا فیتنە و ئاشووب و ئازاردانی موسڵمان نەمێنێت و (ئەو خەڵکە سەربەست بن لە هەڵبژاردنی بەرنامە و ئاییندا)، تا دین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی بۆ خوا بێت، جا ئەگەر بێ باوەڕان کۆڵ بدەن، ئەوە بابزانن بەڕاستی خوا بینایە بەهەموو ئەو کارو کردەوانەی کە دەیکەن.

پاشان ئەحکامەکانی (غەنیمەت و فەیئو و سەلب و جزیە و خەراج..هتد) ئەمە تەنها لە ئەحکامی جیهاد.

ئەحکامەکانی بەشداری لە جەژن و خۆشی و ناڕەحەتی یاخود جلوبەرگیان و خواردنیان (سەربڕاوەکانیان)..هتد.

هەموو ئەم ئەحکامانە کە دامەزراوە لەسەر بنەمای (ئیمان و کردار و گوفتارە) زیاد و کەم دەکات.



# وشەی ئیمان

وشەی ئیمان لە زمانی کوردیدا ئەڵتەرناتیڤی نییە، بە واتـای ڕاسـتگۆیی یاخود باوەڕ دێت یان بەمانای ئاسایش و دانپیانان و ئیقرار دێت، یـان زۆر مـورادیفی تـر هەڵـدەگرێت کە هەموویـان ڕاسـتن بـۆ تەرجـومە کـردن و وەرگێڕان، بەڵام هەمووی لە ئیماندا کۆدەبێتەوە. هەنـدێک کـات بەواتـای باوەڕ دێت وەکو نموونەی کوڕەکانی یەعقوب لە سورەتی یوسف دا خـوای گەورە دەفەرموویت:

﴿قَالُواْ يَـٰٓأَبَانَآ إِنَّا ذَهَبْنَا نَسْتَبِقُ وَتَرَكْنَا يُوسُفَ عِندَ مَتَـٰعِنَا فَأَكَلَهُ ٱلذِّئْبُ ۖ وَمَآ أَنتَ بِمُؤْمِنٍ لَّنَا وَلَوْ كُنَّا صَـٰدِقِينَ ﴿١٧﴾﴾ یوسف. وتیان: باوکە ئێمە ڕۆیشتین پێشبڕکێمان کردو (یوسف)مان لای کەل و پەلەکەمان بەجێهێشت، گورگ (پەلاماری داو) خواردی، بەڵام تۆ بڕوامان پێ ناکەیت هەرچەندە ڕاستگۆش بین.

لێـرەدا بەواتـای بـاوەڕ وە ڕاسـتگۆیش دێـت، هەنـدێکجار بەواتـای پارێزگاری و ئاسایش هاتووە نموونەی (الملک، القدس، السلام، المؤمن) بۆیە ئیمانداران ناونراون بە ئیماندار، چونکە خۆیـان دەپـارێزن لەئـاگری دۆزەخ بە ئیمانەکەیان، خوای پەروەردگار یەکێک لە نـاوە پیرۆزەکـانی (المـؤمن)ە بەواتای موسـوڵمان دەپارێزێـت و ئاسایشـیان پـێ دەبەخشـێت لە دۆزەخ. هەندێکجار بەواتـای بـاوەڕدار و ئیقـرار و دانپیانـان دێـت بـۆ بـڕوا بـوون بەخوای پەروەردگار..

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ ءَامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ



﴿وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٣٦﴾ النساء. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، با باوەڕتان پتەو بێ بە خواو پێغەمبەرەکەی وە بەو قورئانەش کە ناردویەتییە سەر پێغەمبەرەکەی وە بەو کتێبەش کە پێشتر ڕەوانە کراوە، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە خواو بە فریشتەکانی و بە کتێبەکانی و بە پێغەمبەرانی و بە ڕۆژی دوایی، ئەوە بێگومان زۆر گومڕاو سەرگەردانە.

یان زۆرجار بەواتای تەوحید و یەکتاپەرستی دێت..

﴿ٱلۡيَوۡمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُۖ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ حِلّٞ لَّكُمۡ وَطَعَامُكُمۡ حِلّٞ لَّهُمۡۖ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنَٰتِ وَٱلۡمُحۡصَنَٰتُ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ مِن قَبۡلِكُمۡ إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ مُحۡصِنِينَ غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾ المائدة. لەمڕۆ بەدواوە هەرچی خۆراکی چاک و پاکە بۆتان حەڵاڵە، خواردنی ئەوانەی کە خاوەن کتێبن لە (گاورو جوو) بۆتان حەڵاڵە، خواردەمەنی ئێوەش بۆ ئەوان حەڵاڵە، ئافرەتانی پاک داوێن لە ئیماندارانی سەربەست و لە خاوەنانی کتێبی پێش ئێوە (بۆتان حەڵاڵە) ئەگەر مارەییان پێ ببەخشن، بەمەرجێک پاک داوێن بن و دوورە پەرێز بن لە دۆست گرتن و داوێن پیسی، بێگومان ئەوەی لە ئیمان پاشگەز بێتەوەو مەرجەکانی نەپارێزێت، ئەوە ئیتر هەموو کارو کردەوە چاکەکانیشی پووچ دەبێتەوە و ئەو جۆرە کەسانە لە قیامەت دا لە ڕیزی خەسارەتمەندو زەرەرمەندانن.

هەندێک جار بە واتای نوێژ دێت..ئەمانەو چەندین واتای تر کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

کەواتە ئەوانەی تەنها باوەڕ یاخود بە ڕاستگۆیی یان بەیەک وشە وەریدەگێڕن هەڵەیە، بەڵکو ئیمان کۆکراوەی هەموو ئەو واتا و مانایانەیە.

لەڕووی زاراوەوە پێکهاتووە لە پێنج بەش کە جیاناکرێتەوە لەیەکتری بەواتای: گوفتاری دڵ و کرداری، گوفتاری زمان و کرداری، کرداری ئەندامەکانی لاشە(قول القلب وعمله، قول اللسان و عمله، عمل الجوارح والأركان). مەبەست بە (گوفتار بە دڵ) بە واتای شایەتمان و بڕوا پێکردنی بە دڵ و زانینی واتای چییە (گوفتار بە زمان) واتا وتنی شایەتمان بە خوا و پێغەمبەر (صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ) و دانپێدانان و ئەنجامدانی فەرزەکان و ئەوەی کە پێویستە بۆ شایەتمان، (کردار بە زمان) ئەویش خوێندنی قورئان و تەسبیحات و سوپاسکردنی خوا و تۆبەو ئیستغفار، (کردار بە دڵ) وەکو تەوەکول کردن بەخوای پەروەردگار و نییەت و دڵسۆزی و ئیخلاص، (کردار بە ئەندامەکانی لاشە) وەکو نوێژ، زەکات و فەرمان بە چاکە و ڕێگری لە خراپە و..هتد.

ئەمەش کۆڕای زانایانی ئەهلی سونەت و جەماعەیە، ئەوە مانای ئیمانە، هەریەک لەم پێنج خەصڵەتە ناتەواو بێت ئەوا ئیمان ناتەواوە و پێچەوانەی ئیمانیش کوفرە.

بۆهەریەک لەم خەصڵەتانەی ئیمان کە پێنج دانەن و لەسەر بنەمای قورئان و سونەت دامەزراوە، نەک قسەی زانا و پیاوچاکان و ئەهلی مەزهەب، مەبەست ئەوەیە کە خوودی بنەڕەتی ئایین پێغەمبەری خوایە، کە خوای پەروەردگار ناردوویەتی و پێی ڕازییە و لەهەمانکاتدا ئایینی هەموو پێغەمبەرانیشە.



خەصڵەتی یەکەمی ئیمان: گوفتار بە دڵ "قـول القلـب" وتە بە دڵ واتـا بنەمـای سـەرەکی نیـیەت دڵە، نیـیەت لە دڵـدایە بـۆیە پێغەمـبەری خـوا ﷺ کاتێک کە فەرمووی (إنما الأعمال بالنيـات) دەسـتی موبارەکی بردە سـەر دڵـی، کە وتنـی شـایەتومان بە زمـان و دڵ، یـان هەر بنەمایەکی تری ئەم ئایینە لە فەرز و واجب و.هتد دەبێت بە گوفتـارو دڵ بێت.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆز دا دەفەرموویت:

﴿وَٱلَّذِي جَآءَ بِٱلصِّدۡقِ وَصَدَّقَ بِهِۦٓ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ٣٣﴾ الزمر.
ئەو کەسەش ڕاستی و حەقیقتی هێناوەو باوەڕیشی پێیەتی، تەنها ئا ئەوان خواناس و دیندارن.

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ الحجرات.
بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا ﷺ هێناوەو پاشان ناکەونە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بە خۆیان و سەرو ماڵیشیانەوە تێدەکۆشن لە پێناوی ئایینیی خوادا.لە ڕاستیدا ڕاست و ڕاستگۆ هەر ئەوانەن.

﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ يَقُولُونَ إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ لَهُمۡ فِي

ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٞۖ وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٤١﴾ المائدة. ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ خەفەت مەخۆ لەوانەی کە بە پەلە بەدەم کوفرو بێ دینییەوە دەچن لەوانەی کە بە دەم و زاریان دەڵێن باوەڕمان هێناوە، بەڵام دڵیان ئیمان و باوەڕی تیا نییە، هەروەها لەو جولەکانەش کە گوێ بۆ درۆو دەلەسە دەگرن، گوێ دەگرن بۆ کەسانێکی تریش (کە خوانەناسن) نەهاتوون بۆ لات قسە دەگۆڕن و قسە لە جێی خۆی دا ناگێڕنەوە، یاخود ئاوەژووی دەکەن، دوای ئەوەی جێی خۆی گرتبوو (ئەوانەی کە خەڵک دەینێرن بۆ لای پێغەمبەرو پێی) دەڵێن: ئەگەر ئاوا بڕیاری دا لێی وەرگرن، وە ئەگەر وا بوو هۆشیار بن، جا ئەوەی خوای گەورە بیەوێت تووشی تاقیکردنەوەی سەختی بکا ئەوە هەرگیز تۆ ناتوانی بەری دەسەڵاتی خوا بگری بە هیچ شێوەیەک، ئەوانە هەر خوا نەیویستووە دڵیان پاک و خاوێن بکات (چونکە خۆیشیان مەبەستیان نەبووە) ئەوانە لە دنیادا سەرشۆڕیی و شەرمەزاریی بەشیانە، لە قیامەتیشدا سزای سەخت و گەورە چاوەڕییانە.

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴿٢٨﴾ الرعد. ئەوانەی باوەڕیان هێناوەو دڵ و دەروونیان ئارام دەبێت بە قورئان و پەیامەکەی خوای پەروەردگار، ئاگاداربن دڵەکان: هەر بە قورئان و یادی خواو (پابەندبوون بە ئایینەکەیەوە) خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە.

﴿مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ النحل. ئەوەی پاشگەز بێتەوە لە خواناسی، دوای باوەڕهێنانی، جگە لەوانەی کە بەزۆر (وشەی کوفر دێت بە زاریاندا) و دڵیان پڕە لە ئیمان و دامەزراوی، بەڵام ئەوەی (دوای ئیمانی پەشیمان

بێتەوە) و بەدڵ ڕێبازی کوفرو بێدینی بگرێتەبەر، ئەوانە خەشم و قینی خوایان لەسەرە، سزای سەخت و دژوار چاوەڕێیانە.

هەروەهـــا لە فەرمـــوودەی پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ هاتووە: ئەبو هـورەیرە (ڕەزامەنـدی خـوای لەسـەر بێـت) فەرمـووی: ئەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ کێ خوشحاڵە لە خەڵکـی لە ڕۆژی قیـامەت بە شـەفاعەتت؟ پێغەمـبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ فەرمـووی: وا پەیم بـرد کە کەس ئەم پرسـیارەم لـێ ناپرسـێت، و اتـۆ یەکەم کەسـی لەم پرسـەوە پرسـیار دەکەیـت بە هـۆگرییەوە، پاشـان فەرمـووی: ئەو خەڵـکە خۆشـحاڵن بە شـەفاعەتم لە ڕۆژی قیـامەت ئەوانەن کە دەلـێن (لاإله إلا الله) بە دڵسۆزی و ئیخلاص لە دڵیانەوە.

(عن أبي هريرة رضي الله عنه أنه قال: قلت: يـا رسـول اللـه، مـن أسـعد الناس بشفاعتک يوم القيامة، فقال: لقد ظننت يا أبـا هريـرة أن لا يسـألني عن هذا الحديث أحد أول منک؛ لما رأيت من حرصک على الحديث: أسـعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال: لا إله إلا الله خالصا من قبل نفسه).[٥٣]

هەروەهـــــا جەنــــابی پێغەمــــبەری خـــــوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: شاهیدی ئەدەم لای خوای پەروەردگار، هەرکەسێک بمرێـت و بڵێت شەیادی ئەدەم کە خوای پەروەردگار تـاک و تەنهـایە و پێغەمـبەر محمد صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ نێردرا و پێغەمبەری خـوایە، بەڕاسـتگۆیی لە دڵییەوە، ئەوە بە دڵنیاییەوە ڕێگایەکی گرتووە کە ڕێگـای بەهەشـتە أشـهدُ

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٣] رواه البخاري.

عند اللهِ لا يموتُ عبدٌ يشهدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وأني رسولُ اللهِ صدقًا من قلبِـه ثـم يسددُ إلا سلك في الجنَّةِ.[٥٤]

هەروەهـــا پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ فەرمـــووی بە ئەبوهـورەیرە: لە پشـتی ئەم پەرژیـنەوە هەرکەس شـاهیدی دا کە خـوای پەروەردگار تاک و تەنهایە و (لەسەر یەکتاپەرستی) مرد بە دڵنیاییەوە وتـی و بەدڵ بڕوای پێکرد مژدەی بدەرێ کە هەشتییە.

خەصڵەتی دووەمی ئیمان: گوفتارە بە زمان "قـول باللسـان"، خوێنـدنی قورئان و زیکر و تەهلیلە و تەسبیح و دوعا کردن و..هتد.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٤] كُنَّا قُعُودًا حَوْلَ رَسولِ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ ، معنا أبو بَكْرٍ، وعُمَرُ في نَفَرٍ، فَقامَ رَسولُ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ من بَيْنِ أظْهُرِنا، فأبْطَأَ عَلَيْنا، وخَشِينا أنْ يُقْتَطَعَ دُونَنا، وفَزِعْنا، فَقُمْنا، فَكُنْتُ أوَّلَ مَن فَزِعَ، فَخَرَجْتُ أبْتَغِي رَسولَ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ حتَّى أتَيْتُ حائطًا للأنْصارِ لِبَنِي النَّجّارِ، فَدُرْتُ به هلْ أجِدُ له بابًا؟ فَلَمْ أجِدْ، فإذا رَبِيعٌ يَدْخُلُ في جَوْفِ حائطٍ من بئْرٍ خارِجَة، والرَّبِيعُ الجَدْوَلُ، فاحْتَفَزْتُ، فَدَخَلْتُ على رَسولِ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ ، فقالَ: أبو هُرَيْرَةَ فَقُلتُ: نَعَمْ يا رَسولَ الله، قالَ: ما شَأْنُكَ؟ قُلتُ: كُنْتَ بيْنَ أظْهُرِنا، فَقُمْتَ فأبْطَأْتَ عَلَيْنا، فَخَشِينا أنْ تُقْتَطَعَ دُونَنا، فَفَزِعْنا، فَكُنْتُ أوَّلَ مَن فَزِعَ، فأتَيْتُ هذا الحائطَ، فاحْتَفَزْتُ كما يَحْتَفِزُ الثَّعْلَبُ، وهَؤُلاء النَّاسُ ورائِي، فقالَ: يا أبا هُرَيْرَةَ وأعْطانِي نَعْلَيْه، قالَ: اذْهَبْ بنَعْلَيَّ هاتَيْنِ، فمَن لَقِيتَ مِن وراءِ هذا الحائطِ يَشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بها قَلْبُهُ، فَبَشِّرْهُ بالجَنَّة، فَكانَ أوَّلَ مَن لَقِيتُ عُمَرُ، فقالَ: ما هاتانِ النَّعْلانِ يا أبا هُرَيْرَةَ؟ فَقُلتُ: هاتانِ نَعْلا رَسولِ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ ، بَعَثَنِي بهِما مَن لَقِيتُ يَشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بها قَلْبُهُ، بَشَّرْتُهُ بالجَنَّة، فَضَرَبَ عُمَرُ بيده بيْنَ ثَدْيَيَّ فَخَرَرْتُ لاسْتِي، فقالَ: ارْجِعْ يا أبا هُرَيْرَةَ، فَرَجَعْتُ إلى رَسولِ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ ، فأجْهَشْتُ بُكاءً، ورَكِبَنِي عُمَرُ، فإذا هو علَى أثَرِي، فقالَ لي رَسولُ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ: ما لكَ يا أبا هُرَيْرَةَ؟ قُلتُ: لَقِيتُ عُمَرَ، فأخْبَرْتُهُ بالَّذِي بَعَثْتَنِي به، فَضَرَبَ بيْنَ ثَدْيَيَّ ضَرْبَةً خَرَرْتُ لاسْتِي، قالَ: ارْجِعْ، قالَ رَسولُ الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ: يا عُمَرُ، ما حَمَلَكَ علَى ما فَعَلْتَ؟ قالَ: يا رَسولَ الله، بأَبِي أنْتَ، وأُمِّي، أبَعَثْتَ أبا هُرَيْرَةَ بنَعْلَيْكَ، مَن لَقِيَ يَشْهَدُ أنْ لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ مُسْتَيْقِنًا بها قَلْبُهُ بَشَّرَهُ بالجَنَّة؟ قالَ: نَعَمْ، قالَ: فلا تَفْعَلْ، فإنِّي أخْشَى أنْ يَتَّكِلَ النَّاسُ عليها، فَخَلِّهِمْ يَعْمَلُونَ، قالَ رَسولُ اللهِ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ: فَخَلِّهِم.



خوای پەروەردگار دەفەرموویٚت:

﴿۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤﴾ الحجرات. بیابان نشینە عەرەبەکان دەڵێن: باوەڕمان هێناوە و موسوڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵکو تەسلیم بوون، چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، خوای گەورە لە (پاداشتی) چاکەکانتان کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

﴿قُلۡ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَمَآ أُنزِلَ عَلَيۡنَا وَمَآ أُنزِلَ عَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَمَآ أُوتِيَ مُوسَىٰ وَعِيسَىٰ وَٱلنَّبِيُّونَ مِن رَّبِّهِمۡ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ وَنَحۡنُ لَهُۥ مُسۡلِمُونَ ٨٤﴾ آل عمران. (ئەی محمد صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) بڵێ: باوەڕمان بە خواو بەوە هەیە کە دابەزێنراوە بۆمان، بەوەش کە دابەزێنراوە بۆ سەر ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکانی، بەوەش کە دراوە بە موسا و عیساو پێغەمبەران لەلایەن پەروەردگاریانەوە.

ئێمە جیاوازی ناکەین لە نێوان هیچکامیاندا، وە هەموامان تەسلیمی ئەو پەروەردگارەین.

﴿وَإِذَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡهِمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِهِۦٓ إِنَّهُ ٱلۡحَقُّ مِن رَّبِّنَآ إِنَّا كُنَّا مِن قَبۡلِهِۦ مُسۡلِمِينَ ٥٣﴾ القصص. کاتێکیش قورئان دەخوێنرێتەوە بەسەریاندا دەڵێن: ئێمە باوەڕمان پێ هێناوە چونکە بەڕاستی ئەمە حەقیقەت و ڕاستەقینەیە

لەلایەن پەروەردگارمانەوە پێمان ڕاگەیەنراوە بێگومان ئێمە پێشتر هەرموسڵمان و فەرمانبەردار بووین.

﴿فَلِذَٰلِكَ فَٱدۡعُۖ وَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَۖ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡۖ وَقُلۡ ءَامَنتُ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ مِن كِتَٰبٖۖ وَأُمِرۡتُ لِأَعۡدِلَ بَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمۡۖ لَنَآ أَعۡمَٰلُنَا وَلَكُمۡ أَعۡمَٰلُكُمۡۖ لَا حُجَّةَ بَيۡنَنَا وَبَيۡنَكُمُۖ ٱللَّهُ يَجۡمَعُ بَيۡنَنَاۖ وَإِلَيۡهِ ٱلۡمَصِيرُ ١٥﴾ الشورى. کەواتە (ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ) لەبەر ئەوەتۆ بانگەوازی خۆت بکەو پایەدارو دامەزراو بە هەروەک فەرمانت پێدراوە، شوێن ئارەزووی ئەوان مەکەوە، (وە بە ئاشکرا) بڵێ: من، باوەڕم هێناوە بەو کتێب و پەیامانەی خوا بۆی ناردووم، فەرمانم پێدراوە کە دادپەروەریی بەرپا بکەم لە نێوانتانا، چونکە (الله) پەروەردگاری ئێمەیەو پەروەردگاری ئێوەشە، بێگومان (دەرئەنجامی) کردەی خۆمان بۆ خۆمانەو کردەی ئێوەش بۆ خۆتانە، ئیتر هیچ بەڵگەو کەلێنێک نییە لە نێوانماندا (بۆ دووریی و جیاوازی) ئێمەو ئێوە هەر خوا خۆی کۆمان دەکاتەوەو سەرئەنجامامان بۆلای ئەوە.

﴿وَلَا يَمۡلِكُ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِ ٱلشَّفَٰعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِٱلۡحَقِّ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ٨٦﴾ الزخرف. (ئەوەش چاک بزان کە لەو ڕۆژەدا) ئەوانەی کە ئەوان دەیانپەرستن تکاو شەفاعەتیان بەدەست نییە، مەگەر کەسێک کە شایەتی ڕاستی دابێت و بزانێت کێ شایستەی تکا بۆکردنە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ قَالُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ثُمَّ ٱسۡتَقَٰمُواْ تَتَنَزَّلُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَلَّا تَخَافُواْ وَلَا تَحۡزَنُواْ وَأَبۡشِرُواْ بِٱلۡجَنَّةِ ٱلَّتِي كُنتُمۡ تُوعَدُونَ ٣٠﴾ فصلت. ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارمان (الله)یە لەوەودوا بەردەوام پابەندی ئەو ڕێبازە ڕاستە دەبن، (لە سەرەمەرگدا) دەستە دەستە فریشتە دادەبەزن بۆلایان، پێیان دەڵێن: هیچ ترس و بیمێکمان نەبێ (لە داهاتوو) هیچ غەم



و پەژارەیەکتان نەبێ (بۆ ڕابردوو) مژدەتان لێبێت بەو بەهەشتەی کە کاتی خۆی بەڵێنتان پێ دەدرا..

﴿وَإِذۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ لَا تَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ وَبِٱلۡوَٰلِدَيۡنِ إِحۡسَانٗا وَذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَٱلۡيَتَٰمَىٰ وَٱلۡمَسَٰكِينِ وَقُولُواْ لِلنَّاسِ حُسۡنٗا وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ ثُمَّ تَوَلَّيۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا مِّنكُمۡ وَأَنتُم مُّعۡرِضُونَ٨٣﴾ البقرة.

(لەبیرتانە) کاتێک کە پەیمانمان وەرگرت لە نەوەی ئیسرائیل کە جگە لە خوا کەسی تر نەپەرستن وە لەگەڵ دایک و باوک دا چاکەکار بن، هەروەها لە خزمان و هەتیوان و هەژارانیشدا. وە گوفتاری چاک و جوان ڕوو بۆ خەڵکی بڵێن، هەروەها نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن و زەکاتیش ببەخشن، کەچی ئێوە (لەجیاتی گوێڕایەڵی) پشتتان تێ کرد، جگە لە کەمێکتان نەبێ، ئەگینا زۆربەتان ڕوتان (لەو هەموو ئامۆژگاریە بەسوودانە) وەرچەرخاند.

بەڵگەی فەرموودەی پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لەسەر (وتنی ئیمان بە زمان).

پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت: فەرمانم پێ کراوە کە بجەنگم لەگەڵ خەڵکی هەتاکو دەڵێن و شاهیدی ئەدەن کە خوا تاک و تەنهایە وە منیش پێغەمبەری خوام، ئەگەر وتیان ئەوا ماڵ و سامان و ژیان و خوێنیان پارێزراو دەبێت بە وتنی ئەو حەقە، پاشان لێپرسینەوەیان لە قیامەت لای پەروەردگارە وعَن ابن عُمَر رَضِيَ اللَّه عنْهَما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أن أقاتِلَ النَّاسَ حَتَّى يَشْهَدُوا أن لا إِلهَ إلاَّ اللَّه

وأنَّ مُحَمّدًا رَسُولُ اللَّهِ، ويُقِيمُوا الصّلاةَ، وَيُؤْتُوا الزّكاةَ، فَإِذا فَعَلوا ذلكَ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وأَمْوَالَهم إِلاَّ بحَقِّ ئيسلام، وحِسابُهُمْ عَلى اللَّهِ.[٥٥]

خەصڵەتی سێیەم لە ئیمان: "کردارە بە نییەت لە دڵدا" (عمل القلب): ئەو کردارەی کە مرۆڤی موسوڵمان دەیکات دەبێت نییەتی بۆ خوا بێت لە دڵیدا خۆ ئەگەر نییەتی بۆ هەرشتێکی تر بێت لێی وەرناگیرێت، نموونەی ڕیابازی و کۆکردنەوەی دەنگ بۆ پەرلەمان و خۆدەرخستن.هتد.

بەڵگە قورئانیەکان لەسەر ئەم خەصڵەتە ئەم ئایەتانەیە بە نموونە..

﴿وَلَا تَطْرُدِ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ مَا عَلَيْكَ مِنْ حِسَابِهِم مِّن شَيْءٍ وَمَا مِنْ حِسَابِكَ عَلَيْهِم مِّن شَيْءٍ فَتَطْرُدَهُمْ فَتَكُونَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٥٢﴾﴾ الأنعام. ئەی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ (ئەی ئیماندار) نەکەی ئەوانە دەربکەیت (لە مزگەوت و کۆڕی خواناسین) کە لە بەیانیان و ئێواراندا لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوەو (دەیپەرستن) مەبەستیان تەنها ڕەزامەندی ئەوە، حساب و لێپرسینەوەی ئەوان لە سەر تۆ نییە، وە حساب و لێپرسینەوەی تۆش لەسەر ئەوان نییە، تا دەریان بکەیت و خۆت بخەیتە ڕیزی زاڵم و ستەمکارانەوە.

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٢﴾﴾ الأنفال. بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووهەم) کاتێکیش ئایەت و

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٥] مُتفقٌ عليه.



فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێهەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن..

﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ۝٦٠﴾ المؤمنون. ئەوانەی کە لەو شتانە دەبەخشن کە پێمان بەخشیون وە دڵیان دەترسێ لە گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریان (نەوەکو چاکەکانیانی لا پەسەند نەبێت).

﴿إِلَّا ٱبۡتِغَآءَ وَجۡهِ رَبِّهِ ٱلۡأَعۡلَىٰ ۝٢٠﴾ الليل. چونکە تەنها مەبەستی بەدەست هێنانی ڕەزامەندیی پەروەردگاری بەرزو بڵندە.

﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ۝٥﴾ البينة. فەرمانیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن، وە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو بن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، (بێگومان) هەر ئەوەشە دین و ئایینی ڕاست و دروست.

﴿۞ قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ۝١٤﴾ الحجرات. بیابان نشینە عەرەبەکان دەڵێن: باوەڕمان هێناوە و موسوڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵکو تەسلیم بوون، چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، خوای گەورە لە (پاداشتی) چاکەکانتان کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

﴿وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ فِيكُمۡ رَسُولَ ٱللَّهِۚ لَوۡ يُطِيعُكُمۡ فِي كَثِيرٖ مِّنَ ٱلۡأَمۡرِ لَعَنِتُّمۡ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ حَبَّبَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡإِيمَٰنَ وَزَيَّنَهُۥ فِي قُلُوبِكُمۡ وَكَرَّهَ إِلَيۡكُمُ ٱلۡكُفۡرَ وَٱلۡفُسُوقَ وَٱلۡعِصۡيَانَۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلرَّٰشِدُونَ ٧﴾ الحجرات. ئێوە لە یادتان بێت پێغەمبەری خوا لەناوتاندایە، زۆر شت هەیە ئەگەر ئەو بە ڕای ئێوە بکات تووشی گیروگرفت و ناخۆشیی دەبن. بەڵام خوا ئیمان و باوەڕی لەلا خۆشەویست کردوون و، لە دڵ و دەروونتاندا ڕازاندویەتیەوە. لەولایشەوە کوفرو بێ باوەڕیی و کوفرو بێ دینی و یاخیبوون (لە فەرمانی خوای)ی لا تاڵ و ناشرین کردوون، جا ئەمانە ئەوانەن کە ڕێگەی ژیریی و سەرفرازییان گرتۆتە بەر.

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادٗا يُحِبُّونَهُمۡ كَحُبِّ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَشَدُّ حُبّٗا لِّلَّهِۗ وَلَوۡ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِذۡ يَرَوۡنَ ٱلۡعَذَابَ أَنَّ ٱلۡقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعٗا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعَذَابِ ١٦٥﴾ البقرة. (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێ کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی کە خواپەرست بێ، شتی تر دادەتاشێ بۆ خۆی و (شوێن ڕینمەنییەکانی خوا ناکەوێ و) خۆشەویستی و سۆزی دەدا بەو بت و بەرنامۆلکەو تولە ڕێگایانە و خۆشی دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە خوایان زۆر زیاتر خۆش دەوێ (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمکارن کاتێ کە ڕووبەڕووی سزا دەبنەوە بەچاوی خۆیان سزاو ئازاری (دۆزەخ دەبینن) بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بەدەست خوایە، وە ئەو ڕۆژە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

لە فەرمـوودەدا هـاتووە کە پێغەمـبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ لەبـارەی کـردار بە نییەتـی دڵ دەفەرمووێـت: هەرکەس ڕەمەزان بەڕۆژوو بێـت و شەوەکانی زیندوو بکـاتەوە ئەوا خـوای پەروەردگـار لە تاوانەکـانی خـۆش



دەبێت (عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قَالَ: مَنْ قَامَ رَمَضَانَ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).[٥٦]

له فەرموودەیەكی تـردا دەفەرمووێـت: ئیمانـدار نییه ئەو كەسـەی كه ئەوەی بۆ خۆی پێی خۆشه بۆ برا موسوڵمانەكەشی پێـی خـۆش نەبێـت. لا یؤمن أحدكم حتى یحبّ لأخیه ما یحبّ لنفسه. رواه البخارى

له جێگایەكی تردا سەروەرمان دەفەرمووێت: ئیمانی تەواوەتـی ئەوەیه كه لەبەرخوا خەڵكیت خۆش بوێـت هەر لەبەر خـوای پەروەرگـار خەڵكـی ببوغزێنێت عَنِ الْبَرَاء بْنِ عَازِبٍ، عن النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ قـال: (إِنَّ أَوْثَقَ عُرَى الْإِيمَانِ: أَنْ تُحِبَّ فِي اللهِ، وَتُبْغِضَ فِي اللهِ).[٥٧]

خەصڵەتی چوارەم له ئیمان:كردار به گوفتار "عمل اللسان"

كردار به زمان نموونەی زیكر و قورئـان خوێنـدن و وتەی چـاك و خێـر كردن و بانگ كردنی خەڵكی بۆ دینداری و بانگەواز كردن.

نموونەی چەند ئایەتێكی قورئان لەبارەی ئەم خەصڵەتەوە..

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَتۡلُونَ كِتَٰبَ ٱللَّهِ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنفَقُواْ مِمَّا رَزَقۡنَٰهُمۡ سِرّٗا وَعَلَانِيَةٗ يَرۡجُونَ تِجَٰرَةٗ لَّن تَبُورَ ٢٩﴾ فاطر. بەڕاستی ئەوانـەی كـه پـەیامی خوا (قورئان) دەور دەكەنـەوە و نوێژەكانیـان بـه چـاكیی ئـەنجام دەدەن، لــەو ڕزق و ڕۆزی و ســامانه جۆراوجۆرانــەی كــه پــێمان بەخشــیوون، دەبەخشـن بـه نهێنـی و بـه ئاشـكرا. (كـه بەخشـینی زانسـتی و یەرمـەتی خەڵكی به جەستەش دەگرێتـەوە) بـەنهێنی (بـۆ ئـەوەی ڕیـاو ڕووپامـایی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٦] رواه البخاري.
[٥٧] رواه البخاري

تێکەڵ نەبێت)، بە ئاشکراش (بۆ هاندانی خەڵکی) ئەوانە بە ئومێدی بازرگانییەک ئەو کارە دەکەن کە هەرگیز نائومێدو زەرەرمەند نابن.

﴿وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ٢٧﴾ الكهف. بخوێنە (ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰآلِهِوَسَلَّمَ) ئەوەی کە بە وەحی ڕەوانەکراوە بۆ تۆ، لە کتێب و (قورئانی) پەروەردگارت، فەرموودەو گوفتاری ئەو زاتە (ڕاستیی تەواوە لە هەموو ڕوویەکەوە) و هەرگیز پەناگاو یاریدەدەرێکی وەکو ئەو زاتەت دەست ناکەوێت.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ ذِكۡرٗا كَثِيرٗا ٤١﴾ ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە زۆر زۆر یادی خوا بکەن (هەمیشە ناوی پیرۆزی ئەوتان لەیاد بێ لە دڵ و دەروونتانا جۆش بخواو بێتە سەر زارتان).

﴿وَسَبِّحُوهُ بُكۡرَةٗ وَأَصِيلًا ٤٢﴾ الأحزاب. (تەسبیحات) و ستایشی بکەن لە بەیانیان و دەمەو ئێواراندا.

﴿۞ إِنَّ رَبَّكَ يَعۡلَمُ أَنَّكَ تَقُومُ أَدۡنَىٰ مِن ثُلُثَيِ ٱلَّيۡلِ وَنِصۡفَهُۥ وَثُلُثَهُۥ وَطَآئِفَةٞ مِّنَ ٱلَّذِينَ مَعَكَۚ وَٱللَّهُ يُقَدِّرُ ٱلَّيۡلَ وَٱلنَّهَارَۚ عَلِمَ أَن لَّن تُحۡصُوهُ فَتَابَ عَلَيۡكُمۡۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرۡضَىٰ وَءَاخَرُونَ يَضۡرِبُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَبۡتَغُونَ مِن فَضۡلِ ٱللَّهِ وَءَاخَرُونَ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنۡهُۚ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَقۡرِضُواْ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗاۚ وَمَا تُقَدِّمُواْ لِأَنفُسِكُم مِّنۡ خَيۡرٖ تَجِدُوهُ عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٗا وَأَعۡظَمَ أَجۡرٗاۚ وَٱسۡتَغۡفِرُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمُۢ ٢٠﴾ المزمل. بەڕاستی ئەو پەروەردگارەت دەزانێت کە تۆ نزیکەی دوو بەشی شەو یاخود نیوەی



یان سێ یەکی هەڵدەسیت و (شەونوێژ دەکەیت) هەروەها هەندێک لەوانەی کە لەگەڵتان، خوایش حسابی بۆ شەوو ڕۆژ کردووە و دەزانێت ئەوە کارێکی ئاسان نییە، ئەگەر فەرزی بکات لەسەرتان بۆتان ئەنجام نادرێ، لەبەرئەوە لە کەموکوڕیتان دەبورێت، چەنتان توانی و چۆنتان بۆ لوا (لە شەو نوێژو لەکاتی تردا) قورئان بخوێنن و دەوری بکەنەوە، چونکە ئەو خوایە (میهرەبانە)و دەزانێت، لەوانەیە کەسانێکتان لێ نەخۆش بکەوێت، و کەسانی تریش بن لە زەویدا بگەڕێن بەشوێن بازرگانی و فەزڵی خوادا، کەسانی تر لە داهاتودا بجەنگن (بۆ لابردنی کۆسپەکانی سەر ڕێی) دینی خوا، بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی ئەو، کەواتە چەندەتان بۆکرا ئەوەندە قورئان بخوێنن، نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش (بەو شێوەیەی دیاریکراوە) بیدەن، قەرز بە شێوەیەکی جوان بەخوا بدەن (ئەوەی بۆ خوا ببەخشرێ خوای گەورە بە قەرزێکی دادەنێ کە بە زاتی خۆی درابێت) جا هەر دەستپێشکەریەک بکەن بۆ خۆتان (سبەی) دەیبیننەوە لای خوا کە زۆر بەرەکەتی تێ خستووەو پاداشتی گەورەی بۆ ئامادە کردوون، دە ئیتر داوای لێ خۆشبوون هەر لە خوا بکەن، دڵنیا بن کە ئەو خوایە لێخۆش بوو میهرەبانە.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَٱثْبُتُواْ وَٱذْكُرُواْ ٱللَّهَ كَثِيرًا لَّعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٤٥﴾﴾ الأنفال. ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە: کاتێک دەگەنە دەستەیەک و ڕوو بە ڕوتان دەبنەوە، ئەوە دەبێت خۆڕاگربن و سەنگەر چۆڵ نەکەن و زۆر یادی خوا بکەن و لێی بپاڕێنەوە، بۆ ئەوەی ئێوە سەرفرازو سەرکەوتوو بن..

﴿إِنَّ ٱلْمُسْلِمِينَ وَٱلْمُسْلِمَـٰتِ وَٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُؤْمِنَـٰتِ وَٱلْقَـٰنِتِينَ وَٱلْقَـٰنِتَـٰتِ وَٱلصَّـٰدِقِينَ وَٱلصَّـٰدِقَـٰتِ وَٱلصَّـٰبِرِينَ وَٱلصَّـٰبِرَٰتِ وَٱلْخَـٰشِعِينَ وَٱلْخَـٰشِعَـٰتِ وَٱلْمُتَصَدِّقِينَ وَٱلْمُتَصَدِّقَـٰتِ وَٱلصَّـٰٓئِمِينَ وَٱلصَّـٰٓئِمَـٰتِ

وَٱلْحَٰفِظِينَ فُرُوجَهُمْ وَٱلْحَٰفِظَٰتِ وَٱلذَّٰكِرِينَ ٱللَّهَ كَثِيرًا وَٱلذَّٰكِرَٰتِ أَعَدَّ ٱللَّهُ لَهُم مَّغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا ﴿٣٥﴾ الأحزاب. بەڕاستی پیاوان و ئافرەتانی موسوڵمان، پیاوان و ئافرەتانی ئیماندار، پیاوان و ئافرەتانی ملکەچ و فەرمانبەردار، پیاوان و ئافرەتانی ڕاستگۆ، پیاوان و ئافرەتانی خۆگر، پیاوان و ئافرەتانی لەخوا ترس، پیاوان و ئافرەتانی بەخشندە، پیاوان و ئافرەتانی ڕۆژووان، پیاوان و ئافرەتانی داوێن پاک و ئەو پیاو و ئافرەتانەی زۆر یادی خوا دەکەن، بەخشین و لێ بوردەیی و پاداشتی زۆر مەزن و بێ سنووریان لەلایەن خوای گەورەوە بۆ ئامادەکراوە (هەرکە دنیایان بەجێهێشت پێی شاد دەبن).

لەبارەی کردار لە سوونەت دا بە زمان پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: باشترینتان ئەو کەسەیە کە فێری قورئان دەبێت و خەڵکانی تریش فێردەکات (عن عثمان بن عفان رضي الله عنه عن النبي صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ قال: خَيرُكُم من تعلَّمَ القرآنَ وعلَّمَهُ).[٥٨]

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: وشەیەک هەیە لەسەر زمان ئاسانە و لەسەر شایەن و کێشان زۆر گران و سەنگینە، خۆشەویستە لای پەروەردگاری ڕەحمان، ئەویش (سبحان الله وبحمده، سبحان الله العظيم)، واتا پاک و بێگەردی بۆ خوا و سوپاسێک کە شایستەیە بە زاتی، هەروەها پاک و بێگەردی بۆ خودایەک کە لەهەرچی شتێک هەیە گەورەترە (عنْ أَبِي هُرَيْرَة رضى الله عنه قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٨] رواه بخاری.



كلمَتَانِ خَفِيفَتَانِ عَلَى اللِّسَانِ، ثَقِيلَتَانِ فِى الْمِيزَانِ، حَبِيبَتَانِ إِلَى الرّحْمَنِ: سُبْحَانَ اللَّهِ وَبِحَمْدِهِ، سُبْحَانَ اللَّهِ الْعَظِيمِ).[٥٩]

خەصڵەتی پێنجەم لە ئیمان: کردار بە لاشە "عمل الجوارح والأركان": نموونەی نوێژ و جیهاد و زەکات و ئەخلاقی جوان..هتد.

چەند نموونەیەک لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەبارەی ئەم خەصڵەتەوە..

﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱرۡكَعُواْ مَعَ ٱلرَّٰكِعِينَ﴿٤٣﴾﴾ البقرة. نوێژەکانتان بەچاکی ئەنجام بدەن بەدروشمەکانییەوەو زەکاتیش بدەن، لەگەڵ کڕنووش بەراندا کڕنووش ببەن (بۆ پەروەردگارتان).

﴿حَٰفِظُواْ عَلَى ٱلصَّلَوَٰتِ وَٱلصَّلَوٰةِ ٱلۡوُسۡطَىٰ وَقُومُواْ لِلَّهِ قَٰنِتِينَ﴿٢٣٨﴾﴾ البقرة. لە ئەنجام دانی نوێژەکاندا کەمتەرخەمی مەکەن بەتایبەتی نوێژی ناوەند (کە نوێژی عەسرە) وە هەمیشەو بەردەوام ئامادە بن کە بۆ خوا ملکەچیانە پەرستش ئەنجام بدەن.

﴿وَقَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يُقَٰتِلُونَكُمۡ وَلَا تَعۡتَدُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ﴿١٩٠﴾﴾ البقرة. بجەنگن لە پێناوی خوادا دژی ئەوانەی کە دژتان دەجەنگن، نەکەن دەستدرێژی بکەن (دژی ژن و مناڵ و ماڵات و ڕووەک...هتد) چونکە بەڕاستی خوا دەستدرێژکەرانی خۆش ناوێت.

﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴿٧٦﴾﴾

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٥٩] متفق عليه.

ئەوانەی کە ئیماندارن (تەنها) لە پێناوی خوادا دەجەنگن (بەڵام) ئەوانەی کە کافرن لە پێناوی ستەمکارو زۆرداردا دەجەنگن، دەبجەنگن دژی یاوەرانی شەیتان (چونکە) بەڕاستی پیلان و تەڵەکەی شەیتان پووچ و لاوازە.

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمۡ كُفُّوٓاْ أَيۡدِيَكُمۡ وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقِتَالُ إِذَا فَرِيقٞ مِّنۡهُمۡ يَخۡشَوۡنَ ٱلنَّاسَ كَخَشۡيَةِ ٱللَّهِ أَوۡ أَشَدَّ خَشۡيَةٗۚ وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبۡتَ عَلَيۡنَا ٱلۡقِتَالَ لَوۡلَآ أَخَّرۡتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٖ قَرِيبٖۗ قُلۡ مَتَٰعُ ٱلدُّنۡيَا قَلِيلٞ وَٱلۡأٓخِرَةُ خَيۡرٞ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظۡلَمُونَ فَتِيلًا ٧٧﴾ النساء. ئایا نەت بینی ئەوانەی کە پێیان دەوترێت دەست بپارێزن کاتی جەنگ نییە، هەر نوێژ بکەن و زەکات بدەن، کەچی کاتێ کە جەنگیان بۆ بڕیار درا، دەستەیەکیان لە خەڵکی دەترسان بە قەدەر ئەوەی کە لە خوا دەترسن یاخود زیاتریش و دەیانوت: خوایە تۆ بۆچی جەنگت لەسەر فەرز کردین، خۆزگە بۆ ماوەیەک دوات دەخستین، بەوانە بڵێ: ڕابواردنی ژیانی دنیا زۆر کەم و کورتە، ژیانی قیامەت چاکترو خۆشترو نەبڕاوەیە بۆ ئەوانەی لە خوا دەترسن و پارێزکارن، بە قەدەر تاڵی ناوکی خورمایەک ستەمیان لێ ناکرێت.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱرۡكَعُواْ وَٱسۡجُدُواْۤ وَٱعۡبُدُواْ رَبَّكُمۡ وَٱفۡعَلُواْ ٱلۡخَيۡرَ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ۩ ٧٧﴾ الحج. ئەی ئەو کەسانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە کڕنووش و سوژدە بەرن و (نوێژەکانتان بەجوانی بکەن) و پەروەردگارتان بپەرستن لە هەموو بارودۆخێکداو تا دەتوانن چاکە و چاکەکاری ئەنجام بدەن بۆ ئەوەی سەرفرازو سەرکەوتووبن..



﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ٥٦﴾

النور. ئەی ئیمانداران: نوێژەکانتان لە کاتی خۆیدا بە چاکی ئەنجام بدەن و زەکاتی ماڵەکانتان بدەن و فەرمانبەرداری پێغەمبەریش بکەن بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێت.

چەند ئایەتێک لە سورەتی الفرقان

﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ٦٣﴾ بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەنە کە زۆر بە سەلاریی بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش کە نەفامان (بە قسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن) دەڵێین: سڵاو (خۆیان لە شەڕیان دەپارێزن).

﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدٗا وَقِيَٰمٗا٦٤﴾ ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان بە سوژدە وەستاون و (نوێژ) دەبەنەسەر.

﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا٦٥﴾ ئەوانەی دەڵێن: پەروەردگارا سزای ئاگری دۆزەخمان لێ لادەو (پەنامان بدە) چونکە سزاو ئازاری لەکۆڵ نابێتەوەو بەردەوامە (بۆ خوانەناس و یاخییەکان).

﴿إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا٦٦﴾ بەڕاستی شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵەو پەشیمانی بێ سنوور بۆ ئەو کەسەی لەناویدا گیردەخوات).

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ٦٧﴾ (هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەن کە کاتێک ماڵ و سامانیان

دەبەخشن و خەرجی دەکەن، نە زیادەڕەویی تیا دەکەن و بەزایەی دەدەن، نە دەست نوقاوو ڕەزیلیشن، بەڵکو لەو نێوانەدان و (مام ناوەندین و لەشتی بەسوودا بەکاری دەهێنین).

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨﴾ ئەوانەی کە هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێک بۆ خوا بڕیار نادەن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر لەسەر حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و (نزیکی ناکەون) ئەوەی ئەو جۆرە کارە (خراپانە) ئەنجام بدات تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت.

﴿يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا ٦٩﴾ لە قیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرابەر دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و ڕیسواییەوە دەبێت ژیانی تیا بەرێتە سەر.

﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلٗا صَٰلِحٗا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ٧٠﴾ مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکات و باوەڕ بێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکە، چونکە هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (بەرانبەر خەڵکیی بە گشتی، وە ئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی).

﴿وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابٗا ٧١﴾ جا ئەوەی کە تەوبە دەکات و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدات، ئەوە تەوبەکەی هەر لە پەروەردگار داواکردووە، ئەویش تەوبەی (ڕاست و دروست وەردەگرێت).



﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامًا ﴿٧٢﴾﴾
(بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن و ئامادە نین کە لە شوێنێکدا ئامادەبن کە شایەتی ناحەقی تیا ئەنجام دەدرێت، کاتێک کە بەلای گەمەو گاڵەو چەپۆکانی (نەفاماندا) تێ دەپەڕن، بە هێمنی و لەسەر خۆیی و سەربەرزییەوە تێدەپەڕن.

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا﴿٧٣﴾﴾
هەروەها ئەوانەشن کە کاتێ بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بێدارکرانەوە، هەروا بە کەڕیی و کوێری بەلایدا تێناپەڕن (بەڵکو تێدەفرکن و لێکی دەدەنەوەو پاشان پەیڕەویی دەکەن).

﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴿٧٤﴾﴾ ئەوانەشن کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان، وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران.

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا﴿٧٥﴾﴾ ئەو جۆرە کەسانەی (کە باسکران) پاداشتیان ژوورە (ڕازاوەو خۆشەکانی بەهەشتە) لەبەرانبەر خۆگرتن و ئارامگرتنیانەوە وە بەسڵاوو درووود پێشوازییان لێدەکرێت (بۆ هەمیشە دەحەوێنەوە تیایدا).

﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا﴿٧٦﴾﴾ لەناو ئەو بەهەشتەدا ژیانی کامەرانیی بەردەوام دەبەنە سەر، بەڕاستیی جێگەو ڕێگەو نیشتەجێیەکی خۆش و سازگارو ڕازاوەیە.

﴿قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا﴿٧٧﴾﴾ الفرقان. پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان

پێنادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دۆعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر بەرنامەی (پەروەردگار) بەدرۆدەخەنەوە (ئەگەر بەردەوام وابن) ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئاییندەدا یەخەتان پێ دەگرێت و لەکۆڵتان نابێتەوە.

﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ البينة. فەرمانیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن، وە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو بن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، (بێگومان) هەر ئەوەشە دین و ئایینی ڕاست و دروست.

﴿هَلۡ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأۡتِيَهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ أَوۡ يَأۡتِيَ رَبُّكَ أَوۡ يَأۡتِيَ بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَۗ يَوۡمَ يَأۡتِي بَعۡضُ ءَايَٰتِ رَبِّكَ لَا يَنفَعُ نَفۡسًا إِيمَٰنُهَا لَمۡ تَكُنۡ ءَامَنَتۡ مِن قَبۡلُ أَوۡ كَسَبَتۡ فِيٓ إِيمَٰنِهَا خَيۡرٗاۗ قُلِ ٱنتَظِرُوٓاْ إِنَّا مُنتَظِرُونَ ١٥٨﴾ الأنعام. مەگەر ئەوانە چاوەڕێی ئەوە بکەن کە فریشتەی (تۆڵە) بێت بۆیان، یا پەروەردگار خۆی یەکسەر بێت (بۆ لەناو بردنیان) یا هەندێک لە نیشانەکانی پەروەردگارت دەکەوێت (کە بەڵگەیە لەسەر نزیک بوونەوەی قیامەت)، ئەو ڕۆژەی کە هەندێک لە نیشانەکانی (نزیک بوونەوەی قیامەت) دەردەکەوێت (وەکو هەڵهاتنی خۆر لە خۆرئاوا)، ئەو کەسەی ئەو کاتە ئیمان و باوەڕ دەهێنێت، ئەو ئیمان و باوەڕەی سوودی بۆی نابێت ئەگەر پێشتر ئیمانی نەهێنابێت، یا کردەوەی چاکی هاوڕێ لەگەڵ ئیمانەکەیدا نەبووبێت، پێیان بڵێ: چاوەڕێ بکەن (بزانن خوا چیتان بەسەر دێنێت) ئێمەش چاوەڕوانین.

﴿قُلۡ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٞ مِّثۡلُكُمۡ يُوحَىٰٓ إِلَيَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ فَمَن كَانَ يَرۡجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾



الكهف. (ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ پێیان) بڵێ: من تەنها ئادەمیزادێکم وەک ئێوە وەحی و نیگام بۆ هاتووە (کە ئەم ڕاستیەتان تێبگەیەنم) کە: خوای ئێوە تەنها خوایەکی تاک و تەنیایە، جا ئەوەی دەیەوێت بە دیداری پەروەردگاری شاد ببێت (بە خۆشنودیەوە) با کارو کردەوەی چاک و دروست ئەنجام بدات، وە بەهیچ شێوەیەک لە پەرستنیدا هاوەڵ و شەریک (بۆ خوای گەورە) بڕیار نەدات.

﴿إِنَّمَا يُؤۡمِنُ بِـَٔايَٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِهَا خَرُّواْ سُجَّدٗا وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ۩ ١٥﴾ السجدة. ئەوانەی بڕوایان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە هەرکاتێ یاداوەری دەکرێن پێی، خێرا سوژدە دەبەن، (تەسبیحات) و سوپاسگوزاری پەروەردگاریان دەکەن، ئەوانە (بەهیچ شێوەیەک) فیزیان نییەو خۆیان بە گەورە نازانن.

دەربارەی کرداربە لاشە پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرمووێت: ٧ جۆر لە خەڵکی لەژێر سێبەری خوای پەروەردگاردان کە لەو ڕۆژەدا هیچ سێبەرێک نییە.

یەکەم: پێشەوایەکی دادپەروەر.

دووەم: گەنجێک بە بەندایەتی و خواناسی پەروەردە دەبێت.

سێیەم: کەسێک دڵی وابەستەیە بە مزگەوت واتا نوێژەکانی بە جەماعەت دەکات.

چوارەم: دوو کەس لە پێناوی خوادا یەکتریان خۆش دەوێت، یاخود پێچەوانەکەی.

پێنجەم: کەسێک ئافرەتێکی جوان و شـۆخ و شـەنگ و پـارەدار بـانگی دەکـات بۆکـاری خـراپە و زینـا ئەو کەسـە لەبەرخـاتری خـوای گەورە واز دەهێنێت و دەڵێت لە خوا دەترسم.

شەشەم: کەسێک لەپێناوی خوای گەورە بەدەستی ڕاستی دەبەخشـێت و دەستی چەپی پێی نازانێت.

حەوتەم: کەسـێک لەپێنـاوی خـوای پەروەردگـار زیکـر و خواپەرسـتی دەکات و چاوەکانی پڕ لە گریانن (قال رسـول الـلە صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ: سَبْعَةٌ يُظِلُّهُمُ اللَّهُ فِي ظِلِّه يَوْمَ لا ظِـلَّ إلَّا ظِلُّـهُ: إِمـامٌ عـادِلٌ، وشـابٌ نَشَـأَ فِي عِبَادَةِ اللَّه تَعـالى، وَرَجُـلٌ قَلْبُـهُ مُعَلَّـقٌ فِي المَسَـاجِد، وَرَجُـلانِ تَحَابّـا فِي اللَّـه: اجتَمَعا عَلَيه، وتَفَرّقَا عَلَيه، وَرَجُلٌ دَعَتْهُ امْرَأَةٌ ذَاتُ مَنْصِبٍ، وَجَمَالٍ فَقَالَ: إِنِّي أَخافُ اللَّه، وَرَجُلٌ تَصَدَّقَ بِصَدَقَة فأَخْفَاها، حتَّـى لا تَعْلَـمَ شِـمالُهُ مَـا تُنْفِـقُ يَمِينهُ، وَرَجُلٌ ذَكَرَ اللَّه خالِياً فَفَاضَتْ عَيْنَاهُ).[٦٠]

یاخود لە فەرمودەیەکی تـردا دەفەرموێـت: هەرکەس لە پێنـاوی خـوا خەڵکی خۆش بووێت یـاخود ڕقـی لە خەڵکـی بێتەوە(مەبەسـتی کـافرو و مونافیقـە یـان کـافری موحاریبـە) یـان لە پێنـاوی خـوا ببەخشـێت یـان لە پێناوی خوادا ڕێگری بکات(لەکاری خراپە) ئەوا ئیمانی تەواوە و پڕە(عن أبي أمامة، عن رسول الله صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ أنه قال: من أحـب للـه، وأبغـض للـه، وأعطى لله، ومنع لله فقد استكمل الإيمان).[٦١]

---

[٦٠] رواه بخاري
[٦١] أخرجه ابوداود.



ئەوەی لێرەدا زۆر گرنگە ئاماژەی پێ بدەین ئەوەیە کۆمەڵگای کوردی بەگشتی وا هەست دەکەن کەسێک کە بەدڵ بڕوای هێناو بە زمان وتی بڕوام هەیە، ئیتر ئەوە دەچێتە خانەی ئیماندارو هیچ پێویستی بەکاروکردار نییە، بەڵام لە ڕاستیدا پەیوەندی بە ئیمانەوە نییە، بەڵکو ئیمانی نییە تەنها چەند هۆکارێک پاڵی پێوەناوە بۆ ئەو وتەیە لەو هۆکارانە لەوانەیە لە خێزانێکی موسوڵمان و کلتورێکی ئیسلامی پەروەردە بوبێت و لە ژیانیدا سوجدەیەکی بۆ خوا نەبردووە و ڕۆژێک بە ڕۆژوو نەبووە لەبەرخاتری خوای گەورە، یان زەکاتی نەداوە و بانگەوازی نەکردووە بۆ دینی خوا، ئەگەر لە جێگایەکدا پێویستی بەوەکردبێت کە بەرگری لە ئیسلام بکات وتویەتی جا من بۆ خۆم پیاو خراپ بکەم خۆ بەتەنها من موسوڵمان نیم.

یاخود هەیە لەبەر سومعە و ناووناوبانگی لەناو کۆمەڵگا دەڵێت من موسوڵمانم، ئیتر لە نوێژ و ڕۆژو و زەکات و حەج نەک بڕوای پێی نییە، بەڵکو کە دێتە سەر باسی بەندایەتییەکان بەکردار، دەڵێت دڵ حیسابە و نوێژ تەنها وەرزشە لەگەڵ ڕۆژو، من پێویستم پێی نییە و دڵم پاکە. یان لەوانەیە کە بڕوای هەیە و بەدرۆی ناخاتەوە، بەڵام تەمەڵ و لاشە قورسە بۆ بەندایەتی، بەڵام بۆکاری تر چالاک و زۆر لاشەی سوکە. ئەوەی ئەمری پێ دەکرێت بەندایەتی پەروەردگارە و بەڵام ئەو وازی لێ دەهێنێت و لە ژیانیدا زیکرێک ناکات، یان لاپەڕەیەک قورئانی نەخوێندۆتەوە و سڵاواتێکی نەداوە لەسەر پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ. لەوانەیە هەر نەیزانێت و بەدوای فێربوونیشیدا نەگەڕا بێت.

کۆمەڵێکی زۆر لە ئەهلی سەلەف و زانایان ئەو جۆرە کەسانەیان بە بێ ئیمان و کافر داناوە، لەوانە (وکیع بن جراح، ئەحمەد بن حنبل و أبی عبید)، شیخ ئیسلام ئیبنو تەیمییە لە مەجموعەی فەتاوادا باسی کردووە.

واتا بە کافریان داناون ئەوانەی دەڵێن ئیمان لە دڵدایە یاخود بە زمانە و هیچ ئاماژەیان بۆ کردار نەکردووە، واتا دەڵێن ئیمان تەنها (قەول)ە نەک (کردار "عمل").

لێرەدا دەبێت ئاماژەیەک بەوە بکەین کە شەیتان بڕوای بە خوا هەیە و بڕوای بە قیامەتیش هەیە، بەدرۆی نەخستۆتەوە، بەڵام کرداری نییە لە هیچ جێگایەکی قورئان و سوننەت دا نەهاتووە کە بڕوا و ئیمانی بەدرۆ بخاتەوە، بەڵکو بە پێچەوانەوە کافر بوون و لوت بەرزی سیفاتی بووە، لەبەرئەوەی فەرمانی خوای پەروەردگاری پیادە نەکردووە.

یان یەهود سور دەزانن محمد نێردراوی پەروەردگارە، دڵنیا بوون کە قورئانەکەشی کەلامی خوایە، بەڵام ئەو ئیمان و بڕوایە هیچ فریایان نەکەوت، بەڵکو بە خراپترین دوژمن و سەرسەخت ترین نەیار و کافر و تەنانەت بە شەیتان ناوبراون لە قورئاندا، چونکە بڕوا بوون بە دڵ یان بە زمان دادی مرۆڤ نادات بۆ هاتنە ناو چوارچێوەی ئیسلام، بەڵکو پێویستی بە کردارە لەگەڵیدا.

- هەروەها فیرعەون بە زمان وتی بڕوام بە خوای تاک و تەنهای موسا -علیه السلام- هەیە، بەڵام ئیمانەکەی فریای نەکەوت.

جەنگی هەڵگەڕاوەکان لەسەردەمی ئەبوبەکر دا تەنها بەشێکیان بڕیاریاندا کە تەنها زەکات نەدەن، ئەبوبەکری صدیق قبوڵی نەکرد و بەهەڵگەڕاوە ناوی بردن، کەواتە ئیمان (گوفتار و کردار و نییەتە) هەریەک لەم خەسڵەتانە نەمان ئەوا ئیمان نامێنێت.

ئەوەی بڕوای بە ئیمانە و دەیەوێت بێتە ناو خانەی ئیسلام دەبێت دان بنێیت بە شایەتومان و ئەو هەواڵانەی کە هاتووە بۆ پێغەمبەری



صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ و قورئـان و پاشـان ئەو فەرمـان و ڕێگریـانەی کە کراوە دەبێت مرۆڤی ئیماندار ئەنجامی بدات و گەردن کەچ و زەلیلـی بـۆ بنوێنێت.

هەرقـــل پادشـــای ڕۆم بـــڕوای بەوە کـــرد کە پێغەمـــبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ نێـردراوی خـوایە، بەڵام ئـیمانەکەی هـیچ فریـای نەکەوت.

شەیخول ئیسلام ئیبنو تەیمییە دەفەرمووێت: ئەگەر گریمانێک دابنێـین لەوەی کە هۆزێک بێنە خزمەتی پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ و بڵـێن ئەی محمـد ئەوەی جەنابـت هێنـاوتە بڕوامـان پێیەتـی بە دڵ و بە زمـان شـــایەتومان دەهێنـــین و هـــیچ گومانمـــان لە ڕاســـتی و دروســـتی پێغەمبەرایەتیت نییە، بەڵام ئەوەی فەرمانت پێ کردووین لە نـوێژ، ڕۆژوو، زەکات، حەج، ڕاستگۆیی، ئەمانەت و سیلەی ڕەحم..هتـد هیچـی نـاکەین، هـیچ کـات بـانگەواز بـۆ دینـەکەت نـاکەین و ئەوەی قسـەی بە خـوا و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ وت خۆمانی لێ هەڵە دەکەین.

ئایـــا پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ: بەمە ڕازی دەبـــوو؟ دەیفەرمـوو: ئێـوە ئیمانـدارن یـاخود لە ڕۆژی قیـامەت بەر شـەفاعەتم دەکەون؟ یاخود دەیفەرموو ئێوە کافرن و جەنگ کردن لەگەڵتاندا واجبە.

لەکۆتاییـدا دەڵێـین ڕاسـتگۆیی بە زمـان و نیـیەت پـاکی بەڵ، کـردار دەخاتە لاشەی مرۆڤ، کە دڵی پاک داینەمۆی زمان و کردارە، دڵـی پـیس و خـراپ مـرێنەری لاشـەیە و دەیگۆڕێـت. هەربـۆیە پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموێت لەلاشەدا پارچەیەک هەیە ئەگەر چاک

بوو ئەوا هەموو لاشە چاک و باش دەکات، ئەگەر خراپ بوو ئەوا لاشە خراپ و پیس و بۆگەن دەکات، ئەویش دڵە (عن النعمان بن بشير رضي الله عنهما قال: سمعت رسول الله صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ يقول: ألا وإن في الجسد مضغة إذا صلحت صلح الجسد كله، وإذا فسدت فسد الجسد كله، ألا وهي القلب).[٦٢]

## ئیمان زیاد و کەم دەکات

کۆڕای پێشینانمان (سلف) لەسەر ئەوە هاوڕان کە ئیمان بریتییە لە کردارو ڕەفتار "قول وعمل" و نیەت و ئیمان بە کردەوەی چاکە زیاد دەکات و بە تاوان و دوورکەوتنەوە لە بەندایەتی لاواز و کەم دەکات.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿وَمَا جَعَلْنَآ أَصْحَٰبَ ٱلنَّارِ إِلَّا مَلَٰٓئِكَةً ۙ وَمَا جَعَلْنَا عِدَّتَهُمْ إِلَّا فِتْنَةً لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِيَسْتَيْقِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَيَزْدَادَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِيمَٰنًا وَلَا يَرْتَابَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ وَلِيَقُولَ ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ وَٱلْكَٰفِرُونَ مَاذَآ أَرَادَ ٱللَّهُ بِهَٰذَا مَثَلًا ۚ كَذَٰلِكَ يُضِلُّ ٱللَّهُ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ ۚ وَمَا يَعْلَمُ جُنُودَ رَبِّكَ إِلَّا هُوَ ۚ وَمَا هِىَ إِلَّا ذِكْرَىٰ لِلْبَشَرِ ﴿٣١﴾﴾ المدثر. جا ئێمە وەنەبێ کار گوزارانی دۆزەخمان (لە کەسانی تر) جگە لە فریشتە بەدی هێنابێ، ئەو ژمارەیەشمان کردووە بەهۆی تاقیکردنەوەی بێباوەڕان، هەروەها بۆ ئەوەش کە خاوەنانی کتێب دڵنیا بن

---

[٦٢] متفق عليه.



لە ڕاستی ئەم قورئانە (چونکە لە تەورات و ئینجیلدا ئەو باسە هەیە) بۆ ئەوەش کە ئیمانداران زیاتر باوەڕیان دامەزراو بێت، خاوەنانی کتێب و ئیماندارانیش حەق نییە توشی دوودڵی بن، با ئەوانەی دڵ و دەروونیان نەخۆشە (لە دووڕوەکان و) بێ باوەڕان (هەر بۆ خۆیان قسە بکەن و) بڵێن: خوا باسی ئەم ژمارەیەی بۆچی کردووە؟ جا هەر بەو شتانە دەردەکەوێت (کێ ڕێگەی گومڕایی گرتووە) تا خوا گومڕای بکات، کەسیش بە (ژمارەو دەسەڵاتی) سەربازانی پەروەردگارت ئاگادار نییە جگە لە زاتی خۆی، ئەو دۆزەخەش بۆ خەڵکی (یاخی یە) تا ژیرەکان (حسابی بۆ بکەن).

بەهەمان شێوەش لە سورەتی الأنفال د اهاتووە کە دەفەرمووێت:

﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ ٱللَّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُهُۥ زَادَتْهُمْ إِيمَٰنًا وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ۝٢﴾ الأنفال. بێگومان ئیماندارانی ڕاستەقینە تەنها ئەوانەن: (یەکەم) کە کاتێک ناوی خوا برا، ئەوە دڵەکانیان دەترسێت و دەهەژێت، (دووەم) کاتێکیش ئایەت و فەرمانەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنرێتەوە، ئەوە ئیمان و باوەڕیان زیاد دەکات، (سێیەم) (لە هەموو کارو بارێکیشیاندا) هەر پشت بە پەروەردگاری خۆیان دەبەستن.

ئیمان وەکو ناوک و تۆو وایە، چەندت لەناو زەویدا چاند و خزمەتت کرد و ئاوت دا ئەوەندە نمو دەکات و سەر دەردەهێنێت و لق و پۆ بڵاودەکاتەوە و بەرزدەبێتەوە، زانایان دەڵێن دەشێت ئیمان وەکو شاخ ڕەگ دابکوتێ و سەربڵند بێت، دەشێت بەهەمان شێوە لە شێوەی خۆڵ و تەپوتۆزدا بێت.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ سەبارەت بە زیادو کەمی ئیمان لەچەندین فەرموودەدا بۆی باسکردووین لەوانە کە دەفەرمووێت: هەرکەس لەئێوە کارێکی خراپەی بینی با بەدەستی بیگۆڕێت، خۆ ئەگەر

نەیتوانی با بەزمانی بیگۆڕێت، ئەگەر هەر نەیتـوانی بـابەدڵ پێـی بـاخۆش بێت، ئەوەش کۆتا پلەی ئیمانە.

(عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال سمعت رسول الله صلى اللـه عليـه وسلم يقول: من رأى منكم منكرا فليغيره بيـده فـإن لم يسـتطع فبلسـانه فـإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان).[٦٣]

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە ئیمان پێکهـاتووە لە چەنـد بەشـێک یان پۆلێک کە دەشێت ٦٠-٧٠ پلە و بەش بێت، باشترین پلەی وتنـی (لاإله إلا الله)یە کە واتای یەکتاپەرستییە و خواروترین بەشی ئیمان لابردنی خۆڵ و بەردو پیسیی و ئازارە لەسەر ڕێگای خەڵکی.

(عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه قال سمعت رسول الله صلى الله عليـه وسلم يقول: من رأى منكم منكرا فليغيره بيـده فـإن لم يسـتطع فبلسـانه فـإن لم يستطع فبقلبه وذلك أضعف الإيمان).[٦٤]

حديث أبي هريرة أن رسول الله صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ قـال: الإيمـان بضـع وسبعون أو بضع وستون شعبة، فأفضلها قول لا إله إلا الله، وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان).[٦٥]

ئایەتی قورئانی و فەرموودەی پێغەمـبەری خـوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ لەم بـارەیەوە یەکجـار زۆرە، تەنـانەت لە زانسـتی فەرموودەوانیـدا بەش و خانەی بـۆ جیـاکراوەتەوە، سـەرەڕای زۆری ئـایەت و فەرموودەکـان، ئـێمە

---

[٦٣] رواه مسلم.
[٦٤] رواه مسلم.
[٦٥] رواه البخاري.



لێرەدا بەوەندە کۆتایی پێ دەهێنین، بەڵام با پـێکەوە بـزانین هۆکارەکـانی کەمو زیاد کردنی ئیمان چین؟

## هۆکاری زیاد بوون و کەمبوونی ئیمان

دەشێت هەر زاناو خواناسێک بەگوێرەی ئەزموون و توانای خۆی باسی هۆکارەکانی زیاد بوونی ئیمانی کردبێت، لەڕاستیدا هۆکـاری زیـاد بـوونی ئیمان لە مەملەکەتی من و تۆدا وای دەبینم کە بە زوهد و ئیرادەی مرۆڤ دەست پێ بکات، زوهد پـێچەوانەی ڕەغـبەتە بەو واتـا نـیـە کە هەنـدێک بەناوی سۆفییەوە ئەنجامی ئەدەن و کـارو کەسـابەت و ژیـان ئەوەستێنن بەنـــاوی زوهـــد، دوورکەوتـــنەوەیە لەوەی کە خـــوا و پێغەمـــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓءَالِهِۦوَسَلَّمَ حەرامیان کردووە یاخود مەکروهە و دەبێت مرۆڤ خۆی لێ دوور بخاتەوە، ئەوە مانای زوهدە.

کەواتە هەڵسـان لە خەوی غەفـڵەت  و چـالاک کـردنەوەی ئـیمان بەم خاڵانە دەبێت:

یەکەم: زۆر خوێندنی قورئانی پیرۆز و تێگەیشتن لێـی و بیرکـردنەوە لە ڕستە و واتا و تەفسیرەکەی بە دڵ و بە گیان.

دووەم: تێگەیشتن و خوێندن و بوونی زانست لەسـەر سـیفات و نـاوی پیرۆزی خوای پەروەردگار.

سـێیەم: گەڕان بەدوای زانسـتی شـەرعی و مرۆیـی کـار پێکردنـی تـا بتگەیەنێتە ئەو پلەیەی کە کارت لەبەر خوا بێـت، ترسـت لە دۆزەخ بێـت، ڕەغبەتیشت بۆ بەهەشت بێت.

چـــــوارەم: دەســــــتگرتن بە ســــــوننەتی پێغەمـــــبەری خــــوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ و خوێنــدنەوەی ژیاننــامەکەی و چــاولێکردنی لە ڕەوشت و هەڵسوکەوت و بەندایەتیدا.

پێنجەم: تێگەیشتن لە خوودی ئایین و ئەرکان و پایە و شەریعەتەکە.

شەشــەم: ورد بــوونەوە لە گەردوون و زانســتی مرۆیــی بە گشــتی و نیعمەتەکانی خوای پەروەردگار و هەموو دروستکراوەکانی.

حەوتەم: بەردەوام بــوون لە وتنــی زیکــر و ئیســتیغفار و تەهلــیلە و تەسبیحات.

هەشتەم: گەڕان بەدوای بەندایەتی و نزیک بوونەوە لەخوای گەورە بە تایبەت جیهادکردن لە خاوەنەکەی لە پلەی ئیمان دادەمەزرێت و لە پلەی نیفاق و دووڕوویی دووری دەخاتەوە.

نـۆیەم: بەفیڕۆنەدانــی ئەوکــاتەی کە توانــای چــوون بــۆ حەج یــاخود عــــومرەت هەیە، یـــان ڕۆژووی عاشـــورا و دە ڕۆژی زیـــل حـــیجە"ذي الحجة"(نۆمینەی حاجیان) و شەوی قەدر و مانگی شەوال و ئیعتیکـاف لە مزگەوتی حەرەم یان مزگەوتی پێغەمـبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ لە شـاری مەدینە یان هەر مزگەوتێکی دیکە.

دەیەم: خوێنــدنەوەی ژیــانی هــاوەڵان و شــوێنکەوتوان و پیاوچاکــان بەگشتی.

یانزەیەم: چوونە مەجلیسی خواناسان و گوێگرتن لە زانـا و بـانگخوازان لە هەرجێگایەک باسی خواناسی کرا خۆتی بگەیەنەرێ.



دوانزەیەم: هەوڵدان بۆ گەیشتن بە پلەو پایەو مەقامی ئیحسان لە بەندایەتیدا.

سیانزەیەم: چاکە لەگەڵ دایک و باوک و ئیحسان لەگەڵ دراوسێ و نزیکەکان و سیلەی ڕەحم و یارمەتی خەڵکی لە پێداویستیەکانیاندا.

چواردەیەم: هەوڵدان بۆ بانگەوازی ئیسلام و گەیاندنی ئایینی خوا و پێغەمبەرەکەی بەهەموو کوچە و کۆڵان و جێگایەکدا لەم جیهانەدا.

پانزەیەم: هەوڵدان بۆ بەدەست هێنانی کارو کاسبی حەڵاڵ و دوورکەوتنەوە لە حەرام و سەلامەتی دڵ و سینەت لە بوغز و ئیرەیی و دوور بوون لە قەرزاری و دڵپیسی و لوت بەرزی و لەخۆت و ڕازی بوون و زۆری تر لە بوارەکانی تەزکیەی نەفس دا کە ئیمان زیاد دەکات.

هەرچۆن خاسێتی و خەسڵەتی تایبەت هەیە بۆ زیادکردنی ئیمان بەهەمان شێوەش بۆ لەناو چوونی ئیمان خەسڵەت و تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆیە پێویستە تۆی خوێنەری هاوڕێم خۆت لەم خاسێتانە بەدوور بگریت کە هۆکاری سەرەکی ئیمان لاواز بوونن. بڕەودان بە شەهوەت یاخود شوبهاتی نەفس و تەمەڵی و خواردنی زۆر و قەڵەو بوونە کە مرۆڤ تەمەڵ دەکات، ئەگەر مرۆڤ ئیرادە و زوهدی مرد ئەوا ئیمان لەق و لاواز دەبێت و ئەویش کۆتایی بە ژیانی دێت. هۆکاری کەم بوونی ئیمان زۆرن هەندێکیان بەرچاوی تۆی بەڕێز لەم مەملەکەتەدا.

یەکەم: تەمەڵی و غافڵ بوون لە زیکری خوای پەروەردگار و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

دووەم: نەزانی و جەهلی تەواو بە دینەکەت و شـوێنکەوتنی نەفـس و شەیتان.

سێیەم: داهێنـان و بیـدعە لە دینـداو وازهێنـان لە سـونەتی پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.

چـوارەم: شـوێنکەوتنی پێشـەوایانی گـومڕاو سەرلێشـێواو لەعەلمـانی و ئەهلی نەفس و هەواو بیدعە و کافر.

پێنجەم: چـاوکردن لەخەڵکـی گـومڕاو سەرلێشـێواو لە ئەهلـی کـوفر و تاوان و گـومڕایی وەکـو گـۆرانی بێـژو مۆدێلـەکان و هونەرمەنـدی ڕوت و کاری زشت و خراپەکاری بڵاودەکەنەوە.

شەشەم: شوێنکەوتنی حەزەکان و دەست نەگرتنەوە لە ئارەزووەکـان و نەبوونی کۆنترۆڵ بۆ نەفس و نەبوونی هیچ ئەداتێک بۆ تەزکیەی نەفس.

حەوتەم: زیادەڕۆیی و وازهێنان لە دینی خوا.

هەشـتەم: کەمـی بەنـدایەتی و خواناسـی و نزیـک بـوونەوە لە خـوای گەورە.

نۆیەم: نەزانی و جەهل بەنـاو سـیفاتی پیـرۆزی خـوای پەروەردگـار و نیعمەت و چاکەکانی کە لەگەڵی کردوویت.

دەیەم: هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی دونیا و وازهێنان لە ژیانی قیـامەت، سەرقاڵ بوون بە ماڵ و سامان و منداڵ لە بیرکردنی ئاخیرەت.

یانزەم: تەمەڵی لە بەندایەتی و نەبوونی ئیرادە و عەزیـمەت و بچـوک بوونەوەی تاوان لەبەرچاوی خاوەنەکەی و بەردەوام بوون لەسـەری وەکـو خوپێوەگرتن.



دوانــزەیەم: نەبــوونی کــۆنترۆڵ لەســەر تەماشــا کردنــی فــیلم و تۆڕەکۆمەڵایەتیەکان و قسەکردنی ناپەسەند لەگەڵ جنسی جیاواز..هتد

سیانزەیەم: نەبوونی ئینتیما بۆ موسـوڵمانان و ئاشـکرانەکردنی بەرائەت و دوژمنــایەتی نەکردنــی ئەوانەی کە دوژمنــایەتی خــوا و پێغەمــبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەکەن.

چواردەیــــەم: نەبــــوونی بەرپرســــیارێتی بەرانــــبەر بە ئــــوممەت و موسوڵمانان.

هەست نەکردن بە ئـازار و نـاڕەحەتی موسـوڵمانان و مردنـی هەسـتی بەرپرسیارێتی.

## جیاوازی ئیسلام و ئیمان

جیاوازییەکی زۆر هەیە لە نێوانی زانایاندا کە ئایا ئیمان و ئیسـلام یەک مانایان هەیە، لە ڕاستیدا سێ جۆرن.

جـۆری یەکەم دەڵـێن هـیچ جیـاوازیەکی نـیە و هەردووکیـان بە یەک واتاو مانـا دێـت. جـۆری دووەم دەڵـێن ئیسـلام گوفتـارە و ئـیمان کـردارە، جۆری سێیەم دەڵێن هەریەکە واتای تایبەتی خۆی هەیە.

ڕای سـێیەم ڕای زۆریـنەی ئەهلـی سـونەت و جەمـاعەیە، کە بەڵـگەی ڕوونتر و بەهێزیان لە هەردوو وەحیەکەدا هەیە.

واتا قورئـان و سـوننەت، ئـیمان و ئیسـلام جیـاوازن و هەریەکە مانـا و مەدلولاتی تایبەتی خۆی هەیە.

﴿* قَالَتِ ٱلۡأَعۡرَابُ ءَامَنَّاۖ قُل لَّمۡ تُؤۡمِنُواْ وَلَٰكِن قُولُوٓاْ أَسۡلَمۡنَا وَلَمَّا يَدۡخُلِ ٱلۡإِيمَٰنُ فِي قُلُوبِكُمۡۖ وَإِن تُطِيعُواْ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ لَا يَلِتۡكُم مِّنۡ أَعۡمَٰلِكُمۡ شَيۡـًٔاۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ١٤﴾ الحجرات. بیابانشینە عەرەبەکان دەڵێن: باوەڕمان هێناوە و موسوڵمانین، پێیان بڵێ: نەخێر، باوەڕتان نەهێناوە، بەڵکو تەسلیم بوون، چونکە هێشتا باوەڕ نەچۆتە ناو دڵەکانتانەوە و تیایدا جێگیر نەبووە، خۆ ئەگەر بەڕاستیی ئێوە گوێڕایەڵی فەرمانی خواو پێغەمبەری خوا بن، خوای گەورە لە (پاداشتی) چاکەکانتان کەم ناکاتەوە، چونکە بەڕاستی خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە.

لەڕاستیدا دەشتەکیەکان وتیان ئێمە ئیسلامین و بەڵام لە ترسی جەنگ و خوێن و پاراستنی ماڵ و منداڵیان، بەڵام ئیماندار نەبوون و تەنها خوای پەروەردگار پێی دەزانین، دەشێت خەڵکی بڵێت ئیسلامم بەڵام ئیمان لە دڵدایە وەکو خێزانی لوط و خێزانی نوح -علیهما السلام- هەردووکیان خیانەتی ئیمانیان کرد لە هاوسەرەکانیان، لەبەرچاوی مێردەکانیانیاندا وتیان ئیسلام بوونی خۆمان ڕادەگەیەنین، بەڵام لەڕووی ئیمانییەوە لەگەڵ بێباوەڕەکان بوون بۆیە سزا و عەزابەکە ئەوانیشی گرتەوە. لێرەدا بەواتای خیانەتی ژن ومێردایەتی نایەت، بەڵکو خیانەتی ئیمانە، خوای پەروەردگار لەوبارەیەوە دەفەرموێت:

﴿فَمَا وَجَدۡنَا فِيهَا غَيۡرَ بَيۡتٖ مِّنَ ٱلۡمُسۡلِمِينَ ٣٦﴾ الذاريات. هەرچەندە لە ماڵە موسوڵمانێکمان زیاتر بەدی نەکرد.

هەروەها لە فەرمودەیەکی جوبریل دا کە پێشتریش ئاماژەمان پێکردووە، کاتێک جوبریل دوو پرسیاری جیاواز دەکات لە پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ کە ئیمان و ئیسلام واتای چییە، پێغەمبەری خوا





صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ وەڵامــــی جیـــاوازی ئەداتەوە لەباســـــی ئـــیمان دەفەرمووێت:

(أن تؤمن بالله وملائكته، وكتبه ورسـوله، واليـوم الآخـر، وبالقـدر خـيره وشره. لەوەڵامـی ئیسـلام دەفەرمووێـت: أن تشـهد أن لا إلـه إلا اللـه، و أن محمداً رسـول اللـه. وتقـيم الصـلاة وتـؤتي الزكـاة. وتصـوم رمضـان و تحـج البيت).

لە فەرموودەیەکـــــدا هـــــاتووە پێغەمـــــبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: خەڵکی ئیسلام بوون واتـا موسـوڵمان بـوون، بەڵام (عەمـری کوڕی عاص) ئیمانی هێناوە واتا ئیماندار بووە. (أسلم النـاس، وآمـن عمـرو بن عاص).[٦٦]

ئیمان بەرزترە تا پلەی ئیسلام، ئەشێت خەڵکی لە ترساندا تەسلیم بێـت بە فەرمانڕەوای ئیسلام، بەڵام ئیمان لە دڵدایە وە نییەتی ڕاسـتە هەر بـۆیە خـــوای پەروەردگـــار کە باســـی پاداشـــتی بەهەشـــت دەکـــات هەمیشـــە دەفەرمووێت: (ياأيهـا الـذين آمنـوا..) هەمـوو ئەحکـامی شـەرعی لەسـەر ئیماندار دادەمەزرێت.

کەواتە ئیسلام و ئیمان دوو واتای جیـاوازن ئەوەی دەچێـتە نـاو ئـیمان چۆتە ناو ئیسلام، بەڵام ئەوەی چۆتە نـاو ئیسـلام مەرج نیـیە چـووبێتە نـاو خانەی ئیماندار.

ئەم باسەش کە جیاکراوەتەوە لە دوو بەشی سەرەکیدا باسکراوە، بەشی یەکەم ئیسلامی حوکمەو بەشی دووەم ئیسلامی حەقیقەتە.

---

[٦٦] رواه الترمذي.



ئیسلامی حوکم ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە ئەحکام (لە نیکاح، میرات، ئەحکامی جەنازە، ویلایەت و سەربڕینی ئاژەڵ و.هتد).

ئیسلامی حەقیقەت، پەیوەندی هەیە بە ئەحکامی ئیمانی و ڕۆژی دوایی.

ئەگەر لە تۆ بپرسرێت ئیمانداری یان موسوڵمانیت، واتا مسلم یاخود موئمینی؟

لەناو ئەهلی سونەتدا دەبێت خۆی جیابکاتەوە لە نێوان شک و گومان و حەقیقەتی ئیمان، واتا ڕاستەوخۆ نەڵێت موسوڵمانم یاخود ئیماندارم، دەبێت بڵێت إن شاء الله لە ئیماندارانم یان لە موسوڵمانانم. ئەوە مورجیئەو گروپەکانی ترە کە ڕاستەوخۆ دەڵێن ئیمانداریین یاخود موسوڵمانین.

تەنانەت پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ئەفەرموێت: هیواخوازم کە من ئەو کەسە بم کە زۆرترین لە خوا دەترسم و یاخود لە کردەوەکانمدا خۆپارێزی پێوە دیارە. (والله إني لأرجو أن أكون أخشاكم الله وأعلمكم بما أتقى).[٦٧]

ئایەتی قورئان لەم بارەیەوە زۆرە لەوانە..

﴿لَّقَدْ صَدَقَ ٱللَّهُ رَسُولَهُ ٱلرُّءْيَا بِٱلْحَقِّ لَتَدْخُلُنَّ ٱلْمَسْجِدَ ٱلْحَرَامَ إِن شَآءَ ٱللَّهُ ءَامِنِينَ مُحَلِّقِينَ رُءُوسَكُمْ وَمُقَصِّرِينَ لَا تَخَافُونَ فَعَلِمَ مَا لَمْ تَعْلَمُوا۟ فَجَعَلَ مِن دُونِ ذَٰلِكَ فَتْحًا قَرِيبًا ﴿٢٧﴾﴾ الفتح. بێگومان خوا خەونی

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٧] رواه مسلم.



پێغەمبەرەکەی بەڕاستیی و وەک خۆی هێناوەتەدی کە دەفەرمویّت: بەم زوانە ئێوە بە هەموو ئارامیی و ئاسوودەییەکەوە بەویستی خوا دەچنە ناو مزگەوتی حەرامەوە (مەککەوە)و (وە عەمرە بەجێدێنن) سەرتان دەتاشن یا کورت دەکەنەوە بێئەوەی ترس و بیمتان لە کەس هەبێت، جا ئەوەی ئێوە نایزانن خوا دەیزانێت، کە جگە لە سەرکەوتنی (مەککە) سەرکەوتنێکی نزیکی (کە گرتنی خەیبەرە) بۆ بڕیار داون و، پێتان دەبەخشێت.

﴿وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا﴿٢٣﴾﴾ هەرگیز دەربارەی هیچ شتێک و هیچ کارێک مەڵێ، من سبەی ئەو کارە دەکەم.

﴿إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّي لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾﴾ الكهف. (مەگەر بڵێی) ئەگەر خوا بیەوێ، ئەگەر ویستی پەروەردگاری لەسەر بێ، ئەگەر (ان شاء الله)ت لەبیرچوو هەرکاتێ بیرت هاتەوە بیلێ و یادی پەروەردگارت (فەرامۆش مەکە) (لەئەنجامدانی هەر کارێکدا) بڵێ: ئومێدەوارم ڕێنموونیم بکات تا بەو شێوەیەی پێی چاکەو لای پەسەندە جێبەجێی بکەم.

﴿وَءَاخَرُونَ مُرْجَوْنَ لِأَمْرِ ٱللَّهِ إِمَّا يُعَذِّبُهُمْ وَإِمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١٠٦﴾﴾ التوبة. کەسانێکی تریش هەن (لە بەجێ ماوەکان) ئەنجامی کردەوەیان دواخراوە بۆ فەرمانی خوا، یان سزایان دەدات (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر دووڕووی) یاخود تەوبەیان لێ وەردەگرێت (ئەگەر پەشیمان بن)، خوای گەورەش هەمیشە زاناو دانایە.

کەواتە هەمیشە دەبێت موسوڵمان لە ترس و هیواخواستن بێت بۆ ئیمان واتا لە نێوانی (خوف و رجاء) دا بێت.

کێ دەزانێت ئیمانی تەواوە پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ لەنێوانی خەوف و ڕەجاء دابێت، دەبێت من و تۆی داماو لەکام پلە دابین،

پێویستە مرۆڤ ئەگەر لێیان پرسیت کە موسوڵمانیت یان ئیماندار، پێویستە بڵێیت هیواخوازم لە ئیمانداران بم و إن شاء الله لە موسوڵمانان دەبم.

﴿۞ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ بِٱلۡحَقِّ إِذۡ قَرَّبَا قُرۡبَانٗا فَتُقُبِّلَ مِنۡ أَحَدِهِمَا وَلَمۡ يُتَقَبَّلۡ مِنَ ٱلۡأٓخَرِ قَالَ لَأَقۡتُلَنَّكَۖ قَالَ إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلۡمُتَّقِينَ ٢٧﴾ المائدة. بەسەرهات و ڕووداوی دوو کوڕەکەی ئادەم (قابیل و هابیل) بۆ ئەو خەڵکەی بگێڕەوە کە بە ڕاستی ڕوویداوە کاتێ کە قوربانەیەکەیان کرد، لە یەکێکیان (کە هابیلە) وەرگیرا (کە لە سەر حەق بوو، لە خوا ترس بوو) وە لەوی تریان (کە قابیلە) وەرنەگیرا (چونکە ڕق ئەستورو لەخوا نەترس بوو) (کەچی قابیل بە هابیلی) وت: هەر دەتکوژم (هابیل لەوەڵامی هەڕەشەکەیدا) وتی: خوای گەورە تەنها لە پارێزکاران قوربانی و چاکە وەردەگرێت.

﴿ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ إِنَّ رَبَّكَ وَٰسِعُ ٱلۡمَغۡفِرَةِۚ هُوَ أَعۡلَمُ بِكُمۡ إِذۡ أَنشَأَكُم مِّنَ ٱلۡأَرۡضِ وَإِذۡ أَنتُمۡ أَجِنَّةٞ فِي بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمۡۖ فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ ٣٢﴾ النجم. ئەوانەی کە خۆیان دەپارێزن لە گوناهو تاوانە گەورەکان، جگە لە وردە گوناهان، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ، ئەی ئیماندار) چاوپۆشی زۆر فراوانە، چاک دەتان ناسێت، کاتێک کە ئێوەی لە زەویدا بەرپاکردووە، پێشتر ئێوە کۆرپەلەی بچوک بوون لە سکی دایکتاندا، خۆتان بەچاک مەزانن و خۆتان بە پاڵفتە دامەنێن، چونکە هەر خوا خۆی دەزانێ کێ تەقوای هەیەو پارێزکارە.



﴿وَٱلَّذِينَ يُؤۡتُونَ مَآ ءَاتَواْ وَّقُلُوبُهُمۡ وَجِلَةٌ أَنَّهُمۡ إِلَىٰ رَبِّهِمۡ رَٰجِعُونَ ٦٠﴾ المؤمنون. ئەوانەی کە لەو شتانە دەبەخشن کە پێمان بەخشیون وە دڵیان دەترسێ لە گەڕانەوەیان بۆ لای پەروەردگاریان (نەوەکو چاکەکانیانی لا پەسەند نەبێت).

کردار لە نێوانی ئەوەی کە خوای گەورە قبوڵی دەکات یان نایکات، تەنها پەروەردگار بڕیاری لەسەر ئەدات، بۆیە مرۆڤ هەمیشە دەبێت بە ئاوات و هیواخواستن و ترس و خۆشەویستی خوای گەورەدا بژی. خوای گەورە بە بەزەییەو بە ڕەحمە، بەڵام خاوەن عەزاب و سزایە کە زۆر ترسێنەر و بەسۆیە ئازارەکەی.

هیچ جۆرە بێ تاقەتی و بێزاری و ناخۆشی و پەستیەک دووچاریان نابێت و هیچ کات ئەوان لەو بەهەشتە دەرناکرێن.

﴿۞ نَبِّئۡ عِبَادِيٓ أَنِّيٓ أَنَا ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ٤٩﴾ ئەی پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ هەواڵ بدە بە بەندەکانم کە هەر من بە ڕاستی لێبوردەی میهرەبانم (بۆ باوەڕداران).

﴿وَأَنَّ عَذَابِي هُوَ ٱلۡعَذَابُ ٱلۡأَلِيمُ ٥٠﴾ الحجر. بێگومان هەر سزاو تۆڵەی منیش، سزاو ئازارێکی زۆر بە ئێشە (ئامادەم کردووە بۆ بێ باوەڕو سەرکەش و یاخییەکان).

کەواتە مرۆڤ هەمیشە لەنێوان سێ سیناریۆی ژیاندا دەژی.

یەکەم: خۆشەویستی خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ بەو خۆشەویستیەوە بەندایەتی و کاری چاکە دەکات، لەبەرئەوەی خوای گەورە داوای لێ کردووە لە ڕێگای پێغەمبەرەکەیەوە.

دووەم: بەهیـوای ئەوەی خـوای گەورە بیخـاتە بەهەشـت و پاداشـت لەسەر کردەوەکانی وەربگرێـت و لە کۆتاییـدا براوەبێـت و خۆشەویسـتی خوا بەدەست بهێنێت و داوای بەهەشتی لێ دەکات.

سێیەم: لە ترسی دۆزەخ و سزاکانی ڕۆژی دوایی، مرۆڤ خۆی لەئـاگری دۆزەخ دەپارێزێت لە سـزاکان و بەڵکـو خـوای گەورە ڕەحمـی پێبکـات لە ئاگری دۆزەخ بەدووری بگرێت.

## پۆل و پلەی ئیمان

لەناو ئەهلی سونەتدا چەسـپاوە کە ئـیمان پـۆل و پـلەیە و لەگەورەوە دەسـت پێـدەکات کە پیـادەی یەکتاپەرسـتییە هەتـاوەکو لابردنـی بەرد و خاشاک لە سەر ڕێگادا، ئەم پلە و پـایەی ئـیمان و پـۆلێن کـردنە بـۆ بەرزو نزمـی پـلەی ئـیمانەو خـاوەنەکەی پـلەی بەرز دەبێـتەوە لای خـوای پەروەردگار. بۆ بەدەستهێنانی پاداشت، هەر لە کردار بەلاشە و بەدڵ و بە زمان خاوەنەکەی دەخاتە پلەی بەرزی بەهەشتەوە.

خوای پەروەردگار لە قورئاندا لە زۆر جێگـادا باسـی ئەو پـلەو پایـانەی کردوە لەوانە سورەتی  البقرة ئایەتی ١٧٧ دا دەفەرمووێت:

﴿۞ لَّيْسَ ٱلْبِرَّ أَن تُوَلُّوا۟ وُجُوهَكُمْ قِبَلَ ٱلْمَشْرِقِ وَٱلْمَغْرِبِ وَلَـٰكِنَّ ٱلْبِرَّ مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ وَٱلْكِتَـٰبِ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ وَءَاتَى ٱلْمَالَ عَلَىٰ حُبِّهِۦ ذَوِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَـٰمَىٰ وَٱلْمَسَـٰكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَٱلسَّآئِلِينَ وَفِى ٱلرِّقَابِ وَأَقَامَ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَى ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَـٰهَدُوا۟ ۖ وَٱلصَّـٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ ۗ أُو۟لَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ صَدَقُوا۟ ۖ



﴿وَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُتَّقُونَ ١٧٧﴾ البقرة. چاکەو چاکەکاری و خواناسی بریتی نییە لە ڕووکردنە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا (چونکە جولەکە زۆر لەسەر گۆڕانی قیبلە دوان و پڕوپاگەندەی زۆریان کرد)، بەڵکو چاکە بریتییە لەو کەسەی کە باوەڕی هێناوە بەخواو بە ڕۆژی دوایی و بە فریشتەکان و بە کتێبەکان و بە پێغەمبەران، هەروەها ماڵ و سامانی دەبەخشێ، هەرچەندە خۆشەویستە، بە خزمان و هەتیوان و هەژاران و ڕێبواران و ئەوانەی کە داوای دەکەن بەناچاری بۆ ئازاد کردنی گەردنەکان لە بەندەیی، هەروەها نوێژەکان بە چاکی ئەنجام دەدات، زەکات لە ماڵ و سامانی دەردەکات و هەر پەیامێک ببەستێ وەفای پێ دەکات و دەیباتە سەر، ئەوانەش دەگرێتەوە کە خۆگرن و لەکاتی نەداری و هەژاری و نەخۆشی و ناخۆشی و کاتی جەنگ و شەڕو شۆڕدا، ئا ئەو جۆرە کەسانە ڕاست دەکەن و هەر ئەوانەن پارێزکارو خواناس و دیندارەکان.

که ئەم ئـایەتە کـۆکەرەوەی زۆربەی پـۆل و پـایەو پلەکـانی ئـیمانە کە بریتییە لە:

- ئیمان بەخوای پەروەردگار.

- ئیمان بەڕۆژە دوایی.

- ئیمان بە فریشتەکان.

- ئیمان بە کتێبو ئاسمانییەکان.

- ئیمان بە پێغەمبەران.

- بەخشینی سەروەت و سامان.

بەئیخلاس و پاکی لەپێناوی خوادا و بـۆ ئەو شـەش پـۆلە لە ئـایینەکەدا باسکراوە.



- بەجێهێنانی نوێژ.

- دانی زەکات.

- بەوەفایی بەرانبەر بە گفت و پەیمان.

- ئـــارامگرتن لەکـــاتی نـــاڕەحەتی و ئـــازار و ئەشـــکەنجەو قورسییەکاندا..هتد.

هەروەهـــا لە ســـورەتی (المؤمنـــون ئەیەتـــی ١-١١)دا خـــوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿قَدۡ أَفۡلَحَ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ١﴾ بەڕاستی ئیمانداران سەرکەوتوو سەرفەرازن.

﴿ٱلَّذِينَ هُمۡ فِي صَلَاتِهِمۡ خَٰشِعُونَ ٢﴾ ئەوانەی کە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ و دڵ ئارام و دڵ دامەزراون و ترسی خوا لە دەروونیاندا هەیە.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَنِ ٱللَّغۡوِ مُعۡرِضُونَ٣﴾ ئەوانەی کە لە گوفتاری بێ سوودو کرداری نابەجێ و بێهودە خۆیان دوورەپەرێز دەگرن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِلزَّكَوٰةِ فَٰعِلُونَ٤﴾ ئەوانەی کە زەکاتی ماڵیان دەردەکەن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ٥﴾ ئەوانەی کە داوێنی خۆیان پاک ڕادەگرن و خۆیان لە شەرواڵ پیسی دەپارێزن و کاری جوت بوون ئەنجام نادەن.

﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ٦﴾ جگە لەگەڵ هاوسەران و کەنیزەکانیاندا نەبێت، ئەوە جێگەی لۆمەو سەرزەنشت نییە، (لە بارودۆخی نائاسایدا بەهۆی جەنگەوە ئافرەتانی موسوڵمان دەکەونە دەست دوژمنان و دەستدرێژی بێ سنوور دەکرێتە



سەریان، دوور نییە ئافرەتانی دوژمن نەکەوێتە دەست ئیمانداران، ئەو کاتە تەنها یەک کەس دەبێتە هاوسەری و، بەڕێزەوە ڕەفتاری لەگەڵ دەکات). ئەمەش کاتێ ئەکرێت کە دوژمن ئەو کارە بکەن لەگەڵ ئافرەتانی موسڵمان و بۆ وەستاندن و گێڕانەوەیان لەو ڕەفتارەیان ئەکرێت. ئەگینا بژاردەی یەکەم نییە.

﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ٧﴾ ئەوەی جگە لەو سنوورە دیاریکراوە، ڕێگەو ڕێبازی تر بگرێتە بەر، ئەو جۆرە کەسانە بە یاخی و لە سنوور دەرچوو دەژمێردرێن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَـٰنَـٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ٨﴾ هەروەها ئەوانەی کە چاودێری ئەمانەت و پەیمانەکانیان دەکەن و خیانەت و فێڵ ناکەن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمۡ يُحَافِظُونَ٩﴾ ئەوانەی کە پابەندی نوێژەکانن و لەکاتی خۆیدا بەڕێک و پێکی ئەنجامی دەدەن.

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡوَٰرِثُونَ١٠﴾ ئا ئەوانە میراتگران و خاوەنانی (بەهەشتن).

﴿ٱلَّذِينَ يَرِثُونَ ٱلۡفِرۡدَوۡسَ هُمۡ فِيهَا خَـٰلِدُونَ ١١﴾ المؤمنون. ئەوانە دەبنە خاوەنی بەهەشتی فیردەوس (کە بەرزترین و بەنرخترین بەهەشتە) بۆ هەمیشە ژیانی نەبڕاوەی تیادا دەبەنە سەر.

هەروەها لێرەدا باسی کۆمەڵێکی تر لە پۆل و پلەکانی ئیمان دەکات وەکو

- گەردن کەچی لە نوێژدا (خشوع).

- وازهێنان لە گاڵتەوگەپی بێماناو خراپ.

- پاراستنی پاش و پێش لە تاوانی زینا.

- تەزکیەی نەفس.

- پاراستن و چاودێری ئەمانەت.

- بەوەفا بەرانبەر پەیمان و کردار.

- پاراستنی نوێژەکان.

هەروەها لە سورەتی المعارج ئایەتی ١٩-٣٤ خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿۞ إِنَّ ٱلْإِنسَٰنَ خُلِقَ هَلُوعًا﴿١٩﴾﴾ بەڕاستی (زۆربەی ئینسانەکان) بە شپرزەیی و تەنگەتاوی دروستکراون.

﴿إِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ جَزُوعًا﴿٢٠﴾﴾ هەرکە توشی ناخۆشی و (هەژاریی و کەمدەستی و نەخۆشی.هتد) دەبێت، بێزارە دەم بە هاوارە.

﴿وَإِذَا مَسَّهُ ٱلْخَيْرُ مَنُوعًا﴿٢١﴾﴾ کاتێکیش تووشی خێرو بەرەکەت دەبێت، دەستی دەنوقێنێت و قەدەغەی چاکە دەکات.

﴿إِلَّا ٱلْمُصَلِّينَ﴿٢٢﴾﴾ جگە لە نوێژگەران (کە بەهۆی ئیمان و باوەڕیانەوە بارودۆخ نایان گوڕێت)

﴿ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ﴿٢٣﴾﴾ ئەوانەی لە سەر نوێژەکانیان بەردەوامن و (هەرگیز پشت گوێی ناخەن).

﴿وَٱلَّذِينَ فِيٓ أَمْوَٰلِهِمْ حَقٌّ مَّعْلُومٌ﴿٢٤﴾﴾ هەروەها ئەوانەی کە مافێکی ئاشکراو دیاریکراو لە سامانیاندا هەیە (بۆ جیهادو تێکۆشان)



﴿لِّلسَّآئِلِ وَٱلۡمَحۡرُومِ۝٢٥﴾ هەروەها بۆ هەژارو نەداران (بێ منەت، وە بەڕێزەوە پێشکەشیان دەکەن)

﴿وَٱلَّذِينَ يُصَدِّقُونَ بِيَوۡمِ ٱلدِّينِ۝٢٦﴾ ئەوانەی کە بڕوایان هەیە و دڵنیان کە ڕۆژی قیامەت بەرپا دەبێت.

﴿وَٱلَّذِينَ هُم مِّنۡ عَذَابِ رَبِّهِم مُّشۡفِقُونَ۝٢٧﴾ (بۆیە) لە سزای ئەو ڕۆژە ترس و بیمیان هەیە

﴿إِنَّ عَذَابَ رَبِّهِمۡ غَيۡرُ مَأۡمُونٖ۝٢٨﴾ بەڕاستی سزای پەروەردگاریان (حەق نییە) کەس لێی ئەمین بێت.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِفُرُوجِهِمۡ حَٰفِظُونَ۝٢٩﴾ هەروەها ئەوانەی کە داوێن پاکن و خۆیان لە (زینا) دەپارێزن.

﴿إِلَّا عَلَىٰٓ أَزۡوَٰجِهِمۡ أَوۡ مَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُهُمۡ فَإِنَّهُمۡ غَيۡرُ مَلُومِينَ۝٣٠﴾ مەگەر لەگەڵ هاوسەرەکانیاندا یان کەنیزەکەکانیان (کە بەهۆی بارودۆخی تایبەتەوە هەبوو)، ئەوانە لۆمەکراو نابن.

﴿فَمَنِ ٱبۡتَغَىٰ وَرَآءَ ذَٰلِكَ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡعَادُونَ۝٣١﴾ جا ئەوەی بێجگە لەو حاڵەتانە ڕێگەی تر (بۆ تێر کردنی ئارەزووەکانی)، ئەوانە لە سنوور ترازاوەکانن.

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ لِأَمَٰنَٰتِهِمۡ وَعَهۡدِهِمۡ رَٰعُونَ۝٣٢﴾ هەروەها ئەوانەی کە ئەمانەت دەپارێزن و پەیمان دەبەنە سەر.

﴿وَٱلَّذِينَ هُم بِشَهَٰدَٰتِهِمۡ قَآئِمُونَ ۝٣٣﴾ ئەوانەی کە پابەندی شایەتەکانین دەبن و (لێی پاشگەز نابنەوە).

﴿وَٱلَّذِينَ هُمۡ عَلَىٰ صَلَاتِهِمۡ يُحَافِظُونَ۝٣٤﴾ المعارج. ئەوانەی کە پارێزگاری نوێژەکانیان دەکەن و (لە کاتی خۆیدا ئەنجامی دەدەن).

لێرەدا هەندێکی دووبارە بۆتەوەو هەندێکی تریشی بۆ زیاد کردوە وەکو ترسان لە ڕۆژی سزاو ڕاستگۆیی و شاهیدی دانی ڕاستی پاشان لە سورەتی التوبة ئایەتی ١١٢ خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ٱلتَّـٰٓئِبُونَ ٱلۡعَـٰبِدُونَ ٱلۡحَـٰمِدُونَ ٱلسَّـٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّـٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَـٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ۝١١٢﴾ التوبة. (جا ئەوانەی ئەو مامەڵەیە دەکەن پێشتر بەم سیفەتە پیرۆزانە خۆیان ڕازاندۆتەوە): تەوبەکارن و لەهەڵەکانیان پەشیمانن، خواپەرستن (لە هەموو هەڵس و کەوتیاندا)، سوپاسگوزارن (لەسەر هەموو نازو نیعمەتێک)، گەڕۆکن (لەسەر زەویدا، ئەندێشەو بیرو هۆش بەکاردەهێنن بۆ بیر کردنەوە لە بونەوەرو دەوروبەر)، سوژدەبەرو کڕنوشبەرو نوێژ خوێنن، فەرماندەرن بەهەموو چاکەیەک، قەدەغەی خراپەو هەموو نادروستیەک دەکەن و پارێزەرن بۆ سنوورەکانی خواو قەدەغەکراوەکانی، ئینجا مژدە بدە بەئیمانداران (ئەوانەی ئەو سیفاتانە لە خۆیاندا دەهێننە دی).

لە سورەتی الفرقاندا ئایەتی ٦٣-٧٧ خوای پەروەردگار زیاتر باس لە تەوبە و سیفاتی ئیمانداران دەکات و دەفەرموێت:

﴿وَعِبَادُ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلَّذِينَ يَمۡشُونَ عَلَى ٱلۡأَرۡضِ هَوۡنٗا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ ٱلۡجَٰهِلُونَ قَالُواْ سَلَٰمٗا ۝٦٣﴾ بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەنە کە زۆر بە سەلاریی بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش کە نەفامان (بە قسەو قسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان دەبن) دەڵێین: سڵاو (خۆیان لە شەڕیان دەپارێزن)



﴿وَٱلَّذِينَ يَبِيتُونَ لِرَبِّهِمۡ سُجَّدًا وَقِيَٰمًا ٦٤﴾ ئەوانەی کە شەوگار بۆ پەروەردگاریان وەستاون و بە سوژدە و (نوێژ) دەیبەنەسەر

﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا ٱصۡرِفۡ عَنَّا عَذَابَ جَهَنَّمَۖ إِنَّ عَذَابَهَا كَانَ غَرَامًا ٦٥﴾ ئەوانەی کە دەڵێن: پەروەردگارا سزای ئاگری دۆزەخمان لێ لادەو (پەنامان بدە) چونکە سزاو ئازاری لەکۆڵ نابێتەوەو بەردەوامە (بۆ خوانەناس و یاخییەکان).

﴿إِنَّهَا سَآءَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا ٦٦﴾ بەڕاستی شوێن و نیشتەجێیەکی زۆر ناخۆش و ناسازە (ئاهو ناڵەو پەشیمانی بێ سنوور بۆ ئەو کەسەی لەناویدا گیردەخوات).

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَآ أَنفَقُواْ لَمۡ يُسۡرِفُواْ وَلَمۡ يَقۡتُرُواْ وَكَانَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ قَوَامٗا ٦٧﴾ (هەروەها بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەن کە کاتێک ماڵ و سامانیان دەبەخشن و خەرجی دەکەن، نە زیادەڕەویی تیا دەکەن و بەزایەی دەدەن، نە دەست نوقاوو ڕەزیلیشن، بەڵکو لەو نێوانەدان و (مام ناوەندین و لەشتی بەسوودا بەکاری دەهێنین).

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ وَلَا يَزۡنُونَۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ يَلۡقَ أَثَامٗا ٦٨﴾ ئەوانەی کە هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێک بۆ خوا بڕیار نادەن، کەسیش ناکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردبێت مەگەر لەسەر حەق و ڕەوا، هەروەها زینا ناکەن و (نزیکی ناکەون) ئەوەی ئەو جۆرە کارە (خراپانە) ئەنجام بدات تووشی سزاو ئازارو ڕیسوایی دەبێت.

﴿يُضَٰعَفۡ لَهُ ٱلۡعَذَابُ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَيَخۡلُدۡ فِيهِۦ مُهَانًا﴿٦٩﴾﴾ لە قیامەتیشدا ئازارو سزای بۆ چەند بەرابەر دەکرێت و بە زەلیلی و خەجاڵەتی و ڕیسواییەوە دەبێت ژیانی تیا بەرێتە سەر.

﴿إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٧٠﴾﴾ مەگەر ئەو کەسەی کە تەوبە بکات و باوەڕ بێنێت و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام بدات، ئەو جۆرە کەسانە خوا کارو کردەوە خراپەکانیان بۆ دەگۆڕێ بە چاکە، چونکە هەمیشەو بەردەوام خوا لێخۆشبوو و میهرەبانە (بەرانبەر خەڵکیی بە گشتی، ئەو جۆرە کەسانە بەتایبەتی).

﴿وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴿٧١﴾﴾جا ئەوەی کە تەوبە دەکات و کارو کردەوەی چاکە ئەنجام دەدات، ئەوە تەوبەکەی هەر لە پەروەردگار داواکردووە، ئەویش تەوبەی (ڕاست و دروست وەردەگرێت).

﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَشۡهَدُونَ ٱلزُّورَ وَإِذَا مَرُّواْ بِٱللَّغۡوِ مَرُّواْ كِرَامٗا ﴿٧٢﴾﴾ (بەندەکانی خوای میهرەبان) ئەوانەشن کە شایەتی ناحەق نادەن و ئامادە نین کە لە شوێنێکدا ئامادەبن کە شایەتی ناحەقی تیا ئەنجام دەدرێت، کاتێک کە بەلای گەمەو گاڵەو چەپۆکانی (نەفامان‌دا) تێ دەپەڕن، بە هێمنی و لەسەر خۆیی و سەربەرزییەوە تێدەپەڕن.

﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمۡ لَمۡ يَخِرُّواْ عَلَيۡهَا صُمّٗا وَعُمۡيَانٗا﴿٧٣﴾﴾ هەروەها ئەوانەشن کە کاتێ بە ئایەتەکانی پەروەردگاریان بێدارکرانەوە، هەروا بە کەڕیی و کوێری بەلایدا تێناپەڕن (بەڵکو تێدەفرکن و لێکی دەدەنەوەو پاشان پەیڕەویی دەکەن).



﴿وَٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبۡ لَنَا مِنۡ أَزۡوَٰجِنَا وَذُرِّيَّٰتِنَا قُرَّةَ أَعۡيُنٖ وَٱجۡعَلۡنَا لِلۡمُتَّقِينَ إِمَامًا﴿٧٤﴾﴾ ئەوانەشن کە دەڵێن: پەروەردگارا لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێ ببەخشە کە ببنە مایەی ڕووناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان، وە بمانکە بە پێشەوای پارێزکاران.

﴿أُوْلَٰٓئِكَ يُجۡزَوۡنَ ٱلۡغُرۡفَةَ بِمَا صَبَرُواْ وَيُلَقَّوۡنَ فِيهَا تَحِيَّةٗ وَسَلَٰمًا﴿٧٥﴾﴾ ئەو جۆرە کەسانەی (کە باسکران) پاداشتیان ژوورە (ڕازاوەو خۆشەکانی بەهەشتە) لەبەرانبەر خۆگرتن و ئارامگرتنیانەوە وە بەسڵاوو درووود پێشوازییان لێدەکرێت (بۆ هەمیشە دەحەوێنەوە تیایدا).

﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ حَسُنَتۡ مُسۡتَقَرّٗا وَمُقَامٗا﴿٧٦﴾﴾ لەناو ئەو بەهەشتەدا ژیانی کامەرانیی بەردەوام دەبەنە سەر، بەڕاستیی جێگەو ڕێگەو نیشتەجێییەکی خۆش و سازگارو ڕازاوەیە).

﴿قُلۡ مَا يَعۡبَؤُاْ بِكُمۡ رَبِّي لَوۡلَا دُعَآؤُكُمۡۖ فَقَدۡ كَذَّبۡتُمۡ فَسَوۡفَ يَكُونُ لِزَامَۢا﴿٧٧﴾﴾ الفرقان. پێیان بڵێ: (خەڵکینە) پەروەردگارم هیچ گوێتان پێنادات و نرختان بۆ دانانێت، ئەگەر دۆعاو نزاو خواپەرستیتان نەبێت، کەچی زۆربەتان هەر بەرنامەی (پەروەردگار) بەدرۆدەخەنەوە (ئەگەر بەردەوام وئیبنو) ئەوا سزاو تۆڵەی خوایی لە ئاییندەدا یەخەتان پێ دەگرێت و لەکۆڵتان نابێتەوە

هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت: ئـیمان ٦٠-٧٠ پۆل و پلەیە، باشترینی وتنی یەکتاپەرستیە و خوارترین پلە لابردنـی خۆڵ و خاشاک و دڕک و ئازارە لەسەر ڕێگا، پاشان فەرمـووی شـەرم کـردن بە شێکە لە پلەی ئیمان.

(عن أبي هريرة، قال: قـال رسـول اللـه صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: «الإيمـان بضـع وسـبعون - أو بضـع وسـتون - شـعبة، فأفضـلها قـول لا إلـه إلا اللـه، وأدناها إماطة الأذى عن الطريق، والحياء شعبة من الإيمان).[68]

ئەوانەی کە پێغەمـبەری خـوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ باسـی کـردووە دەچێتە خانەی کردار و گوفتار و ڕەفتار وەکو وتنی شایەتوومان و لابردنـی پیسی و بەرد و چیلکە وچەوێڵ لەسەر ڕێگـادا دەچێـتە خـانەی کـردار، وە شەرم کردن دەچێتە خانەی دڵ و دەروون.هتد.

ئیبن حەجەری عەسقەلانی دەفەرمووێت: (پۆل و پـلەی ئـیمان لە سـێ خانەدا جێی دەبینێتەوە کردار بە دڵ، کردار بە زمان، کردار بە لاشە).

خوای گەورە لە سورەتی الواقعةدا ئایەتی ١٠-١١ دەفەرمووێت:

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ ١٠﴾بەتایبەت) ئەوانەی کە پێشبڕکێیان دەکرد لەبەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوادا ئێستا وا لە ڕیزەکانی پێشەوەن (مەگەر خوا خۆی بزانێت چ نازو نیعمەتێکی بێ وێنەی بۆ ئامادەکردوون).

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ١١﴾ الواقعة. ئەوانە نزیکن لە پەروەردگاریانەوە.

هەروەها لە سورەتی النساء دا ئایەتی ٦٩دا دەفەرمووێت:

﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ٦٩﴾

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[68] رواه مسلم.



النساء. ئەوەی فەرمانبەرداری خواو پێغەمبەر بکات، ئا ئەوانە لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەبن (لە بەهەشتی بەریندا) خوا نازو نیعمەتی ڕژاندوە بەسەریاندا لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاو چاکان، ئای کە ئەوانە هاوەڵ و هاوڕێ و هاودەمێکی (بێ وێنەن).

پاشان لە سورەتی المجادلةدا ئایەتی ١١ دافەرمووێت:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَكُمْ تَفَسَّحُواْ فِى ٱلْمَجَـٰلِسِ فَٱفْسَحُواْ يَفْسَحِ ٱللَّهُ لَكُمْ ۖ وَإِذَا قِيلَ ٱنشُزُواْ فَٱنشُزُواْ يَرْفَعِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مِنكُمْ وَٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ دَرَجَـٰتٍ ۚ وَٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ ۝١١﴾ المجادلة. ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە ئەگەر لە دانیشتن و کۆبوونەوەکاندا پێتان وترا: ڕێ بدەن بە کەسانی ترو ئەڵقەی دانیشتنەکە فراوان بکەن بێ دوودڵی فراوانی بکەن، خوایش پاداشتی فراوانتان پێدەبەخشێت، خۆ ئەگەر پێتان وترا هەستن و جێگە چۆڵ بکەن، (بۆ پیاوماقووڵ و ڕیش سپی و گەورەکانتان) جێگە چۆڵ بکەن، بێگومان خوا ئەوانەی ئیمانیان هێناوە پلەو پایەی بەرزو بڵندیان پێدەبەخشێت، خوایش بە ئاگایە بەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: ٦٠-٧٠ پۆل و پلەیە گومانی تێدانییە کە خواو پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ باشتر دەزانن، ئەم پۆلێن کردنە و پلە بەندییە هەریەکەیان دەیان و سەدان لقی لێ دەبێتەوە، هەر زاناو بیرمەندێک بەگوێرەیی دانایی و زیرەکی خۆی پەی پێبردووە، لەوانە: ئیبن حەجەر عەسقەلانی، ئیمامی بەیهەقی، ئیبن بەطە) سەدەها زانای تر.

لێرەدا ئاماژە بە بەشێکی دەکەین کە زانایان ئاماژەیان پێ کردووە ئەوانیش بریتین لە: ئیمان بە خواو ڕۆژی دوایی و فریشتەکان و پێغەمبەران، بەڕاست زانین و دانپێدانان و باوەڕپێکردن بەوەی کە خواو

پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ناردوویانەو ڕازی بوون پێی، بە قەزا و قەدەری، هەرکەس ئەم ئیمانەی هەبوو ئەوا لەسەر ڕێی تەواوە و دوای ئەوە پلەکانی دەست پێدەکات کەوەک ئاماژەمان پێ دا دەبێت لە گوفتار و دڵ و ڕەفتاریدا ڕەنگ بداتەوە، کە نوێژ بکات و بەڕۆژوو بێ، زەکات بدات، ئەگەر توانی بچێت بۆ حەج، پارێزگاری لە نوێژی جەماعەت و بەتایبەت نوێژی جومعە بکات، بڕوات بۆ جیهاد، خۆی بشوات لە لەشگرانی و پیسی خۆی پاک بکاتەو، دەست نوێژ بەجوانی هەڵبگرێت، پاک و خاوێن بێت، لەگەڵ دایک و باوکی چاکە بکات، سیلەی ڕەحم بەجێبهێنێت، ڕەوشتی جوان بێت، لەکاتی هەڵەکردن زوو پەشیمان بێتەوە، بەدوای کاری چاکەوە بێت و چاکە کار بێت، لەگەڵ نزیک و خەڵکیدا بەگشتی، دانەوەی حەق بە ناحەق لێکراوان، ئاگاداری مافی منداڵ، مافی هەژاران، مافی ڕێبواران، مافی دراوسێ، مافی ژێر دەستەو خزمەتکار، فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگری لە خراپە، خۆشویستن لەبەر خوا و ڕق لێبوونەوە لەبەرخوا، لەگەڵ پیاو چاکان بوون و دوورکەوتنەوە لە پیاوخراپان، حوکم بەوەی خوا و پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ ناردوویانە، گوێڕایەڵی ئەمیر و سەرکردەکەت، گوێڕایەڵی زانا و عارف و خواناسان، ئامۆژگاری کردن، گوێگرتن بۆ ئامۆژگاری، تورەبوون لەبەرخوا، ڕازی بوون هەرلەبەر خوا، وەفا، پەیمان، ڕاستگۆیی لە گوفتار، وەفا کردن بەو خێرەی کە بڕیارت لەسەر یاوە واتا "نذر"، پاراستنی ئەمانەت، پاراستنی نهێنی، پاراستنی سەروەت و سامان و بەفیڕۆنەدانی، گەڕانەوەی قەرز بۆ خاوەنەکانی، دەستپاک و ڕاستگۆ لە کڕین و فرۆشتن، شاهیدی لە بازاڕدا و دادپەروەر و ڕاستگۆ لە هەموو شاهیدی دانێک.



پاراستنی میزان و شایەن، یادی خوا، لە تەسبیحات و تەهلیلە و تـۆبە و ئیستیغفار، لێخۆشـبوون لەکـاتی هەر هەڵەو خراپەیەکـدا و چـاکەکردن بە دوایدا، بە فیڕۆنەدانی کات، کرداری جوان و تەوبە کردن و گەڕانەوە بۆلای خـوای پەروەردگـار بەزوتـرین کـا، داوای لێخۆشـبوون لەتـاوان، نزاکـردن، ناسینی حەق و ئەهلی حەق، ناسـینی دادپەروەری و ئەهـلەکەی، ناسـینی خراپە و زوڵم و خەڵکەکەی، هەوڵدان بۆ چاککردنیان و یان دوورکەوتنەوە لێیان، پاراستنی سنوورەکانی خوای پەروەردگار، ڕۆنەچـوون لەڕای جیـاواز، هەوڵدان بۆ سوننەت و ئیزن وەرگرتن بـۆ میـوان و مـاڵان، نەچـوونە هـیچ ماڵێک بەبێ ئیزن و ئاگادار کردنەوە، وتنی ناوی خۆت لەکـاتی لێپرسـین و لە پشتی دەرگاوە، هەرگیز مەڵێ "منم" یاخود "خۆمانین"، سەلام کردن بە سڵاوی ئیسلام، پێش ئەوەی گوێت لەوان بێـت یـان سـەیریان بکەیـت زوو بیگەیەنە تا بزانێت ئەهلی ئیسلام و سەلامیت.

ئەگەر وترا مەیە ژوورەوە دەست بەجێ بگەڕێرەوە و یەکسەر جێگـاکە بەجێ بهێڵە.

دەبێت ئاگـاداری و پارێزگـاری لە تایبەتمەنـدی کـچەکەت، کـوڕەکەت، خوشکەکەت یان براکەت بکەیت، کە ویستت بچیتە ژوورەکەی دەبێـت لە دەرگاکەی بدەیت، دوورکەوتنەوە لە شەڕ و ئاژاوە، سووربون لە پاراسـتنی سـەروەرت و سـامانی خەڵکـی مەگەر لە ڕێگـای کەسـابەتەوە بێـت و بە ڕەزامەندی هەردوولا بێت، واتا فرۆشیار و کڕیار.

خۆپاراستن لە ماڵی هەتیوان و بێسەرپەرشتان بە زوڵـم لـێ نەکردنیـان، نە خـواردنەوەی شـەراب و مەی و جۆرەکـانی، خۆپاراسـتن لە خـواردن و خواردنەوەی حەرام، خۆپاراستن لە ڕیبا و سووبازی، خۆ پاراستن لە قومار و

جۆرەکانی، خۆپاراستن لە بەرتیل و ڕەشوە، خۆپاراستن لە بەدەستهێنانی سەروەت لە ڕێگای ناپەسەند.

خۆپاراستن لە بوختان، لە تاوانبارکردنی خەڵکی لە تۆمەتی شەرەف، خۆپاراستن لە پاکێتی داوێن پاکان و قسەنەکردن لە شەرەف و کەرامەتی خەڵکی، خۆپاراستن لە درۆکردن و قسە زۆر کردن.

خۆپاراستن لە شاهیدی درۆ و دانانی ناوونـاتۆرە ناشرین لە خەڵکی، خۆپاراستن لە جاسوسی، لە دووڕوویی، لە پەی پێبردنی خراپ بە خەڵکی و گومان دروستکردن لەسەرخەڵکی بەتایبەت خواناسان لە پیاو و لە ژن، خۆپاراستن و بەردەوام بوون لە دوورکەوتنەوە لە تاوان و گوێ پێنەدانی، خۆ پاراستن لە لوت بەرزی، لە فەخر کردن، لە ڕیایی و ئەیرەیی، لە خەڵک بەیەکدا دان و فیتنەیی کردن لە نێوانیاندا، لە لەخۆڕازی بوون، خۆپاراستن لە خۆشی و شادی زۆر، دەم پیسی و جنێو، بەگشتی خۆپاراستن لە حەرام و هەوڵدان بۆ حەڵاڵەکان.

ئەمە بەشێکی کەم بوو کە زانای پایەبەرز ئیبن و بەطە ئاماژەی پێکردووە، هەروەها ئیبن و حەبان یەکەم زانا بوو گرنگی داوە بەم باسە و چەند بەرگی لەسەر نوسیووە، بەڵام بێجگە لەوەی زانایان لێیان وەرگرتووە خوودی کتێبەکانی لەناوچوون و وون بوون، جەنابیان کردوویانە بە سێ بەشەوە.

کرداری دڵ، گوفتار، کردار بە لاشە.

لەباسی خانە و پۆل و پلەی ئیمان، ئیمام ئەبی عەبدوڵڵا حەلیمی شافیعی - ڕەحمەتی خوای لێ بێت- کۆنترین نوسەرە لەدوای ئیبن حەبان نووسیوویەتی کە تۆی خوێنەر لەوە تێبگەیت بواری عەقیدە کام زانایە



نـزیکتر بـوو لە سـەردەمی پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و هـاوەڵان و شــوێنکەوتوان، ئەوە وەردەگــرین بەو پێــیەی ئەوان شــارەزاتر بــوون لە بوارەکانی عەقیدە، بەڵام لەبوارەکانی تری زانستی وەکو فیکر و تەفسـیری ئایینە مەتەشابیهەکان باشترە زانایانی نوێ وەربگیرێت..هتد.

کــورت و پوخــت ئەوەی باســی مەحــکەمە، واتــا کــۆنکرێتە ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ سەلەفمان، ئەوەشی کە زیـاد لە مانـایەک هەڵـدەگرێت و پەیوەنـدی بە بیروبـاوەڕەوە نـیـە، پانتـایی زۆری هەیە، ئـایین بەگشـتی بەرفراوانە لە ڕووی زانستەکانیەوە ئەوە کـەڵکی تـەواو لـە زانایـانی دواتـرو ئێستا وەرئەگرین.

دەگەڕێینەوە ناو باسەکەمان و بـۆ کتێـبە نایـابەکەی حیلمـی کە سـاڵی ٤٠٣ی کۆچی وەفاتی کردووە و قازی و دادوەریش بووە.

کتێبەکەی ناوی (المنهج في شـعب الإيـمان)ە کە خـانە و پـۆلی ئیمانـی کردووە بە ٧٧ بەشەوە.

ئەوانیش ئەمانەی خوارەوەن:

ئـیمان بەخـوای پەروەردگـار، ئـیمان بە پێغەمـبەران -علـیهم السـلام-، فریشتەکان، کتێبەکان، قەزاو قەدەر بە خێر و شەڕی، ڕۆژی دوایی، گـۆڕ و بەرزەخ، لێپرسـینەوە و میـزان، بەهەشـت و جەهەنەم و پـردی "صـیراط"، خۆشەویسـتی خـوا، بیرکـردنەوە لە دروسـتکراوەکان، ترسـان لە خـوا و لە هەرەشەکانی، نزا و ئادابەکانی و کاتەکـانی، تەوەکـول و پشـت بەسـتن بە خـوا لە بوارەکـانی ناخۆشــی و نـاڕەحەتی ژیـان، خۆشویسـتنی پێغەمـبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و هاوەڵان و ئالوبەیت، بەگەورە ڕاگرتنی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و ڕێزی زۆر نواندن بـۆی، بەخیـل نەبـوون لەدانـی

قەرزبە خـاوەن پێداویسـتی، وەرگرتنـی زانسـت و زانیـاری، بڵاوکـردنەوەی زانست و زانیاری، خوێندنی قورئانی پیرۆز و ئادابەکـانی، پـاک و خـاوێنی، نوێژ، خێر و سەدەقات، ڕۆژوو، ئیعتیکاف، دروشـمەکان بەگشـتی لە حەج دا، جیهـــاد، سەنگەرنشـــینی لە پێنـــاوی خـــوادا، خـــۆڕاگری لەکـــاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، دانی خومس لە غەنیمەت، ئازاد کردنی کۆیلە و عەبــد لەپێنــاوی خــوادا، دانەوەی قەرز و خۆپــاککردنەوە لە قەرزاری عیبادەت، وەفا بە پەیـمان، شـوکرانە بژێـری نیعمەتەکـانی خـوا، پاراسـتنی زمـان لە خراپەکـاری و شـتی بێمانـا، پاراسـتنی ئەمـانەت و گەڕانەوەی بـۆ خاوەنەکەی، خراپە نەکردن لەگەڵ خەڵیکدا، خۆپاراستن لە زینـا، پاراسـتنی ماڵی خەڵکی و بەدەسـت پـاکی مـانەوە، خـواردن و خـواردنەوەی حەڵاڵ، بەکارهێنانی قاپ و قاچاغی حەڵاڵ، لەبەرکردنی جلوبەرگی حەڵاڵ و شیاو و وازهێنان لە گاڵتەوگەپی بێ ماناو بێسوود، نەکردنی زیادەڕۆیی لە خەرج کردن و خواردنی ماڵی خەڵکی بە زوڵم، وازهێنان لە بەغیلی و حەسـوودی و ئێرەیی بردن، پاراستنی شەرەف و ناموسا خەڵکی و واز هێنان لە باسێک کە پەیوەنــدی پێــتەوە نیــیە، دڵسـۆزی لەکــار و وازهێنــان لە ڕیابــازی، خۆشحاڵی بەکاری چاکە و دڵتەنگی بەکاری خراپە، چارەسەری تاوان کردن بە تۆبە کردن، سەربڕین و قوربانی کردن لە پێناوی خوادا، گوێڕایەڵی باشە و چــاکەی ئەمیــرەکەت، دەسـتگرتن بە کـۆمەڵی موسـوڵمانان، دادوەری نەکردنی خەڵکی بە قسەی خەڵکی و وتی وتی، فەرمان بە چاکە و بەرگری لە خراپە، هاوکـاری کـردن لەسـەر چـاکە و تەقـوا و خۆپـارێزی و یـارمەتی مەزڵـوم و لێقەومـاوان، شـەرم کـردن، چـاکە کـردن لەگەڵ دایـک و بـاوک، سیلەی ڕەحـم بەجێهێنـان، خـواردنەوەی ڕق و کیـنەو لە پێنـاوی خـوادا و ڕەوشـت جـوانی و هێمنـی و لەسـەرخۆیی و تەوازوع و خـۆ بەکەم زانـی، چاکەکردن لەگەڵ خزمەتکارو کۆیلەدا، چاکەکردن لەگەڵ هاوسەر و منداڵ



و دانــی مافەکانیــان، نزیکبــوونەوە لەخەڵکــی خوانــاس و چاکەکــار و ســڵاولێکردنیان، وەڵامــدانەوەی ســەلام، بەســەرکردنەوەی نەخــۆش و لێقەومـاوان، مـافی گەورە بەسـەر بچـوکەوە و خۆشەویسـتی و ڕەحـم لە نێوانیاندا، نوێژکردن لەسەر مردووی ئەهلی قیبلە، وتنی الحمد الله لەکاتی پژمین دا و وەڵامدانەوە، دوورکەوتنەوە لە کافر و خوانەناس و خراپەکاران و ڕق لێبوونەوەیان، ڕێزی دراوسێ و دانـی مافەکـانی، ڕێزگرتنـی میـوان و مافەکانی، داپۆشینی عەیب و عاری خەڵکی، ئارامگرتن لەسـەر موسـابەت، زوهد و خـۆگرتنەوە لە خۆشـی ژیـان، وازهێنـان لە دڵپیسـی، وازهێنـان لە دەمپیســی و باســی شــەرەفی خەڵکــی بە گــاڵتە و گەپ، دڵفــراوان و بەخشندەیی، چاکەکاری لەنێوانی خەڵکیدا، بۆ خۆت چیت پێخۆشە بۆ بـرا موسوڵمانەکەشت پێت خۆش بێت، لابردنی بەردو خۆڵ و خاشـاک لەسـەر ڕێگادا.

ئەم زانا بەڕێزە پۆلێنی کردووە بەم شێوەیە جا تـۆی خـوێنەر بە پـۆل و پلەکانـدا سـەربکەوە تـا خـوای پەروەردگـار فیردەوسـی بەرزت پێشـکەش بکات، خوای گەورە لەوانە بمانگێڕێت کە دەبنە خاوەنی فیردەوس، آمین.

## سێ پلەکەی ئیمان

پێشتر باسی پۆل و پلەکانی ئیمانمان کرد کە لە زاراوەی "شعب الإيمان" وەرمانگرتبوو، بۆیە وشەی پۆلمـان خسـتە پـێش پـلەکە لە باسـی ڕابـردوودا چونکە باسەکە لە پـۆلێنکردنی بەرز و نزمـی پـلە و پۆلەکـانی ئـیمان بـوو، بەڵام ئەم سێ پلەیە جیاوازە وەکـو شـوعەبی ئـیمان نییە، خـاوەنەکەی بە



هۆی کردن و نەکردنییەوە پلەی بەرز بێتەوە یاخود دابەزێت، یان خەڵکی بەگشتی تێیدا جیاوازن لە ئیماندا.

## پلەی ئیمان کە خەڵکی تێیدا سێ جۆرن

- ئیمانی بنەڕەتی و چاکەی هەیە، بەڵام تاوانی زۆرترە (ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ).

- ئیمانێک کە چاک و خراپی تێکەڵ کردوە و باشەی زیاترە (وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ).

- ئیمانێک کە لە دونیا هیچی ناوێت و ئەیەوێت لە هەمو تاوانێک بە دووربێت (سَابِقٌ بِالْخَيْرَاتِ).

هەرچەندە لە ئێستادا بۆ من ئاسان نییە بتوانم وشەی کوردی بۆ ئەم زاراوە عەقیدەییانە بدۆزمەوە لەوانەیە وەکو خۆی واتا نەدات بە دەستەوە، بۆیە ناچارم زاراوە بنەڕەتییەکان وەکو خۆیان دابنێمەوە، پاشان شیکاری بۆ بکەین تا لێی تێدەگەین، هەموو ئەم سێ پلەی ئیمانە زانایان لە سورەتی فاطر ئایەتی -٣٢- کۆیانکردۆتەوە کە دەفەرمووێت:

﴿ثُمَّ أَوْرَثْنَا ٱلْكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصْطَفَيْنَا مِنْ عِبَادِنَا ۖ فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ وَمِنْهُمْ سَابِقٌۢ بِٱلْخَيْرَٰتِ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلْفَضْلُ ٱلْكَبِيرُ ﴿٣٢﴾﴾ فاطر. پاشان کەسانیکمان کردە خاوەن و ڕاگەیەنەری ئەم قورئانە کە هەڵمان بژاردوون لە بەندەکانمان، هەیانە ستەمی لەخۆی کردووە (چاکەی کەمەو گوناهی زۆرە)، هەشیانە مام ناوەندییە، هەشیانە زۆر گەرم و گوڕە کە چاکەکاریدا بە ویست و (یارمەتی) خوا، (ئا ئەو



هەڵبژاردنەو ئەو گەرم و گوڕییە لە چاكەكاریدا) ڕێزو خەڵاتێكی زۆر گەورەیە.

﴿ثُمَّ أَوۡرَثۡنَا ٱلۡكِتَٰبَ ٱلَّذِينَ ٱصۡطَفَيۡنَا مِنۡ عِبَادِنَاۖ..﴾ ئەم بەشەی مەبەست ئوممەتی پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ, پاشان هەر لە ئایەتەكەدا دەفەرموویێت: فَمِنْهُمْ ظَالِمٌ لِّنَفْسه، ئەمە جۆری یەكەمە كەناونراوە بە بنەڕەتی ئیمان(أَصل الإيمَان)، خاوەنەكەی وازی لە هەندێك واجبات و فەرز هێناوە لە نێوانی كردن و نەكردنیدا زیادە ڕۆو كەمتەرخەمە و گوێ بە حەڵاڵ و حەرام نادات، خاوەنەكەی دەكەوێتە بەر سزای خوای پەروەردگار، بەڵام دانی ناوە بە یەكتاپەرستی خوای پەروەردگار و ئەسڵی ئیمانی هەیە، بەڵام نەگەیشتوە بە پلەكانی تر چ ئەوەی كە خراپەی هەیەو چاكەی زۆرترە یان ئەوەی كە هیچی لە دونیا ناوێت و ئەیەوێت لە تاوان بەدور بێت.

بەشی دووەم لە ئیمان لە ئایەتەكەدا دەفەرموویێت: وَمِنْهُم مُّقْتَصِد.

ئەم جۆرە لە پلەی ئیمان بریتییە لەو كەسانەی كە ئەوەی واجباتەو لەسەری فەرزە دەیكات، بەڵام پەیوەست نییە بە سونەت و كاری چاكەخوازی و بانگەواز و گوێ بە مەكروهەكان نادات و وردە تاوانیش ئەكات، ئەمجۆرە خۆی لە پلەی ئیمانێكدا ئەبینێتەوە كە چاك و خراپی تێكەڵ كردوە و وەلێ باشەی زیاترە (وَمِنْهُم مُّقْتَصِدٌ).

﴿.. وَمِنۡهُم مُّقۡتَصِدٞ وَمِنۡهُمۡ سَابِقُۢ بِٱلۡخَيۡرَٰتِ بِإِذۡنِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَضۡلُ ٱلۡكَبِيرُ٣٢﴾ ئەم جۆرە باشترین ئیماندارانن و كە ئەوەی لە توانایاندا بێت دەیكەن و لە هەوڵی چاكەكاری و خواناسیدان، كە خوای پەروەردگار لە سورەتی الواقیعەدا ئایەتی ٧-١١ بە كۆمەڵی چەپ و ڕاست و پێشەنگەكان

ناوی بردوون یاخود بە نزیکەکان لە خوای پەروەردگار (المقربون) ناوی بردوون و دەفەرمووێت:

﴿وَكُنتُمْ أَزْوَاجًا ثَلَاثَةً۝٧﴾ جا ئەو کاتە ئێوە (نەوەکانی ئادەم) دەبنە سێ دەستەوە.

﴿فَأَصْحَابُ ٱلْمَيْمَنَةِ مَآ أَصْحَابُ ٱلْمَيْمَنَةِ۝٨﴾ دەستەی ڕاستان (دەردەکەون)، جا چووزانی ئەوانە لە چ خۆشییەکدان؟!

﴿وَأَصْحَابُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ مَآ أَصْحَابُ ٱلْمَشْـَٔمَةِ۝٩﴾ هەروەها دەستەی چەپ و لارو وێرەکانیش، جا چووزانی ئەو شومانە لە چ سەرگەردانییەکدان؟!

﴿وَٱلسَّٰبِقُونَ ٱلسَّٰبِقُونَ۝١٠﴾)بەتایبەت) ئەوانەی کە پێشبڕکێیان دەکرد لەبەدەست هێنانی ڕەزامەندیی خوادا ئێستا وا لە ڕیزەکانی پێشەوەن (مەگەر خوا خۆی بزانێت چ نازو نیعمەتێکی بێ وێنەی بۆ ئامادەکردوون).

﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۝١١﴾ الواقعة. ئەوانە نزیکن لە پەروەردگاریانەوە.

کەواتە هەر سێ جۆرەکەی پلەی ئیمان، لە مرۆڤی موسوڵمان و ئیمانداردا کۆدەبێتەوە وەکو پێشتر ئاماژەمان پێداوە، وشەی ئیمان واتای هەمووی دێنێت واتا مانای هەموو بەندایەتیەکانە و هیچ کامیان خاڵی نین لە کەل و کسوری لەبەرئەوەی مرۆڤ مرۆڤە و کەس مەعصوم نیە جگەلە پێغەمبەران.

ئەویش بە گوێرەی کردن و نەکردنی خاوەنەکەی تێیدا پاداشت و سزا وەردەگرێت، مەرجی ئیمان دانامەزرێت بە سێ پایەکەی نەبێت (کردار،



گوفتار و نیەت لە دڵ)دا، ئەمانە هەمـو وبەیەکەوە بنەڕەتـی ئـیمان پێـک دەهێنن.

ئەو بنەمایانەی لە ئەحکامدا کە لەبنەڕەتی ئـیمان بە نەکردنـی مـرۆڤ تووشی کوفر و کافر بوون دێنێت، پێویسـتی بە تەوبە و گەڕانەوەیە وەکـو زینـاکردن، یـاخود مەی خـواردنەوە یـان دەسـتدرێژی و هەوڵـدان بـۆ خراپەکاری لەگەڵ دراوسێ.

ئەم کـــوفرانە نـــاونراون بە (کـــوفری دون کـــوفر) کە پێغەمـــبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویێت: عن أَبِي هريرة -رضى الـله عـنه- (أن النَّبيّ صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓاٰلِهِوَسَلَّمَ قَالَ: واللَّـهِ لا يُـؤْمِنُ، واللَّـهِ لا يُـؤْمِنُ، واللَّـهِ لا يُؤْمِنُ، قِيلَ: مَنْ يا رسولَ اللَّهِ؟ قَالَ: الَّذي لا يأْمنُ جارُهُ بَوَائِقَهُ).[٦٩]

ئیماندار نییە ئەو کەسەی پارێزگاری و ئاسایش بۆ دراوسـێکەی دابـین نەکات.

لاَ يَؤْمِنُ أَحَدُكمْ حَتَّى يُحِبَّ لِأخيهِ مَا يُحِبُّ لِنَفْسِهِ، صحيح البخارى

ئیماندار نییە ئەو کەسەی چی پێخۆشە بۆ خـۆی بـۆ بـرا ئیمانـدارەکەی پێی خۆش نەبێت

هەروەها لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموویێت: لا يَزْني الزّاني حينَ يَـزْني و هُو مؤمنٌ

زیناکار لەکاتی زیناکردنیدا ئیمانی نییە.

هەروەها دەفەرموویێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٦٩] متفق عليه.

ولا يسرق حين يسرق وهو مؤمن

لەم بارەیەوە فەرمووده زۆرە ئەم تاوانانە خاوەنەکەیان کافر ناکات واتا ناچێتە دەرەوەی ئیسلام و ئیمانداری، بەڵکو تاوانەکە زۆر گەورەیە لە پلەی کوفردایە، واتا وازی لە تاعەتی خوا هێناوە. یانی ڕوونتر ئەوەیە کە ئیمانی ئەو جۆرە کەسانە کامڵ نییە و کەل و کسوری گەورەی تێکەوتووە و ئەبێت زوو فریای تۆبە بکەوێت هەربۆیەش هەندێک لەو تاوانانە لەبەر گەورەییان سزای دونیایی هەیە ئەگەر دەسەڵات بە شەریعەت حوکم بکات.

بەڵام ئەوەی کە پەیوەندی هەیە بە ئەصڵی ئیمان وەکو نموونەی نوێژ، ئەوە خاوەنەکەی کافر دەکات بە نەکردنی و تەرک کردنی جا بەهەر هۆکارێک بێت، واتا هۆکاری تەمەڵی یان بڕوا پێ نەبوون، یان هەر هۆکارێک تەرکی کردبێت، پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِۦ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: إن بين الرجل، وبين الكفر ترك الصلاة. رواه مسلم عن جابر بن عبدالله.

ئەوەی کە مرۆڤی ئیماندار لە کافر جیادەکاتەوە وازنەهێنانە لە نوێژ.

یاخود حوکم نەکردن بە شەریعەتی خوا و حوکم بە طاغوت و نەدانی زەکات، خوای گەورە دەفەرمووێت:

سورەتی النساء ئایەتی ٦٥

﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ النساء. نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانە ئیمان وباوەڕیان دامەزراو نابێت هەتا لە



هەموو کێشەیەکدا کە ڕوو دەدات لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ ناڕەزاییەک دروست ببێت بەرانبەر ئەوەی کە دادوەریت لەسەر کردووە، و دەبێت بە تەواوی تەسلیم بن و ڕازی بن.

سورەتی النساء ئایەتی ٦٠-٦١

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزۡعُمُونَ أَنَّهُمۡ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبۡلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدۡ أُمِرُوٓاْ أَن يَكۡفُرُواْ بِهِۦۖ وَيُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمۡ ضَلَٰلَۢا بَعِيدٗا ٦٠﴾ ئایا نابینیت و سەرسام نیت لەو (جولەکانەی) کەوا نیشان دەدەن کە باوەڕیان هێناوە بەوەی کە بۆ تۆ ڕەوانە کراوە، بەوەش کە پێش تۆ ڕەوانە کراوە (بۆ پێغەمبەران) کەچی دەیانەوێت ڕوو بکەنە زۆردارو جادوگەرو خوانەناسان تا دادوەرییان لە نێواندا بکەن و چارەسەری کێشەکانیان بکەن، لە کاتێکدا کە فەرمانیان پێ دراوە کە باوەڕیان بە شتی ناڕاست و نادروست نەبێت، شەیتانیش دەیەوێت بەرەو گومڕاییەکی دوورو بێ سنوور بیان بات.

﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمۡ تَعَالَوۡاْ إِلَىٰ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَإِلَى ٱلرَّسُولِ رَأَيۡتَ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودٗا ٦١﴾ النساء. کاتێ کە پێیان دەوترا وەرن بەدەم بانگەوازی خواوە، وە بۆ لای ئەو (قورئانەی) کە خوا ناردوویەتی، ڕوو بکەنە پێغەمبەرەکەی (بۆ چارەسەری کێشەکانتان) کەچی دەبینی کە دووڕووەکان پشتت تێ دەکەن و ڕوت لێ وەردەگێڕن.

سورەتی التوبة ئایەتی ١١

﴿فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَإِخۡوَٰنُكُمۡ فِي ٱلدِّينِۗ وَنُفَصِّلُ ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ١١﴾ التوبة. جا ئەگەر تەوبە بکەن و پەشیمانی

دەربڕن و نوێژەکانیان ئەنجام بدەن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، ئەوە برای دینی ئێوەن، ئێمەیش ئایەت و فەرمانەکان ڕوون دەکەینەوە بۆ کەسانێک کە دەیزانن.

سورەتی البقرة ئایەتی ٢٥٦

﴿لَآ إِكۡرَاهَ فِي ٱلدِّينِۖ قَد تَّبَيَّنَ ٱلرُّشۡدُ مِنَ ٱلۡغَيِّۚ فَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلطَّٰغُوتِ وَيُؤۡمِنۢ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱسۡتَمۡسَكَ بِٱلۡعُرۡوَةِ ٱلۡوُثۡقَىٰ لَا ٱنفِصَامَ لَهَاۗ وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ٢٥٦﴾ البقرة. دینداری بە زۆر نابێ بکرێت و دین بەزۆر نادرێت بە سەر کەسدا، چونکە ڕێبازی چاک و دروست و ئاشکرا بوەو (جیا بۆتەوە لە تولە ڕێگای) گومڕایی و سەرکەشی، جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە (طاغوت) کە بریتییە لە هەموو ڕێگەو ڕێبازو هێزو بەرنامەو بت و لادانێک، باوەڕی دامەزراو بێنێت بە خوا، بێگومان ئەوە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە، کە هەڵناوەشیت و هەڵناتەکێت، هەمیشە پتەوو دامەزراوە، خوای گەورەش بیسەرو زانایە، (بە هەموو کردارو گوفتارو نییەت و نهێنی بەندەکانی).

هەموو ئەم ئایەتانە باسی تاعەتی کەم و زۆر ناکات، بەڵکو باسی ئەهلی ئیمان دەکات لەسەر ئەو بەندایەتیانەی کە ئەصڵی ئیمان پێکدەهێنێت، ئەوەی واز لەم ئەصڵانە بهێنێت ئەوا نەفی ئیمانی کردووە، و دژی ئیمانی بەکارهێناوە، هەروەکو چۆن ئیمان ئەصڵی هەیە و لەبنەڕەتەوە دەچێتە ناو ئیمان، هەرواش پێچەوانەو بەتاڵکەرەوەی هەیە، بە نەکردنی یاخود وازهێنان و پشتگوێخستنی یاخود عەمدەن کار پێنەکردنی لە بەر ویست و ئارەزوو و مەصڵەحەت و پلەوپایەی ژیان، ئەوا مرۆڤ بێ ئیمان دەکات و خاوەنەکەی دەبێتە کافر. نموونەکانمان باسکرد لە (نوێژ، زەکات و ڕازی بوون بە حوکمی طاغوت و..هتد).



# مەرجەکانی ئیمان

پێویستە من و تۆ ئەوە باش بزانین وشەی (لاإله إلا الله) ئەو ڕستەیەیە کە هەموو گەردوونی پێکهێناوە، هەموو دروستکراوەکان لەبەرخاتری ئەو ڕستەیە دروست بوون، لە سەر ئەو بنەمای ئەو ڕستەیە ئوممەت دروست بووە، قیبلە دامەزراوە، شمشێر و چەک و جبەخانە تێدابەکار هاتووە و جیهادی لە پێناوا کراوە، خوای گەورە ئەمری بەهەموو جنۆکە و مرۆڤ و هەمو ومەخلوقات بە گشتی کردووە کە بیزانن و لە سروشتو فیطرەتیاندا دایمەزراندووە.

کلیلی هەموو بەندایەتیەکە لەسەر ئەو بنەمایەیە کە پێغەمبەران - علیهم السلام- هاتوون و ئوممەتەکان و هەموو خەڵکی بۆ ئەو ڕستەیە بانگێشت کراون ئەگەر زانیت وشەی (لاإله إلا الله) چییە، ئەوە چوونە بەهەشت مسۆگەرە.

بەڵام خزمەت بە خاوەنەکەی ناکات تەنها بە وتنی، دەبێت مەرجەکانی بزانێت و دڵسۆزی و ئیخلاص و بەخشینت هەبێت بۆی و کرداری پێبکەیت، زۆرێک بە زمان وتیان بەڵام لە خوارترین پلەی دۆزەخ دان.

خوای پەروەردگار لە وبارەیەوە لە سورەتی النساء ئایەتی ١٤٥ دا دەفەرموویت:

﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ١٤٥﴾ النساء. بەڕاستی دووڕووەکان لە چینی هەرە خواری ناو دۆزەخدان، وە هەرگیز نابینی کەسێک پشتیوانیان لێ بکات و بەهانایانەوە بچێت (چونکە تاوانیان زۆر گەورە بوو لە دنیادا).



وتن بە زمان وەکو لای خەڵکی بـاوە هـیچ سـوودی نیـیە، ئەگەر بێتـو بڕوای تەواوت پێی نەبێت و بەکردار نەیسەلمێنیت و بە زمـان بیلێیـتەوە و کرداری پـێ بکەیـت بەلاشـەت، هەر خەصـڵەتێک لە خەصـڵەتی (گوفتـار، کردار و نیەتی دڵ) نوقسـان بـوو ئەوا ئیمانـی نیـیە و دژی ئـیمان جێگـای دەگرێتەوە.

ئاخر با تۆ برسیت بێت و هەر بڵێیت خواردن یان نان، یان برنج و شـلە و گۆشت، بە دڵ و بە زمان, هیچ لە برسێتیت کەم ناکـات و تێـرت ناکـات، یان با تینوت بێت بە زمـان بڵێیـت ئـاو یـان شـەربەت هـیچ لە تونیەتیـت ناشکێت.

بۆیە پێویستە لەگەڵ وتـن کـردار هەبێـت و بەنیـیەت کـار بکەیـت تـا بتوانیت خۆت بپارێزیت لە برسێتی و تینوێتی، هەرچـی ئـیمان کە وشـەی بەرزی (لاإله إلاالله)یە مەرجی خۆی هەیە.

ئەو مەرجـانە کە حـەوت مەرجـن بەو مەرجـانە نەبێـت واتـای ڕاسـتی (لاإله إلاالله) دروست نابێت، جەنابی ئەلحیکەمی (الحكمـی) هەر حـەوت مەرجەکەی لە دوو دێڕدا کۆکردۆتەوە و دەڵێت:

| | |
|---|---|
| **العلم واليقين والقبـــــول** | **والانقيـاد فادر ما أقول** |
| **والصـدق والإخلاص والمحبة** | **وفقک الله لما أحبـــه** |

کەواتە بریتییە لە (العلم، اليقـين، القبـول، الانقيـاد، الصـدق، الإخـلاص، المحبــة) واتــا (زانســت، دڵنیــایی، وەرگــرتن، گەردن کەچــی، ڕاســتگۆیی، دڵسۆزی و خۆشەویستی).

بۆ ئەم حەوت مەرجە شیکارییەک دەکەین..



مەرجی یەکەم: زانستێک لە جەهل و نەزانی بترەوێنێتەوە (العلم المُنافي للجهل).

بەرزکردنەوەی دەنگ بە ڕستەی (لاإله إلاالله) ئەگەر بە زانست لێی تێبگەیت وەکو دروشمێکی سادە و سانا لەکاتی جوڵاندنی هەست و سۆزت دا بڵێیت هیچ کاریگەریەکی نییە، بەڵکو دەبێت بزانیت بە زانست کە واتای ئەو ڕستەیە چییە و چۆن نەفی هەرچی خواکانی سەرزەوییە دەیکەیت و ئیسپاتی خوای پەروەردگار دەکەیت لە بەرزترین پلەو پایەدا، خوای گەورە ئەمرمان پێ دەکات کە بە زانست زاتی پاکی و ناوو صیفاتی پیرۆزی بناسین.

خوای گەورە لە سورەتی محمد ئایەتی ١٩دا دەفەرمووێت:

﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مُتَقَلَّبَكُمۡ وَمَثۡوَىٰكُمۡ ١٩﴾ محمد. ئەی ئینسان!! دەی ئیتر چاک بزانەو دڵنیابە کە جگە لە خوا کەسی تر شایانی پەرستن نییە، داوای لێخۆشبوونی گوناهان بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ئافرەتان بکە، دڵنیابە کە خوا دەزانێت لەڕۆژدا بەچییەوە خەریکن و لە شەویشدا لەکوێ ستار دەگرن، یاخود دەزانێت چی دەکەن لە دنیادا و جێگەو ڕێگەی قیامەتیشتانی لا ڕوونە.

ئەو کاتەی کە خوودی خوای پەروەردگارت ناسی ئەوکات حەقی ناسینی ئەدەیتێ، ئەو ناسینەش پێویستی بە زانستە، هەر بەو زانستی (لاإله إلاالله) دەتوانیت هێز و توانا و جەبەروت و مەلەکوت و سوڵطانی خوای گەورە بناسیت، خوای گەورە لە سورەتی الزمر ئایەتی ٦٧دا دەفەرمووێت:

﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدْرِهِۦ وَٱلْأَرْضُ جَمِيعًا قَبْضَتُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَٱلسَّمَٰوَٰتُ مَطْوِيَّٰتُۢ بِيَمِينِهِۦۚ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ۝٦٧﴾ الزمر.
خوانەناسان؛ قەدری خوایان وەک پێوست نەگرت، ڕێزیان بۆ دانەنا، بەمەرجێک هەر هەموو گۆی زەوی پڕ مشتێکی ئەو زاتەیە لە ڕۆژی قیامەتدا، ئاسمانەکانیش بەدەستی ڕاست و دروستی خوا پێچراوەن (ئاماژەیە بۆ دەستەڵاتی بێ سنووری ئەو زاتە)، پاکی و بێگەردی و بڵندی بۆ ئەو پەروەردگارە مەزنەی شایستەی ئەوە نییە نەفامان هاوەڵی بۆ بڕیار بدەن و قەدری نەزانن.

خۆپاراستن لەهەموو جۆرە هاوبەشێک بە تێگەیشتنە لەزانستی لاإله إلاالله

هەروەها پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت: هەرکەس مردو زانا و زانست و زانیاری هەبوو لە سەر (لاإله إلا الله) دەچێتە بەهەشت:(مَن ماتَ وهو يَعْلَمُ أنَّه لا إلَهَ إلَّا اللَّهُ، دَخَلَ الجَنَّةَ)،[٧٠]

فەرموودەکە لە عوسمانی کوڕی عەففانەوە ڕیوایەتی کراوە، بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەرکەس لەسەر یەکتاپەرستی بمرێت دەچێتە بەهەشت. هیچ موسوڵمانێک نییە زانستی بەو ڕستەیە نەبێت، کە نەتزانی ئەو ڕستەیە چییە و وەک خۆی کارت پێی نەکرد واتای کافریت.

مەرجی دووەمی ئیمان: دڵنیایی و یەقین کە دوورت بخاتەوە لە گومان و دڵەڕاوکێ و دوو دڵی (اليقين المُنافي للشك والريب).

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٠] صحيح المسلم.



ئەم دڵنیایی و یەقینە لەخۆیەوە دروست نابێـت، بەڵکـو وابەسـتەیە بە مەرجی دواى خۆى کە زانستە، بۆئەوەى بیروباوەڕ دامەزرێت و لە گومـان و شـوبهە و دوودڵـی دووربێـت، پێویسـتە وەرزش بە ئەقڵـت بکەیـت و بیکەیـتە مەیـدانی زانسـت و زانیـاری شـەرعی، ئەم یەقـین و دڵنیـاییە پێویستی بە خوێندن و خوێندنەوەیەو پێویسـتی بە تـێکەڵ بـوونە لەگەڵ مەجلیسی پیاو چاک و زانایان و گوێگرتن لە بانگخوازە زیرەکو ووریاکان و گەڕانی بەردەوامە لە بەدەست هێنانی زانست و زانیاری.

تا تێبگەیـت و دڵنیـا بیـت لە خـوا و ئـایین و پەیـام و پێغەمـبەرەکەی ﷺ خوای گەورە دەفەرموویێت::

سورەتی ابراهیم ئایەتی ١٠

﴿۞ قَالَتۡ رُسُلُهُمۡ أَفِي ٱللَّهِ شَكّٞ فَاطِرِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ يَدۡعُوكُمۡ لِيَغۡفِرَ لَكُم مِّن ذُنُوبِكُمۡ وَيُؤَخِّرَكُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۚ قَالُوٓاْ إِنۡ أَنتُمۡ إِلَّا بَشَرٞ مِّثۡلُنَا تُرِيدُونَ أَن تَصُدُّونَا عَمَّا كَانَ يَعۡبُدُ ءَابَآؤُنَا فَأۡتُونَا بِسُلۡطَٰنٖ مُّبِينٖ ١٠﴾ إبراهيم. پێغەمبەرانیان وتیان: باشە، ئاخر گومان لە چی دەکەن؟ ئایا لە خوای پەروەردگاردا گومان هەیە؟! بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی؟! ئەو زاتە بانگتان دەکات بۆ ئەوەی لێتان خۆش ببێت، بۆ ئەوەی هەڵەو گوناهەکانتان چاوپۆشی بکات و مۆڵەتیشتان دەدات تا کاتێکی دیاریکراو، کەچی (خوا نەناسان ڕوو بەپێغەمبەران) وتیان: ئێوە تەنها بەشەرن وەکو ئێمە هیچی تر نین (لەباتی سوپاسی خوا بکەن کە ئەوەندە ئادەمیزاد ڕێزدارە، نوێنەر لە خۆیان هەڵدەبژێرێت)، کەچی ڕەخنەیان گرت و وتیان: ئێوە دەتانەوێت ڕێگرو دژ بەوە بن کە باو و باپیرانمان دەیانپەرست (دەی ئەگەر ڕاست دەکەن) بەڵگەیەکی ئاشکرامان بۆ بهێنن و نیشانمان بدەن؟!

سورەتی الحجرات ئایەتی١٥

﴿إِنَّمَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ لَمۡ يَرۡتَابُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمۡوَٰلِهِمۡ وَأَنفُسِهِمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلصَّٰدِقُونَ ١٥﴾ الحجرات. بێگومان ئیماندارانی ڕاست ئەوانەن کە باوەڕیان بە خواو پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ هێناوەو پاشان ناکەونە هیچ گومان و دوودڵیەکەوە، بۆ خۆیان و سەروماڵیشیانەوە تێدەکۆشن لە پێناوی ئایینیی خوادا لە ڕاستیدا ڕاست و ڕاستگۆ هەر ئەوانەن

سورەتی التوبة ئایەتی ٤٥

﴿إِنَّمَا يَسۡتَـٔۡذِنُكَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَٱرۡتَابَتۡ قُلُوبُهُمۡ فَهُمۡ فِي رَيۡبِهِمۡ يَتَرَدَّدُونَ ٤٥﴾ التوبة. (بەڵکو) بەڕاستی تەنها ئەوانە مۆڵەتت لێ دەخوازن کە باوەڕ بەخواو بە ڕۆژی دوایی ناهێنن، ئەوانە هەمیشە دوودڵن و دڵە ڕاوکێیانە، بەردەوام لە گومانی خۆیاندا سەرگەردان و وێڵن و دێن و دەڕۆن.

هەرکەس یەقینی نەبوو بەم دینە ئەوە کافرو مونافیقە!

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ دەفەرموویێت: شاهیدی بدەن کە خوای گەورە تاک و تەنهایە و منیش نێردراو و پێغەمبەرم لەلایەن ئەو پەروەردگارەوە، هەرکەس گەڕایەوە بۆلای خوا ئەو ڕستەیەی وت و دڵنیا بوو لێی دەچێتە بەهەشت. (أشهَدُ أنْ لا إلهَ إلَّا اللهُ، وأنِّي رسولُ اللهِ، لا يلْقَى اللهَ بِهِما عبدٌ غيرَ شاكٍّ فِيهِما إلَّا دخَلَ الجنةَ).[٧١]



-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧١] صحيح المسلم.

مەرجی سێییەم لە ئیمان بە لا اله الا الله: وەرگـرتن بەبـێ ڕەتکـردنەوە (القبول المُنافي للرفض).

ئەم وەرگرتن و قبـوڵ کـردنە بەواتـای زمـان و دڵ و جەسـتە دێـت، بە کردار بە وتنی عیبادەت بۆ خوای تاک و تەنها بە دڵ و یەقین و زانستەوە. خۆ ئەگەر ئەم سێ مەرجە نەبوو ئەوا خوای پەروەردگـار دەفەرمووێـت لە سورەتی الصافات ئایەتی ٣٥-٣٧ دا

﴿إِنَّهُمْ كَانُوٓا۟ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ﴿٣٥﴾﴾ ئا ئەوانە، کاتی خۆی کە پێیان دەوترا هیچ خوایەک نییە جگە لە (الله) سەریان بادەداو فوویان دەکردە خۆیان و فیزیان دەکرد.

﴿وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓا۟ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ﴿٣٦﴾﴾ دەیانوت: ئێمە چۆن واز لە خواکانمان دەهێنین بۆ شاعیرێکی شێت؟!

﴿بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ﴿٣٧﴾﴾ الصافات. (نەخێر وانییە) بەڵکو ئەو حەق و ڕاستەقینەی پێیە، ڕاستی پێغەمبەرانی پێش خۆیشی سەلماندووە.

مرۆڤ ئەگەر زانست و یەقین و قبوڵ کردنی نەبوو، ئەوا تووشی لـوت بەرزی و تەکەبـور دەبێـت و کـافریش بە گشـتی لـوت بەرز و خـاوەن تەکەبورن لە ئاستی دینی خوادا.

هەروەها مەرجی قبول لە سونەتی پێغەمـبەردا صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێت:

نمونەی ناردنی من بە هیدایەت و زانستەوە وەک بارانێک وایە بارییبێتە سەرزەوی، بەشێک لەو زەوییـە بـاش و ئامادەیـە، ئاوەکـە قبـوڵ ئـەکات و

گژوگیایەکی زۆر سەوز ئەکات، کەچی بەشێکی تری ئەو زەوییە وشک و ڕەقە و ئاوەکە گل ئەداتەوەو خەڵک بۆ خواردنەوەو ئاودان سوودی لێ ئەبینن، بەشێکی تری ئەو زەوییە ڕەقەڵانەو نە ئاو ئەگرێتەوەو نە هیچ گیایەک سەوز ئەکات، ئەمەش نمونەیە بۆ ئەوەی لە دینی خوا حاڵی بووە و سوودبەخشە بەوەی خوا ناردویتی، فێر ئەبێت و فێر ئەکات، هیتر هەیە ئایینی خوای قبوڵ نییە لەوەی من هێناومە و سوودێک ناگەیەنێت. (عَنْ أبي موسى قَالَ: قَالَ رَسُول اللَّه صَلَّىٰ اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ: إنَّ مَثَل مَا بعَثني اللَّه بِهِ منَ الْهُدَى والْعلْمِ كَمَثَلَ غَيْثٍ أَصَاب أَرْضاً فكَانَتْ طَائفَةٌ طَيبَةٌ، قبِلَت الْماءَ فأَنْبَتت الْكلأ والْعُشْبَ الْكَثِيرَ، وَكَانَ منْهَا أَجَادبُ أمسكَت الماء، فَنَفَعَ اللَّه بِهَا النَّاس فَشَرِبُوا منْهَا وسَقَوْا وَزَرَعَوا. وأَصَابَ طَائفَةٌ منْهَا أُخْرَى، إنَّمَا هيَ قيعانٌ لا تُمْسِكُ مَاءَ وَلا تُنْبِتُ كَلأ فَذَلِكَ مَثَلُ مَنْ فَقُهَ فِي دِينَ اللَّه، وَنَفَعَه بمَا بعَثَني اللَّه بِهِ، فَعَلِمَ وعَلَّمَ، وَمثَلُ مَنْ لَمْ يَرْفَعْ بِذلِكَ رَأْساً ولَمْ يَقْبَلْ هُدَى اللَّهِ الَّذي أُرْسِلْتُ بِهِ).[٧٢]

مەرجی چوارەم لە ئیمان: بریتییە لە گەردنکەچی و خۆ تەسلیم کردن بەو ڕستەیە کە (لاإله إلاالله)یە و هەوڵدانە بۆ کردنی واجبات و ئەو حەقانەی کە لەسەر ئیماندار فەرزکراوە (الإنقياد المُنافي للتمرّد)

ئەم بەشی گەردن کەچی و تەسلیم بوونە مەحەکی ڕاستگۆیی بوونە لەگەڵ ڕستەی لاإله‌إلاالله، ئیمانداری ڕاستگۆ گەردن کەچە بۆ خوا لە ناخ و دەروون و لاشە و کردار و ڕووکەشدا. گوێرایەڵی تەواوەتیان هەیە بۆ خوای پەروەردگار، خوای گەورە لە چەند جێگایەکی قورئانی پیرۆزدا لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٢] متفق عليه.



سورەتی البقرة ئایەتی ٢٨٥

﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلۡمُؤۡمِنُونَۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ لَا نُفَرِّقُ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّن رُّسُلِهِۦۚ وَقَالُواْ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ غُفۡرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيۡكَ ٱلۡمَصِيرُ٢٨٥﴾ البقرة. پێغەمبەرو ئیمانداران باوەڕیان هەیە بەوەی کە لەلایەن پەورەردگاریانەوە هاتۆتە خوارەوە، هەموویان باوەڕیان هەیە بە خواو فریشتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرەکانی (وە دەڵێن) هیچ جۆرە جیاوازیەک ناکەین لە نێوان پێغەمبەرانی خوادا هەروەها دەڵێن: گوێڕایەڵ و ملەکەچین (بۆ بەدی هێنەرمان).پەروەردگارا لێمان خۆش ببە سەرەنجام و گەڕانەوەمان بۆلای تۆیە

سورەتی النور ئایەتی ٤-٥

﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ٤﴾

ئەوانەی کە بوختان دەکەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاک و خاوەن مێرد، پاشان ناتوانن چوار کەسیش بە شایەت بهێنن، ئەوانە هەشتا قامچیان لێ بدەن و هەرگیز شایەتیان لێ وەرمەگرن، ئەوانە لە ڕیزی تاوانبارو لە سنوور دەرچوو و یاخیەکاندان.

﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ٥﴾

النور. جگە لەوانەی کە تەوبەی ڕاستەقینەیان کردووە دوای تەمێ کردنەکەیان، چاکسازی خۆیشیان کردووە، ئەوە بێگومان خوا (بە نیسبەت ئەو جۆرە کەسانەوە) لێخۆشبوو و میهرەبانە.

سورەتی النساء ئایەتی ٦٥



﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾ النساء. نەخێر، سوێند بە پەروەردگارت ئەوانە ئیمان وباوەڕیان دامەزراو نابێت هەتا لە هەموو کێشەیەکدا کە ڕوو دەدات لە نێوانیاندا تۆ نەکەن بە دادوەرو گوێڕایەڵی تۆ نەکەن، دوای ئەوەش نابێت لە دڵ و دەروونیاندا هیچ نارەزاییەک دروست ببێت بەرانبەر ئەوەی کە دادوەریت لەسەر کردووە و دەبێت بە تەواوی تەسلیم بن و ڕازی بن.

پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ دەفەرموویێت: فەرمانم پێکراوە کە لەپێناوی شایەتومان بە لا إله إلا الله و محمد رسول الله کە جیهاد و کۆشش بکەم، یاخود جەنگ لەگەڵ خەڵکی بکەم لەسەر وتنی ئەو ڕستەیە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، ئەگەر گەردنکەچ بوون و تەسلیم و ڕەزامەندیان دەربڕی، ئەوا ماڵ و سامان و خوێنیان پارێزراوە بە حەقی ئیسلام، لێپرسینەوەیان لەسەر خوای پەروەردگارە لە قیامەت. (عَن ابنو عُمَر رَضيَ اللَّه عنهُما، قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّه صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ: أُمِرْتُ أن أقاتلَ النَّاس حَتَّى يَشْهَدُوا أن لا إِلهَ إِلاَّ اللَّه وأَنَّ مُحَمَّدًا رَسُولُ اللَّه، ويُقِيمُوا الصَّلاةَ، وَيُؤْتُوا الزَّكاةَ، فَإِذا فَعَلوا ذلكَ، عَصَمُوا مِنِّي دِمَاءَهُمْ وأَمْوَالَهم إِلاَّ بحَقِّ ئیسلام، وحِسابُهُمْ عَلى اللَّه).[٧٣]

مەرجی پێنجەم لە ئیمان: ڕاستگۆیی کە وازت پێ لێبهێنێت لە درۆکردن (الصدق المُنافي للكذب).

[٧٣] متفق عليه.



ڕاســـتگۆیی یەکـــانگیرە لەگەڵ واقیعـــی بیروبـــاوەڕ و دژی درۆ و تەڵەکەبازیە لە باوەڕ، پێویستە بە ڕاستگۆیی شایەتومان بهێنیت بە زمان و بە کردار و بەدڵ و دەروون و ڕووکەشت. دەبێت ئاگات لە دەروون و نـاخ و ڕاستگۆیی و ڕووکەشـت بێـت تـا لە دووڕووەکـان هەژمـار نەکرێیـت و دووربیت لە نیفاق.

خوای پەروەردگار لە باسی مونافیقاندا لە قورئانی پیـرۆزدا  لە سـورەتی البقرة ئایەتی ٨-١٠ دا دەفەرمووێت:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ وَمَا هُم بِمُؤۡمِنِينَ ٨﴾ لەناو خەڵکیدا کەسانێک هەن کە دەڵێن: ئیمان و باوەڕمان بە خواو بە ڕۆژی قیامەت هێناوە (لە ڕاستیدا ئەوانە درۆ دەکەن) ئەوانە هەمیشە باوەڕدار نین:

﴿يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ ٩﴾ ئەوانە (بەخەیاڵی خۆیان وادەزانن) خوا و ئەو کەسانە دەخەڵەتێنن کە باوەڕداری ڕاستەقینەن!! کەچی جگە لە خۆیان کەسیان پێ ناخەڵەتێت، بەڵام هەست ناکەن و فام ناکەنەوە و بیرناکەنەوە.

﴿فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ فَزَادَهُمُ ٱللَّهُ مَرَضٗاۖ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمُۢ بِمَا كَانُواْ يَكۡذِبُونَ ١٠﴾ البقرة. ئەوانە لە دڵ و دەروونیاندا نەخۆشی بێ باوەڕی و حەسوودی و کینە هەیە، خوایش (بەسەرخستنی حەق و ئیمانداران) ئەوەندەی تر دەردیان گران و کاریگەر دەکات و سزایەکی سەختیش (لە دنیا و قیامەتدا) چاوەڕێیانە بەهۆی درۆکردن و (دژایەتییان بۆ ئیسلام).

هەروەها بـۆ تـاقی کـردنەوەی ڕاسـتگۆیی ئیمانـداران خـوای گەورە لە سورەتی العنكبوت ئایەتی ٢-٣دا دەفەرمووێت:

﴿أَحَسِبَ ٱلنَّاسُ أَن يُتْرَكُوٓاْ أَن يَقُولُوٓاْ ءَامَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ ۝٢﴾ ئایا خەڵکی وایانزانیوە، وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟

﴿وَلَقَدْ فَتَنَّا ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۖ فَلَيَعْلَمَنَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ صَدَقُواْ وَلَيَعْلَمَنَّ ٱلْكَٰذِبِينَ ۝٣﴾ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون.

پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: هەرکەس بڵێت شایەتوومانم هێناوە بە خواو پێغەمبەرەکەی بە دڵ و ڕاستگۆیی ئەوا ئاگری جەهەنەم لەسەری حەرام کراوە. (ما من عبد يشهد أن لا إله إلا الله، وأنَّ محمدا عبده ورسوله صِدْقًا من قلبه إلَّا حرمه الله على النار).[٧٤]

مەرجی شەشەم لە ئیمان بە لا الە الاّ اللە: دڵسۆزی و ئیخلاص دژی هاوبەش دانان و ڕیایی (الإخلاص المُنافي للشرك).

خۆساغ کردنەوەی ئیمانداره لە نواندنی دڵسۆزی بۆ پەروەردگاری لە بەندایەتی و دوورکەوتنەوەیە لە هاوبەشدانان، ڕیایی، خۆبادان، ئیخلاص دوو مەرجی هەیە یەکەم لە نیەت و مەقصود دا، دووەم لە کارێک کە شەرع پێی ڕازی بێت.



---

٧٤ متفق عليه.

خوای پەروەردگار کارێکی ناوێت ئەگەر مەقصود و نیەتت بۆ خوای پەروەردگار نەبێت، دەبێت دووربیت لە هاوبەش دانان، ناکرێت لە خۆتەوە کارێک یان بەندایەتیەک دابهێنیت کە شەرعی خوایی ڕازی نەبێت، پێغەمبەری خوا صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ لە فەرموودەیەکی قودسیدا دەفەرمووێت: خوای پەروەردگار دەفەرمووێت: من بێ سنوور دەوڵەمەندم و بێباکم لەشەریک، هەر کەسێک کارێک بکات و تەنها بۆ من نەبێت و شەریکم بۆ دانێت، پشت هەڵئەکەم لە خۆی و کارە شیرکاوییەکەی: عن أبي هريرة رضي الله عنه مرفوعا: "قال تعالى (أنا أغنى الشركاء عن الشرك؛ من عمل عملا أشرك معي فيه غيري تركتُه وشِرْكَه).[٧٥]

سورەتی الزمر ئایەتی ٣

﴿أَلَا لِلَّهِ ٱلدِّينُ ٱلۡخَالِصُۚ وَٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ يَحۡكُمُ بَيۡنَهُمۡ فِي مَا هُمۡ فِيهِ يَخۡتَلِفُونَۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي مَنۡ هُوَ كَٰذِبٞ كَفَّارٞ ۝٣﴾ الزمر. ئاگاداربن: دینی پاک و خاوێن تەنها بۆ خوایە، ئەوانەش جگە لەو زاتە کەسانی ترو شتی تر دەکەنە پشتیوانی خۆیان دەڵێن: ئێمە ئەم بت و شتانە ناپەرستین تەنها لەبەر ئەوەی لە خوا نزیکمان بخەنەوە، لەکاتێکدا ئەوان لەخواوە نزیکترن، بێگومان خوا داوەری دەکات لە نێوانیاندا، لەو شتانەدا کە کێشەیان لەسەری هەیەو ڕایان دەربارەی جۆراو جۆرە، بەڕاستی خوا ئەو بیروباوەڕ چەوتەیان لێوەرناگرێت و هیدایەت و ڕێنموویی ئەو کەسانە ناکات کە درۆزن و بێ باوەڕن.

سورەتی البينة ئایەتی ٥

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٥] رواه مسلم.



﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ البينة. وە فەرمانیان پێ نەدرابوو جگە بەوەی کە خواپەرستی بکەن، وە ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو بن و زەکات لە ماڵ و سامانیان دەرکەن، (بێگومان) هەر ئەوەشە دین و ئایینی ڕاست و دروست.

سورەتی الزمر ئایەتی ١٤:

﴿قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصًا لَّهُۥ دِينِي١٤﴾ الزمر. بڵێ: من تەنها هەر خوا دەپەرستم و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئایین و بەرنامەکەی ئەو دەبم.

پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرموویێت: خۆشحاڵترین خەڵکی بە شەفاعەتم ئەو کەسانەن کە بە ئیسلام لە دڵیانەوە خوای گەورەیان پەرستووە بەیەکتاپەرستی (أسعد الناس بشفاعتي. من قال لا إلـه إلا اللـه، مخلصا من قلبه أو نفسه).[٧٦]

دژی ئیخڵاص هاوبەش دانانە, هەرکەس هاوبەشی دانا کردەوەکانی بەتاڵ دەبێتەوە، پەنا بەخوای گەورە. لەم بارەیەوە خوای گەورە لە سورەتی الزمر دا ئایەتی ٦٥ پێمان ڕادەگەیەنێت.

﴿وَلَقَدۡ أُوحِيَ إِلَيۡكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكَ لَئِنۡ أَشۡرَكۡتَ لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ٦٥﴾ الزمر. سوێند بەخوا بادڵنیابینو کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆو بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە.

-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-.-

[٧٦] رواه بخاري عن أبي هريرة.



حەوتەم مەرجی ئیمان: خۆشەویستی دەربڕینە بۆ لاإله إلا الله و دەربڕینی خۆشحاڵییە بۆی (المحبة المُنافية للبغض و الكره).

پێویستە خۆشەویستی بۆ شایەتوومان دەرببڕین، چونکە ئەگەر خۆشەویستی بۆی نەبێت ناتوانیت کاری بۆ بکەیت، ئەگەر خۆشەویستیت بۆی نەبێت ناتوانیت زانست لەسەری وەربگریت، تا یەقینت بۆ دروست نەبێت و خۆشەویستی تەواوت بۆی دروست نەبێت ڕاستگۆ نابیت لەگەڵیدا. بۆیە دەبێت خوا و پێغەمبەرت صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ لە خۆت و ماڵ و منداڵ و سەروەت و سامانت خۆشتر بوێت، دەنا ئیمانت تەواو نییە.

خوای پەروەردگار لە سورەتی البقرة ئایەتی ١٦٥دا دەفەرموویت:

﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ ۗ وَلَوْ يَرَى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِذْ يَرَوْنَ ٱلْعَذَابَ أَنَّ ٱلْقُوَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا وَأَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلْعَذَابِ ١٦٥﴾ البقرة. (لەگەڵ ئەو هەموو بەڵگە ئاشکرایانەدا) هەندێ کەس هەیە لەجیاتی ئەوەی کە خواپەرست بێ، شتی تر دادەتاشێ بۆ خۆی و (شوێن ڕینمونییەکانی خوا ناکەوێ و) خۆشەویستی و سۆزی دەدا بەو بت و بەرنامۆلکەو تولە ڕێگایانە و خۆشی دەوێت، بەڵام ئەوانەی ئیمان و باوەڕیان هێناوە خوایان زۆر زیاتر خۆش دەوێ (هەر بەراورد ناکرێت) جا ئەوانەی کە ستەمکارن کاتێ کە ڕووبەڕووی سزا دەبنەوە بەچاوی خۆیان سزاو ئازاری (دۆزەخ دەبینن) بۆیان دەردەکەوێت کە هێزو تواناو دەسەڵات هەر هەمووی بەدەست خوایە، وە ئەو ڕۆژە ئەو خوایە سزاکەی زۆر بە ئازارە (بۆ ستەمکاران).

ئەم خۆشەویستییە لەسەر سێ بنەما دامەزراوە بۆ بەندایەتی:

یەکەم: ترس لە خوا واتا لە سزای دۆزەخ.

دووەم: هیوای بەخشینی بەهەشت واتا ڕەجاء.

سێیەم: خۆشەویستی خوای پەروەردگار (الخوف والرجاء والمحبة).

ئەم سێ بەشە بەسەردوو بەشـی سـەرەکیدا دابەشبـووە کە بـریتین لە خۆشەویستی (أوجب) و خۆشەویستی (واجب).

خۆشەویستی (أوجب) واجبترین: واتا لە ئیسلام ڕازیت بەورد و درشـت و ئەصڵ و فەرعییەوە خۆشەویستی بۆ خوای پەروەردگـارە و بە ئاراسـتەی پەیامەکەی کاردەکەیت، هاوبەشی بۆ بڕیار نادەیت، گەردنکەچیت بۆی بە کەماڵی خۆشەویستی و کەماڵی گەردنکەچـی، هەر لەو دەترسـیت و هەر ئەو بە گەورە و شاهی شاهان دەزانیـت، ئەم خۆشەویسـتیە دەتگەیەنێـتە حەلاوەت و شیرینی ئیمان

پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ دەفەرمووێـــت: ئەوانەی کە شیرینی ئیمان دەچێژن بەهـۆی سـێ هۆکـارە لە ئیمانیانـدا: یەکەم- خـواو پێغەمبەریان لەهەرچی شتیانە خۆشتر دەوێت.

دووەم- هەرکەسێکی خۆش بوێت لەبەر خۆشەویستی خوایە.

سێیەم-قینی ئەبێتەوە لەوەی بگەڕێتەوە بـۆ کـوفر دوای ئـەوە ی خـوا هیدایەتی دا، وەک چۆن ڕقی لەوەیە بیخەنە ناو ئـاگرەوە. (ثـلاثٌ مَـنْ كـنَّ فيه وجَدَ حلاوَةَ الإيمانِ: أنْ يكونَ اللهُ و رسولُهُ أحبّ إليه ممَّا سواهُما, و أنْ يُحبَّ المرءَ لا يُحبّهُ إلَّا لله, و أنْ يَكرَهَ أنْ يَعودَ في الكفرِ بعـدَ إذْ أنقـذَهُ اللـهُ مِنْهُ ؛ كما يَكرَهُ أنْ يُلْقى في النارِ).[٧٧]

---

[٧٧] رواه البخاري عن أنس بن مالك



خۆشەویستی واجب: بریتییە لەوەی کە پێغەمبەری خوا صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ هێناویەتی لە واجبات و وازهێنان لە تاوان و خۆشەویستی بۆ موسوڵمانان و پیاوچاکان و ڕق بوون لە کافر و خوانەناسان و حەزکردن بە سەرکەوتنی موسوڵمانان و بەرەو ڕووخان و داڕمانی کافران، ئەمانەی باسمان کردن هەموو مەرجی (الا إله إلا الله) بوو.

## دەرچوون لە ئیمان و کافر بوون

هەرکو چۆن مەرج و خاسێتی تایبەت هەیە بۆ هاتنە ناو ئیمان بەهەمان شێوە مەرج و خاسیەتی تایبەت هەیە بۆ دەرچوون لە ئیمان کە دژی ئیمان و کافر بوونە (پەنا بەخوا).

ئەگەر پێکهاتەی ئیمان بریتی بێت لە (کردار، گوفتار و نیەت) ئەوە پێکهاتەی بێ ئیمانی بریتییە لە (گوفتار، ڕەفتار، بیروباوەڕ).

- بەتاڵ بوونەوەی ئیمان لە گوفتاردا و بە زمان و تۆنی دەنگ وەکو جنێودان بە خوا و پێغەمبەر صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِۦوَسَلَّمَ

و ئیسلام و شەریعەت، یاخود ئەو پیرۆزیانەی کە دەقی ڕاشکاوی لەسەرە وەکو دروشمەکان و جێگاکان و..هتد. مرۆڤ بە ئینکاری کردن یاخود جنێودان یان گاڵتە پێ کردن پێی کافر دەبێت و لە میللەتی ئیسلام دەچێتە دەرەوە، کافرە یاخود مورتەدە.

- بەتاڵ بوونەوەی ئیمان لە ڕەفتاردا وەک وازهێنان و تەرک کردنی عیبادەتی واجب و فەرز و سوتاندنی قورئان یاخود فڕێ دانی لە پیسی و چوونە ناو کڵیسا بەمەبەستی بەشداری کردن لە بۆنەی مەسیحی یاخود



ئـایینی دیـکە و جەژنەکانیـان و هەڵگرتنـی دروشـمیان وەکـو خـاچ یـان ئەستێرەی داودی یەهودی یان نیشانەی ئەهـورا مەزدای زەردەشـتی..هتد. مرۆڤ بەو ڕەفتارانە کافر دەبێت و لە میللەتی ئیسلام دەردەچێـت یـاخود بە هەڵگەڕاوە هەژمار دەکرێت.

- بەتاڵ بوونەوەی ئـیمان بەهۆکـاری گۆڕانکـاری لەبیروبـاوەڕدا، وەکـو زیادکردن لە خۆتەوە بۆ ئایین یان گومان و دوودڵـی، یـاخود ڕازی نەبـوون بە یاساو ڕێسـای ئیسـلام بەهەنجەتـی کـۆن و دواکەوتـوویی، یـاخود ڕازی نەبـوون بە شـەریعەت و لە جیـاتی ئەو شـەریعەتە بەرنـامەی ژیـان لە مرۆڤەکانەوە وەربگریت.

بەشـی سـێیەم لە (نواقضـی ئـیمان) لەهەردوو بەشـەکەی تـردا خـۆی دەبینێتەوە و لەگەڵیشیدا کار لەسەر نییەتی خاوەنەکەی دەکات.

خوای پەروەردگار لە قورئانی پیـرۆزدا لەسـەر بەتـاڵ بـوونەوەی ئـیمان لەڕووی (کـردار، گوفتـار و بیروبـاوەڕ) ئـایەت گەلێکـی زۆری بـۆ بـاس کردووین و بە پێغەمبەرەکەی صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بۆ ناردووین لەوانە:

سورەتی النساء ئایەتی ١١٥

﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ١١٥﴾ النساء.

ئەوەش کە دوژمنایەتی پێغەمبەر صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَى آلِهِ وَسَلَّمَ بکات دوای ئەوەی کە ڕێگەی ڕاست و دروستی بۆ ڕوون بۆتەوە، وە ڕێبازێک بگرێتە بەر کە جیاواز بێت لە ڕێگەو ڕێبازی ئیمانداران، ڕووی دەکەینە ئەو ڕووگەو بەرنامەیەی کە هەڵی بژاردووە (لە قیامەتیشدا) دەیخەینە ناو دۆزەخەوە کە سەرئەنجامێکی زۆر ناخۆش و سامناکە.

سورەتی التوبة ئایەتی ٦٥-٦٦



﴿وَلَئِن سَأَلۡتَهُمۡ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلۡعَبُۚ قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ٦٥﴾ کاتێک تۆ ئەی پێغەمبەر ﷺ لە گوفتاری نابەجێیان ئاگادار دەبیت، و لێیان دەپرسیت (ئەوە خەریکی چین؟!) ئەوە بێگومان دەڵێن: بەڕاستی ئێمە تەنها دەمەتەقێ و گەمە و گاڵتەمان دەکرد، پێیان بڵێ: ئایا ئێوە بە خواو ئایەت و فەرمانەکانی و پێغەمبەرکەی گاڵتەتان دەکرد؟!

﴿لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ إِن نَّعۡفُ عَن طَآئِفَةٖ مِّنكُمۡ نُعَذِّبۡ طَآئِفَةَۢ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ مُجۡرِمِينَ ٦٦﴾ التوبة. ئیتر بێسوودە پاکانە مەکەن، چونکە بەڕاستی ئێوە بێ باوەڕ بوون دوای ئەوەی لە ڕواڵەتدا باوەڕتان هێنابوو ئەگەر لە دەستەیەکتان خۆش ببین (دوای تەوبەی ڕاستەقینە) دەستەیەکتان هەر ئازار دەدەین، (بەهۆکاری کاری نابەجێییەوە) چونکە بەڕاستی ئەوان تاوانبار و تاوانکار بوون.

سورەتی النحل ئایەتی ١٠٧

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٠٧﴾ النحل. ئەو (خەشم و قینەش لەبەرئەوەیە) چونکە ئەوانە ژیانی دنیایان خۆش دەوێ و هەر ژیانی دنیایان مەبەستە تا ژیانی دواڕۆژ، بێگومان خوا هیدایەتی قەوم و کەسانی کافرو خوانەناس نادات.

سورەتی المائدة ئایەتی ٥١-٥٢

﴿۞ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە جولەکەو گاور مەکەنە یارو



یاوەرو پشتیوانی خۆتان ئەوانە هەندێکیان پشتیوان و پشتگیری یەکترن، ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ئەوە هەر لەوانەو (حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت) بەڕاستی خوا هیدایەتی قەومی ستەمکار نادات.

﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٌۚ فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأْتِيَ بِٱلْفَتْحِ أَوْ أَمْرٍ مِّنْ عِندِهِۦ فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ۝٥٢﴾ المائدة. بە ڕوونی دەبینی ئەوانەی دڵیان نەخۆشەو (ئیمان لاوازن) بە پەلە دەچن بۆ لایان و دەڵێن: دەترسین تووشی بەڵایەک بین یا کارەساتێک بێت بەسەرمان دا، جا دوور نییەو لەوانەیە بەم نزیکانە خوا سەرکەوتن ببەخشیت (بە ئیمانداران) یاخود بە شێوەیەکی یەکسەریی بە (معجزة)یەک لەلایەن خۆیەوە (سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت) ئەو کاتە باوەڕ لاوازان پەشیمان دەبنەوە لەو نهێنی و خەتەرە و خەیاڵەی لە دڵ و دەروونیان دا شاراوەبوو.

سورەتی سبأ ئایەتی ٣١-٣٢

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَن نُّؤْمِنَ بِهَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ وَلَا بِٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِۗ وَلَوْ تَرَىٰٓ إِذِ ٱلظَّٰلِمُونَ مَوْقُوفُونَ عِندَ رَبِّهِمْ يَرْجِعُ بَعْضُهُمْ إِلَىٰ بَعْضٍ ٱلْقَوْلَ يَقُولُ ٱلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُواْ لِلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُواْ لَوْلَآ أَنتُمْ لَكُنَّا مُؤْمِنِينَ ۝٣١﴾ ئەوانەی کە بێبڕوان دەڵێن: هەرگیز باوەڕ بەم قورئانەو بەو (کتێبانەش) ناکەین کە پێش ئەم (ڕەوانە کراوە)، خۆ ئەگەر دەبینی لە ڕۆژی قیامەتدا) چۆن ستەمکاران وەستێنراون لەبەردەم (دادگای) پەروەردگاریاندا قسە دەڵێن بە یەکترو (یەکتری تاوانبار دەکەن)، لاوازکراوەکان بە زۆردارو دەسەڵاتدارەکان دەڵێن: ئەگەر ئێوە نەبوونایە ئێمە باوەڕدار دەبووین.



﴿قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسۡتَكۡبَرُواْ لِلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُوٓاْ أَنَحۡنُ صَدَدۡنَٰكُمۡ عَنِ ٱلۡهُدَىٰ بَعۡدَ إِذۡ جَآءَكُمۖ بَلۡ كُنتُم مُّجۡرِمِينَ ٣٢﴾ سبأ. دەسەڵاتدارو زۆردارەکانیش بەلاوازکراوو ژێردەستەکان دەڵێن: بۆچی ئێمە ئێمە ڕێگەی هیدایەتمان لێ بەستبوون و نەماندەهێشت دوای ئەوەی کە بۆتان هاتبوو؟! نا، وانییە، خۆتان تاوانبار و تاوانکارن.

سورەتی الأعراف ئایەتی ١٧٥-١٧٨

﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥﴾ ئەی محمد صَلَّىٰٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓآلِهِوَسَلَّمَ هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەرەوە کە فەرمانەکانی خۆمانمان پێبەخشی بوو، کەچی ئەویش خۆی لێ داماڵی و خۆی لێ دوورە پەرێز گرت، ئەوسا ئیتر شەیتان شوێنی کەوت و دایەپێش و چووە ڕیزی سەر لێشێواوانەوە.

﴿وَلَوۡ شِئۡنَا لَرَفَعۡنَٰهُ بِهَا وَلَٰكِنَّهُۥٓ أَخۡلَدَ إِلَى ٱلۡأَرۡضِ وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُۚ فَمَثَلُهُۥ كَمَثَلِ ٱلۡكَلۡبِ إِن تَحۡمِلۡ عَلَيۡهِ يَلۡهَثۡ أَوۡ تَتۡرُكۡهُ يَلۡهَثۚ ذَّٰلِكَ مَثَلُ ٱلۡقَوۡمِ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۚ فَٱقۡصُصِ ٱلۡقَصَصَ لَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ١٧٦﴾ خۆ ئەگەر بمانویستایە ئەوە بەو ئایەت و فەرمانانە بەرزمان دەکردەوە، بەڵام ئەو خۆی چەسپان بەزەویەوە و (دەستی کرد بەدنیا پەرستی و) شوێنی ئارەزووی خۆی کەوت، جا نموونەی (ئەو جۆرە کەسانە) وەکو نموونەی سەگ وایە ئەگەر دەری بکەیت و پیایدا هەڵبشاخێیت هەناسە بڕکێیەتی (زمان دەردەکێشێت)، یاخود ئەگەر وازی لێ بهێنیت ئەوە هەر هەناسە بڕکێیەتی، ئەوە نموونەی ئەو کەسانەیە کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوە و بڕوایان پێی نەبووە، کەوابوو ئەم جۆرە بەسەرهاتانە بگێڕەرەوە بۆ ئەوەی (دابچڵەکێن و) بیربکەنەوە.

﴿سَآءَ مَثَلًا ٱلۡقَوۡمُ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَأَنفُسَهُمۡ كَانُواْ يَظۡلِمُونَ ١٧٧﴾ ئای که چەندە نموونەیەکی ناشرینە، نموونەی ئەو کەسانەی کە بەڵگەو فەرمانەکانی ئێمەیان بەدرۆ زانیوەو بڕوایان پێ نەکردوە، ئەوانە هەر ستەمیان لە خۆیان دەکرد.

﴿مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِيۖ وَمَن يُضۡلِلۡ فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ١٧٨﴾ الأعراف. ئەوەی خوا ڕێنموویی بکات ئەوە هەر ئەو ڕێنموویی وەرگرە، ئەوەش کەگومڕای بکات ئەوە هەر ئەوانە زەرەرمەندن.

## نموونەی بەتاڵبوونەوەی ئیمان لە ڕەفتار و گوفتار و بیرووباوەڕ

ئەگەر تەماشای زۆرێک لەبەتاڵ کردنەوەی ئیمان بکەیت لە چواردەورماندا زۆر بەئاسانی دەبینرێت، بێ ئەوەی خەڵکی لێیان ئاگادار بکەینەوە هەندێک جار هەر نازانێت کە خاوەنەکەی بە ڕەفتار و گوفتار و بیرووباوەڕ کافر بووە لە ئیسلام چۆتە دەرەوە.

## نموونەی کافر بوون و بەتاڵ بوونەوەی ئیمان بە زمان

- جنێودان بەخوا و پێغەمبەران و پێغەمبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيۡهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ

- گاڵتەکردن بە خوا و پێغەمبەران

- گاڵتەکردن بە ئەحکامە شەرعییەکان و بەخراپ تەماشاکردنی و وتەی نەشیاو لە بەرانبەری دا بۆ نموونە ئەگەر بڵێت: نادادپەروەرانەیە و



بەکەڵکی سەردەم نـایەت، نمـوونەی دەسـت بڕینـی دز، کوشـتنی بکـوژ و ڕەجم کردنی زیناکار.هتد.

- بەربەرەکـــــانێی فەرمانەکـــــانی خـــــوا و پێغەمـــــبەری خوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ، نموونە بۆچی خوا وای کردووە، بۆ بەم شـێوەی نەکردووە، وەکو ئەو کەسـەیە ڕێگـاو پلان بـۆ خـوای پەروەردگـار دابنـێ هەموو ژیانی بەرهەڵستکاریە بۆ خوا، پەنا بۆ خوا.

سورەتی الأنبیاء ئایەتی ٢٣

﴿لَا يُسْـَٔلُ عَمَّا يَفْعَلُ وَهُمْ يُسْـَٔلُونَ ﴿٢٣﴾﴾ الأنبیاء. ئەو زاتە کەس ناتوانێت لێی بپرسێتەوەو (محاسبە)ی بکات دەربارەی ئەو ڕووداو شتانەی کە دەیکات و پێشی دێنێت، بەڵام ئەوان (گرۆی ئادەمیزاد) بەرپرسیارن و پرسیاریان لێ دەکرێت و (محاسبە) دەکرێن.

- گاڵتەکردن بە قورئان و کتێبەکانی ئاسمانی و یاخود جنێودان پێیـان و لەگەڵ دروسـتکردنی تـۆمەت و بوختـان بـۆ دەقەکـان بەنـاوی خەڵکـانی ترەوە.

- گاڵتەکردن بە فریشتەکان و یان جنێوپێدان پێیان.

- قســـەوتن بە خێزانەکـــانی پێغەمـــبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ یـــان ناووناتۆرەی ناشرین بۆیان و یاخود گاڵتەپێکردن پێیان.

- تـــانەدان لە بـــانگەوازی پێغەمـــبەری خـــوا صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ و بەسوک تەماشاکردنی.

- گاڵتەپێکردن و بەکەم تەماشاکردنی درووشمە ئیسلامیەکان، نمـوونەی ڕیش و حیجاب و بانگ.هتد یان شوبهاندنی خوا بە مەخلوقات.

هەموو قسە باوەکانی ناو کۆمەڵگا کە خاوەنەکەی کافر دەکات.

- ئەگەر فلان کەس ببێت بەخوا ناپپەرستم.

- ئەگەر فلانە کەس ببێتە پێغەمبەر باوەڕی پێ ناکەم

- لەخواو پێغەمبەرم خۆشتر دەوێیت.

- بانگەشەی پێغەمبەر بوون، کاتێک دەڵێ من پێغەمبەرم.

- گاڵتەکردن بە زیکرەکان، وەکو بژمین یان وتنی هەر زیکرێـک بەتـانە و تەشەرەوە یان بڵێیت هیچ کاریگەری نییە.

- کورە من لە قیامەت ناترسم ئەگەر هەشبێت.

- ئەوانەی کە لە دەزگـا ئەمنییەکـان ئـیش دەکەن زیـاتر ئەم قسـەیە ئەکەن کە دەڵێن ئەگەر خوا هەبێت ئەویشمان تەعزیب ئەیا.

- ئینکـاری و بەبـەتاڵ زانینـی حـوکمە موتەواتیرەکـانی شـەرع و حەڕامەکان کە دەقی ڕاشکاوی لەسەرە.

- هەرکەس وتی قورئان مەخلوقە ئیمانی بەتاڵە.

- خوێندنی قورئان بە دەف و شمشاڵ و هەر جۆرە ئامێرێکی مۆسیقی.

- بەکارهێنانی ئایەتە قورئانیەکان بۆ کۆمێدیا و مەشهەدی کۆمێدی یان بەکارهێنانی بۆ گاڵتەوگەپ.

- بەتایبەت لەناو عەرەب ئەوە بـاوە کە دەڵـێن کـورتە وەکـو سـورەتی الکوثر.

- گاڵتەکردن بە حوکمی جیهاد و موجاهیدان یان لە شان و شـەوکەتیان کەم بکرێتەوە بۆ بەرژەوەندی دوژمن.

- وتنی وشەی (خوام نەما، دەوەرە خوات بمێنێ.هتد).

- سوێند خواردن بە تەلاقی پێغەمبەر صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ.





- ئەگەر خوا بەهەشتم بداتێ تۆی لێ نەبیت نامەوێت.

- هەرکەس بانگەشـەی ئەوەی کـرد کە غەیـب ئەزانێـت و ئەزانێـت لە داهاتوو چی ڕووئەدات.

- ناوبردنی خوا بە زاڵمو  جەلاد.

- ئەوەی کە بڵێت پێغەمبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ بە شمشێر و خوێن و خوێنڕێژی دینی بڵاوکردۆتەوە.

- لەناو کـورددا زۆر بـاوە کە دەڵـێن ئەمە خـوای جـوانییە، یـان خـوای چاکەیە فڵان کەس یان خوای شیعرە لەم جۆرە قسانە.

- ئەوەی بڵێت جوبریل خیانەتی لە پەیامەکە کردووە.

- هەرکەس هــاوەڵان کــافر بکــات یــان تــاوانی زینــا بــداتە پەنــای خێزانەکـانی پێغەمـبەر صَلَّىٰ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰٓ آلِهِ وَسَلَّمَ, کـافرە یـان مـورتەدە یـان کافرکردنی خولەفا ئەوا خۆی کافر دەبێت.

- هەرکەس وتی قورئان محمد نوسیوویەتی.

- هەرکەس وتی من تەکلیفی شەرعیم لەسەرنەماوە، وەکو هەندێک لە شێخەکان دەڵێن یان وای نیشـان ئـەدەن کە گەیشـتوون بە پـلەی یەقینـی عیبادەت.

- هەرکەس وتی ڕاستەوخۆ خوام دیـوەو بەچـاو قسـەم لەگەڵ کـردووە یان بە زمان.

- زۆر باوە لەناو خەڵکیدا کە دەڵێن فڵانە کەس ئەو کارەی کرد لە (کن فیکون)ێکدا، (کن فیکون) تەنهـا بـۆ خـوایە. ئەگـەر زانی کـوفرەو هـەر بـە عیناد بەکاری هێنا.

- خوایش پێی بڵێ ئەو کارە بکە، نایکەم.

- گۆڕینی ناوە شەرعی و ئەحکام و زاراوە عەقائیدییەکان نموونەی کوفر بە ئیمان و موجاهید بە تیرۆریست و جیهاد بە خوێنڕێژی.هتد.

- نەوتنی کافر بە کافر دەبێت، واتا ئەوەی کافرە دەبێت کافری بکەیت بەکافری بزانیت مادام ڕوون بێت کە کافرە.

- وتنی خواش ئەو کارەم پێ ناکات.

## چەند نموونەیەک لەبەتاڵکردنەوەی ئیمان لە ڕووی کردارەوە

- سوجدە بردن بۆ پەیکەر و مۆنۆمێنت، ڕۆژ، مانگ، ئەستێرە، خاچ، مرۆڤ، یان بڵێین سوجدە بردن بۆ غەیری خوای پەروەردگار.

- قورئان فڕێ بدرێتە جێگای پیس جا بەشێکی یان هەمووی.

- سەربڕین بۆ بەندایەتی بێجگە لە خوای پەروەردگار.

- پاڕانەوە لە مردوو و داوای یارمەتی کردن لێیان سەیرکردنی وەک فریادڕەس.

- دروستکردنی مەعبەد وجێگای هاوبەش دانان، وەکو کەنیسە و پەرستگای یەهودی و هیندۆس.هتد،

- نەزرکردن بێجگە لەخوای پەروەردگار.

- لەمل کردنی خاچ و دروشمی ئایینەکانی تر وەکو زەردەشتی و یەهودی و شەیتان پەرستەکان.

- چوون بۆ کەنیسە و بەژداری کردن لە بۆنە و یادەکانیاندا.



- پیسکردنی کەعبە یاخود مزگەوتەکان بەگشتی یان ڕووخاندنیان.

- دژایەتی ئیسلام و ڕێگر بوون لە بڵاوبوونەوەی دینی خوا.

- دەربڕینی خۆشەویستی وەلاء بۆ کافر و دوژمنانی خوا و موشریک و ئەهلی کتێب.

-سەرخستنی موشریک و کافر بەسەر موسوڵماناندا.

- دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ کافر بۆ کوشتنی موسوڵمانان.

- قەدەغەکردنی دروشمەکانی ئیسلام و واجباتەکان و دژایەتی کردنی ئەهلی ئیسلام.

- حوکم کردن بە یاسای دەستکرد و قەدەغە کردنی یاسای ئیسلام.

- دادوەریکردن لای طاغوت و دەزگا طاغوتییەکان و وەک بەدیل شەریعەت قبوڵی بکەیت.

- ئیمزاکردنی پەیماننامە دژی شەرعی خوای گەورەیە حەڵاڵ کردنی ئەوەی کە خوای پەروەردگار حەرامی کردووە.

- بەرگریکردن لەیاسا و دەستورە مرۆییەکان لەبەرانبەر شەرعی خوا.

- حەڵاڵ کردنی ئەوەی کە خوای گەورە حەرامی کردووە بە پێچەوانەوە حەرامکردنی حەڵاڵەکان.

- وتنی بسم الله لەکاتی کاری حەرام و زینا و مەی خواردن کە مانای سوکایەتی کردن ئەگەیەنێ بەناوی خوا یان بە حەڵاڵ زانینی ئەو تاوانانە.

- سەما کردن بە دەقی قورئانی و مۆسیقا بۆی.

- ڕازی بوون بە کوفر و شیرک بەبێ ئەوەی بە زمان یان کردار ئینکاری بکەیت.

- بەڕاست و دروست زانینی دینی کوفر و مەزهەب و بیروباوەڕیان.

- وازهێنان لە نوێژ و تەرککردنی.

- نەدانی زەکات و شەڕکردن لەپێناو نەدانی.

- ڕق لێبوونەوە لەدینی خوا و پێغەمبەر و ئەوەی کە هێناویەتی.

- خۆشــی و شــادی دەربــڕێن بە هەرەس و ڕووخــانی موســوڵمانان، پێچەواکەنەی سەرکەوتنی کافر و بێباوەڕوان.

- قەدەغەکردنی پابەند بوون بە ئیسلام و شەریعەتەوە.

- سەرخستنی هاوبەشدانەرەکان بەسەر موەحیدینەکاندا.

- فێربوونی سیحر و جادو و کەهەنوتی و بانگکردنی شەیتان.

## نموونەی بەتاڵبوونەوەی ئیمان بە کوفر لە ڕووی بیروباوەڕەوە

- پێشخستنی زانست بەسەر دیندا.

- گومان لە زیندووبوونەوە و ڕۆژی قیامەت.

- بە لاشە دانانی خوای پەروەردگار و شوبهاندنی بە مەخلوق.

- بڕوا بوون بە لەناوچوونی بەهەشت و دۆزەخ کە هەتا هەتایی نین.

- بڕوا بوون بە حەڵاڵی حەرامێک کە دەقی ڕاشکاوی لەسەر هاتووە.

- بــڕوا بــوون بەوەی کە خــوای گەورە لە قیــامەت لێپرســینەوە ئەداتە دەست پێغەمبەران و پیاو چاکان وئەولیاکان.



- بڕوا بوون به زیاد وکەم کردنی ڕزق و ڕۆزی و باران بارین.هتد لەلایەن پیاوچاکان و ئیمامان و پێغەمبەرانەوە.

- گومان لەوبوارە غەیبیانەی کە خوا و پێغەمبەرەکەی صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِوَسَلَّمَ بۆیان باس کردووین.

- گومان لە کوفری کافران و بەڕاست زانینی مەزهەب و دینیان.

- بڕوا بوون بەوەی کە دەتوانین بێجگە شەریعەتی خوا شوێنکەوتووی شەریعەتی تر بین.

- بڕوات وابێت هەندێک کەس سیفاتی ئولوهیەت و ڕبوبیەتیان هەیە، جا هەرکەس بێت.

- دوو ڕووی لە بیروباوەڕدا لە ناخ دا کافر بیت و لە ڕووکەشدا خۆت بە موسوڵمان بناسێنیت.

- بڕوات وابێت کە ٤ خولەفای ڕاشیدین کافرن.

- بڕوات بەوە نەبێت کە ئایینە ئاسمانییەکان کۆتاییان هاتووە و نەسخ بونەتەوە یاخود کاری پێبکەیت.

- بڕوات وابێت کە قورئان دەستکاری کراوە.

- بڕوات وابێت پێغەمبەر صَلَّىٱللَّهُعَلَيۡهِوَعَلَىٰٓ آلِهِوَسَلَّمَ فەیلەسوف یاخود زانا یان چاکەخواز بووە پەیوەندی بەسەر وەحی و پێغەمبەرایەتیەوە نییە.

- بڕوات وابێت کە خوای گەورە زانستی ڕابردوو ئێستا و داهاتووی نییە.

- بڕوات وابێت لە بەهەشت هیچ جۆرە لەزەتێک نییە.

- بڕوات وابێت لە بەهەشت تەنها ڕۆحە لاشە بوونی نییە.



- بڕوا نەبوون بە شەیتان و جنۆکە و فریشتە.

ئەمانەی کە باسمان کرد لە کوفری (کردار، گوفتار و بیروباوەڕ) چەند نموونەیەک بوون، دەشێت نموونەی تر زۆر بن، خوای گەورە بمان پارێزێت لەکافر بوون. سوپاسی نیعمەتی ئیسلام بکەین کە خوای گەورە بەخشیوویەتی پێمان و هیدایەتی داوین، هەمیشە سوپاسگوزار بین و نزا بکەین کە خوای گەورە دامەزراوترمان بکات و هیدایەتی زیاتر وەربگرین، آمین. و الحمد لله رب العالمين و صَلَّى ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَعَلَىٰ آلِهِ وَسَلَّمَ على سيدي و قرة عيني محمد و على آله و صحبه و أتباعه إلى يوم الدين.



# سەرچاوەکانی من و تۆ:


- احياء علوم الدين، الامام محمد الغزالي.

- أصول اهل السنة، الامام ئەحمەد.

شرح ربيع بن الهادي المدخلي.

- العقيدة الطحاوية، للعلامة ئيبنو أبي العز الحنفي.

-قواعد في بيان حقيقة الايمان عند اهل السنة والجماعة، عادل محمد بن علي الشيخاني.

- الأصول الثلاثة، محمد بن عبدالوهاب (شرح محمد حسان).

-تفسير القرآن الكريم, ئيبنو كثير.

- في ظلال القرآن، سيد القطب.

- مجموعة الفتاوى، ئيبنو التيمية.

-تفسير البدائع، ئيبنو القيم الجوزية.

-رياض الصالحين، للإمام النووي (شرح شيخ العثيمين).

- اللؤلؤ و المرجان فيما اتفق عليه الشيخان. محمد فؤاد عبد الباقي.

- رحلة عقل، عمرو شريف.

-تەفسيرى ئاسان.

# پێرست

## بەندی دووەم.................................................................. ٧٣

## بەندی سێیەم ................................................... ١١١

## بەندی چوارەم......................................... ١٥٣

## بەندی حەوتەم...................................................... ٣٠٥

